# ژن

# لەسەر تەختی دەسەڵات

مەحموودی تلووعی

وەرگێڕانی

ئەبوبەکر مەجیدی

کوردستان – هەولێر
٢٠٠٥



ناونیشانی کتێبی لێوەرگێڕدراو:

محمود تلوعی

زن بر سریر قدرت

**ناوی کتێب: ژن لەسەر تەختی دەسەلاٌت**

- نووسەر: مەحموودی تلووعی
- وەرگێڕانی: ئەبوبەکر مەجیدی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: (٣٢٦)
- چاپی یەکەم
- نرخ: ٤٥٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب – ١٩ – (١٢٢)

**ناونیشان**

دەزگای چاپ و بلاٌوکردنەوەی موکریانی

پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن: 2260311

www.mukiryani.com



## پێڕست







ئەم بەرهەمە پێشکەشە بەبرای زۆر خۆشەویستم کاک ئەحمەد کەبەو پەڕی هەست بەبەرپرسایەتی وخۆشەویستی‌یەوە ئەرکی پەروەردەو خوێندنی منی بەئەستۆوە گرتووە. هیوادارم ئاورینگی بەختەوەری دڕکە وشکەکانی داوێنی ژیانی ئاگرباران بکات‌و مەلی ئاواتەکانی بەرەو نیشتمانی ئامانجەکانی بفرێت.

# پێشەکی وەرگێڕ

ئەم پەرتوکەی کە لەبەر دەستان دایە بەرهەمی چەندین ساڵ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی نووسەری ئێرانی، ئاغای مەحمودی تلووعیە کە سەبارەت بە ژنانی دەسەڵاتداری جیهان ئەنجامی داوەو بەپاڵپشتی سەرچاوە مێژووییەکان تیشکی خستۆتە سەر بارودۆخی ژیانو چۆنیەتی بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتو هەروەها شێوازی دەسەڵاتداریو ئەو ژنانەی کە لەدێژایی مێژوودا دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرتووەو رەوتی مێژووی وڵاتەکەیانو لەهەندێك جاردا مێژووی جیهانیان گۆڕیوە. پێش ناساندنی کورتەیەك لەناوەڕۆکی ئەم پەرتوکە ئاماژە بەم چەند خاڵەی خوارەوە بەپێویست دەزانم.

**یەکەم:** بەهۆی نەبوونی مێژوویەکی نووسراوی باوەڕپێکراو سەبارەت بە ژنانی دەسەڵاتداری جیهان لە هەزارەی یەکەمی پ.ز نووسەر ئاماژەی بەژنانی دەسەڵاتداری ئەم بەشە لەمێژوو نەکردووە.

**دووهەم:** بەهۆی ئەوە کە نووسەر ئێرانییە، لەپێشەکی ئەم پەرتوکەدا ئاماژەی بەژمارەیەك ژنی ئێرانی کردووە کە دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان نەبووەو ناتوانین ناوی ئەوان لەریزی ناوی ژنانی دەسەڵاتداری جیهان بهێنین.

**سێهەم:** لەبەر ئەوەی کە لەچاپی چوارەمی ئەم پەرتووکە ئاماژە بە سەرچاوەکانی نەکراوە، منیش نەمتوانیوە لە وەرگێڕانی پەرتووکەکە ئاماژە بەسەرچاوەکانی بکەم.

سەبارەت بەناوەڕۆکی پەرتوکەکە دەتوانم بڵێم کە شێوازی بەدەستەوەگرتنو هەروەها چۆنیەتی بەڕێوەبردنی دەسەڵات لەلایەن ژنانی دەسەڵاتدارەوە بەدوو قۆناغ دابەش دەبێت، قۆناغی یەکەمی دەسەڵاتداری ژنان، لە کلیۆپاتراوە (٥١پ.ز) دەست پێدەکاتو بەسەردەمی حکومەتی ژۆزێفینی هاوسەری ناپلیۆن بۆناپارت کۆتایی پێدێتو قۆناغی دووهەمیش لە مەلیکە ڤیکتۆریاوە دەست پێدەکاتو تا ئێستاش بەردەوامە. لەقۆناغی یەکەمدا بەشێوەیەکی گشتی شێوازێکی هاوبەش لەنێوان ژناندا بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتو هەروەها بەڕێوەبردنی دەبینرێت. هەموویان لەجوانیو راکێشانی سێکس بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات کەڵکیان وەرگرتووەو بەهۆی رێگا پێنەدانی یاساکانی ئەوکات نەیانتوانیوە راستەوخۆ دەسەڵات بەدەستەوە بگرنو هەربەم هۆیەشەوە وەك شاژن یاخود دایكو ئەوینداری پاشاو لەرێگای



کارتێکەری لەهاوسەرەکانیان حوکمڕانیان کردووە. ئاستی دەسەڵاتدارێتی ژنان لەم قۆناغەدا سەرکەوتوو نەبووە: ناعەدالەتی، چەوسانەوەو بەفیڕۆدانی سامانی وڵات، بێبەزەییو کوشتارو گەندەڵیو پیلانگێڕان، دیمەنی سەرەکی دەسەڵاتی ژنانی ئەم قۆناغەیە. ئاگریپینا بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆی لەگەڵ کوڕەکەی جووت دەبێت، ماری تۆدۆر نازناوی ماری خوێنمژ وەردەگرێتو ماری دۆمێدیسی کارەساتی "ساینت بارتۆلۆمی" دەخولقێنێ و... هتد. هەڵبەت ئاماژە بەم خاڵە پێویستە کە هاوسەرەکانیان کە دەسەڵاتداری راستەقینە بوون لەوان سەرکەوتووتر نەبوون. نووسەر لەم پەرتوکەدا ئەم دیمەنانە لەچوارچێوەی دەسەڵاتدارێتی ژنان لێکدەداتەوەو ئەگەرچی ژنانی ئەم قۆناغە لە خولقاندنی ئەم کارەساتانە رۆڵی سەرەکییان نواندووە، بەڵام نابێ ئەم بابەتەش کە دیمەنی دەسەڵاتی پاشاکانی ئەوکاتیش بەگشتی هەربەم شێوەیە بووە لەچاوی ئاوێنەی دادپەروەری بشارینەوە. ئەگەر بەراوردێکم هەبێت لەنێوان دەسەڵاتدارێتی ژنانو پیاوانی ئەوکاتو هەموو ئەو دۆخو چوارچێوەیەی کە ژنانو پیاوانی تێدا ژیاوە هاوکات لەگەڵ تێڕوانینی کۆمەڵگا بخەمە بەر هەڵسەنگاندنێکی دادپەروەرانە، ئەوە دەتوانم بڵێم کە ژنان سەرکەوتووتر بوون. ژنە دەسەڵاتدارانی ئەم قۆناغە ئەگەر تینووی دەسەڵاتنو نەیانتوانیوە سەرکەوتوو بن، دەرئەنجامی سروشتی چەوسانەوەو بێبەری بوونی ئەوانە لەدەسەڵات. ئەمەش بەنۆبەی خۆی جگە لەناشیاویو ناشارەزاییو چەوتی دەسەڵات ئاکامیتری لێناکەوێتەوەو هەربۆیەش ناتوانین وەك نمونە پەنجە لەسەر ژنە دەسەڵاتدارێکی کارامەو لێهاتوو لەم قۆناغەدا دابنێین، بەڵام پیاوان کە لەسەرتای ژیانی مرۆڤەوە ئەزموونی دەسەڵاتدارییان هەبووە دەبوایە پەڕەکانی پەرتوکی مێژووی دەسەڵاتیان لەوەی کە هەیە خاوێنتر بووایە. لە قۆناغی دووهەمی دەسەڵاتدارێتی ژنان، ژنە دەسەڵاتدارانی ئەم قۆناغە جگە لە مەلیکە ئالێکساندارو تێزۆهسی (کە ئەم دوانەش لە گرووپی ژنە دەسەڵاتدارانی قۆناغی یەکەم جێدەگرن) لەرێگای میراتگریو بە زۆرینە تا لەسەر دەمی ئەمرۆکە نێزیکتر دەبێتەوە، لە رێگای هەڵبژاردن بە دەسەڵات دەگەن. بەهۆی ئاڵو گۆڕی قووڵ لە تێڕوانینی کۆمەڵگاو خەباتی ژنانو پێشکەوتنی یاساکان و...هتد، ئیتر رۆڵی جوانیو راکێشانی سێکس بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات نامێنێو لێهاتوویيو شارەزاییو هەڵبژاردن رۆڵی سەرەکی دەگێڕێ. لەم قۆناغەدا ژنان بەهۆی ئەم ئاڵو گۆڕییانەی کە باسمان کرد بەدەستێکی پڕ لە زانستو رووناکبیرییەوە دێنە ناوگۆڕەپانی دەسەڵاتو هاوشانی پیاوان ئەرکی بەڕێوەبەری کۆمەڵگا

دەگرنە ئەستۆ. هەر بۆیەش دەبینین لە چوارچۆوەی سیاسەتی دەرەوە بۆچوونەکانی مەلیکە ڤیکتۆریا دروستو وردبینانەترە لە بۆچوونەکانی وەزیری دەرەوەی (پالمیرستۆن)و هەروەها ژنە دەسەلاتدارانی وەکوو ئێڤیتا پیرۆن بە نازناوی فریشتەی رزگاری هەژارانو مارگاریت تاچێر بە نازناوی ژنی ئاسنینی بریتانیاو گۆلدا مایێر بە نازناوی دایەگەورەی ئیسرائیل دێنە ناو گۆڕەپانی سیاسەتەوەو ئەرکی سیاسەتی ولاتەکەیان دەگرنە ئەستۆو راستەوخۆ (نەك لەرێگای کارتێکەری لە هاسەرەکانیان) لەسەر کورسی دەسەلات بڕیار دەدەن. ئەگەر بێن بەراوردێك بکەین لەنێوان ئەم دوو قۆناغەدا بۆمان دەردەکەوێ کە لە قۆناغی یەکەمدا ژن بەشێکی چەوساوەو بڕیار لەسەر دراوو بێبەش لە دەسەلاتی کۆمەلگایە کە کاتێك دەسەلات بەدەستەوە دەگرێت چەوت کەلکی لێوەردەگرێو ناشارەزایانە یان لە رووی عوقدەوە گەندەلی دەکات. بەلام لە قۆناغی دووهەمدا ژن پتر شارەزاو رۆشنبیرەو کاتێك دەسەلات بەدەستەوە دەگرێت شان بەشانی پیاوان بەرێوەی دەباتو هەروەها بەهۆی دەرەتانی یاساییو کۆمەلایەتییەوە، ئیتر رۆلی جوانیو راکێشانی سێکس بۆ بەدەستهێنانی دسەلات نامێنێو تواناییو شارەزایی شۆێنی دەگرێتەوەو خۆی راستەوخۆ پال بە تەختی دەسەلاتەوە دەدات. ژنانی قۆناغی دووهەم ئەگەرچی سەرکەوتنێکی زۆریان بەدەست هێناوە بەلام بەراورد لەگەل پیاوان لە ئاستێکی نزمتر دابوونو ئەمەش هەر وەك لەسەرەتادا باسم کرد لەوە سەرچاوە دەگرێ کە هێشتاش تێڕوانینی کۆمەلگا سەبارەت بە ژن ئەگەر چی بەرەو پێش چووە بەلام نەگەیشتووەتە ئاستی یەکسانیو کۆمەلگای ئەمرۆش بەتایبەت لە شەرق رۆلی گرینگی لە دانانو داسەپاندنی هەرێمە گشتیو تایبەتییەکان هەیە، واتە رۆلو کاری ژن لە هەرێمە تایبەتییەکانی وەکوو کاروباری مالداریو مندال بەخێو کردنو بە گشتی هەموو ئەو کارانەی کە لە چوارچێوەی دیواری مالەوە ئەنجام دەدرێ بەرجستە دەبێ (هەرێمی تایبەتی)و ئەرکی سیاسیو بەڕێوەبردنیکۆمەلگاو بە گشتی کاری دەرەوەی ناو مال (هەرێمە گشتییەکان) لەسەر شانی پیاوانەو ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوە کە ژن بە خواستی خۆی نا بەلکوو لەژێر دەسەلاتو سیستەمی پیاوسالاریدا ناچار بێ کاروباری سیاسی بەجێ بهێلێت.

نووسەر لەپێشەکی ئەم پەرتووکەدا ئاماژە بەوە دەکات کە دەسەلاتی ژنو رۆلی ئەوان لە سیاسەتی جیهانیدا پێوەندی راستەوخۆی بەسەرکەوتنی ژنان لە بەدەستهێنانی مافە سیاسییەکانەوە نییە، بەلام بە وردبوونەوە لە مێژووی دەسەلاتدارێتی ژنان کە نووسەر بۆ



خۆشی لەم پەرتووکەدا ئاماژەی پێداوە، بۆمان دەردەکەوێ ژمارەی ئەو ژنانەی کە لەسەردەمی ئێمە (سەردەمی خەباتی ژنان بۆ بەدەستهێنانی مافە رامیارییەکانو هەروەها بەرز بوونەوەی ئاستی رووناکبیری کۆمەلگا) بەدەسەلات گەیشتوون، زۆرترەو لەگەل ئەمەشدا رەوتی بەدەستهێنانو شێوازی دەسەلاتداری رەوتێکی رێکوپێكو درووستی بە خۆیەوە گرتووەو ژنە دەسەلاتداری ئێستا پشتیوانی بەرەو پێشچوونی دەسەلاتە نەك گەندەلکەری دەسەلات. لێردا پێویستە ئاماژە بەم خالە بکرێ کە دوای تەواوبوونی وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە ژمارەیەکی زۆر لە ژنانی جیهان بۆ وێنە مێگاواتی سوکارنۆ سەرۆك کۆماری ئەندونێزیاو گلۆریا ئەرۆیۆی، سەرۆك کۆماری فیلیپینو خاتوو ئانا لیندای وەزیری دەرەوەی سویدو خاتوو کۆندۆ لیزارایزی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی جۆرج بووش و... هتد لە پۆستە جیاجیاکانی حکوومەت وەك سەرۆك وەزیرانیو وەزیری دەرەوە و... هتد لەسەر تەختی دەسەلات دانیشتون کە لەم پەرتووکەدا ناویان نەهاتووە.

لەکۆتاییشدا جێگەی خۆیەتی سپاس و ئەمەگناسی خۆم پێشکەش بە هەموو ئەو کسانە بکەم کە لەئامادەکردنی ئەم بەرهەمە یارمەتیان داوم. هیوادارم نەمامی ئەوین لە پێدەشتی ژیانیان بڕوێت وداری ئاواتەکانیان چرۆی بەختەوەری بگرێت.





# پێشەکی نووسەر

ئەم پەرتووکەی کە لەبەردەستاندایە، بەرهەمی چەندین ساڵ لێکۆڵینەوەو بە دواداچوونە سەبارەت بە ژنانی حوکمڕانی جیهان، کە لەم کۆتاییانە دەرفەتێك بۆ نووسینەوەی ئەم زانیارییانە رەخسارو هاوکات لەگەڵ رێکخستنی بابەتەکانی هەر بەشێك، کەڵك لەنوێترین سەرچاوەکانی تایبەت بەو ژنانە وەرگیراوە کە لەنیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا بە دەسەڵات گەیشتوون. حوکمڕانیی ژنانو رۆڵی ئەوان لە سیاسەتی جیهاندا هیچ پێوەندییەکی راستەوخۆی بە سەرکەوتنی ژنان لە بەدەستهێنانی مافە رامیارییەکانەوە نییە، بەهۆی ئەوەی کە تا کۆتایی سەدەی بیستەم تەنیا ژنانی نیوزیلەندا توانیبوویان مافە سیاسییەکانیان بەدەست بهێنن. پێش شەڕی یەکەمی جیهانیش وێڕای بەخشینی مافی سیاسی بە ژنانی ئۆستۆرالیاو فینلەنداو نۆروێژ، ژمارەی ئەم وڵاتانە لە چوار دەوڵەت تێ پەڕی نەدەکرد. لەمەودای شەڕی یەکەمو دووهەمی جیهانیشدا تەنیا ژنانی نۆزدە وڵاتی جیهان کە زۆربەیان ژنانی وڵاتانی ئەورووپی بوون، بۆ وێنە شوڕەوی (یەکێتی سۆڤیەت) لەساڵی ١٩١٧، ئەڵمانیا لەساڵی ١٩١٨، بریتانیا لەساڵی ١٩١٩و ئەمریکا لەساڵی ١٩٢٠ توانیان مافە رامیارییەکانیان بەدەست بهێننو ژنانی فەڕانسەو ئیتالیاش دوای کۆتایی شەڕی دووهەمی جیهانی مافی دەنگدانیان بەدەست هێنا.  لەسەرەتای نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا تەنیا ژنانی سی وڵات لە کۆی وڵاتانی سەربەخۆی جیهان کە نێزیکەی سەد وڵات بوو، مافی دەنگدانیان هەبووو ئەمەش تەنیا وڵاتانی جیهانی سێهەمی نەدەگرتەوە بەڵکو لەهەندێ وڵاتە پێشکەوتووەکانیش بۆ وێنە سویسرا، ژن مافی دەنگدان یان هەڵبژاردنی بۆ پۆستە سیاسییەکانی نەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا مێژووی دەسەڵاتداری ژنان بۆ چەندین هەزار ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە کە نووسراوی مێژوویی لەوبارەیەوە تا دووهەزار ساڵ لەمەوپێش لەبەردەستدایە. لە نووسین و رێکخستنی بابەتەکانی ئەم پەرتووکە لەمێژووی نووسراوەی دووهەزار ساڵە کەلك وەرگیراوەو ئەگەر ئاماژە بە ژنانی وەك بلقیس، شاژنی سەباو سمیرامیس، شاژنی ئاشوورو نەفرتیتی، شاژنی میسر نەکراوە بەهۆی نەبوونی سەرچاوەیەکی مێژوویی باوەڕپێکراوو هەروەها ئەفسانەیی بوونی ئەو باسو بەسەرهاتانەیە کە سەبارەت بەو ژنانە نووسراوە. یەکەمین ژنی دەسەڵاتداری جیهان کە لەم



پەرتووکەدا (کۆکراوەیە) باسی دەکەین، کیلۆپاترای شاژنی میسرە. دوای کیلۆپاترا لەنیوان ئەو ژنانەی کە لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین دەسەڵاتیان بەدەست هێناوە، ئاماژە بە ژنانی ناوداری رۆماو "تیۆدۆرا" شاژنی بیزانس کراوە. سەبارەت بە باتەکانی ئەم بەشەی پەرتووکەکە وەبیرهێنانەوەی ئەم خاڵە پێویستە کە لەنێوان سەرچاوە مێژووییەکانی تایبەت بە رووداوەکانی ژیانی ئەو ژنانەی کە لەهەزارەی یەکەمی پێش زایین بە دەسەڵات گەیشتوون، هەندێك بابەتو نووسراوەی دژبەیەك هەیە کە لەم پەرتووکەدا لە باوەڕپێکراوترین سەرچاوەکان کەڵك وەرگیراوە. بەڵام بابەتەکانی تایبەت بە رووداوەکانی ژیانی ژنانی دەسەڵاتداری جیهان لە هەزارەی دووهەمی پێش زایین کەمتر جێگای شكو گومانن، ئەمەش بەهۆی نێزیکی  لەسەردەمی ئێمەو هەروەها زۆر بوونی سەرچاوە مێژووییەکان کە کاری لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە ژیانی ئەو ژنانە ئاسانتر کردووە کە لەم چەند سەدەیەی رابردوو بە دەسەڵات گەیشتوون. پێش ناساندنی سەرچاوەکانی ئەم پەرتووکە، وەبیرهێنانەوەی ئەم خاڵەش پێویستە کە مەبەست لە ژنانی دەسەڵاتداری جیهان یاخود ئەو ژنانەی کە بەدرێژایی مێژوو خاوەن دەسەڵات بوون تەنیا ئەو ژنانە نییە کە راستەوخۆ دەسەڵاتیان بەدەستەوە بووە، وەك پاشاو شاژن یاخود لە پۆستی سەرۆك کۆماریو سەرۆك وەزیرانی و... هتد حوکمیان گێڕاوە، بەڵکو بە درێژایی مێژوودا زۆر ژن هەبوون کە هیچکام لەو پایەو پۆستانەیان نەبووەو راستەوخۆ حوکمڕانیان نەکردووە بەڵام وەك جێگری پاشاو دایکی پاشا بەسەر وڵاتەکەیاندا حوکمیان گێڕاوەو یان لەرێگای هیچکام لەمانەش، بەڵکو لە رێگای زاڵ بوونو کاریگەری لە مێردەکانیان چارەنووسو رەوتی مێژووی وڵاتەکەیان گۆڕیوە. کاترین دۆمێدیسی کە نێزیکەی چل ساڵ بەناوی کوڕەکانی لە فەڕانسا حکوومی گێڕاوە، مەلیکە ئەلێکساندرا کە لەژێر کاریگەریو کارتێکەری پیاوێکی بەرەنگ ئایینی بەناوی راسپووتین ئیمپراتۆریەتی تێزارەکانی روخاندو ئێدیت ویلسۆن هاوسەری سەرۆك کۆماری بەناوبانگی ئەمریکا (ویلسۆن) کە لەدووساڵی کۆتایی خولی سەرۆك کۆماری مێردەکەیدا بەناوی ئەو لە ئەمریکا حکوومی گێڕا، چەند وێنەیەکن لەو ژنانە. خاڵی هاوبەشی هەموو ژنانی دەسەڵاتداری جیهان، تووڕەییو سووربوون لە کاروباری دەسەڵاتو بێبەزەییو دڵڕەقی بەرامبەر بە دوژمنانو رکابەرەکانیانە کەلەم کارەدا تا ئەو جێگایە چوونەتە پێشێ کە تەنانەت ژمارەیەکیان بۆ پاراستنی هێزو دەسەڵاتیان، لە کوشتنی منداڵەکانیشیان نەپرینگاونەتەوە. وا دێتە بەرچاو کە ئەو ژنانەی تینووی دەسەڵاتن، لە گەیشتن بەدەسەڵات یان





لەمەش ئەو سەرچاوانەی کە ئاماژەیان بە رۆڵی ژنانی ئێرانی لە دەسەڵاتدا کردووە، زۆر کەمنو لەناوەرۆکدا لەگەڵ یەکتر جیاوازن، ئەمەش پیشاندانی دیمەنی راستەقینەو رۆشەنی ژنانی دەسەڵاتداری ئێرانی دژوار دەکات. لەگەڵ ئەمەشدا جێگای خۆیەتی ئاماژەیەکی کورت بەو ژنە ئێرانی‌یانە بکرێت کە لە حکومەتدا رۆڵیان نواندووە. یەکەمین ژنی ئێرانی کە لە دەسەڵاتدا رۆڵی گێڕاوە کە بەسەرهاتەکەی بەشێك لە پەرتووکی پیرۆز پێك هێناوە، ژنێکی یەهوودی بەناوی "ئێسترا" یان ستارەیە کە بەپێی پەرتووکی پیرۆزی یەهوودییەکان لەسەردەمی خەشایار شاو بەپێی هەندێك لەسەرچاوە فارسییەکان لەسەردەمی پاشایەتی ئەردەشێری یەکەمی هەخامەنشی، شاژنی ئێران بووەو لەسەرەتادا بە کارتێکردن لەسەر پاشای هەخامەنشی، هامانی سەرۆك وەزیرانی ئەوی کوشتووەو دواتریش مامی خۆی بەناوی "مەرد خای" لە جێگەی ئەو داناوە. بەپێی گێڕانەوەی پەرتووکی پیرۆز، هامان لەگەڵ یەهودییەکان دوژمنایەتی هەبووەو فەرمانی کۆمەڵکوژی ئەوانی لە خەشایار شا وەرگرتووە، بەڵام خەشایار شا (یان بەپێی ژمارەیەك سەرچاوەی ئێرانی ئەردەشێری یەکەم) دوای کوژرانی هامان ئەم بڕیارەی هەڵوەشاندۆتەوەو دیسانیش بەپێی گێڕانەوەی پەرتووکی پیرۆز، یەهودییەکان بە پاڵپشتی ستارەو مەردخای تۆڵەیەکی بەزەبرو قورسیان لە دوژمنەکانی خۆیان سەندۆتەوەو لەرۆژەکانی سێزدەو چواردەی مانگی "ئادار"دا ٧٧٠٠٠ کەسیان لێ‌کوشتوون. یەهودییەکان لە رۆژی چواردەی ئاداردا بۆ وەبیرهێنانەوەی ئەو رۆژە جێژن (جێژنی پوریم) دەگێڕن. یەکەمین ژنی ئێرانی کە بە پلەی پاشایەتی گەیشتووە، "پوران دۆخت" یان "بوران دۆخت" بە مانای کچێکی رووخسار نێوەگوڵ کە ساڵێك دوای کوژرانی باوکی (خوسرەو پەروێز) لەدەورووبەری ساڵی ٦٢٩ی زایینی بەدەسەڵات گەیشتو بەپێی ژمارەیەك سەرچاوە، ساڵێكو چوار مانگو بەپێی هەندێ سەرچاوەی‌تر هەژدە مانگ پاشایەتی کرد. سەردەمی دەسەڵاتداری ئەو هاوکات بوو لەگەڵ کۆتاییەکانی جێنشینی ئەبوبەکرو سەرەتاکانی جێنشینی عومەرو سەردەمی بەهێزی دەسەڵاتداریەتی ئیسلام. سەبارەت بە سەردەمی پاشایەتی ئەو لە پەرتوکی "حبیب السیر"ی خاندمیر بە گێڕانەوەی مێژووی تەبەری هاتووە کە: "... دوای ئەوەی کە پوران دۆخت پاڵی بە تەختی دەسەڵاتەوەدا، زوڵمو زۆرداری نەماو دادپەروەری پەرەی سەند...و سەفروخی (پووس فەرۆخ) کردە وەزیرو نامەی بۆ سوپاکان نووسی کە "ئەم پاشایەتییە تەنیا بە پیاو بەڕێوە ناچێت بەڵکو لەژێر سێبەری بەزەیی خوداو بە دادپەروەریو سیاسەتی پاشا رادەگیرێ...



پاراستنی دەسەڵات لە هیچ توندوتیژییەك خۆ ناپارێزنو دەیانهەوێ کەم وکوڕییە دەروونی‌یەکانیان بە دڵڕەقیو توندوتیژی قەرەبوو بکەنەوەو وانیشاندەن کە لە پیاو کەمتر نین. ژمارەیەك لەو ژنانە بۆ وێنە کاترین دۆمێدیسیو ئیلیزابێتی یەکەمو ئیندیراگاندیو گۆڵدامایێر هیچ جوانیو ناسکیو هەستێکی ژنانەیان نەبووەو دەڵێی سروشت بەهەڵە ئەوانی کردۆتە ژن، بەڵام ژمارەیەکی تر لەو ژنانە وەکوو کاترینی گەورە دەسەڵاتداری بەهێزی رووسیا لەنیوەی دووهەمی سەدەی هەژدەیەمو یان ئەو ژنانەی کە لە ئیمپراتۆریەتەکانی رۆماو بیزانس بەدەسەڵات گەیشتوون، بەهۆی هەوەسبازی بێ سنووریان هێزو گەندەڵیان تێکەڵ بە یەکتر کردووە.

سەرچاوەکانی ئەم پەرتووکە جگە لەو پەرتووکانەی کە لە کۆتاییدا ئاماژە بە پێڕستەکانیان دەکرێ، بریتین لە خولەکانی (دەورەکانی) سێ "دائره المعارف"ی گەورەی ئەمریکاناو بریتانیکاو لارۆس. هەروەها لە نووسینەوەی هەندێك لە بەشەکانی ئەم پەرتووکە لە خولەکانی گۆڤارە فەڕانسەییەکانی وەکو "هیستۆریا HISTORIA"و "لیستوار L'HISTOIRE"و "لیر LIRE" کەڵك وەرگیراوە. سەبارەت بەو ژنانەی کەلەم بیست ساڵەی رابردوودا بە دەسەڵات گەیشتوون، جگە لەو پەرتووکانەی کە لەسەر ئەوان نووسراوە، لە ژمارە جۆراوجۆرەکانی ئەو گۆڤارو رۆژنامە بیانی‌یانە کەڵك وەرگیراوە کەتا سەرەتاکانی ساڵی ١٩٨٩ بڵاوبوونەتەوە. لەنێوان ئەم گۆڤارانەدا پتر لە گۆڤارە ئەمریکاییەکانی وەکو "تایم TIME"و "نیوزویك NEWS WEEK"و هەروەها گۆڤاری فەڕانسەیی "لێکسپرێس L'EXPRESS"و بڵاوکراوە بەریتانیاییەکانی "لەندەن ریڤیوو ئۆف بوکس " LONDON REVIEW OF BOOKS" کە تایبەتە بە ناساندنی نوێترین پەرتووکە بڵاوکراوەکانی بەریتانیا کەڵك وەرگیراوە.

* * *

رەنگە خوێنەرە خاوەنڕاکان رەخنە لەنووسەر بگرن کە بۆچی بەشێك لەم پەرتووکە تەرخان نەکراوە بۆ ئەو ژنە ئێرانی‌یانەی کە بە دەسەڵات گەیشتوون یان رۆڵیان لەدەسەڵاتی ئێراندا گێڕاوە؟ راستیەکەی ئەوەیە کە لەمێژووی ئێراندا هیچ ژنێك رۆڵی یەکەمی لە دەسەڵاتدا نەبینیوە ئەو دوو ژنە ئێرانی‌یەش کە لە کۆتاییەکانی دەوڵەتی ساسانی بە دەسەڵات گەیشتوون، کەمتر لە دووساڵ حکوومەتیان کردووەو هێزو دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان نەبووەو جگە

هەروەها سوپاش تەنیا بە دادپەروەریو جیاوازی نەکردن رادەگیرێو ئەگەر پاشا دادپەروەر بێ، دەتوانێ پارێزگاری لە هەرێمی دەسەڵاتو حکومەت بکات جا چ ژن بێ و چ پیاو. هیوادارم سەبارەت بە ئێوە دادپەروەر بووبم ئەویش کە هیچ کەسێکتان بەو شێوەیە نەبینی بێت..."
دواتریش فەرمانیدا کە هەموو خەراجی پاشماوەی سەردەمی خوسرەو پەروێزە بدەنەوە بە خەڵکی ویلایەتەکانو دادپەروەری بڵاو بکەنەوەو داری چلیپا (خاچ) کە لەسەردەمی خوسرەو پەروێز لە رۆمایان داگیر کردبووو نەیگەڕاندبۆوە، بدەنەوە بە دەوڵەتی رۆم بۆئەوەی سازش و لایەنگری لەگەڵ حکومەتی پوران دۆخت بکات... ئەو ساڵێکو چوار مانگ پاشایەتی کرد.

خاندمیر دوای ئەم پێشەکییە کە کەمو زۆر دان بە توانایی‌و دادپەروەری پوران دۆخت دادەنێ ئەم چەند بەیتەشی نووسیوە:

چون تاج کیانی به پوران رسید — شکوهی دار آن خاندان کس ندید
بیاد آور این قول سنجیده را — بخوان قول مرد جهان دیده را
شکوهی نماند در آن خاندان — که بانگ خروس آید از ماکیان

وەرگێڕانەکەی بریتیە لە:
کاتێك کە تاجی دەسەڵاتی کیانی بە پوران گەیشت هیچ کەس شکۆیەکی لەم بنەماڵەیە نەبینی
ئەم وتە بەجێو بەنرخە وەبیرەخۆت بهێنەوەو پەندی پیاوانی گەڕیدە بخوێنەوە کە هیچ شکۆیەك بۆ بنەماڵەیەك نامێنێتەوە کاتێك کە لەجیاتی کەڵەشێر مریشك دەخوێنێ
فێردەوسیش کە لەگەڵ چەمکی هۆنراوەکەی سەرەوە سەبارەت بە دەسەڵاتدارێتی ژنان هاوڕایە، لەسەر سەردەمی پاشایەتی پوران دۆخت دەنووسێ:

یکی دختری بود پوران بنام — چو زن شاه شد کارها گشت خام
که از تخم ساسان همان مانده بود — بس دفتر خسروان خوانده بود
بر آن تخت شاهیش بنشاندند — بزرگان بر او گوهر افشاندند
چنین گفت پس دوخت پوران، که من — نخواهم پراکندن انجمن
کسی را که درویش شد، ز گنج — توانگر کنم، تا نماند به رنج
مبادا به گیتی کسی مستمند — که از داد او بر من آید گزند
ز کشور کنم دور بدخواه را — بەر**آئین** شاهان کنم راه را



وەرگێڕانەکەی بریتیە لە:

کچێك بەناوی پووران هەبوو کە کاتێك بوو بە ژنی پاشا هەموو کارەکان شێوان
لەبنەماڵەی ساسان تەنیا ئەو کچە مابوو کە بەسەرهاتی زۆربەی پاشاکانی خوێندبۆوە
کاتێك لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت گەورە پیاوان زێڕو گەوهەریان بەسەردا باراند
دواتر پوران دۆخت ئاوای گوت: کە من نامهەوێ ئەم پاشایەتییە بشێوێنم‌و
کەسێك کە لەگەنج بێبەش (فەقیر) بێت دەوڵەمەندی دەکەم تا دەردو رەنجی نەمێنێ
نابێ لەجیهاندا کەس دەستکورت بێ لەبەرئەوەی کە بەهۆی هاوارو سکاڵای ئەوەوە زەرەرمەند دەبم
نەیاران لە وڵاتەکەم دوور دەخەمەوەو بەشێوەی شاهانە (دادپەروەرانە) دەسەڵاتداری دەکەم

دوای مردنی پوران دۆخت، خوشکەکەی بەناوی "ئازەر میدۆخت" کە بە واتای پیرنەبوون یان کچی هەمیشە گەنج دێت لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت، بەڵام سەردارێکی سوپای ساسانی بەناوی "فەرۆخ هۆرمۆزد" داوای تاجو تەختی ئەوی کردو دواتر داوای لە ئازەر میدۆخت کرد زەماوەندی لەگەڵ بکات، بەڵام ئازەر میدۆخت کە ئامادە نەبوو زەماوەندی لەگەڵ بکات، کار دروستایی کوشتنی ئەوی ئامادە کرد. کوڕی فەرۆخ هۆرمۆزد بەناوی رۆستەم بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی باوکی دژی ئەو راپەڕیو توانی حکوومەتەکەی بڕوخێنێو خودی ئازەر میدۆختیش کوێر بکات. بەپێی مێژووی ئێرانی بەر لە ئیسلام، سەردەمی دەسەڵاتی ئازەر میدۆخت لە دەوروبەری سێ یان چوار مانگ بووە.

"تورکان خاتوون"ی ناسراو بە خوای جیهان کە هاوسەری تەکێشو دایکی سوڵتان محەمەدی خارەزمشا بوو، لە مێژووی ئێرانی دوای ئیسلامدا بەناوبانگترین ژن بووە کە رۆڵی کاریگەری لەدەسەڵاتدا نواندووەو ماوەیەکی کورتیش بەتەنیا حوکمڕانی کردووە. تورکان خاتوون کچی یەکێك لەخانەدانە تورکەکان بووو بەپشتیوانی خێڵەکەی (قبچاق) توانی لەدەرباری خازەرمشادا دەسەڵاتێکی زۆر بەدەست بهێنێو زۆربەی وەزیرەکانی پاشاش کە بەراوێژو مەیلی ئەو هەڵدەبژێردران، پێڕەویان لێدەکرد. بەهۆی ئەوەکە سوڵتان محەمەد دەیهەویست کوڕەکەی





(جەلالەدین) کە لە ژنێکی تورکمان بوو بکاتە جێنشینی خۆی، ناکۆکی کەوتە نێوان ئەوو دایکیو تەنانەت تورکان خاتوون کاتی هێرشی مەغۆلیش ئامادە نەبوو لەگەڵ کوڕەکەی خارەزم بەجێ بهێڵێ، بەڵام بە نزیك بوونەوەی سوپای مەغۆل وردەوردە ترس لەسەر دڵی نیشتو دوای کوشتنی شازدە کەس لە شازدەکان (بەپێی هەندێ سەرچاوە ۲۷ کەس) کە رکابەرو داواکاری تاجو تەختی دەسەڵات بوون، خارەزمی چۆڵ کردو لە قەڵای ئیلال کە وایدەزانی مەغۆلەکان دەستیان پێی ناگات، جێگیر بوو. واسیلییان، نوسەرو مێژوونوسی رووس لەپەرتووکی بەناوبانگی خۆیدا (جەنگیزخان) سەبارەت بەچارەنووسی تورکان خاتوون دەنوسێ: "... مەغۆلەکان دوای ماوەیەکی کورت گەیشتنە قەڵاکەو گەمارۆیاندا. دەوراودەوری ئەم کێوە چڕەیان بەدیوار هەڵچنیو بەتەواوی پەیوەندی گەمارۆدراوەکانیان لەگەڵ دەرەوە بڕی. گەمارۆی قەڵاکە چوار مانگی خایاندو دوای ئەوەکە ئاوو خۆراك نەما، تورکان خاتوون بەناچاری خۆی بەدەستەوەدا. مەغۆلەکان هەموو ژنو منداڵە بچوکەکانی خارەزمشایان لەگەڵ تورکان خاتوون دەستبەسەر کردو بەشێوەیەك کە لە پەرتووکی مێژووی جیهانگیردا ئاماژە پێکراوە، کوڕەکانی سوڵتان محەمەدیان بەگەورەو بچوکەوە کوشتو کچەکانی سوڵتان محەمەدو هەروەها دایکیشیان ناردە خێوەتگای چەنگیز". واسیلییان درێژەی پێدەداتو دەڵێت: "سەرکردەی مەغۆل کچەکانی خارەزمشای دا بە کوڕو خزمەکانی خۆیو تورکان خاتونیشی بۆ نمایش لەکۆڕەکانی بەزمو ڕەزمی خۆی راگرت. تورکان خاتوون دەبوایە لەپێشەوەی تەختی پاشا راوەستێو گۆرانی خەمین بڵێ. جەنگیزخان لەتە ئێسقانی دەخستە بەردەمی تورکان خاتوونو ئەویش کە خۆی بەدەسەڵاتداری رەهای خارەزمو شاژنی جیهان دەزانی بەم لەتە ئێسقانانە دەژیا". لەمێژووی ئێراندا ژنێکیتریش بەناوی تورکان خاتوون بەدەسەڵات گەیشتووە. ئەو ژنی ئەتابەگی سەعدی کوڕی ئەبووبەکری ئەتابەکانی فارس بوو. کوڕەکەی ئەتابەك سەعد (محەمەد) لەکاتی مردنی باوکیدا منداڵ بووو هەر بەم هۆیەشەوە دایکی هەوساری کاروباری دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتو بەپێشکەش کردنی خزمەت بە هۆلاکۆ خانی مەغۆل، بەناوی کوڕەکەی مۆڵەتی دەسەڵاتی لە هۆلاکۆ خان وەرگرت. بەڵام محەمەد دوو ساڵ دواتر مردو تورکان خاتونیش بەراوێژی گەورە پیاوانی دەوڵەتی کوڕەکەی، کوڕی سەلغوری کوڕی سەعدی زەنگیی کردە ئەتابەکی فارسو کچەکەشی لێمارە کرد. سەعدی زەنگی دوای بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات، دەستی بەزوڵمو زۆرداری کردو بەشێوەیەك خەڵکی ئازار دەدا کە تورکان خاتون دژی راپەڕیو دوای دەستبەسەر



کردنی، ناردیە هۆلاکۆ خان. هۆلاکۆ خان، سەلجوق شای کردە دەسەڵاتداری فارسو سەلجوق شاش دوای رۆیشتن بۆ شیراز، تورکان خاتونی مارەکرد. بەڵام ئەم زەماوەندە کە لەپێناو بەرژەوەندیدا بوو، ئاکامێکی باشی لێ نەکەوتەوەو تورکان خاتوون لەساڵی ٦٦١ی کۆچی مانگی بەفەرمانی سەلجوق شا کوژرا.

لەمێژووی هاوچەرخی ئێراندا کە لەسەردەمی قاجارییەوە دەست پێدەکات، هیچ ژنێك بەڕادەی "مەهدی عۆلیا"ی دایکی ناسرەدین شا لە حکومەتی ئێراندا رۆڵی نەنواندووەو دەتوانین بڵێین ئاژاوەو دووزمانییەکانی ئەو کە بووە هۆی کوژرانی میرزا تەقیخانی ئەمیر کەبیر، رەوتی مێژووی ئێرانی گۆڕیووە. دکتور فەرەیدوونی ئادەمیەت کە گشتگیرترین لێکۆڵینەوە مێژووییەکانی تایبەت بەسەردەمی ئەمیر کەبیری ئەنجامداوە، لە پەرتووکی "ئەمیر کەبیرو ئێران" بەم شێوەیە مەهدی عۆلیا دەناسێنێ: "خاوەن شکۆی ناسراو بە نەوابو خاوەن نازناوی مەهدی عۆلیا، کچی ئەمیر محەمەد قاسم خانی قاجارو ژنی محەمەد شاو دایکی ناسرەدین شاو شازادە "عزت الدولە" بوو. ئەو زۆر ژیرو پاوانخوازو رازاوە دۆستو ناشیرین بوو. هەروەها لێهاتوییەکی بێوینە لە نووسینی خەت بەشێوازی چلیپا هەبوو. جگە لەمانەش مامۆستای هونەری مەکربازیو فرت وفێڵ بوو. دەسەڵات پەرستیو هەوەسبازی، خووو رەوشتی ئەوی پێك دەهێناو ژیانی ئەو پەروەردەی ئەم دوو رەوشتە بوو. محەمەد شا، مەهدی عولیای خۆش نەدەویستو هەربۆیەش تەڵاقی دابوو... بەڵام لەدەستی ئەو رزگاری نەدەهاتو بەردەوام لە مەترسی پیلانگێڕی ئەو دابوو. مەهدی عۆلیا لەمەودای مردنی محەمەد شاو هاتنە سەرکاری ناسرەدین شا وەك جێگری پاشا حوکمڕانی دەکرد. ناسرەدین شا بەپێچەوانەی رای دایکی، میرزا تەقی خانی وەك سەرۆك وەزیران هەڵبژارد. ئەم گرنگی نەدانە بەڕای مەهدی عۆلیا زۆر لەدڵی دایکی گران هات، ئەمەش لەکاتێکدا کە تا دوێنێ دایکە پاوانخوازەکەی خاوەن دەسەڵات بوو... بەڵگە باوەڕپێکراوەکان هەندێك بابەتی گشتی ئاشکرا دەکەن: مەهدی عۆلیا هەر لەسەرتای دەست بەکاربوونی ئەمیر کەبیر دەستی بەپیلانگێڕی کرد. سەرەڕای ئەوەی کە ئەمیر کەبیر بەردەوام سازشی لەگەڵ دەکرد، داواکارییەکانیشی بۆ خۆ پاراستن لەدوژمنایەتی ئەو بەجێ دەگەیاند! ناسرەدین شا دایکی نەدەدواندو لێی دوور دەکەوتەوە، بەڵام خاڵی سەرنج راکێش ئەوە بوو کە ئەمیر کەبیر هەوڵیدەدا ناسرەدین شا رازی بکات کە دڵی دایکی بداتەوە..." لەگەڵ ئەوانەش، مەهدی عۆلیا کە دەیهەویست سەرۆك وەزیران ملکەچو پێڕەوی





بێت، هیچکات لەگەڵی ڕێك نەدەکەوت‌و دوژمنایەتییەکەی لەگەڵ ئەمیر کەبیر بەهۆی ئەوە کە ناسرەدین شا بەپێچەوانەی ویستی دایکی، خوشکەکەی (عزەت الدولە) لە ئەمیر کەبیر مارەکرد، توندوتیژتر بوو. لەراپۆرتی نوێنەری سیاسی بریتانیا لەئێران (فرانت) بەڕوونی ئاماژە بەم بابەتە کراوەو بۆ وێنە هاتووە "... مەهدی عۆلیا بەتوندی لەگەڵ ئەم زەماوەندە ناکۆك بوو، لەبەرئەوەی کە دەترسا دەسەڵاتی ئەمیر کەبیر لەم ڕێگایەوە زیاتر بێت‌و ئەمەش شتێکی سروشتی‌بوو. بەڵام ناسرەدین شا گوێی بەقسەی دایکی نەداو سوربوو لەسەر ئەم کارەو دەیگوت کە سەرکەوتون و بەردەوام بوونی حکوومەتەکەی بە بوونی ئەمیر کەبیرەوە بەستراوەتەوە. ئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتی لەناوخۆیاندا بەتەشەروە دەیانگوت: کوڕی نۆکەری "قائم مقام" لەگەڵ خوشکی شای ئێستاو کچی شای پێشوو دەستیان لەناودەستی یەکترەوە ناوە..." ئەمیر کەبیر دوای زەماوەند لەگەڵ کچی مەهدی عۆلیا زیاتر لەجاران هەوڵیدەدا کە دڵی خەسوەکەی بداتەو، بەڵام مەهدی عۆلیا کە چاوەڕوانی ئەوە بوو زاواکەی نۆکەرو ملکەچی بێت، لەڕێزو زمانخۆشی‌و هێمنی ئەمیر کەبیر رازی نەدەبوو، تا ئەوەی کە ئەمیر کەبیر وردە وردە شێوازی توندتری لەبەرامبەر پیلان‌و دووزمانی‌یەکانی مەهدی عۆلیا گرتەبەرو مەهدی عۆلیاش لەبەرامبەردا ڕێژەی جوڵانەوەکانی چڕتر کردو توانی بەکەڵك وەرگرتن لەلایەنگرەکانی لەدەربار، تۆوی دڵپیسی لەدەرونی ناسرەدین شادا بچێنێ‌و لەماوەیەکی کورتدا کاردروستایی لەسەرکار لابردن‌و دوورخستنەوەو دواتریش کوشتنی ئەمیر کەبیر ئامادە بکات. مەهدی عۆلیا دوای کوژرانی ئەمیر کەبیرو تا تەواوبوونی سەردەمی سەرۆك وەزیرانی میرزا ئاقاخانی نوری کە نزیکەی حەوت ساڵی خایاند، رۆڵی گرنگی لە کاروباری وڵاتدا گێڕاو ئامانجەکانی خۆی لەرێگای میرزا ئاقاخانی نوری‌یەوە دەستەبەر کرد، بەڵام دوای ئەمانە رۆڵی بەرچاوی نەبوو لەساڵی ١٣٩٠ی کۆچی مانگی کە لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا مرد، کڕو بێدەنگ ببوو. لەنێوان ژنە جۆراوجۆرەکانی ناسرەدین شای قاجار، تەنیا "انیس الدولە"ی سەرتۆپی ژنانی حەرمسەرا رۆڵی کاریگەری لەکاروباری وڵاتدا دەنواندو بەکارتێکەری لە ناسەرەدین شا، دەستی لەدانان و لەسەرکار لابردنی پۆستە گرینگەکانی دەوڵەتی وەردەدا. لەنامەیەکی "انیس الدولە" بۆ ناسرەدین شا سەبارەت بە بڕیاردەری شیراز کە لەپەرتوکی "بیرەوەرییەکان‌و مەترسییەکان"ی حاجی "مخبر السلطنة "ی هیدایەت دا چاپکراوە، ئاماژەیەك بەو دەست تێوەردانانە کراوە. لەو نامەیەدا کە بە رستەی "قوربانی



خاکی بەرپێت بم" دەست پێدەکات، "انیس الدولە" داوا لە هاوسەری دەکات کە "رکن الدولە" لەسەر حکوومەتی شیراز لانەبات. لەو نامەیەدا دوای پێشەکییەکەی هاتووە: "بیستومە کە دیسان حکوومەتی شیرازتان گۆڕیوە. بەخودا جێگەی سەرسووڕمانە. "رکن الدولة"ی بەستەزمان سەرەڕای ئەو زیانە زۆرە حەوت مانگەکە رۆیشتوە. ئەگەر بۆ پێشکەشیە لەشازادەی وەرگرن. بەم شێوەیە رەعیەتی داماو لە پەل و پۆ دەکەون. رەعیەت بەم شێوەیە تەواو دەبێت، حاکم کە لەخۆی نادا.... لەجوامێری بەدوورە ئەو داماوانە لەهەموو لایەکەوە تەواوبون...". ناسەردین شا لەسەروی ئەو داواکارییەی "انیس الدولە"دەنوسێ:"رکن الدولة" حاکمە. وڵامی داواکارییەکەشیمان بە تێلێگراف داوە..."

"انیس الدولة" لەگەڵ میرزا حسێن خانی سپەهسالار، (مشیر الدولة) سەرۆك وەزیرانی لێهاتووی "ناسرەدین شا"ش ناکۆك بووو پێشەکییەکانی لەسەر کار لابردنی ئەوی ئامادە کرد. دێنیس رایتی باڵوێزی پێشوی بریتانیا لەئێران کە لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلی سەبارەت بە مێژووی هاوچەرخی ئێران ئەنجام داوە، لەدوایین پەرتووکی خۆیدا لەژێر ناوی "ئێرانییەکان لەنێوان بەریتانییەکان" ئاماژەی بەڕیشەو بنەماکانی ئەو ناکۆکییانە داوەو سەبارەت بەسەفەری یەکەمی ناسرەدین شا بۆ ئەورووپا کە لەرێگای روسیەوە ئەنجامدرا، دەنوسێ:" ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەبەندەری ئەنزەلی لەگەڵ ناسرەدین شا چوونە سەر پاپۆڕەکە لە دەوروبەری سەد کەس دەبوون‌و کۆمەڵێك مرۆڤی سەیرو سەمەرە بوون کە زۆربەیان بۆ یەکەمین جار بۆ دەرەوەی وڵات سەفەریان دەکرد. "انیس الدولة"و سێ کەس لەخزمەتکارەکانیشی لەگەڵ ئەو گرووپەدا بوون‌و تەنیا ژنانی ئەو گرووپەیان پێك دەهێنا. وەفدە سەرکییەکەی شا لەو سەفەرەدا بریتی بوو لە میزاحسێن خان (مشیر الدولة) و ١٠ یان ١٢ کەس لە وەزیرو شازادەکان کە ژمارەیەکیان وەزیر بوون... ناسەردین شاو هاوڕێیانی لەرێگای دەریای خەزەرەوە بەرەو بەندەری ئیستراخان وەڕێکەوتن‌و لەوێشەوە بە پاپۆڕێکی‌تر چوونە رووباری ڤۆڵگاو لەم رووبارەشەوە بەرەو تێزاریتسین (ئێستالین گراد) وەڕێکەوتن‌و لەو شارەوە سواری دوو شەمەندەفەر بوون. ئەمە یەکەمین شەمەندەفەر بووکە ناسرەدین شاو هاوڕێیانی دەیانبینی، ئەوان بەشەمەندەفەرەکە چوونە مۆسکۆو چەند رۆژێك لەوێ مانەوەو هاوسەری ناسرەدین شا لەو ماوەیەدا لە مۆسکۆ گرفتێکی سازکرد. روون نی‌یە کە ئایا ئەم گرفتە بەهۆی دوور راگرتنی ئەو لەبەر چاوی پیاوان بووە یا خود لە حەزو ئارەزووی "انیس الدولة" بۆ گەڕان‌و





بەشداری لەکۆڕو کۆمەڵە جیاوازەکان بەشێوەیەکی رووت سەرچاوەی گرتووە. لەئاکامدا سەرۆك وەزیران توانی ناسرەدین شا رازی بکات کە هاوسەرو خزمەتکارەکانی لەژێر سەرپەرشتی مەلایەك بۆ تاران بگەڕێنێتەوە. ئەو(انیس الدولة) بەنادڵیو تورەییەوە ملکەچی ئەم بڕیارە بوو، بەڵام رقی لەسەرۆك وەزیران هەڵگرتو دەڵێن هەوڵەکانی ئەو فاکتەری سەرەکی لەسەرکار لابرانی سەرۆك وەزیران دوای گەڕانەوە لەسەفەری ئەوروپا لەمانگی سێپتەمبەردا بووە".

دوای ئەم پێشەکییە کە تایبەت بوو بە رۆڵی ژنی ئێرانی لەسیاسەتو حوکمڕانیدا، ئێستا لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدەدەینەوەو بەسەرهاتی ئەو ژنانە دەخەینە بەرچاو کە لە درێژایی مێژوودا پاڵیان بەتەختی دەسەڵاتەوە داوەو هەندێجار رێگەو رەوتی مێژووی جیهانیان گۆڕیوە.







# یەکەم ژن کە جوانیو سەرنجڕاکێشیی سێکسی لەخزمەتی سیاسەت دا بەکارهێنا

بێگومان لەنێوان ژنانی مێژووسازی جیهاندا، کلیۆپاترا[1] شاژنی میسر لە کۆتاییەکانی سەدەی پێش زایین، یەکەمینو بەناوبانگترینی ئەو ژنانەیە. بە درێژایی مێژوو لەسەر هیچ ژنێك بە رادەی ئەو پەرتووكو شانۆنامە نەنووسراوەو بەسەرهاتی ئەو پتر لە هەموو ژنێك هاتۆتە سەر تەختەی شانۆو پەردەی سینەما. نوسەرانی بەناوبانگی وەکو شێکسپیر[2] لەسەدەکانی پێشوو، بیرنارد شۆ[3] لە سەردەمی ئێستادا بەپێزترین شانۆنامەکانی خۆیان لەسەر بەسەرهاتو چارەنووسی ئەو ژنە نووسیوەو هێشتاش دوای تێپەڕبوونی چەند سەدەیەك، دراماکانی ئەوان لەسەر ژیانی کلیۆپاترا، یەکێك لە سەرکەوتووترینو پڕبینەرترینی ئەو درامایانەیە کە لە ئەمریکاو ئەوروپا پێشان دەدرێن. زۆربەی کات بۆ نواندنی رۆڵی کلیۆپاترا لە فیلمو شانۆکاندا، جوانترین ئەکتەرەکانی سینەماو شانۆ هەڵدەبژێردرێنو بینەرانی ئەو فیلمو شانۆیانە بەم شێوەیە بیر دەکەنەوە کە جوانی ئەفسووناوی کلیۆپاترا هۆکاری سەرەکیی کارتێکەریو دەسەلاتی ئەو لەسەر دوو سەرکردەی گەورەی ئەوکاتی رومی، واتە ژولیۆس سێزار[4]و مارك ئانتۆنی[5] بووە. لەحاڵێکدا بەڵگە مێژووییەکان دەری دەخەن کە کلیۆپاترا جوانییەکی لە ڕادەبەدەری نەبووەو هۆکاری سەرەکی کارتێکەریو دەسەلاتی ئەو لەسەر پیاوانی هاوچاخی خۆی، هۆشو زیرەکیو توانایی ئەو لە کەڵك وەرگرتن لەخاڵە لاوازەکانی پیاوانی سەردەمی خۆیو لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییانەش، سەرنج راکێشیو عیشوەگەری ئەو بووە و ئەو شتەیە کە حافز بە "ئەو" ناوزەدی دەکات.

کلیۆپاترا ناوی چەند کەس لە خاتوو شازادەکانی میسرییە کە لەنێوانیاندا ئەوەی مەبەستمانە، کلیۆپاترای حەوتەم کچی یەکێك لە پاشاکانی بنەماڵەی پتۆلێمییە[6]. بنەماڵەی پتۆلێمی کە بە

1-Copleatra.
2-Shkespear
3-Berard shaw
4-Julus Caesar
5-Mark Antony
6-Ptolemy



ڕەچەڵەك یۆنانیو خەڵکی مەقدوونیە بوون، دوای داگیرکرانی میسر لەلایەن سوپای ئەسکەندەری مەقدوونییەوە لەساڵی ٣٣٢ی (پ.ز) دەسەلاتی ئەم ولاتەیان بەدەستەوە بوو. بەلام لەکاتی لەدایکبوونی کلیۆپاترای حەوتەم لەساڵی ٦٨ یان ٦٩ی(پ.ز) حکوومەتەکەیان بەرەو نەمان دەچوو. پاشاکانی پتۆلێمی لە درێژە پێدانی فەرمانڕەوایی خۆیان، پشتیان بە رۆمییەکان دەبەستو لەژێر فەرمانی قەیسەرە رۆمییەکان دابوون. هەندێك لە مێژوونووسان بۆ نموونە "پلۆتارك"[7]ی یۆنانی باس لە تواناییو ژیری کلیۆپاترا لە فێربوونی زانستو زمانە باوەکانی سەردەمی خۆی دەکاتو دەنووسێ کە کلیۆپاترا لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا جگە لە زمانی میسریو یۆنانی، بە ئاسانی بەزمانەکانی لاتینو عێبریو عەرەبیو ئێرانیو حەبەشی قسەی دەکرد. تەنانەت زمانی خەڵکانی رەسەنی کەناراوی دەریای سوریش فێر ببوو. کلیۆپاترا کە گەورەترین کچی پتۆلێمی یازدەیەم بوو لەکاتی مردنی باوکی لەساڵی ٥١ی(پ.ز) لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا بوو بە پاشای میسر، بەلام بەپێی دابو نەریتی میسرییەکان دەبوایە مافو دەسەلاتەکانی پاشایەتی لەگەڵ کوڕی گەورەی باوکی (پاشای کۆچکردوو) دابەش بکات. پاشایەتیی هاوبەشی کلیۆپاتراو برا گچکەکەی (پتۆلێمی دوازدەیەم) تا ساڵی ٤٩ی (پ.ز) درێژەی کێشا، تا ئەوکاتە کە داروودەستەی براکەی کلیۆپاترا بۆ بەدەستەوە گرتنی جڵەوی دەسەلات، دژی کلیۆپاترا پیلانیان گێڕاو لەسەر دەسەلاتیان لابرد. کلیۆپاترا بۆ ولاتی سوریە دوور خرایەوە، بەلام دەستی لە هەوڵەکانی خۆی بۆ سەندنەوەی دەسەلات هەڵنەگرتو دەستی بە کۆکردنەوەی هێز بۆ هێرش بردنە سەر ئەسکەندەریە کرد. هەوڵی کلیۆپاترا بۆ گەڕانەوە بۆ سەر دەسەلات هاوکات بوو لەگەڵ شەڕی دەسەلات لە رۆما لەنێوان ژۆلیۆس سێزارو پۆمپی.[8] لە شەڕێکدا کە لەنێوان هێزەکانی ژۆلیۆس سێزارو پۆمپی روویدا، پۆمپی شکستی خواردو هەلات بۆ ئەسکەندەریە. ژۆلیۆس بە مەبەستی راوەدوونانی چوو بۆ ئەسکەندەریە، بەلام کەسانیدەستو پێوەنداری پتۆلێمی، پاشای کەم تەمەنی میسر بۆ خۆشخزمەتی بەسەرکردەی سەرکەوتووو بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی ئەو،سەری پۆمپییان بڕیو لەکاتی چوونە ژوورەوەی ژۆلیۆس سێزار بۆ شاری ئەسکەندەریە، سەری بڕاوی پۆمپییان لەسەر سینیەکی زێڕین داناو پێشکەشی ئەویان کرد.

7-Plutarch
8-Pompey








**وێنەی کیلۆپاترا**

ژۆلیۆس سیزار کە دەیەویست پۆمپی بە زیندوویی بگرێو لەگەڵ خۆی بیباتە رۆما،لەو کارەی دەسەلاتدارانی میسری کە بەبێ ئیزنی ئەو کردبوویان تووڕە بوو و بە ساردی لەگەڵیان جوولاوە. کلیۆپاترا کە ناوبانگی ژنبازیی ژۆلیۆس سیزاری بیستبوو، لەو هەلە بۆ داگیرکردنی دڵی ئەو کەڵکی وەرگرتو بۆ بینینی ژۆلیۆس، بە نهێنی چوو ناوشاری ئەسکەندەریە. لە هەندێك لە بەڵگە جیاوازە مێژووییەکاندا هاتووە، کلیۆپاترا لەناو فەرشێك کە وەك دیاری بۆ ژۆلیۆس سیزاریان دەبرد، چووە ناو ئەو کۆشکەی کە جێگای نیشتەجێ بوونی ژۆلیۆس بوو لە ئەسکەندەریە. کاتێك کە فەرشەکەیان لەپێش چاوی ژۆلیۆس کردەوە، کلیۆپاترا هاتەدەرێ. کلیۆپاترا کە لەوکاتەدا تەمەنی لە دەوروبەری بیست ساڵ بوو، بۆ فریودانی ژۆلیۆس سیزاری ٥٢ ساڵە لە هەموو فرتو فێڵێکی ژنانە کەڵکی وەرگرتو کاتێك کە بە جلوبەرگی بەنرخو رازاوەییو عەترو بۆنێکی زۆرەوە خۆی خستە بەرپێی ژۆلیۆس، بۆنی عەتری هەوەسهێنیی سیزاری سەرسام کرد.

کاتێك کلیۆپاترا زمانی قسەی کردەوە، بە پاراوییەك قسەی لەگەڵ ژۆلیۆس سیزار کرد کە ئەو سەردارە رۆمییە تا ئەو کاتە لەزمانی هیچ ژنێکی نەبیستبوو، هەر بەم هۆیەشەوە سیزار ئاشقی جوانیو ژیری ئەو ژنە جوانو دڵرفێنە بوو. ئەو ئەفینو هۆگریە سەرەتای رووداوگەلێك بوو کە رەوتی مێژووی جیهانی لە نیوەی سەدەی کۆتای پێش زایینی گۆڕی. پشتیوانی ژۆلیۆس سیزار لە کلیۆپاترا



بۆ حکوومەت لەسەر میسر بووە هۆی راپەڕینی برا (پتۆلێمی)و داروودەستەکەی بە دژی سیزار. سیزارو هێزە چوارهەزار کەسیەکەی لە ئەسکەندەریە کەوتنە ژێر گەمارۆی پتر لە بیست هەزار سەربازی میسری. کلیۆپاترا داوای یارمەتیی لە هێزە لایەنگرەکانی خۆی کردو لە شەڕێکدا پتۆلێمی دوازدەیەم کوژرا. سیزار دوای ئەو سەرکەوتنە،کلیۆپاترای کرد بە شاژنو دەسەلاتداری میسرو لەگەڵ ئەودا بە پاپۆڕێکی گەورەو بە شکۆ سەفەرێکی بەدرێژایی رووباری نیل کرد. کلیۆپاترا لەو سەفەرە یەك مانگە لەسەر رووباری نیل کە لە مێژوودا بە مانگی هەنگوینی سیزارو کلیۆپاترا ناودێر کراوە، سکی لە سیزار پڕ بووو ساڵی دواتر (ساڵی٤٧ی پ.ز) کوڕێکی بوو کە ناویان نا "سیزاریۆن"[9] یان کوڕی سیزار. لەم کاتانەدا ژۆلیۆس سیزار دوای چەند داگیرکارییەکیتر گەڕایەوە شاری رۆما و ئەنجومەنی سێنای رۆما ئەویان وەك دیکتاتۆری[10] هەمیشەیی هەڵبژارد، بەلام لەرۆما داواکاری کلیۆپاترا سەبارەت بەوەی کە سیزاریۆن کۆری ژۆلیۆس سیزارە، شكو دوودڵی تێکەوت، تا ئەوە کە سیزار لەساڵی ٤٦ی(پ.ز) بە بانگهێشت کردنی کلیۆپاتراو منداڵەکەی بۆ رۆما بەکردەوە پاڵپشتی لە داواکارییەکەی کلیۆپاترا کرد.



**پەیکەری ژۆلیۆس سیزار لە مۆزەخانەی بێرلین**

---

9-Caesarion

١٠- پۆستی دیکتاتۆری کە ئێستا بۆ پاشا زاڵمو زۆردارەکان بەکار دەهێندرێت، لەیۆنانی قەدیم پلەیەکی بەرزو رێزدار بوو. لەراستیدا ئەو پۆستە کۆمەلێك دەسەلاتی رەهای تێدا بوو کە لەلایەن سێنای رۆما بە کەسێك دەدراو ژۆلیۆس سیزار یەکەمین سەرداری رۆمی بوو کە ئەو پۆستەی وەرگرت.

کلیۆپاترا دوای دەرچوونی سێزار لە میسر، بەپێی داب‌و نەریتی دەرباری میسر شوی کرد بە برا گچکەکەی، پتۆلیمی سێزدەیەم کە لەو کاتە منداڵێکی یازدە ساڵە بوو (لە راستیدا کلیۆپاترا مێردی هەبوو). بەلاَم ئەو کارە رێگر نەبوو لە پەیوەندی ئاشقانەی سێزارو کلیۆپاترا. سێزار کۆشکێکی بە شکۆی لە قەراغی رووباری "تیبەر" خستە ژێردەستی کلیۆپاتراو بە فەرمانی ئەو پەیکەری زێرینی کلیۆپاترایان لە پەرستگای ڤینۆس خستە بەر چاوی خەڵك. ئیتر هیچ گومانێك بۆ کەس نەمابوو کە کلیۆپاترا دڵی بەهێزترین پیاوی ئەو کاتی جیهانی داگیر کردووەو بەکردەوە بووە بە شاژنی میسر. سێزار لە دەربڕینی ئەشق‌و خۆشەویستی بۆ کلیۆپاترا تا ئەو جێگایە چووە پێش کە تەختێکی زێرینی بۆ لە (ئەنجومەنی) سێنای رۆما داناو کلیۆپاترا لە هەندێك لە کۆبوونەوەکانی سێنادا بەشداری کرد. لەم نێوانەدا پیلانێك دژ بە سێزار لە دارِشتن دابوو کە بوونی کلیۆپاترا لە رۆماو کارتێکەری رۆژ لە رۆژ زیاتری ئەو لە سێزار، پاڵنەری ئەنجام درانی ئەم پیلانە بوو.

ئەو پیلانە کە بەدەستی دوو سەرکردەی لێهاتووی رۆمی "کاسیۆس"[11]و "برۆتۆس"[12] دارێژرابوو، رۆژی یازدەی مارسی ساڵی٤٤ی(پ.ز) جێبەجێ کراو ژۆلیۆس سێزار لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی سێنای رۆمادا بە بیست زەربەی چەقۆ کوژرا. برۆتۆس نزیکترین دۆستی سێزار بوو کە لەرێگای رێخۆشکەری پێشوو لەگەڵیدا رۆیشتە سێنای رۆماو کاتێك لەگەڵ ئەوانی تر لە لێدانی چەقۆکان لە جەستەی سێزار بەشداری کرد، سێزار چاوێکی لێکردو گوتی"برۆتۆس... تۆش؟!" کە ئەم رستەیە لەمەڕ خەیانەتی دۆست بۆتە پەند.

کلیۆپاترا کە دوای کوژرانی سێزار خۆی لە مەترسیدا دەبینی، بە پەلە لەوێ دوور کەوتەوەو هەر لەهەمان شەودا (شەوی کوژرانی سێزار) بەو پاپۆڕانەی کە لەگەڵ خۆی هێنابوویە رۆما، لە کاتێکدا کە سێزاریۆنی لە باوەشدا بوو بەرەو میسر وەرێکەوت. کلیۆپاترا دوای دوو ساڵ دووری‌و لەکاتی گەڕانەوە بۆ میسر بینی کە بارودۆخی دەوڵەت ئاڵۆزە، لەلایەکەوە خەڵك بەهۆی کەمی کەل‌و پەل زۆر نارِازی‌و ئامادەی راپەڕین بوون‌و لە لایەکی‌تریشەوە لایەنگرانی مێردو براکەی (هەم مێردی بوو، هەم برا)، پتۆلیمی سێزدەیەم کە ئێستا بۆتە چاردە ساڵ،

11-Cassius
12-Brutus



کلیۆپاترایان بە خەمساردی و گرینگی نەدان بە کاروباری دەوڵەت‌و بە فیرۆدانی سامانی میسرییەکان لە پێناوی سێزاردا تۆمەتبار کردبووو پێشەکییەکانی لابردنی ئەویان لەسەر دەسەلاَت ئامادە دەکرد. براو مێردە چواردە ساڵەکەی کلیۆپاترا کەمێك دوای گەڕانەوەی کلیۆپاترا بە نەخۆشییەکی گومان لێکراو مرد. مێژوونووسان لەوەدا پێکەوە هاوڕان کە مردنی پتۆلیمی کە خۆی بە خاوەن تاج‌و تەختی میسر دەزانی، بەهۆی ژەهرێکی کوشندە بووە کە کلیۆپاترا لە چێشتەکەی کردبوو کلیۆپاترا دوای مردنی براو رکەبەری دەسەلاَتی، دارودەستەکانی ئەویشی لە نێو بردو لەگەڵ کۆمەڵێك کەسی کارامەو لێهاتوو کە لە دەوری خۆی کۆکردبوونەوە، خەریکی بەرنگاری قات‌و قڕی‌و چارەسەر کردنی گیروگرفتی خەڵك بوو. کلیۆپاترا لەو قۆناغەی حکوومەتی بیست ساڵەی خۆیدا لەمیسر، لێهاتوویی‌و تواناییەکی زۆری لەخۆی پێشان داو توانی سنووری حکوومەتی میسر بە کەڵك وەرگرتن لە کێشە ناو خۆییەکانی رۆما دوای مردنی ژۆلیۆس، بەرفراوان بکات.

شەڕی دەسەلاَت لەرۆما دوای کوژرانی سێزار، بە شکست هێنانی کۆماری خوازەکان‌و درێژە پێدانی حکوومەتی دیکتاتۆری بە شێوازی ژۆلیۆس سێزار کۆتایی پێهات، بەلاَم بەهۆی ئەو رکەبەرییە توندوتیژەی کە لەنێوان خوازیارانی جێنشینی سێزار دروست ببوو، سێنای رۆما بە ناچاری شاندێکی سێ کەسیی بە جێنشینی سێزار هەڵبژارد. ئەو سێ کەسە بریتی بوون لە "ئۆکتاڤیان"[13]و "مارکوس ئانتۆنیۆس "[14]و "لێپیدۆس"[15].

مارکوس ئانتۆنیۆس کە لە مێژوودا زۆرتر بەناوی "مارك ئانتۆنی" ناسراوە، کەمێك دوای جێگیربوونی حکوومەتی سێ کەسی لەرۆما، بۆ بەرفراوان کردنی ئیمپراتۆریەتی رۆماو شەڕ لەگەڵ ئەشکانی‌یەکان کە دەست درێژی‌یان کردبووە سەر سنوورەکانی رۆما، بەرەو رۆژهەلاَت بەرێکەوت. مارك ئانتۆنی لە یەکەم قۆناغی لەشکر کێشییەکانیدا، لە بەندەری "تارسۆس"[16] راوەستاو پێش گەیشتن بەو بەندەرە، یەکێك لە پاپۆڕەکانی خۆی نارده ئەسکەندەریە تا کلیۆپاترا بۆ دیدارو قسەو باس لەگەڵ ئەو بیهێنن بۆ بەندەری تارسۆس. کلیۆپاترا بانگهێشتی

13-Octavian
14-Marcus Antonius
15-Lepidus
16-Tarsus





مارك ئانتۆنیی کە دەرفەتێکی نوێی بۆ داگیر کردنی سەرکردەیەکی ڕۆمی پێدەبەخشی، قبووڵ کرد. بەڵام وای بە باش دەزانی کە بەهێزە گەورە دەریاییەکەی خۆی بچێت بۆ بینینی ئەو سەرکردە ڕۆمیە تا هێزو توانای دەریایی خۆی پێشانی ئەو بدات.

کلیۆپاترا دەیزانی کە مارك ئانتۆنی لە لەشکر کێشییەکەی بۆ ئێران، پێویستی بە یارمەتیو هاوڕێیەتی ئەو هەیەو لەلایەکیتریشەوە بەتەما بوو بە یارمەتیدانی سەرکردەی ڕۆمی لەو لەشکر کێشییەو مسۆگەر کردنی سەرکەوتنی ئەو لەو شەڕەدا، شانسی ئەو لە بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتو جێنشینی سێزار زیاتر بکات و لەو ڕێگایەشەوە بتوانێت ئەو پیلانەی کە بە مردنی سێزار سەری نەگرت، بە داگیر کردنی دڵی مارك ئانتۆنیو گەڕانەوەی سەرکەوتووانەی بۆ ڕۆما بە ئاکام بگەیێنێت. یەکەم چاوپێکەوتنی کلیۆپاترا لەگەڵ مارك ئانتۆنی جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ یەکەم دیداری لەگەڵ ژۆلیۆس سێزاردا.

ئەم جارەیان کلیۆپاترا بە گەورەییو شکۆیەکی بەرچاوەوە چووە دیداری سەرکردەی ڕۆمیو لە پاپۆرە بە شکۆکەی خۆیدا میوانداریەکی تێرو تەسەلی لێکرد. کلیۆپاترا لەکاتی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ژۆلیۆس سێزار کچێکی بیست ساڵەو لەش ناسك بوو،بەڵام ئێستا لەتەمەنی بیستو پێنج ساڵیدا، ژنێکی پێگەیشتووو شارەزا بە هەموو سرێکی فرتو فێڵەو سەرەڕای ئەمەش لە جیاتی ژۆلیۆس سێزاری ٥٢ ساڵە، بەرەو ڕووی پیاوێکی بەهێزو چل ساڵەیەو لەم ڕووەوە شانسی سەرکەوتنی زیاترە. مارك ئانتۆنی هەر لەیەکەم چاوپێکەوتنیدا ئاشقی کلیۆپاترا بووو هۆگریی بەم ژنە لە هەر ژوانێکدا زۆرترو پتەوتر دەبوو.

هاودەمی لەگەڵ کلیۆپاترا بووە هۆی ئەوە کە سەرکردەی ڕۆمی لە درێژە پێدانی سەفەرەکەی بۆ ڕۆژهەڵاتو شەڕ لەگەڵ ئەشکانییەکان غافڵ بێتو دوای گەڕانەوەی کلیۆپاترا بۆ ئەسکەندەریە حەجمینی لێهەڵگیراو بە بیانوی بە سەر کردنەوەی شاژنی میسر، بەرەو ئەو وڵاتە وەرێکەوت. کلیۆپاترا پێشوازییەکی بێ وێنەی لەسەرداری ڕۆمی کردو مارك ئانتۆنی کە دەتگوت ئامانجو ئەرکە پێئەسپێردراوە سەرەکییەکەی لەبیر کردەوەو لەحاڵێکدا کە بەشی هەرە زۆری هێزو پاپۆڕەکانی لە تارسۆس بەجێ هێشتبوو، لە کۆشکی بە شکۆی کلیۆپاترا جلکی مانەوەی لەبەر کرد. یەکێك لە بەڵگە مێژووییەکانی سەبارەت بە ژیانی کلیۆپاترا لەگەڵ مارك ئانتۆنی، نامەیەکە کە بالۆیزی ڕۆمای دەرباری کلیۆپاترا بۆ "فلۆڤیا"[17]ی هاوسەری مارك ئانتۆنی

17-Fluvia



نووسیوە. فلۆڤیا کە دوای ڕۆیشتنی مێردەکەی بۆ ڕۆژهەڵات لە ڕۆما مابۆوە، درۆو ڕاستی ئەو دەنگۆگەلەی کە لەبارەی پێوەندی مێردەکەی لەگەڵ کلیۆپاترا گەیشتبووە ڕۆما، لە بالۆیزی ڕۆمای لەمیسر پرسی. بالۆیزەکە کە وادیارە خزمی فلۆڤیا بووەو لەگەڵ ئەو پێوەندی هەبووە، لە وەڵامی نامەکەی فلۆڤیادا ئاماژەی بە تەواوی وردەکارییەکانی ئەم پێوەندییە کردووەو دەنوسێ:

"بە تەواوی ڕوونە کە خاتوو کلیۆپاترا هەموو شارەزاییو پسپۆڕی ژنانەی خۆی بۆ داگیر کردنی دڵی ئانتۆنی بەکار هێناوەو بە باشی سوود لە خاڵە لاوازەکانی وەردەگرێ بەرامبەر بە ژنان. کەرستەی خۆشیو خۆشڕابواردن، شەوو ڕۆژ بۆ ئانتۆنی ساز دراوەو شاری ئەسکەندەریە سەرنج ڕاکێشی تەواوی هەیە بۆ دابینکردنی ویستو هەوەسەکانی... ئەو (کلیۆپاترا) لە تەواوی کاتژمێرەکانی ڕۆژو شەو لە تەنیشت ئانتۆنییەو تەنیا لەو کاتژمێرانەی کە ئانتۆنی دوای خواردنەوە لە میوانییەکانی شەوانە دەچێتە خەوەوە، لەگەڵ وەزیرو ڕاوێژکارەکانی بۆ داڕشتنی پلانەکانی داهاتوو کۆ دەبێتەوە..."[18]

مانەوەی درێژخایەنی ئانتۆنی لە میسر، ڕۆمییەکانی تووڕە کرد. بەڵام بیانووی ئەو بۆ ڕاوەستان لە ئەسکەندەریە کۆکردنەوەی هێزو کەڵك وەرگرتن لەسەرچاوە گەورەکانی سامانی میسرییەکان بۆ هەڵمەتێکی بەرفراوان بۆ ڕۆژهەڵاتو داگیر کردنی ئێرانو هێندووستان بوو. کلیۆپاترا داوای لەسەرکردە ڕۆمییەکە کرد کە لە ڕێو ڕەسمێکداو بەپێی دابو نەریتی میسرییەکان زەماوەندی لەگەڵ بکاتو ئانتۆنیش کە ئیتر توانای وتنی "نا"ی بە داواکارییەکانی کلیۆپاترای نەبووو لەگەڵ ئەوەش کە ژنەکەی لە ڕۆما دەژیا، سەری بۆ ئەم داوایەی ئەو نەوی کرد.

زەماوەندی کلیۆپاتراو ئانتۆنی بە شکۆو گەورەییەکی بێوێنەوە لە ئەسکەندەریە بەڕێوە چووو لەساڵی ٤٠ی (پ.ز) کلیۆپاترا کوڕو کچێکی جمکی بۆ ئانتۆنی هێنایە سەر دونیا. ناوی کوڕەکەیان نا "ئالێکساندێر هێلیۆس"[19] یانی هەتاوو کچەکەشیان ناو نا "کلیۆپاترا سێلێنی"[20] واتە مانگ کە ئەمەش هێمایەك بوو لە بەرزەفڕییەکانی شاژنی میسرو ئاواتەکانی

18-the life and time of Cleopatra,by Carlo Maria Franzero
19-Alexander Helios
20-Cleopatra Selene





ئەمانەدا کلیۆپاترا بەڵێن دەدات کە تەواوی سەرچاوەکان‌و توانای خۆی بۆ شەڕ لەگەڵ ئەشکانی‌یەکان‌و پێشڕەوی بەرەو هێندووستان لەژێر دەستی ئانتۆنی دابنێت.

ئەم پەیماننامەیە کە بەزمانەکانی لاتین‌و یۆنانی‌و میسری نووسرابووو لە ڕێوڕەسمێکی بەشکۆ لە ئەسکەندەریە واژۆ کرابوو، بە مەزنترین سەرکەوتنی سیاسی کلیۆپاترا دەژمێردرا، لەبەر ئەوەی کە بە لکاندنی زەوییەکانی کەناروی ڕۆژهەڵاتی مەدیتەرانەو دوورگەی قیبرێس بە سنووری حکوومەتی میسر، ئەو وڵاتە گەورەیی‌و بەرفراوانی دەورانی فیرعەونەکانی بەدەست دەهێناوەو هۆکاری داستانە ئاشقانەکانی کلیۆپاترای لەگەڵ ژۆلیۆس سێزارو مارك ئانتۆنی دەردەخست.

دوای واژۆی ئەو پەیماننامەیە، کاهینە میسرییەکان لە ڕێوڕەسمێکدا کە لە ڕێوڕەسمی تاج لەسەرنانی پاشاکانی میسری باو بوو، تاجیان لەسەر کلیۆپاتراو ئانتۆنی داناو کلیۆپاترا بە چەقۆیەکی زێڕینی بچوك کە دەم‌و چاوی پاشاکانی میسرییان پێچەور دەکرد، دەم‌و چاوی ئانتۆنیی پێ چەور کرد. واتای ئەو ڕێوڕەسمانە لای میسرییەکان ئەوە بوو کە سەرکردە ڕۆمییەکە هاوسەری یاسایی شاژنەکەیانەو ملکەچی یاسای میسرو ئەو بڕیارانەیە کە لە میسر دەردەچێ. دوابەدوای ئەو ڕێوڕەسمانە هەندێك دراوی کانزایی لێدرا کە وێنەی کلیۆپاتراو مارك ئانتۆنیی تێدا دەبینرا. کلیۆپاترا کە ئیتر مارك ئانتۆنیی بە تەواوی خستبووە ژێر ڕکێفی خۆی، ئێستا خەیاڵی داگیر کردنی جیهانی لەسەر دایەو دەیەویست بەدەستی پیاوێك کە وەك مۆم لە دەستی‌دا نەرم ببوو، لەسەرەتادا ئیمپراتۆریەتی ئەشکانی‌یەکان لە بەین بباتو ئەو وڵاتانەی کە ئەسکەندەر نەیتوانی بوو بیگرێ، ئەو داگیری بکاتو دواییش سەرکەوتووانە لەگەڵ ئانتۆنی بچێتە ڕۆماو تاجی شاژنی ڕۆمییەکانیش لەسەربنێ. ئانتۆنی



**وێنەی مارك ئانتۆنی کە لەسەر پارەیەکی ئاسن گیراوە**



بۆ گەیشتن بە دەسەڵاتداریتی جیهان. لەم نێوانەدا هاوسەرە ڕۆمییەکەی ئانتۆنی مردو ئانتۆنیش کە لە ئەگەری لەناوچوونی ناوبانگ‌و پایەو پلەکەی نیگەران بوو، گەڕایەوە ڕۆما. ئانتۆنی بۆ ڕوون کردنەوەی سەرکەوتنەکانی خۆی لەمەڕ کۆکردنەوەی هێزێکی گەورە کە بەشێکی گرینگی لە میسرییەکان پێك هاتبوو، لە ئەنجومەنی سێنای میسر ئامادە بووو ڕایگەیاند هەر بە گەڕانەوەی بۆ ڕۆما هێرش بۆ سەر ئێران‌و هێندووستان دەست پێ‌دەکات.لەگەڵ ئەمەشدا، ئانتۆنی هەستی کرد کە بێ‌پشتیوانی ڕکەبەرو شەریکە سەرەکییەکەی لە حکوومەتی ڕۆمادا، واتە ئۆکتاڤیان ناتوانێ پشتیوانی سێنای ڕۆما بەدەست بهێنێ‌و مەرجی ئۆکتاڤیانیش بۆ پشتیوانی لە ئانتۆنی ئەوە بوو کە لەگەڵ خوشکەکەی (ئۆکتاڤیا)[21] زەماوەند بکاتو واز لە ئەشقی کلیۆپاترا بهێنی. ئانتۆنی بەرژەوەندی خۆی لەوەدا بینی کە لەگەڵ ئۆکتاڤیا زەماوەند بکات، بەڵام نەیتوانی دەست لە خۆشەویستی کلیۆپاترا هەڵگرێ‌و هەر بۆیەش ئۆکتاڤیان ناچاری کرد کە هاوسەری (ئۆکتاڤیا) لەگەڵ خۆی ببات بۆ سەفەری ڕۆژهەڵات تا دەرفەتێك بۆ نوێ کردنەوەی پێوەندی لەگەڵ کلیۆپاترا بەدەست نەهێنێ. بەڵام ئانتۆنی دوای چەند مانگ مانەوە لەگەڵ هاوسەری (ئۆکتاڤیا) لە یۆنان، گەڕاندیەوە بۆ ڕۆماو خۆی چوو بۆ دیداری کلیۆپاترا. کلیۆپاترا کە بەهۆی ملکەچ بوونی ئانتۆنی بۆ مەرجەکانەی ئۆکتاڤیان‌و زەماوەندی لەگەڵ ئۆکتاڤیا تووڕە ببوو، ئەم جارەیان بەساردی هەڵسوکەوتی لەگەڵ کرد، بەڵام بەو شارەزاییەی کە لە داگیرکردنی دڵی پیاوان هەی بوو، لەگەڵ ئەوەش کە تووڕەو زویر بوو، بە دڵڕفیوی‌و مەکربازی داخوازی‌و تینوویەتی ئەوی پتر کردو کاتێك کە زانی ئانتۆنی بە کۆتو بەندی پەتەوترەوە لە داوی ئەودا ئەسیر بووە، مەرجی قورسی بۆ ئاشتی لەگەڵی داناو ئانتۆنی بێ ئەملاو ئەولا مەرجەکانی قەبووڵ کرد.

یەکێك لەو مەرجانە بریتی بوو لە سازدانی ڕێوڕەسمێکی تێروتەسەل کە تێیدا ئانتۆنی جگە لە دانیان بە زەماوەندی ڕەسمی خۆی لەگەڵ کلیۆپاترا، وەك شاژنی میسرو کوڕەکەشی (سێزاریۆن) وەك میراتگری تاج‌و تەختی میسر بناسێنێت. لووتکەی ئەو ڕێوڕەسمانە بریتی بوو لە واژۆی بڕیارێك لەنێوان کلیۆپاتراو ئانتۆنی کە بە هۆیەوە ئانتۆنی، سەروەری میسری بەسەر ئەو وڵاتانەی کە دەکەوتنە کەناراووی ڕۆژهەڵاتی مەدیتەرانە (دەریای سپی ناوەڕاست) (سوریەو لوبنان‌و فەلەستین‌و بەشێك لە ئەردەن)و دوورگەی قبرس بە ڕەسمیەت دەناسی‌و لەبەرامبەر

21-Octavia





بەیارمەتی کلیۆپاترا سوپایەکی سەدهەزار کەسی کۆکردەوە کە چل هەزار کەسی ئەو سوپایە لە میسرییەکان پێك هاتبوو. ئانتۆنی‌و کلیۆپاترا لە بەهاری ساڵی ٣٦ی(پ.ز) لە پۆستی سەرکردایەتی ئەم سوپایەدا بەرەو ئێران وەڕێکەوتن. کلیۆپاترا دەیەویست کە خۆی لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا ئامادە بێت‌و ئانتۆنی بە دلێری لەو شەڕەدا تا گەیشتن بە سەرکەوتن هان بدات. بەلاّم کاتێك کە هێزەکانی ڕۆمی‌و میسری گەیشتنە رووباری فوڕات، کلیۆپاترا کەدووبارە لە ئانتۆنی سکی پڕ ببۆوە، نەیتوانی درێژە بەو سەفەرە بدات‌و بۆ زایینی ئەو منداڵەی کە لە سکی‌دا بوو گەڕایەوە میسر. کلیۆپاترا لە کۆشکەکەی خۆی لە ئەسکەندەریە چاوەڕێی لەدایکبوونی منداڵەکەی‌و بیستنی هەواڵە خۆشەکانی سەرکەوتن لە ڕۆژهەلاّت بوو، بەلاّم هاوکات لەگەڵ بە دونیا هێنانی کوڕێکی دیکە بۆ ئانتۆنی کە ناوی نا "پتۆلیمی فیلادێلفۆس"[22]، هەواڵی خراپی لەبەرەی شەڕ لەگەڵ ئەشکانی‌یەکانی پێ‌گەیشت. ئانتۆنی لەیەکەم خولی شەڕ لەگەڵ ئەشکانی‌یەکان کە مانگێکی خایاند، شکستێکی قورسی خواردو دوای کوژرانی بیست‌و چوارهەزار کەس لە هێزە سەد هەزار کەسییەکەی پاشەکشەی بۆ سوریە کرد. پلۆتارك نووسەرو مێژوونووسی بەناوبانگی یۆنانی کەسەبارەت بە ڕۆڵی کلیۆپاترا لە مێژووی جیهان لێکۆڵینەوەی ئەنجامداوە، لەسەر ئەو بڕوایەیە کە ئەگەر کلیۆپاترا لە شەڕەکەدا هاوڕێیەتی ئانتۆنی بکردایە، بە ئەگەرێکی بەهێز ئەم شەڕە بە شکستی ئەشکانی‌یەکان کۆتایی پێدەهات‌و کلیۆپاترا خەونی زێڕینی خۆی لە گەڕانەوەی سەرکەوتووانە بۆ ڕۆماو دەسەلاّتدارێتی بەسەر جیهانی شارستانی ئەوکات بەدی دەهێنا، لەبەر ئەوەی شەڕکەرەکانی ڕۆمی‌و میسری لەو شەڕەدا کەرستەی شەڕو ڕێکخستنی باشتریان هەبووو ئەگەر ئانتۆنی لەتاو دووری کلیۆپاترا خەریکی مەی خواردنەوە نەبوایە، سەرکەوتنی هێزەکانی بەسەر ئەشکانی‌یەکان مسۆگەر دەبوو. پلۆتارك دەنووسێ کە ئانتۆنی تەنانەت یەك جاریش لەم شەڕانەدا هوشیار نەبووو چارەنووسی سوپایەك بە سەرکردەیەکی ئاوا سەرخۆش نەیدەتوانی لەوە باشتر بێت. ئانتۆنی دوای ئەوەی لەگەڵ پاشماوەی هێزە شکست خواردووەکانی گەیشتە سوریە، پەیامێکی ناردە ئەسکەندەریەو داوای لە کلیۆپاترا کرد کە هەرچی زووتر خۆی بگەیێنێتە لای. پلۆتارك دەنووسێ لەو کاتانەدا ئانتۆنی وەك شێتی لێهاتبوو، شەوانە شێتانە مەی دەخواردەوەو ڕۆژانەش لە کەناری دەریا دادەنیشت‌و چاوی لە دوور دەکرد تا کەی ئەو پاپۆڕەی کلیۆپاترای

22-Petolemy Philadelphus



تێدایە دەگاتێ. لەم ڕۆژانەدا زۆربەی نێزیکانی ئانتۆنی، ئەم سەرکردە بەهێزو بەخۆوەیان بینی بوو کە لەکەناری دەریا دانیشت بووو وەکوو منداڵ فرمێسکی دەڕشت. لە ئەنجامدا کلیۆپاترا بە دەیان کەشتی پڕ لە زێڕو خواردەمەنی‌و کەرستەی شەڕ گەیشت‌و شەڕەکەرەکانی شکست خواردووی ئانتۆنی کە هێندەی نەمابوو لە دژی سەرکردەکەیان یاخی بن، گیانێکی تازەیان وەبەرهاتەوە. کلیۆپاترا بە ئانتۆنیی ڕاگەیاند کە ئۆکتاڤیان لە ڕۆما هەندێك چالاکی دژێوی بە دژی ئەو کردووە کە باشتر وایە لە جیاتی درێژە پێدانی پلانی گرتنی ئێران‌و هێندووستان هێزەکانی بگەڕێنێتەوە ڕۆماو شەڕ لەگەڵ ئەشکانی‌یەکان تا کاتی سەرکردایەتی بە سەر ڕۆما وەدوا بخات. لەو ڕۆژانەدا بوو کە نامەبەرێك لە یۆنان گەیشتە سووریەو پەیامێکی لەلایەن ئۆکتاڤیانەوە (هاوسەری ڕۆمی ئانتۆنی) بۆ ئانتۆنی هێنا. ئۆکتاڤیا پەیامی‌دا بوو بە ئانتۆنی کە لە نەبوونی ئەو کچێکی بۆ بە دونیا هێناوەو ئێستاش بە پارەو سوپاو هێزێك کە براکەی (ئۆکتاڤیان) لەژێر دەستی ناوە، هاتۆتە یۆنان تا یارمەتی مێردەکەی بدات لەدرێژ پێدانی شەڕ بۆ داگیر کردنی ئێران‌و هێندووستان. ڕەنگە ئەقڵێو مەنتق وا حوکم بکات کە دەبوایە ئانتۆنی ئەو دەرفەتە نوێیەی بۆ ئاشتی لەگەڵ ئۆکتاڤیان‌و بەدەست هێنانەوەی ناوبانگ‌و شانازییەکانی پێشووی بقۆزێتەوەو خۆی بگەیێنێتە هاوسەرە ڕۆمییەکەی، بەلاّم ئەڤین بڕیارێکی‌تری دەداو ئانتۆنیش ملکەچی حوکمی ئەشق‌و مانەوە لەگەڵ کلیۆپاترا بوو. ئانتۆنی تەنانەت هەنگاوێکی‌تری هەلێناو بە هاندانی کلیۆپاترا بڕیاری تەلاّقی ئۆکتاڤیای ئەسپاردە ئەو پەیکەی (نامەبەرەی) کە ئۆکتاڤیا ناردبوویە لای. ئەم بڕیارە لە حوکمی سووکایەتی بە براکەی ئۆکتاڤیاو هاوکات لەگەڵ ئەوەش، ڕاگەیاندنی شەڕ بە دژی بەهێزترین پیاوی ئەو کاتی ڕۆما بوو. ئۆکتاڤیان کە لە ماوەی نەبوونی درێژخایەنی ئانتۆنی،دەسەلاّتی لە دەست خۆی‌دا پاوان کردبووو کەسانی باوەڕ پێکراوی خۆی خستبووە سەر کارە گرینگەکان، ولاّمی سووکایەتییەکەی ئانتۆنیی بە وتارێکی توندو تیژ لەسێنای ڕۆما داوە. ئۆکتاڤیان لەو وتارە دا وتی: "ئیتر جێگای گومان نەماوە کە کلیۆپاترا ڕووح‌و جەستەی ئانتۆنیی پیس کردووە. بە دانی دەرمانی خۆشەویستی‌و ئەشق بە ئانتۆنی هێزی ئیرادەو بڕیاردانی لێسەندووە... ئانتۆنی ئیتر ئامێری بێ ئیرادەی دەستی کلیۆپاترایەو پیاوێك کە ئاوا لەگەڵ شاژنێکی بێگانە دژی ولاّتی خۆی هاوپەیمان بووە،شایانی ناوی ڕۆمی نی‌یە".





ئۆکتاڤیان لەو وتارەدا ئاماژەی بە ئامادەکارییەکانی ئانتۆنی‌و کلیۆپاترا سەبارەت بەهەڵگیرساندنی شەڕ بە دژی رۆما کردو بۆ سووك کردنی ئانتۆنی، وتی: "ئانتۆنی لە ئامادەکاری‌و ئەنجامدانی ئەو شەڕە هیچ رۆڵێکی نی‌یە. بەڵکوو کلیۆپاتراو راوێژکارو خواجەکانی حەرمسەراو ئارایشکارە تایبەتەکانی ئەون کە ستاڤی جەنگی دژ بە رۆما پێك دەهێنن‌و بۆ سەرکردەیەکی رۆمی هیچ شتێك لەوە شوورەیی‌تر نی‌یە کە بەڕێوەبەرو ملکەچی فەرمانی سەرکردەیەکی ئاوا بێت. تەنیا پیاوێك کە رووح‌و جەستەی خۆی تەسلیمی هەواو هەوەسی ژنێك کردبێ دەتوانێ ئاوا لە شەڕەف‌و ئابڕووی خۆی خۆش بێت". ئۆکتاڤیان دواتر داوای لە سێناتۆرە رۆمییەکان کرد کە رێ بدرێت وەسیەتنامەکەی ئانتۆنی بخوێننەوە کەلە سندوقێکی بچووك لە سێنا دانرا بوو. لەنێوان سەرسووڕمانی سێناتۆرەکان لە وەسیەتنامەکەدا خوێندییەوە کە ئانتۆنی، سێزاریۆنی (کوڕی کلیۆپاترای) بە منداڵ‌و میراتگری راستەقینەی ژۆلیۆس سێزار ناساندووەو بەشی هەرە زۆری سامانەکەی بۆ منداڵەکانی(ئەوانەی لە کلیۆپاتران) بە میرات داناوە. ئاخرین داواکاری ئانتۆنی لەو وەسیەتنامەیەدا ئەوە بوو کە ئەگەر لە رۆما مرد جەستەکەی بنێرن بۆ کلیۆپاتراو لە ئەسکەندەریە بە خاکی بسپێرن. ئۆکتاڤیان دوای خوێندنەوەی وەسیەتنامەکەی ئانتۆنی، داوای لە سێنای رۆما کرد:"بەهۆی ئەوەی کە ئانتۆنی هۆش‌و هەستی خۆی لەدەست داوە" هەموو پلەو پایەکانی لی‌وەربگیردرێتەوە. هەروەها داوای لە سێنا کرد کە بە رەسمی شەڕ دژی کلیۆپاترا رابگەیەنن. سێنا هەر دوو پێشنیارەکەیان قەبووڵ کردو بۆ ئامادەکارییەکانی شەڕ دەسەڵاتی رەهای پێدا.

لەلایەکی‌ترەوە کلیۆپاترا سەرقاڵی ئامادەکاری شەڕێکی گەورە بە دژی رۆما بووو ئیتر نەیدەتوانی متمانە بەهێزە لایەنگرەکانی ئانتۆنی‌و توانایی سەرکردایەتی ئەو لەشەڕی چارەنووس سازی داهاتوو بکات. ئانتۆنیش ئیتر پیاوێکی بەردەوام سەرخۆش بووو نەیدەویست تەنیا بۆ کاتێکیش لە کلیۆپاترا جیا بێتەوە. پاشماوەی سەربازو سەرکردەکانی سوپای رۆمی ئیتر باوەڕیان پێی نەمابووو تەنیا سەرنج راکێشی‌و لێهاتوویی کلیۆپاترا بوو کە ئەوانی لە لای ئانتۆنی هێشتبۆوەو کلیۆپاترای لەسەرکەوتن بەسەر ئۆکتاڤیان‌و بەدەست گرتنی دەسەڵات لە رۆما هیوادار کردبوو. لە ئاکامدا لەساڵی ٣١ی (پ.ز) شەڕی چارەنووس سازی ئۆکتاڤیان



لەگەڵ ئانتۆنی کە لە راستیدا شەڕی ئەو لەگەڵ کلیۆپاترا بوو، لە "ئاکتیۆم"[٢٣] کە دەکەوێتە کەناری رۆژهەڵاتی یۆنان روویدا. شەڕی ئاکتیۆم کە تێیدا بە سەدان پاپۆڕی هەر دوولا بەشدار بوون بە یەکێك لە گەورەترین شەڕە دەریاییەکانی مێژوو بە ئەژمار دێت. پلۆتارك مێژوو نووس‌و نووسەری بەناوبانگی یۆنانی کە پێشتر ئاماژەمان بە لێکۆڵینەکانی ئەو سەبارەت بە ئانتۆنی‌و کلیۆپاترا کرد، لە مەڕ ئەو شەڕە روونکردنەوەیەکی تێرو تەسەلی نووسیوەو لەو باوەڕە دایە کە ئەگەر کلیۆپاترا بە جێگای رووبەڕوو بوونەوەی پاپۆڕەکانی رۆما لە کەنارەکانی رۆژئاوای یۆنان، راستەوخۆ هێرشی کردبایە سەر رۆما، شانسی سەرکەوتنی پتر دەبوو. کلیۆپاترا وایدەزانی کە هێزە دەریاییەکەی رۆما توانای بەرەنگار بوونەوەی دووسەد کەشتییەکەی ئەوی نی‌یە، لە کاتێکدا ئۆکتاڤیان بە درێژایی چەند ساڵێك تەواوی توانایی خۆی بۆ ئامادەکردنی هێزێکی دەریایی شەڕکەر بەکار هێنابووو گەورەترین هێزی دەریایی ئەوکاتی بۆ شەڕ ئامادە کردبوو. کلیۆپاترا کە هیوایەکی زۆری بەسەرکەوتنی خۆی لەو شەڕەدا هەبوو، لە پاپۆڕی سەرکردایەتی‌دا هێرشی پاپۆڕە جەنگییەکانی رێنمایی دەکرد. ئانتۆنیش لە پاپۆڕی سەرکردایەتی خۆیدا لە ریزی پێشەوەی شەڕەکەدا بووکە بە باوەڕی مێژوونووسان هەڵەیەکی‌تری کلیۆپاترا بوو، لەبەر ئەوەی کە ئەگەر ئانتۆنی لەگەڵ کلیۆپاترا لە پاپۆڕێکدا بوونایە، دلێری‌و بوێرییەکی زیاتری لە خۆی پێشان دەداو بە یەکەمین هێرشی هێزی دەریایی رۆما هەڵنەدەهات. دژکردەوەی کلیۆپاترا بەرامبەر بە نیشانەکانی شکست‌و تێکشکانی کەشتییەکانی ژێر سەرکردایەتی ئانتۆنی لەسەرەتای قۆناغەکانی شەڕدا، پرسیارێکە کە مێژوونووسان هێشتاش وەڵامێکی ئەوتۆیان بۆ نەدۆزیوەتەوە. کلیۆپاترا بەجێگای ئەوەی یارمەتی ئانتۆنی بدات‌و هێرش بباتە سەر کەشتییەکانی رۆما، لەنەکاو فەرمانی پاشەکشەی‌دا بە کەشتییەکانی ژێر فەرمانی خۆی‌و ئانتۆنی‌و هاوڕێکانی لەبەرامبەر کەشتییەکانی رۆما بەتەنیا هێشتەوە.ئانتۆنیش کە دەیزانی ئەگەر بەدەستی ئۆکتاڤیا بە دیل بگیرێت چ چارەنووسێکی لە چاوەڕواندا دەبێت، بە خێراییەکی زۆرەوە لە گۆڕەپانی شەڕ هەڵات‌و دوابەدوای کەشتییەکانی کلیۆپاترا وەڕێکەوت. پاپۆڕەکەی ئانتۆنی لەنێوان رێگادا گەیشتە کلیۆپاتراو بە بەلەمێك خۆی گەیاندە نێو پاپۆڕەکە. کلیۆپاترا نارەزایەتی ئانتۆنیی بۆ هەڵاتنی لەشەڕ بێ وەڵام هێشتەوەو تا رۆژێك کە پاپۆڕەکە گەیشتە کەناری ئەسکەندەریە، قسەیەکی‌تریان پێکەوە نەکرد.

23-Actium





کلیۆپاترا دوای گەڕانەوەی بۆ ئەسکەندەریە وای نیشاندا کە لەشەڕ لەگەڵ هێزەکانی رۆما سەرکەوتووە، لەبەر ئەوەی هیچ کام لە پاپۆڕەکانی میسری گورزیان پیٚنەکەوتبوو باوەڕ پێهێنانی میسرییەکان کارێکی دژوار نەبوو. کلیۆپاترا دەیزانی کە ئۆکتاڤیان درەنگ یا زوو کەشتییەکانی خۆی بۆ داگیر کردنی میسر دەنێرێتە ئەسکەندەریە،هەر بەو هۆیەوە بە خێرایی خەریکی کۆکردنەوەی هێزی حەساوە بوو بۆ شەڕ لەگەڵ رۆمییەکانو وای نیشاندا کە دەیهەوێت لەشکر کێشی بکاتە سەر رۆما. ئەو لەم قۆناغەدا ئیتر بە هیچ شێوەیەك ئەو حیسابی بۆ ئانتۆنیو پاشماوی هێزە تێکشکاوو ورە دابەزیوەکانی نەدەکرد. لەو کاتانەدا ئۆکتاڤیان نامەبەرێکی ناردە لای کلیۆپاتراو لە پەیامێکی شاراوەدا پێی راگەیاند کە ئامادەیە پۆستی شاژنیو دەسەلاٚتدارێتی ئەو لە میسر قەبووڵ بکات بە مەرجێك کە ئانتۆنی بە مردوویی یان بە زیندوویی تەسلیمی ئەو بکات. کلیۆپاترا ئەو پێشنیارەی رەد کردەوە. رەد کردنەوەی ئەم پێشنیارەش نەك لەبەر خۆشەویستی ئانتۆنی، بەڵکوو بەهۆی بیٚمتمانەیی بە ئۆکتاڤیان بوو. دەتوانین بلێین هەمووی مێژوونووسان کۆکن لەسەر ئەوەی کە پیاوێکی هەمیشە سەرخۆشی وەك ئانتۆنی کە هیچ دەسەلاٚتو متمانەیەکی لەنێو هاوولاٚتیانی خۆیدا نەماوە، ناتوانیٚ ئەشقو خۆشەویستی کلیۆپاترای هەبێتو ئەگەر کلیۆپاترا پێشنیاری ئۆکتاڤیانی قەبووڵ نەکرد پتر بەهۆی ئەوە بوو کە دەیزانی ئۆکتاڤیان مەبەستی فریودانی ئەوەو دەیەوێت لەو رێگایەوە بیٚ شەڕو خوێنڕێژی ئەو بەدەست بێنیٚ. مێژوونوسان لەو بارەشەوە لەگەڵ کلیۆپاترا هاوڕانو دەڵێن کە ئۆکتاڤیان دەیەویست دوای داگیر کردنی ئەسکەندەریە، کلیۆپاتراو منداڵەکانی بە دیل بگرێتو وەك هێمای سەرکەوتن لەگەڵ خۆیدا بیانباتە رۆما. لە ئاکامدا لەساڵی ٣٠ی(پ.ز) ئۆکتاڤیان لە پێشەوەی پاپۆڕە جەنگییەکانی خۆیدا گەیشتە نێو ئاوەکانی کەناری ئەسکەندەریە. پاشماوەی هێزەکانی ئانتۆنی بەپەلە چوونە نێو هێزەکانی رۆماو میسرییەکانیش بیٚ بەرگرییەکی ئەوتۆ خۆیان بەدەستەوەدا. هێزەکانی ئۆکتاڤیان سەرکەوتووانە چوونە نێو ئەسکەندەریەو ئۆکتاڤیان بەر لە هەر شتێك خەریکی گەڕان بە دوای ئانتۆنیو کلیۆپاترا بوو. ئانتۆنیش خۆی بەدوای کلیۆپاتراو ئامادە کردنی پلانێك بۆ دەرباز بوون لەم کارەساتەدا بوو کە هەواڵی خۆکوژی کلیۆپاترایان پێراگەیاند. ئانتۆنی بە بیستنی ئەو هەواڵە درۆیە بە شێوەی رۆمییەکان خۆی هاویشتە سەر خەنجەرێکی تیژ، بەلاٚم خەنجەرەکە نەچووە نێو دڵیەوەو تەنیا بووە هۆی زامدار بوونی. دوای ئەنجامدانی خۆکوژیەکە، ئانتۆنییان ئاگادار کردەوە کە



کلیۆپاترا زیندووەو هەواڵەکە راست نەبووە. ئانتۆنی داوای لە هاوڕێکانی کرد تا زیندووە بیبەنە لای کلیۆپاترا. کلیۆپاترا بەبینی جەستەی خوێناوی ئانتۆنی خۆی خستە سەر جەستەی نیوە گیانی ئەوو سەروچاوی بە فرمێسك تەڕ کرد. ئانتۆنی لە دوایین کاتەکانی ژیانیدا، داوای لە کلیۆپاترا کرد کە لەگەڵ ئۆکتاڤیان دانوساندن بکاتو گیانی خۆیو منداڵەکان بپارێزێت. کلیۆپاترا بە جووڵاٚندنەوەی سەری وای پێشاندا کە داواکارییەکەی جێبەجیٚدەکاتو ئانتۆنیش بە دڵنیاییەوە لە باوەشیدا گیانی لە دەست دا. لەو کاتەدا کە هەست بزوێنترین دیمەنی دراماو فیلم گەلێکە کەسەبارەت بە ژیانی کلیۆپاترا نووسراوە، سەربازەکانی ئۆکتاڤیان گەیشتنە ئەو شوێنەو کلیۆپاتراو جەستەی خوێناوی ئانتۆنییان خستە ژێر چاوەدێری. کلیۆپاترا داوای لە ئۆکتاڤیان کرد کە مۆڵەتی پیٚبدات رێوەڕەسمی بەخاك سپاردنی مێردەکەی بەپێی دابو نەریتی میسرییەکان بەڕێوە بباتو ئۆکتاڤیانیش ئەو داواکارییەی قەبووڵ کرد. کلیۆپاترا دوای بەشداری لەو رێوەڕەسمەدا لەرزوتایەکی توندی گرتو ئۆکتاڤیانیش چەند جارێك سەردانی کرد، بەلاٚم کلیۆپاترا دەیزانی کە ئەم شەرم وحەیاو رێز گرتنە داوێك زیاتر نییەو ئۆکتاڤیان دەیەوێت بەو ئامادەکارییانە، ئەو بە ساغ وسلاٚمەتی بباتە رۆماو دوای سووکایەتی پێکردنو ئەشکەنجە بیداتە دەست جەللاد.



**لە بەناوبانگترین فیلمیدا کە لە ژیانی کلیۆپاترا**

**دروست کراوە ئێلیزابێت تایلۆر رۆڵی ئەوی نواندوە**

کلیۆپاترا لەو رۆژانەی کە لە جێدا کەوتبوو، بڕیاری خۆی دابوو لەیەکەم رۆژدا کە هەستی کرد تەندروستی باشتر بووەو دەتوانێ لەسەر پێی خۆی راوەستێ، داوای لە خزمەتکارو رازێنەرەکانی کرد کە هێشتاش لەژێر دەستێدا مابوون، کە باشترین جلوبەرگەکانی بۆ بهێننو بە باشترین شێوە بیرازێننەوە. کلیۆپاترا پێشتر کەرستەی خۆکوشتنی خۆی ئامادە کرد بوو کە ژەهری مارێکی بچووک بووو یەك جار پێوەدانی بۆ کوشتنی مرۆڤێك بەس بوو. کلیۆپاترا پێش ئەوەی کە سەری ئەو سەبەتە هەنجیرە بکاتەوە کە مارەکەی تێدا خەوتبوو، قاسدێکی نارده لای ئۆکتاڤیانو داوای لێکرد کە تەرمەکەی لە تەنیشت ئانتۆنی بنێژن. ئۆکتاڤیان هەر بە بیستی ئەو پەیامە بە پەلە خۆی گەیاندە کۆشکی کلیۆپاترا، بەلاّم ئیتر درەنگ ببووو کلیۆپاترا لە جلوبەرگێکی ئاوریشمی (حەریری)و لەحالێکدا کە تەواوی ئاڵتونە بەنرخەکانی بە گوێو گەردنو دەستەکانی‌یەوە بوو، لەسەر تەختە بە شکۆکەی خۆی چوو بووە خەوی مەرگەوە. کلیۆپاترا لەکاتی مردنی‌دا ٣٨ساڵی تەمەن بووو نیزیك بە بیست ساڵ لەتەمەنی کورتی‌خۆی فەرمانڕەوایی میسری کرد. ئەگەر بمانەوێ بە شێوەیەکی دادپەروەرانەو بێ‌لایەن کلیۆپاترا هەڵسەنگێنین، دەبێ بڵێین کە کلیۆپاترا ژنێکی زۆر دەسەلاّت خوازو بەرزەفڕو بەهێزو سیاسەتوان بوو. لە بەراورد لەگەڵ ئەو ژنانەی کە دوای ئەو گەیشتنە دەسەلاّت ناتوانرێت بە ژنێکی هەوەسبازو شەهوەت پەرەست دابنرێت. لە تەواوی ژیانیدا دڵی تەنیا بە دوو پیاو داو تا کۆتایی ژیانیان پێیان وەفادار مایەوە. ئاشق بوونەکەی ئەویش زۆرتر لە رووی بەرنامەو بۆ دابینکردنی ئامانجە رامیارییەکان بووو ئەگەر باسەکە لەم بوارەدا لێك بدەینەوە، یەکەمین ژن بوو کە لە راکێشانی سێکس بۆ مەبەستە رامیارییەکانی کەڵکی وەرگرت. کلیۆپاترا بەو هەموو ژیرییەوە ژنێکی بە بەخت نەبووو یەکەم ئەشقی (ژۆ لیۆس سێزار)لەوپەڕی دەسەلاّتدا کوژراو ئاواتەکانی کلیۆپاترای بۆ سەرکردایەتی جیهان لە تەنیشت ئەو سەرکردە بەهێزە بە بادا. کلیۆپاترا لە هەڵبژاردنی دووهەم پیاویش لەسەر لایەنی دۆڕاو مەرج بەندی کرد. هەرچەند بە بڕوای هەندێك لە مێژوونووسان ئەوە کلیۆپاترا بوو کە لەپیاوێکی بەهێزی وەك ئانتۆنی بوونەوەرێکی لاوازو بەردەوام سەرخۆشی دروست کرد بوو. بە باوەڕی ئەم دەستە لەو مێژوونووسانە کە پلۆتارکی یۆنانی یەکێکە لەوان، ئەگەر ئانتۆنی دیلی ئەشقی کلیۆپاترا نەبوایەو لەکاتی خۆی‌داو پێش ماندوو کردنی هێزەکانی خۆی بچووبایە شەڕی ئەشکانی‌یەکان، بە ئەگەرێکی بەهێز لەو شەڕەدا سەردەکەوتو دوای گەڕانەوەی سەرکەوتووانە بۆ ڕۆما



دەیتوانی وەپێش رکەبەرەکەی خۆی کەوێ. ئۆکتاڤیان کە زڕ کوڕی ژۆلیۆس سێزار بووو خۆی بە جێنشینی بەحەقی ئەو دەزانی، دوای مردنی کلیۆپاترا کوڕی راستەقینەی سێزارو کلیۆپاترای (سێزاریۆن) لەگەڵ خۆی بردە ڕۆماو پێش ئەوەی کە بەناوی "ئاگۆستۆس"[24] پاڵ بە تەختی ئیمپراتۆریەتەوە بدات لەناوی برد. لە دوو کوڕو کچەکەی کلیۆپاترا لە ئانتۆنی، چارەنووسی کوڕە گەورەکەی کە ناوی "ئالێکسانێدر هێلیۆس" بوو، دیار نی‌یە بەلاّم کوڕی دووهەمی لەساڵی ٤٠ی دوای زایین بە فەرمانی "کالیگۆلا"[25] ئیمپراتۆری خوێنمژی ڕۆما کوژرا. تەنیا کچەکەی کلیۆپاترا کە ناوی سێلێنێ یان مانگ بووو شووی بە "جۆبا"[26]ی پادشای مۆریتانیا[27] کردو بە شێوەیەکی سروشتی مرد.

24-Augustus
25-Caligula
26-Juba
27-Mauretania





# ئیمپراتۆرەکانی رۆما لە سەدەی یەکەمی زایینو ئەو ژنانەی حووکمڕانیان بەسەردا دەکردن

ئیمپراتۆریەتی رۆما لە سەدەی یەکەمی دوای زاییندا بەرچاوترین وێنەی گەندەڵیو ئاڵۆزییە بە درێژایی مێژوو. رۆما لە سەرەتای ئەو سەدەیەدا لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆر "ئاوگۆستۆس" کە هەر ئەو ئۆکتاڤیانەیە پێشتر باسمان کرد، لەوپەڕی بەهێزیو دەوڵەمەندی خۆیدا بوو. بەڵام ئەو سامانو شکۆیە لە تەنیشت خۆیدا گەندەڵی رەوشتیو کۆمەڵایەتیی گەشەپێدا کە لە ئاکامدا بووە هۆی لەناوچوونی ئەو ئیمپراتۆریەتە مەزنەو دابەش بوونی بەسەر چەند بەشێکی جیاواز. ئۆکتاڤیان سێ ساڵ دوای مردنی رکەبەرە سەرەکییەکەی، (ئانتۆنی) لەساڵی ١٧ی دوای زاییندا بنەماکانی هەڵبژاردنی لە حکوومەتی رۆما هەڵوەشاندەوەو بە نازناوی "ئاوگۆستۆس" وەك یەکەمین ئیمپراتۆری رۆما لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت. ئاوگۆستۆس یان ئۆکتاڤیان کە لە چیرۆکی ئانتۆنیو کلیۆپاترادا ببوو بە مامۆستای رەوشتو رکەبەرەکەی بە هەوسبازیو خەیانەت بە هاوسەرە رۆمییەکەی (ئۆکتاڤیا) تۆمەتبار دەکرد، خۆی نموونەیەکی خراپتری پێشان داو هاوسەری دووهەمی خۆی لەبەر ئەشقی ژنێکی مێرددار کە منداڵێکی شەش مانگەشی لە سکدا بوو تەڵاق دا. "تاسیتۆس"[1] مێژوونووسی رۆمی لەوبارەیەوە دەنووسێ، کاتێك کە ئۆکتاڤیان بڕیایدا هاوسەری دووهەمی خۆی تەڵاق بدات، کچێکی یەك ساڵەی بەناوی "ژولیا"[2] هەبوو کە کاتێك گەیشتە تەمەنی پێگەیشتوویی (بلوغ) گۆنگەڵییەکی زۆری لێکەوتەوە. ئۆکتاڤیان ئاشقی هاوسەری یەکێك لە ئەفسەرەکانی خۆی بەناوی "لیڤیا"[3] بووو مێردەکەی ناچار کرد خێزانی کە منداڵێکی شەش مانگەی لە سکدا بوو تەڵاق بدات.ئۆکتاڤیان بۆ گەیشتن بە لیڤیا ئەوەندە بەپەلە بوو کە ئامادە نەبوو تا لەدایکبوونی منداڵەکە واتە تەنیا سێ مانگیتر راوەستێ. لیڤیا کە لە بارو دۆخێکی ئەوتۆ مێردی بە ئۆکتاڤیان کرد، هەر لەسەرەتادا بەسەر مێردەکەیدا زاڵ بوو. مێژوونووسی رۆمی لەو باوەڕە

1-Tacitus
2-Julia
3-Livias



دایە کە زۆربەی کردەوەو بڕیارەکانی پیاوێك کە وەك بەهێزترین ئیمپراتۆری رۆما ناسراوە، (بۆ نموونە لەناوبردنی بنەماکانی حکوومەتی هەڵبژێردراو بنیاتنانەوەی ئیمپراتۆری) لە بیرە پاوانخوازییانەکەی لیڤیا سەرچاوەی دەگرت. لیڤیا دوای ئەوە کە وەك ئیمپراتریسی رۆما تاجی لەسەرنا، پتر لە چل ساڵ دەسەڵاتداری راستەقینەی رۆما بووو ئیمپراتۆر هیچ کارێکی بێ راوێژ لەگەڵ ئەو نەدەکرد. لەسەرەتای سەدەی یەکەمی زایینەوە ئەو رۆڵە گۆڕاو تا ساڵی ١٤ی دوای زایین کە ئاوگۆستۆس لەتەمەنی ٧٧ساڵیدا مرد، ئەوە لیڤیا بوو کە لە بەڕێوەبردنیکاروباری دەوڵەتدا بڕیاری دەداو ئەگەریش پێویست بوایە ئاگاداری دەکردەوە. یەکێك لە دەرەنجامەکانی زاڵبوونی لیڤیا بەسەر یەکەم ئیمپراتۆری رۆما ئەوەیە کە لیڤیا چارەنووسی ژولیای کچی ئاوگۆستۆسی کە لە هاوسەری پێشووی بوو، بەدەستەوە گرتو لەتەمەنی ١٤ساڵیدا ئەوی بە زۆرە ملێ بە شوو دا. هاوسەری ژولیا دوو ساڵ دواتر مردو ئەم جارە ئەویان دا بە پیاوێك کە ٢٢ ساڵ لە خۆی گەورەتر بووو ژولیا لە هاوسەری دووهەمی پێنج منداڵی بوو، بەڵام دیسان لەتەمەنی گەنجێتیدا مێردەکەی مردو بۆ دووهەم جار بێوەژن کەوتەوەو ئەم جارەیان لیڤیا بڕیاریدا کە ژولیا بدا بە کوڕەکەی خۆی (تیبێریۆس)[4] کە لە مێردەکەی پێشووی بوو، هەر بەو مەبەستەش تیبێریۆسی ناچار کرد کە لە هاوسەرەکەی جیا بێتەوەو لەگەڵ ژولیا زەماوەند بکات. ئامانجی لیڤیا لە ئەنجامدانی ئەم پلانە ئەوە بوو کە ئاوگۆستۆس، کوڕەکەی کە زاوای خۆشی بوو بکاتە جێنشینی خۆی. ئاوگۆستۆس زوو تەسلیمی هاوسەرەکەی بووو تیبێریۆسی بە جێنشینی خۆی هەڵبژارد. بەڵام ژولیا کە هیچکام لە مێردەکانی خۆش نەدەویستو لە مێردەکانیشی پتر رقی لە لیڤیا بوو و بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی کردبووە ئامێری دەستی خۆی، بڕیاریدا تەواوی کۆتە رەوشتییەکانی ئەو کاتی رۆما کە زۆریش پتەو نەبوو بپچڕێنێتو لەم رێگایەدا ئەوەندە رۆیشتە پێشێ کە جاری وا هەبوو بە ئاشکرایی لە گەڕەکەکە بەد ناوەکانی شار وەدەکەوتو وەکوو لەشفرۆشەکانیتر لەشفرۆشی دەکرد. تیبێریۆس کە توانای هەڵگرتنی ئەو سووکایەتییەی نەبوو، ئەوی تەڵاق داو ئیمپراتۆر ئاوگۆستۆسیش لەژێر داواکاری لیڤیا کچەکەی لەرۆما دوور خستەوە. ئاوگۆستۆس لەساڵی ١٧ی زایینیدا مردو تیبێریۆس وەك دووهەمین ئیمپراتۆری رۆما لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت. تیبێریۆس تا کاتێك کە دایکی لەژیاندا مابوو، لەژێر کارتێکەریو

4-Tiberius





دەسەلاَتی ئەودا بووو لیڤیا دوای مردنی مێردەکەی بەناوی کوڕەکەی دەسەلاَتدارێتی ڕۆمای دەکرد. تیبێریۆس کە تووشی نەخۆشی لادانی سێکس بوو (هاوسەری پێشووی واتە ژولیاش بەو هۆیەوە رقی لێی بوو) دوای تەلاَقی ژولیا ئیتر ژنی نەهێنا. ئەو یەکێك لە گەندەڵترین ئیمپراتۆرەکانی ڕۆما بوو و زۆربەی کاتەکانیخۆی لە حەرەمسەراکەی لە دووڕگەی کاپری رادەبوارد کە لەوێدا کوڕانی جوانی ڕۆمای کۆکردبۆوە. ئەو جێنشینەش کە تیبێریۆس بۆ پۆستی ئیمپراتۆری تەرخانی کردبوو، لەگەندەڵیدا لەو کەمتر نەبوو. جێگرو جێنشینی تیبێریۆس، "کالیگۆلا "[5] بوو کە بە یەکێك لە گەندەڵترینو خوێنمژترین ئیمپراتۆرەکانی ڕۆما دەژمێردرێت. کالیگۆلا کوڕی "ژێرمانیکۆس"[6]و خوشکەزای تیبێریۆس بوو کە بە نەوەی لیڤیاش دەژمێردرا. کالیگۆلا لاوێکی شەڕانیو نائاسایی بووو پێش گەیشتن بە تەمەنی بیست ساڵی دەستدرێژی کردە سەر هەر سێ خوشکەکەی خۆی. دژکردەوەی تیبێریۆس لەبەرامبەر ئەوکارەی جێنشینەکەی تەنیا ئەوە بوو کە هەرچی زووتر مێرد بۆ سێ خوشکەکەی بدۆزێتەوە. یەکێك لەو سێ خوشکە ناوی "ئاگریپینا"[7] بوو کە بە یەکێك لە بەناوبانگترین ژنەکانی مێژووی ڕۆما دەژمێردرێت.

ئاگریپینا دوای ئەوە کە براکەی (کالیگۆلا) دەستدرێژیی کردە سەری، بە نابەدڵی مێردی بە پیاوێکی بەڕەلاَو بەدکار بەناوی "دۆمێتیوس"[8] کرد کە ٢٢ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو. ئەو زەماوەندە کوڕێکی لێکەوتەوە کە دواتر بوو بە ئیمپراتۆری ڕۆماو لە خوێنمژیو هەڵسوکەوتی شێتانەو خراپدا لە هەمووی پێشینیانی خۆی خراپتر بوو. ئەو لە دایك بووە ناپیرۆزە هەمان "نێرۆن"[9] بوو کە بەپێی قسەی دایکی لەلای قاچەوە لە دایك بوو کە ئەوەش بە هێمایەکی ناپیرۆز دەژمێردرا. کالیگۆلا لەگەڵ ئەوەشدا کە خوشکەکانی مێردیان کردبوو، پێوەندییەکانی لەگەڵ هەر سێکیان پاراست بووو لەنێوانیاندا زیاتر ئۆگری خوشکە گەورەکەی (درۆسیلا )[10] بوو. کالیگۆلا لەهەمان کاتدا نێربازیش بووو لەهەمووان زیاتر بە پیاوێکی گەنج

---

5-Caligula
6-Germanicus
7-Agrippina
8-Domitius
9-Nero
10-Drusilla



بەناوی "لیپیدۆس"[11] فێر ببوو. گەندەڵی ئەو بنەماڵەیە بە زماوەندی "درۆسیلا"و لیپیدۆس گەیشتە ئەوپەڕی خۆیو کالیگۆلا دوای ئەو زەماوەندە لە تەختێکدا لەگەڵیان دەنووست! کالیگۆلا بەڵێنی بە لیپیدۆس دابوو کە دوای گەیشتن بە ئیمپراتۆری ئەو دەکاتە جێنشینی خۆیو خوشکەکەشی بە هیوای ئەوە کە ڕۆژێك دەبێتە شاژنی ڕۆما، ئەو ژیانە پڕ لە گەندەڵییەی قەبووڵ کرد. بەلاَم درۆسیلا پێش ئەوەی بە ئاواتەکانی خۆی بگات لەتەمەنی گەنجیدا مردو ئاگریپینا جێگای ئەوی گرتەوە. کالیگۆلا لەساڵی ٣٧ی زایینی بوو بە ئیمپراتۆری ڕۆماو هەر وەك بەڵێنی بە لیپیدۆس دابوو ئەوی کردە جێنشینی خۆی. ئاگریپینا کە دەیەویست هەرچی زووتر تاجی شاژنی ڕۆما لەسەر بنێت، لەگەڵ لیپیدۆس دژی براکەی پیلانی گێڕا، بەلاَم پێش ئەوەی پیلانەکەیان بۆ کوشتنی کالیگۆلا سەر بگرێت، کالیگۆلا لە مەبەستیان ئاگادار کرایەوەو فەرمانی گرتنو کوشتنی لیپیدۆسی دا. دوای لە سێدارە درانی لیپیدۆس هەموو کەس چاوەڕوانی لە سێدارە درانی شەریکی تاوانەکە بوون. بەلاَم کالیگۆلا تەنیا فەرمانی دوور خستەوەی خوشکەکەی دەرکردو پێش جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارە فەرمانیدا ئاگریپینا لە حالێکدا کە دەبوو خۆڵەمێشی تەرمی سووتاوی مێردەکەی بەشان بکێشێ لە شەقامەکانی ڕۆما بیگەڕێنن. حکوومەتی کالیگۆلا ماوەیەکی زۆری نەخایاندو ئیمپراتۆری خوێنمژی ڕۆما لەساڵی ٤١ی زایینیدا بەدەستی یەکێك لە پاسەوانەکانی ئیمپراتۆری کوژرا. کالیگۆلا دوای کوشتنی لیپیدۆس جێنشینێکی بۆ خۆی دانەنابووو ئەفرادی گاردی ئیمپراتۆری کە دوای کوشتنی کالیگۆلا بەکردەوە دەسەلاَتیان گرتبووە دەست، مامی کالیگۆلایان بەناوی "کلۆدیۆس"[12] کە بە فەرمانی کالیگۆلا بەند کرابوو وەك ئیمپراتۆر دیاری کرد. کلۆدیۆس کاتێك کە بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو گەیشتە تەمەنی ٣١ ساڵ پلەی ئیمپراتۆری بوو و ساڵێك پێش ئەو ڕووداوە لەگەڵ کچێکی پازدە ساڵی بەناوی "مێسالینا"[13] زەماوەندی کردبوو. مێسالینا چەند مانگ دوای ئەوە کە تاجی شاژنی ڕۆمانیای لەسەرنا کوڕێکی بۆ ئیمپراتۆری نوێ بە دونیا هێنا. بەلاَم هەمووان دەیانزانی کە ئیمپراتۆر باوکی ئەو منداڵە نییە. کلۆدیۆس دوای گەیشتن بە ئیمپراتۆری فەرمانیدا هەمووی دوورخراوەو

---

11-Lepidus
12-Claudius
13-Messalina





بەندکراوەکان بۆ وێنە برازاکەشی (ئاگریپینای خوشکی کالیگۆلا) ئازاد بکەن. ئاگریپینا گەڕایەوە رۆماو وەدوای ئامانجی پێشووی خۆی بۆ گەیشتن بە پلەی ژنی ژمارە یەکی رۆما کەوتەوەو ویستی بەهەر شێوەیەك بێت رێگایەك بۆ چوونە ناو دڵی کلۆدیۆس بدۆزێتەوە. بەلاّم ئەو کارە ئەوەندە ئاسان نەبوو، لەبەرئەوەی کە مێسالینای گەنجو جوان بە تەواوی رووحو جەستەی ئێمپراتۆری داگیر کردبووو بەسەریدا زاڵ بوو. مێسالنیا بە خراپیو هەرزەیی ناوبانگی هەبوو بەلاّم ئیمپراتۆر گرینگی بەو دەنگۆیانە نەدەدا کە لە بارەی ئەوەوە بلاّوبۆوەو تەنانەت ژمارەیەك لەو کەسانەی کە دەیانگوت مێسالینا پێوەندی لەگەڵیان هەیە، بە راسپێردراوی ئەو لەسەر هەندێك کاری گرینگی دانا بوون! ئاگریپینا کە بەهۆی کارتێکەریو زاڵ بوونی مێسالینا لەسەر کلۆدیۆس نەیدەتوانی راستەوخۆ رێگایەك بۆ دەرباری ئیمپراتۆر بدۆزێتەوە، لە رێگای‌ترەوە دەست بە کار بووو لەگەڵ "پالاّس"[١٤]، خەزێنەداری جێگای متمانەو نهێنی پارێزی کلۆدیۆس پێوەندی سازدا. ئاگریپینا لەو رێگایەوە لە تەواوی رووداوەکانی ناو کوشکی ئیمپراتۆری ئاگادار دەبۆوەو ئەو پروپاگەندانەی کە لەملاو ئەولای رۆما لەبارەی مێسالینا لەسەر زمانان بوو، بە گوێی پالاّسو لە رێگای ئەوەوە بە گوێی کلۆدیۆسی دەگەیاند.



**پەیکەری مێسالینا کە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی ئیمپراتۆریەتی کلۆدیۆس**

14-Pallas



ماوەی ئیمپراتۆری کلۆدیۆس لەسەر رۆما سێزدە ساڵی درێژەی کێشاو مێسالینا نزیك بە حەوت ساڵێ ئەو ماوەیە بڕیاردەری چارەنووسی خەڵکی رۆما بوو. مێسالینا تەنانەت لە چواردیواری کۆشکی ئیمپراتۆریشدا لە عەیشو نۆشو رابواردن ترسێکی نەبووو لە بەشێکی کۆشکی ئیمپراتۆری کە تایبەت بە خۆی کردبوو ،هەموو شەوێك کۆڕی عەیشو نۆشی دەگێڕاو میوانداری لە ئاشقانو ئەویندارانی خۆی دەکرد. کلۆدیۆسیش جارجارێك لەو کۆڕانەدا ئامادە دەبوو، بەلاّم مێسالینا بە دەرمانی خەو کە لە شەرابەکەی دەکرد، دەی خستە خەوو چێژی لەوە وەردەگرت کە لە تەنیشت مێردە سەرخۆشو بێهۆشەکەی لەگەڵ پیاوێتردا دەخەوێت! مێسالینا لە تەنیشت گەندەڵیو عەیاشی لە ئەنجامدانی تاوانیش ترسی نەبووو هەندێك لە ئاشقەکانی خۆی کەلێیان بێزارو ماندوو دەبوو یان بە لەمپەری دەزانین، بە شێوەی جۆراوجۆر لە بەینی دەبردن. تۆمەتی هەمیشەیی ئەوان کە پێویستی بە بەڵگەو سەلماندن نەبوو، پیلان دژی ئیمپراتۆر بوو کە راپۆرتو شایەتیدانی بە درۆی چەند راسپاردەیەك بۆ رازی کردنی ئیمپراتۆر لەو بارەیەوە بەس بووو کلۆدیۆس بێ لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە فەرمانی کوشتنی دەدان. لەشکرکێشی کلۆدیۆس بۆ دوورگەی بریتانیا دەرفەتێکی نوێی دا بە مێسالینا تا عەیاشیو خراپەکاری خۆی بە بەرزترین پلەی خۆی بگەیێنێتو وەکوو ژولیای کچی یەکەم ئیمپراتۆری رۆما لە شەقامەکانی رۆما رکەبەری لەشفرۆشەکانی شار بکات. مێسالینا کە بەهۆی زێدەڕۆیی لە عەیاشیو خراپەکاری وەك نەخۆشێکی جنسی لێهاتبوو، لە گەڕەکە بەدناوەکانی رۆما لەگەڵ لەشفرۆشەکانی شار پێشبڕکیی دەکرد. "ئاندریۆ-ئیۆارت"[١٥] لێکۆڵەری بریتانیایی لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا بەناوی "خرابکارترین ژنانی جیهان"[١٦] لەسەر زاری مێژوونووسانی رۆمی دەڵێت کە مێسالینا بڕیاریدا لە شەوێکدا توانایی خۆی لە رووبەروو بوونەوەی پیاوانی جۆراوجۆر بخاتە پێشبڕکێ، مێسالینا لەم پێشبڕکێیەدا توانی لەدوایین لەشفرۆشێك کە توانیبووی لەگەڵ **٢٥** پیاو جووت بێ بە جیاوازییەکی زۆر بباتەوە!

کلۆدیۆس دوای گەڕانەوە بۆ رۆما داستان گەلێکی سەیری بیست کە لە بارەی هاوسەری لەسەر زمانان بوو، بەلاّم دیسان نەیویست یان نەیتوانی باوەڕیان پێ بکاتو مێسالیناش خراپکاریو عەیاشییەکەی بۆ چوارچێوەی کۆشکی ئیمپراتۆری کورت کردەوە.تاسیتۆس مێژوونووسی رۆمی

15-Andrew Ewart

16-The worlds wickedest women-Odham books London P.52

کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، پێی وایە هۆی گۆڕانی شێوازی مێسالینا، ئەشقی نۆی ئەو بە پیاوێك بەناوی "سیلیۆس"[١٧]ە کە تا سیتۆس ئەو بە جوانترین‌و ڕێکوپێکترین پیاوی ئەوکاتی ڕۆما دەناسێنێت‌و دەنووسێ: "مێسالینا کە دەیەویست ئەو پیاوە لەژێر دەست وله پاوانی خۆیدا بێت، ناچاری کرد کە لە هاوسەرەکەی جیا بێتەوە". مێسالینا کە بۆیەکەم جار لە ژیانیدا ئاشق ببوو یان بە وتەی تاسیتۆس "دەیەویست تامی عەشقیش ئەزموون بکات"، ویستی بۆ هەمیشە لەگەڵ سیلیۆس دا بمێنێتەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا ئامادە نەبوو نازناوی هاوسەری ئیمپراتۆرو ژنی پلە یەکەمی ڕۆما لە دەست بدات. بۆ گەیشتن بەو ئامانجە مێسالیناو سیلیۆس پێکەوە پیلانی کوشتنی کلۆدیۆسیان داڕشت، بەڵام بۆ ئەوەی کە سیلیۆس بتوانێت دوای مردنی کلۆدیۆس بە پلەی ئیمپراتۆری بگات مشوورێکی‌تریش پێویست بوو. مێسالینا بێ‌باکی‌و ڕووهەڵماڵراوی گەیاندبووە جێیەك کە داوای لە کلۆدیۆس کرد کە بە شێوەیەکی کاتی تەڵاقی بدات تا لەگەڵ سیلیۆس زەماوەند بکات. مێسالینا بۆ گەیشتن بەو ئامانجە درۆیەکی گەورەی کردو گوتی کە ئەستێرەناس‌و غەیب گۆیەکەی ناسراو بەختی ئەوی دیوەو وتوویەتی: "مێردەکەت تا مانگێکی‌تر دەمرێ!". کلۆدیۆسیش لە رووی نەفامی‌و سادەدڵییەوە یان بۆ ئەوەی کە داواکارییەکانی هاسەری جێبەجێ بکات، باوەڕی بەو قسەیە کردو لە مێسالینا جیا بۆوە. کلۆدیۆس دوای ڕاگەیاندنی تەڵاقی خێزانی، لە ڕۆما چووە دەرێ‌و مێسالینا جەژنێکی بوکێنی بەشکۆی بۆ خۆی‌و سیلیۆس بەڕێوە برد کە هاوشێوەی ئەو جێژنە لە ڕۆما نەبیندرابوو. لە رەوتی ئەو زەماوەندە کە بە ڕێوەرەسمێکی وەکوو کەژاوەی شادی (کەرنەڤاڵ) کۆتایی پێهات، بووك‌و زاوا لەسەرتەختێکی رەوان (لەسەر شان) بە شەقامەکانی ڕۆمادا دەگەڕان‌و لەبەر چاوی واق وڕماوی خەڵك خەریکی ئەشق بازی بوون. پیلانی مێسالینا دوای ئەنجامدانی ئەو ڕێوڕەسمە بریتی بوو لەکوشتنی کلۆدیۆس‌و دیاریکردنی سیلیۆس وەك ئیمپراتۆری ڕۆما. مێسالینا پێشتر چەند کەسێکی لە خەڵکانی گاردی ئیمپراتۆری بۆ ئەنجامدانی ئەم پیلانە لەگەڵ خۆی خستبوو. بەڵام پالاسی خەزێنەداری ئیمپراتۆری لە ڕێگای یەکێك لە ئەفسەرانی گاردەوە لەو پیلانە ئاگادار کرایەوەو ئەویش لەگەڵ ئاگریپینای باس کرد. ئاگریپینا بەپەلە ڕۆیشت بۆ شوێنی حەوانەوەی کلۆدیۆس لە دەوروبەری ڕۆماو مامی لە وردە کارییەکانی ئەو پیلانە ئاگادار کردەوە کە لەلایەن مێسالیناو سیلیۆس داڕێژرابوو. کلۆدیۆس بەپەلە گەڕایەوە ڕۆما. بەڵام مێسالینا وێڕای ئەوەی کە قسەکانی ئاگریپینای وەدرۆخستەوە، داوای گرتن‌و

---
17-Silius



دوور خستنەوەی ئەوی کرد. کلۆدیۆس کە هێشتاش نەیدەتوانی دڵ لە مێسالینا بەربدات، دیسان خەریك بوو دیلی وەسوەسەکانی بێ کە پالاس یارمەتی ئاگریپینای داو چەند شایەت‌و بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگری لەمەڕ ئەو پیلانەی کە بۆ کوشتنی ئیمپراتۆر داندرا بوو ئاشکرا کرد. لەئاکامدا مەترسی گیان زاڵ بوو بەسەر ئەشق‌و دڵڕفێنی‌و کلۆدیۆس فەرمانی کوشتنی مێسالیناو سیلیۆسی واژۆ کرد. پالاس کە دەترسا وەدواخرانی جێبەجێکردنی ئەو فەرمانە دەرفەتێك بڕەخسێنی بۆ دیداری دووباری مێسالیناو ئیمپراتۆرو ببێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی فەرمانی لەداردانی ئەوان، بەپەلە فەرمانی گرتنی مێسالیناو سیلیۆسی دەرکردو پێش ئەوە کە هەلێك بۆ دیداری دووبارەی ئیمپراتۆر لەگەڵ ئەوان بڕەخسێت، حوکمەکەی لەکاتی خۆیدا جێبەجێ‌کرد. ئەو ڕووداوە لەساڵی ٤٨ی زایینی‌و حەوتەمین ساڵی ئیمپراتۆری کلۆدیۆس ڕوویدا.

ئاگریپینا لەو کاتەدا ژنێکی تەمەن ٣٢ساڵان بوو، بەڵام هێشتاش هەر جوان مابووو دەیتوانی بچێتە دڵی پیاوێکی وەکوو کلۆدیۆس. کلۆدیۆسیش دوای لە سێدارەدانی مێسالینا هۆگری ئاگریپینا ببوو، بەڵام یاساکانی ڕۆما ڕێیان بە زەماوەندی مام‌و براز نەدەدا، تا ئەوەی یاسایەکی نوێ لەلایەن سێنای ڕۆما دەرکراو ئەو لەمپەرەش لابردراو ئاگریپینا بوو بە هاوسەری مامی خۆی‌و شاژنی ڕۆما!. کلۆدیۆس کە لە دەروونڕا پیاوێکی نەفس نزم بوو لەکاتی زەماوەند لەگەڵ ئاگریپینا چل ساڵی تەمەن بووو لە ڕادەبەدەر هێزی ئیرادەو بڕیاردانی لەدەست دابوو.



**پەیکەری کلۆدیۆس کە سێزدە ساڵ ئیمپراتۆری ڕۆما بوو. بەڵام ژنەکانی بەناوی ئەو حکوومەتیان لەسەر ڕۆما دەکرد**





کارەساتی مێسالیناش برینێکی قورسی لە رووحیەی ئەودا بەجێ هێشتبوو کە بەرەو بێدەنگیو سست بوون هانی دەداو ئەوەش دەرفەتێکی باشی بۆ ئاگریپینا رەخساند کە بە تەواوی بیخاتە ژێر دەسەلاٚتو کارتێکەری خۆیو لە پاشماوەی زەمەنی ئیمپراتۆریەتی ئەودا بەسەر رۆما حکوومەت بکات. ئاگریپینا سەرەتا تەواوی دارودەستەکەی مێسالیناو کەسانی جێی باوەڕو وەفاداری ئەوەی لە دەرباری کلۆدیۆس دەرکردو کەسانی سەربەژێرو گوێڕایەڵی خۆی لەجێگای ئەوان داناو پاشانیش کاردرووستایی زەماوەندی کوڕەکەی، واتا نێرۆن و کچی کلۆدیۆسی (ئۆکتاڤیا) ئامادە کرد تا رێگا بۆ ئیمپراتۆریەتی کوڕەکەی لە داهاتوودا خۆش بکات. تەنیا گرفتێکی کە لەئارا دابوو ئەوە بوو کە ئۆکتاڤیا پێشتر دەزگیرانی هەبوو، بەلاٚم لابردنی ئەو گرفتە بۆ ژنێکی وەك ئاگریپینا کارێکی سادە بوو. دەزگیرانی ئۆکتاڤیا تاوانبار بە زینا لەگەڵ خوشکەکەی کراو کلۆدیۆس کە باوەڕی بەم داستانە هەڵبەستراوە کرد، لە دەربار دەری کرد. زەماوەندی نێرۆن لەگەڵ ئۆکتاڤیا کە لە راستیدا زڕبراو زڕخوشك بوون لە نێو رۆمییەکان نایاسایی بوو، بەلاٚم ئەو کارە بۆ ئاگریپینا کە داستانی پێوەندی ئەو لەگەڵ براکەی بە گوێی هەموو کەس گەیشتبوو بە شوو کردن بە مامی خۆی کارێکی حەرامتری ئەنجامدابوو، تاوان نەبوو. بەلاٚم لەمپەرێکی گرینگتر کە لەسەر رێگای بە ئیمپراتۆری گەیشتنی نێرۆن لەئارا دابوو، بوونی کوڕێك بەناوی "بریتانیکۆس"[18] لە هاوسەری پێشووی کلۆدیۆس بوو کە کلۆدیۆس زۆری خۆش دەویستو پێشتر بۆ جێنشینی خۆی لەبەرچاوی گرتبوو. ئاگریپینا بۆ لابردنی ئەو لەمپەرە بڕیاریدا کوڕەکەی وا پەروەردە بکات کە گومانێك لە باشی ئەو بە بەراورد لەگەڵ بریتانیکۆس نەمێنێتەوە. بۆ فێرکردنو پەروەردە کردنی نێرۆن چەند کەس لەباشترین زانایانی ئەوکات وەك فەیلەسۆفو کۆمەڵناسی بەناوبانگ "سێنێکا"[19] راسپێردران، بەلاٚم فێرکردنی ئەو بەزەحمەتو هێواشی دەڕۆیشتە پێشێ، لەبەر ئەوەی کە نێرۆن مێشکی زانستیو فەلسەفی نەبووو زۆرتر هۆگری کاری هونەریو بەتایبەتی مۆسیقا بوو. نێرۆن شێعریشی دەنووسیو ئەو گۆرانییانەی کە خۆی شێعرەکانی دەهۆنییەوە بە مۆسیقایەك کە خۆی دایدەناو سازێك کە خۆی دەیژەنی دەیگوتەوە. دایکی نێرۆن کە دەیەویست کوڕەکەی بۆ بەدەستهێنانی پلەی ئیمپراتۆریو دەسەلاٚتدارێتی بەسەر رۆما پەروەردە بکات، دژایەتی ئەو

18-Britannicu
19-Seneca



کارانەی نێرۆنی دەکرد. نێرۆن لە ترسی دایکی هونەرەکانی دەشاردەوەو بۆ ژەنینی سازو گۆرانی وتن دەچووە دەرێ. نێرۆن دوای ئەوە کە بوو بە ئیمپراتۆر بە سێنێکای (کە ئیتر بۆتە هاورازی) گوت کە ئاواتی ئەو لە منداڵییەوە ئەوە بووە کە ببێتە باشترین گۆرانی بێژی رۆماو ئەگەر پاوانخوازییەکانو چاوەدێرییەکانی دایکی لە ژیانو چارەنووسی ئەودا کاریگەریی نەبوایە، لەوانە بوو لەو کارە زیاتر لە ئیمپراتۆریەت لەژیان کەڵکی وەربگرتبایە. ئاگریپینا لەساڵی ٥٣ی زایینیدا کە بریتانیکۆس بوو بە چواردە ساڵ، (تەمەنێك کە لە رۆما بە تەمەنی پێگەیشتوویی دادەنرێت) بۆ پێشگیری لە راگەیاندنی رەسمیی جێنشینی بریتانیکۆس لەلایەن ئێمپراتۆرەوە، پڕۆپاگەندەی ئەوەی کرد کە ئەو منداڵە ئەقڵی تەواو نییە. لە راستیدا ئاگریپینا بە پێدانی دەرمانە سڕکەرەکان ئەوی لەحاڵەتی سروشتی لابرد بووو بریتانیکۆس لەبارو دۆخێکدا نەبوو کە بتوانێ لە رێوڕەسمی جێنشینی خۆیدا بەشداری بکات. کلۆدیۆس کە سەبارەت بەو رووداوە بەشك کەوتبوو بریتانیکۆسی لە هاوسەری شاردەوەو بۆ حەسانەوەو چارەسەری ناردیە رۆما. پێداگرتنی ئاگریپینا بۆ دانانی کوڕەکەی بە پلەی جێنشینی بێ ئاکام مایەوەو ئاگریپینا کە هەستی دەکرد کارتێکەریو دەسەلاٚتی لەسەر کلۆدیۆس نەماوەو لەوانەیە هەرگیز بە ئاواتی خۆی نەگات، بیری کوشتنی مێردەکەی کەوتە سەریو ژەهرخوراو کردنی ئیمپراتۆر بەهۆی ئەو کەسانی کە گوێ لەمستی بوون، کارێکی دژوار نەبوو. کلۆدیۆس لەساڵی ٥٤ی زایینیدا لەژێر کاریگەری ژەهرێکی کوشندە مرد کە ئاگریپینا رشتبوویە ئەو شیوەی کە زۆری پێخۆش بوو. بەلاٚم ئاگریپینا رێگەی لە بلاٚو بوونەوەی هەواڵی مردنەکەی گرت تا ئەو کاتەی کە پێشەکییەکانی راگەیاندی ئیمپراتۆریەتی نێرۆنی ئامادە کرد. لەو ماوەیەدا بریتانیکۆسیان کە خوازەری سەرەکی ئیمپراتۆری بوو لە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی بەند کردو سەرکردەکانی گاردی ئیمپراتۆری بەڵێنیان دا کە لایەنگری لە نێرۆن بکەن. ئەو کەسانەی کە ئامادە نەبوون بڕیاری ئاگریپینا جێبەجێبکەنو دان بە ئیمپراتۆریەتی نێرۆ دابنێن، گیرانو لە ئاکامدا نێرۆ لە هەلو مەرجێکدا وەك ئیمپراتۆری نوێ ناسێندرا کە هێزێکی ئەوتۆ بۆ بەرنگار بوونەوەی نەمابوو. نێرۆ کە لەتەمەنی ١٨ ساڵیدا بوو بە ئیمپراتۆر، هێشتاش هەر لە دایکی دەترساو نەیدەوێرا لەبەرامبەر فەرمانەکانیدا قسە بکات. لە راستیدا ئەوە ئاگریپینا بوو کە لەسەر رۆما حکوومەتی دەکرد. یەکەم کاری ئەو لەو پلەیەدا دەرکردنی بڕیاری لە سێدارەدانی ئەو کەسانە بوو کە دوای مردنی کلۆدیۆس لەرەوتی گواستنەوەی





دەسەڵات فەرمانەکانی ئەویان جێبەجێ‌نەکرد.هەموو بڕیارەکانی تایبەت بە کوشتن (ئیعدام)و ئەشکەنجەو هەروەها بڕیارەکانی تایبەت بە دانانی پلە نوێیەکان لەلایەن ئاگریپیناوە دەردەکراو نێرۆ لە یەکەمین ساڵەکانی حکوومەتیدا نەیدەوێرا دژایەتی هیچکام لەو بڕیارانە بکات کە لەلایەن دایکییەوە دەردەکران. سێنێکاو "بۆرۆس"[20] (مامۆستاکانی پێشووی نێرۆو راوێژکارانی ئێستای) لە زۆربەی کارەکان رازی نەبوونو نێرۆیان لە ملکەچی بێ ئەملاو ئەولای دایکی لۆمە دەکرد، بەڵام نێرۆ هێشتاش نەیدەوێرا رووبەڕووی دایکی بێتەوە تا ئەوە کە لە ئاکامدا ئەوینی کچێکی جوان، بەجەرگیو توانای راوەستانی لەبەرامبەر داواکارییەکانی دایکی پێدا. ئەو کچەی کە نێرۆ ئاشقی ببوو ناوی "ئاکتێ"[21] بوو کە یەکێك لەخزمەتکارەکانی هاوسەری (ئۆکتاڤیا) بوو. ئاگریپینا کە دەترسا ئەشقی ئاکتێ لە کارتێکەریو دەسەڵاتەکەی لەسەر کوڕەکەی کەم کاتەوە،بیری لە دوورخستنەوەی ئاکتێ لەکۆشکی ئیمپراتۆری کردەوە، بەڵام نێرۆ بۆ یەکەمین جار لەبەرامبەر دایکیدا راوەستاو وتی ئەگەر بڕیار بێت لەنێوان ئیمپراتۆریەتو ئەوینی ئاکتێ یەکیان هەڵبژێرێ، ئەشقەکەی هەڵدەبژێرێ. ئاگریپینا لە ئاکامدا رازی بوو کە پێوەندییە ئاشقانەکەی نێرۆو ئاکتێ بەردەوام بێتو تەنانەت "هێلانەیەکی خۆشەویستی"ی لە دەوری کۆشکی ئیمپراتۆری بۆ دروست کردن، ئەوەش بە مەرجێك کە ئۆکتاڤیا هەروەك شاژنی رۆماو هاوسەری رەسمی ئیمپراتۆر بمێنێتەوە. بەڵام ئاکتێ کە لە تۆڵە سەندنەوەی ئاگریپینا دەترساو دەیزانی رۆژێك بەدەستی ئەو دەرمانداو دەکرێت، ئامادە نەبوو پێ بنێتە ئەو هێلانە ئەشقەی کە دایکی نێرۆ بۆی دروست کرد بوون. لەئەنجامدا نێرۆ بڕیاریدا هاوسەری، واتە ئۆکتاڤیا تەڵاق بداتو بە فەرمی لەگەڵ ئاکتێ زماوەند بکات. ئاکتێ کە تاجی شاژنی رۆمای لەسەرنا بڕیاریدا کۆشکی ئیمپراتۆری لەدەستو پێوەندییەکانی ئاگریپینا پاك بکاتەوەو مێردەکەی لەژێر دەسەڵاتی دایکی بهێنێتە دەرێ. ئاکتێ توانی نێرۆ رازی بکات کە دایکی ئەو بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆی لە ئەنجامدانی هیچ تاوانێك ناپرینگێتەوەو هەر وەك بۆ گەیشتن بە دەسەڵات مێردەکەی کوشت، لە کوشتنی ئەویش روو ناگێڕێتەوە. نێرۆ لەژێر کاریگەری لە گوێ خوێندنەکانی ئاکتێ‌دا هەموو کەسانی دەستو پێوەنداری دایکی لە کۆشکی ئیمپراتۆریو پلە جۆراوجۆرەکانی حکوومەتیدا لەسەرکار

20-Burrus
21-Acte



وەلانا. پالاس، خەزێنەداری کۆشکی ئیمپراتۆریو شەریکی سەرەکی تاوانەکانی رابردووی ئاگریپینا کە هاندەری لادەریەکانی بوو لەسەرووی ئەو گروپەدا بوو. ئاگریپینا لەوکاتە بەملاوە بڕیاریدا بە هەموو تواناوە دژی کوڕە سپڵەو ژنەکەی، کە ئەوی لەبەرامبەر دایکی داناوە، بەرەوڕوو بێتەوەو باشترین ئامێری شەڕی ئەو لەو بەرنگارییەدا بریتانیکۆس بوو کە بەدەستی خۆیو بە ناحەق لە جێنشینی باوکی بێ‌بەش کرابوو. بەڵام نێرۆن دوایین کوڕی ئەم دایکە بووو پێش ئەوە کە پیلانەکەی ئاگریپیناو بریتانیکۆس بە ئەنجام بگات، بریتانیکۆسی دەرمانداو کردو دایکی لە دەربار دوور خستەوە. دوو ساڵ درێژەی کێشا تا ئاگریپینا دووبارە توانی بچێتەوە ناو دڵی کوڕەکەیو ئەمجارەیان لە بێ‌نرخ ترینو سوکترین رۆڵی ژیانی پڕ لەگەندەڵیدا خۆی دەرخست. مێژوونووسانی ناوداری رۆمی، تاسیتۆسو "سۆتۆنیۆس"[22] ئەم رووداوە شوورەییو سەرشۆڕانەیە بە تێرو تەسەلی روون دەکەنەوە ودەنووسن کە چۆنو بە چ شێوەیەك ئاگریپینا بە ئامادە کردنی کۆڕی عەیشو رابواردن، نێرۆن رادەکێشێتە نێو بازنەی کارتێکەری خۆیو لە ئەنجامدا دەبێتە ئەوینداری کوڕەکەی!! چەند سەدیەك دواتر دەروونناسان و"سایکۆلیستەکان" ئەو داستانە سەرسووڕهێنەرە ئاوا شی دەکەنەوە کە نێرۆن دوای ساڵانێك ملکەچیو ترس لە دایك، فشارەکانی سەردەمی منداڵیو مێرمنداڵیی بە داگیرکردنی دایکی قەرەبوو دەکردەوەو لەو پێوەندیە سەرشۆڕانەیە (جووت بوون) چێژی وەردەگرت. کارەساتی پێوەندی ئیمپراتۆرو دایکی تەنانەت بۆ کۆمەڵگای پڕ لە گەندەڵی ئەو کاتی رۆماش هەرس نەدەکرا. سێنێکا کە هێشتا کارتێکەری لە نێرۆدا مابوو، وەبیری هێناوە کە درێژە پێدانی ئە پێوەندییە دەبێتە هۆی راپەڕینو ئەگەر راپەڕینەکەش گشتی بێت تەنانەت گاردی ئیمپراتۆریش پارێزگاری لێ‌ناکەن. نێرۆن بۆ دەرباز بوون لەو مۆتەکەیە بیری لە کوشتنی دایکی کردەوەو بەهۆی ئەوە کە دەیزانی دایکی لەوە ژیرترە کە بەدەستی دارودەستەی ئەو دەرمانداو بکرێت، بڕیاریدا هۆکارەکانی نوقم کرانی ئەو لە دەریادا لەکاتی سەفەرێکی پشوودان لەسەر دەریا ئامادە بکات، بەڵام ئەم پیلانەش سەری نەگرت. لەبەر ئەوەی ئاگریپینا مەلەوانێکی لێهاتوو بووو توانی خۆی بگەیێنێتە بەلەمێکی گەشتوگوزاری و لەو رێیەوە بگاتە قەراغ دەریا. نێرۆن بۆ پێشگرتن لە بلاو بوونەوەی ئەو بەسەرهاتەو رەنگە لە ترسی تۆڵە سەندنەوەی دایکی کە هێشتاش لە ناخی‌دا ریشەی داکوتا بوو، چەند کەسێکی لە ئەفرادی گاردی ئێمپراتۆری راسپارد

22-Suetonius





که به شەو دایکی لە نێو جێگاکەیدا بکوژن‌و بۆ نەهێشتنی شوێنەواری تاوانەکە تەرمەکەی بسووتێنن. ئەو کارەساتە کە لەساڵی ٥٩ی زایینی‌و پێنجەمین ساڵی حکوومەتی نێرۆندا روویدا، کاریگەری قووڵی لەسەر دەروونی داناو بووە هۆی ئەوە کە نێرۆن لە پاشماوەی دەورانی ئیمپراتۆری خۆیدا کردەوەی شێتانەو نامرۆڤانە ئەنجام بدات. ئاگردانی شاری رۆما لەساڵی ٦٤ی زایینی کە لەودا ١٠گەڕەك لە ١٤گەڕەکی رۆما تەخت بوو، خراپترین کارەساتی دەورانی ئیمپراتۆری ئەوە. مێژوو نووسان سەبارەت بەمەبەستی نێرۆن لەو ئاگر تێبەردانە گێڕانەوەی جیاوازیان هەیە. بە بڕوای هەندێکیان نێرۆن دەیەویست دوای وێران کردنی شاری رۆما شارێکی‌تر بنیات بنێ‌و شانازی دانانی ئەو شارە لە مێژوودا بەناوی خۆی تۆمار بکات‌و بە بڕوای ژمارەیەکی‌تر ئامانجەکەی بریتی بوولە تاوانبار کردنی مەسیحییەکان بە ئاگردانی شارو کوشتنی بە کۆمەڵی ئەوان‌و لە کۆتاییدا ژمارەیەك لەو باوەڕە دان کە نێرۆن لە حاڵەتی شێتی‌و مەستی ئەو کارەی کردووەو دەیەویست هاوکات لەگەڵ سەیرکردنی ئاگرەکە شێعر بڵێت!

دواین عەشقی نێرۆن ژنێك بوو بەناوی "سابینا"[23] کە بە جێگای ئۆکتاڤیاو ئاکتێ بوو بە شاژنی رۆما. بەڵام لەساڵی ٦٥ی زایینی‌دا بە تاوانی بەشداری لە پیلانێك بە دژی نێرۆن کوژرا. زۆربەی ناودارانی ئەو کاتی رۆما بە تاوانی بەشداری کردن لەو پیلانە بە کۆمەڵ کوژران. سێنێکا فەیلسوفی ناودارو مامۆستاو راوێژکاری پێشووی نێرۆش لەو کەسانە بوو کە بە تاوانی هاوکاری لەگەڵ پیلانگێڕەکان تۆمەتبار کراو تەنیا بەزەییەکی کە نێرۆ لەحەقی ئەودا کردی ئەوە بوو کە فەرمانی‌دا خۆی بە بڕینی دەمارەکانی کۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێ. نێرۆ لە سێ ساڵی پاشماوەی ئیمپراتۆریدا تووشی چەند شۆڕشێکی گەورە لەسەرتاسەری وڵاتەکەی بۆوەو لە ئاکامدا لەرۆژی نۆی ژوئینی ساڵی ٦٨ی زایینی‌و دوابەدوای هێرشی شۆڕشگێڕەکان بۆ کۆشکی ئیمپراتۆری لە رۆما هەڵات‌و پێش ئەوەی کە بەدەستی شۆڕشگێڕەکان بە دیل بگیرێت خۆی کوشت.

23-Sabina







# ژنێکی سۆزانی کە بوو بە شاژنی گەورەترین ئیمپراتۆری سەردەمی خۆی و لەکاتی مردنیدا نازناوی پاکی "قەشە" وەرگرت!

بەسەرهاتی ژیانی تیۆدۆرا[1]، شاژنی بیزانس[2] یەکێك لە هەژێنەرترین و پڕرووداوترین ژیاننامەکانە کە بە درێژایی مێژوو لە بەسەرهاتی کەمتر ژنێکدا دەبینرێت. لەو ژیاننامە جۆراوجۆرانەی کە سەبارەت بە ژیانی ئەم ژنە نووسراوە، هەڵسەنگاندنی جۆراوجۆرو دژ بەیەك کردراوە. ناوی هەندێك لەو ژیاننامانە "شاژنی سۆزانی"[3]ە کە نووسەرەکانی پتر لەشفرۆشیو برگە شەرمینەکانی ژیانی تیۆدۆرایان بەر لە تاج لەسەر نانی شاژنی بیزانسو خراپکارییەکانی لەکاتی دەسەلاَت روون کردۆتەوە. بەلاَم ژمارەیەکیتر لەنووسەرەکان پتر لە کارە خێرخوازییەکانو مەیلەو چوونی بەرەو ئایین لە کۆتاییەکانی ژیانیدا ورد بوونەتەوەو بە شایانی نازناوی "ساینت تیۆدۆرا"[4] یان تیۆدۆرای پاکی دەزانن کە کەنیسەی ئۆرتۆدۆکس لەکاتی مردنی پێی بەخشیوە.

تەواوی سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە تیۆدۆرا لەساڵی ٥٤٨ی زایینیدا مردووە، بەلاَم رێکەوتی لەدایکبوونی ئەویان لە هەندێك سەرچاوە ٥٠١ی زایینیو لە هەندێکیتر ٥٠٨ی زایینی نوویسوە کە ئەگەر رێکەوتی یەکەم راست بێت، تیۆدۆرا ٤٧ساڵ ژیاوەو بەلاَم ئەگەر رێکەوتی دووهەمیان راست بێت لەتەمەنی چل ساڵیدا مردووە. تیۆدۆرا کچی کابرایەکی راهێنەری ورچ بوو کە لە سێرکی قوستەنتەنییە لە پرۆگرامێکی نمایشیدا کەوتە بەر پەلاماری ورچێکی وەحشیو گیانی لە دەست دا. تیۆدۆرا لەکاتی مردنی باوکیدا ٧ساڵان بووەو دایکی کە توانای دابینکردنی بژێوی ئەوو خوشکە گەورەکەی نەبوو، هەردووکیانی بردە یەکێك لە سۆزانی خانەکانی قوستەنتەنییە. خاوەنی تیاترۆیەکی گەڕەکی بەدناوی شار کە ژنە شانۆکارەکانی لەنێو سۆزانیەکان هەڵدەبژارد، بە بینینی جوانی بێ وێنەی

1-Theodora
2-Byzance
3-Harlot Queen
4-Saint Theodora



ئەو دوو خوشکە، ئەوانی هێنایە سەر تەختەی شانۆو بەشداری ئەوان لەو شانۆیەدا سەرنجی هەمموو کەسی بۆ لای خۆی راکێشا. ئیمپراتۆری بیزانس یان رۆمای رۆژهەلاَت لەسەرەتای سەدەی شەشەمی زایینیدا بە یەکێك لە دوو هێزی گەورەی جیهان دەژمێردراو جگە لە ئیمپراتۆری ساسانی لە رۆژهەلاَت هاوتایەکیتری نەبوو. ئیمپراتۆری بیزانس لەسەرەتای سەدەی چوارەمی زایینیدا بەدەستی کۆنستانتین[5]، ئیمپراتۆری رۆما کە دواتر نازناوی کۆنستانتینی یەکەم یان کۆنستانتینی گەورەی وەرگرت دامەزراو هەر ئەویش بوو کە پێتەختی ئیمپراتۆری رۆمای لە شاری رۆما گواستەوە شاری "بیزانتیۆم"[6] لە جێگای ئێستای شاری ئیستانبوڵو دوای بەرفراوان کردنو دووبارە بنیاتنانەوەی ئەم شارە لەساڵی ٣٢٠ی زایینیدا ناوی نا "کۆنستانتینۆپۆل"[7] یان شاری کۆنستانتین کە بە عەرەبی قۆستەنتەنییەی پێدەوترێ.

رۆماو قۆستەنتەنییە لەکاتی ئیمپراتۆری کونستانتینی یەکەمدا لەژێر چەتری یەك دەسەلاَتدا بوونو رۆما رازی ببوو کە قۆستەنتەنییە وەك پێتەختی نویێ ئێمپراتۆری رۆم دیاری بکرێ. بەلاَم دوای مردنی کۆنستانتین لەساڵی ٣٣٧ی زایینیدا لەنێوان کوڕەکانی کە هەرکامیان لەسەر بەشێکی ئەو ئیمپراتۆریەتە گەورەیە حکوومەتیان دەکرد، ناکۆکی ساز بوو تا وای لێهات لە کۆتاییەکانی سەدەی چوارەمی زایینیدا بە فەرمی ئیمپراتۆری رۆما دابەش بوو بە دوو بەشی رۆژهەلاَتو رۆژئاوا. بەشی رۆژئاوا هەمان ئیمپراتۆریەتی پێشوو بوو. رۆما لە درێژایی سەدەی پێنجەمی زایینیدا چەند جارێك تووشی هێرشی خێڵە دڕندەکانی گاتو ڤاندالْ هاتەوەو لە کۆتاییەکانی ئەو سەدەیە بە تەواوی کەوتە ژێر دەسەلاَتی ئەوان. بەلاَم بیزانس لەبەرامبەر دەست درێژی ئەم خێلانە خۆی بەدەستەوە نەداو چوارچێوەی دەسەلاَتی ئیمپراتۆری بیزانس لەسەرتاکانی سەدەی شەشەمی زایینیدا، تەواوی نیمچە دوڕگەی بالکانو ئاسیای بچووك (توورکیەی ئەمڕۆ)و کەنارەکانی رۆژهەلاَتی مەدیتەرانە (دەریای سپی ناوەڕاست) (سوریە، لوبنانو فەلەستین)و باکوری رۆژهەلاَتی ئەفریقیای (میسر، لیبی) دەگرتە خۆ. کاتێك کە تیۆدۆرا لە شانۆکانی گەڕەکی بەدناوی قۆستەنتەنییە سەمای دەکردو لە سۆزانی خانەکانی ئەو شارەدا میوانداریی لە سۆزانیەکانی دەکرد، قۆستەنتەنییە بە یەکێك لەجوانترینو پڕ

5-Constantine
6-Byzantiume
7-Constantinopole





حەشیمەتترین شارەکانی ئەوکاتی جیهان بە هەژمار دەهات. باوەڕ هێنان بە ئایینی مەسیح لەلایەن سەرکردەکانی بیزانسو مەیل و چوونی زۆربەی هاوولاّتیان بۆ ئەو ئایینە، شاری قۆستەنتەنییەی کردبووە گرینگترین ناوەندی ئایینی مەسیح لە جیهانداو بە کەنێسە گەورەکانی کە لە هەرلایەکی ئەو شارە دروست کرابوو، دیمەنێکی نوێو سەرنج ڕاکێشی هەبوو. داگیرکرانی ڕۆما لەلایەن خێڵەکانی گاتو ڤاندالّ بووە هۆی ئەوە کە زۆربەی هونەرمەندانو تەلارسازانی هەرە باشی ڕۆماش بۆ بیزانسو پێتەختەکەی کۆچ بکەنو تەواوی توانایی‌و هونەری خۆیان لەو شارەدا بخەنە بەر چاوی خەلّك. ئیمپراتۆری بیزانس لەو بەروارەدا "ئاناستاسیۆس"[8]ی ناو بوو کە لەساڵی ٤٩١ی زایینی‌دا لەسەر تەخت دانیشتبووو حکوومەتێکی بەهێزی بنیات نابوو. بۆ بەرنگار بوونەوەی ئەو مەترسییەی کە لەلایەن ئیمپراتۆری ساسانی (لە دەورانی پادشایەتی قوباد کوڕی ئەنوشیروان)و خێڵە وەحشییەکان لە باکورو دەسەلاّتی نوێی گاتەکان لە ڕۆماوە هەڕەشەی لێدەکرد، هێزێکی شەرکەری ئامادەی ڕێك خستبوو. لەنێوان سەرکردەکانی ئەو هێزانە پیاوێکی نەخوێندەوار بەلاّم بەجەرگو بەخۆوە بەناوی "ژۆستین"[9] دەبینرا کە لە بۆلگاریاوە هاتبووە قۆستەنتەنییەو زیاتر لەهەموو سەرکردەکانی ڕۆمی‌و یۆنانی لەلایەن ئیمپراتۆرەوە گرینگی پێ‌دەدرا. ژۆستین دوای ئەوە کە بوو بە سەرکردەی گاردی ئیمپراتۆری، برازاکەی بەناوی "پیتێرساباتیۆس"[10] کە لەدەشتەکای بۆلگاریا شوانی دەکرد، هێنایە قۆستەنتەنییەو چەند مامۆستایەکی بۆدانا تا فێری زانستو خوێندەواری بێتو وەك سکرتێرێك بۆ نووسینو خوێندنەوەی نامەکانی خزمەت بکات. ماوەیەکی دواتر ژۆستین برازاکەی وەك کوڕی خۆی قەبوولّ کردو ناوی نا "ژۆستینیان"[11]. لەو کاتەدا هیچ کەسێك چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد کە یاری چارەنووس سەربازێکی نەخوێندەواری بۆلگاری بکاتە ئیمپراتۆرو ناوی زڕ کوڕەکەی وەك یەکێك لەگەورەترین ئیمپراتۆرەکانی مێژووی هەزارو دووسەد ساڵەی بیزانس بە زیندووی بهێڵێتەوە. وتنی ئەو چەند دێڕەی پێشوو بۆ ڕوون کردنەوەی داستانی تیۆدۆرا لەم لایەنەوە پێویستە کە خوێنەر سەرەتا بارودۆخو ئاستی ئیمپراتۆری بیزانس لە کاتێکدا کە ژنێکی سۆزانی ڕێگای خۆی بۆ نێو کۆشکی ئیمپراتۆری دەکاتەوە، بزانێ‌و لە لایەکی‌ترەوە شارەزای پێشینەو ڕابردووی پیاوێك بێت کە دواتر لە پلەی ئیمپراتۆریەتدا ئەو ژنەی کردە شەریکی

8-Anastasius
9-Justin
10-Peter Sabbatius
11-Justinian



ژیانو حکوومەتی خۆی. ئێستاش دەگەڕێینەوە سەر ژیانی تیۆدۆرا لە سۆزانی خانەکانی قۆستەنتەنییەو مێژووی بیزاسیش لە گێڕانەوەی ژیانی ئەودا درێژەی دەدەین. تیۆدۆرا بەو جوانی‌و عیشوەو تواناییە زۆرەی کە لە بەدستهێنانی خۆشەویستی‌و ڕازی کردنی پیاوان هەیبوو، زۆر زوو بوو بە ئافرەتی بە ناوبانگی شارو ئەویینداری زۆری پەیدا کرد. ناسیاوی ئەو لەگەلّ ژنێك بەناوی"ئانتۆنینا"[12] کە دەلالّی خۆشەویستیی دەولّەمەندانو گەورەپیاوانی شار بوو، کاردروستایی ناسیاوی‌و ڕێگای هاتو چۆی تیۆدۆرای لەگەلّ خاوەن سامان و پلەو پایەکانی ئەوکاتی بیزانس خۆش کرد. یەکێك لەو گەورە پیاوانە بەناوی "ئێکێبۆلۆس"[13] کە لەلایەن ئیمپراتۆرەوە بۆ فەرمانڕەوایی بەشی ئافریقاییی بیزانس دەست نیشان کرابوو، ئاشقی تیۆدۆرا بووو پێشنیاری زەماوەندی پێکرد. تیۆدۆرا کە تینووی پلەو پایە بووو پێیوابوو کە لە پلەی ژنی سەرکردەیەکدا ژیانێکی خۆشو ڕازاوەی دەبێت، ئەو پێشنیارەی قبوولّ کردو لەگەلّ ئێکێبۆلۆس چووە بەندەری "پێنتاپۆلیس"[14] کە بێنغازی ئێستایە. ژیان لەقەسری حاکم لە پێنتاپۆلیس بە پێچەوانەی خەیالّی پێشووی تیۆدۆرا دلّگیرو خۆش نەبوو. تیۆدۆرا کە لە ژیانی شارێکی جوانو پڕ دەنگ هاتبووە ژیانێکی بێ‌دەنگو خامۆشی کۆشکێك کە پتر لە بەندیخانە دەچوو، زۆر زوو لەو پێگە نوێیەی خۆی وەڕەز بووو بۆ هەلاّتن لەو ناخۆشیە سکرتێری حاکمی فریودا کە پیاوێکی لاوو جوان بوو. بەلاّم ئەو پێوەندییە زۆری نەخایاند. ئێکێبۆلۆس لە ڕێگای یەکێك لە خزمەتکارەکانی قەسر لەو پێوەندییە ئاگادار بۆوەو ئەو پیاوە جوانەی لە بەر چاوی مولّەق وەستاوی تیۆدۆرا خستە ناو قەلّپەزی پلّینگەکان. تیۆدۆرا دوای ئەم ڕووداوە بڕیاری هەلاّتنی‌داو لە ئاکامدا لە دەرفەتێکی باش لە ڕێگای بەرتیل دان بە یەکێك لە پاسەوانەکان، بە جلوبەرگی خۆمالّی‌و ڕەسەنی ئەم شوێنە لە کۆشك هەلاّتو سواری پاپۆڕێك بوو کە دەیەویست بچێتە ئەسکەندەریە. کەشتیوانی ئەو پاپۆڕە هەم دەستڕێژی کردە سەری‌و هەم لەکاتی دابەزینیش لە بەندەری ئەسکەندەریە، ئەو ئالّتوونو گەوهەرانەی لێدزی کە لە قەسری حاکم لەگەلّ خۆی هێنابووی. تیودۆرای غەریبو بێ‌پارە چووە ناو ئەسکەندەریەو لەو هەل ومەرجەدا جگە لەپەنا بردن بۆکاری پێشووی خۆی، ڕێگایەکی‌تری لەبەردەمدا نەبوو. بەلاّم هەر لە ڕۆژەکانی یەکەمدا بەهۆی شەڕێك کە لە گەڕەکی ناو زراوی شار

12-Antonina
13-Ekebolus
14-Pentapolis





رووبدا دەستبەسەریان کردو داخێکیان بە پشتییەوە نا کەتا کۆتایی ژیانی شوێنەکەی هەر لەسەر پشتی مابوو. تیۆدۆرا دوای ئەو بەسەرهاتە پەنای بردە بەر کەنیسەو دوای دان پێدانانو تۆبەو خۆشوشتن، جلکی سپی راهیبەکانی لەبەر کرد. بەلاّم هێمنیو ژیانی یەك دەستی کەنیسەش بۆ تیۆدۆرا تاقەت پڕووکێن بووو لە یەکەمین دەرفەتدا کە بازرگانێکی دەوڵەمەندی "ئانتیۆك"[15] ئامادە بوو سەرپەرشتی بکات، کەنیسەو جلکی راهیبەیی وەلانا. بەلاّم ئەو بازرگانە دەوڵەمەندەش کە بۆ خۆشڕابواردنی خۆی لە ماوەی مانەوەی لە ئەسکەندەریە هەڵیبژارد بوو، دوای ئەوەی کە تیۆدۆرا لێی دووگیان بوو ئەوی بەجێهێشت. تیۆدۆرا بۆ بەدوادا گەڕانی ئەو پیاوە بەرەو ئانتیۆك وەڕێکەوت. بەلاّم کاتێك کە گەیشتە ئەو شارە، ئاگادار کراوە کە بازرگانەکە کەمێك دوای گەڕانەوەی بۆ شار مردووە. تیۆدۆرا تا کاتی دانانی منداڵەکە لە ئانتیۆك مایەوەو ناوی کوڕەکەی نا "جان"و دایە دەستی نەنکیو بەرەو قۆستەنتەنیيە وەڕێکەوت. تیۆدۆرا لەساڵی ٥١٩ی زایینی گەڕایەوە قۆستەنتەنیيەو ئەگەر رێکەوتی لەدایکبوونی ٥٠١ی زایینی بێ لەو کاتەدا ١٨ ساڵان بوو. یەك ساڵ پێش گەڕانەوەی تیۆدۆرا بۆ قۆستەنتەنیيە ئاڵ وگۆڕێکی گرنگ لە پێتەختی ئیمپراتۆری بیزانس هاتبووە ئاراوە. ئیمپراتۆر ئاناستاسیۆس لەساڵی ٥١٨ی زایینیدا مردو لە ئەنجامی ئەو گێرەوکێشەیەی کە لەسەر جێنشینی ئەودا سەری هەڵدابوو، ژۆستین سەرکردەی گاردی ئیمپراتۆری کودتای کردو خۆی وەك ئیمپراتۆر ناساند. ژۆستین لە خەزێنەی ئیمپراتۆری کۆچکردوو پتر لە سەدوپەنجا کیلۆی زێڕ دۆزییەوەو دوای دەستبەسەر داگرتنی ئەو سامانە زۆرو زەوەندە هەروەك بەڵێنی دابوو بۆ ئاسایشو هێمنی خەڵکی خەرج کرد کە ئەمەش بووە هۆی جێگیربوونی حکوومەتەکەی. بەلاّم ژوستین کاتێك کە تاجی ئێمپراتۆری بیزانسی لەسەرنا پیر ببووو هەموان دەیانزانی کە درەنگ یان زوو زڕ کوورەکەی جێگای ئەو دەگرێتەوە. ئەو شوانەی پێشووی دەشتەکانی بۆلگاریا ئێستا پیاوێکی زاناو خوێندەوارەو بە شەریکی راستەقینەی دەسەلاّتی مامو زڕباوکی خۆی دەژمێردرا. ژوستینیان کاتێك کە بوو بە جێنشینی ئیمپراتوری بیزانس، ٣٢ ساڵی تەمەن بوو بەلاّم هێشتا ژنی نەهێنابوو. داستانی ناسیاری ئەو لەگەڵ تیۆدۆرا پرسیارێکی مێژووییە، لەبەر ئەوەی هیچکام لە مێژوونووسانی ئەوکات  لەسەر ئەم بابەتە نەدواون کە ژۆستینیان لەکاتی جێنشینی خۆیدا هات وچۆی گەڕەکی بەدناوی شاری کردبێ یان تیۆدۆرا لەرێگای ئانتۆنینای دەلاّلی عەشقی گەورە پیاوانی قۆستەنتەنیيە پێی ناسێندرابی. تیۆدۆرا دوای گەڕانەوە

15 Antioch



بۆ قۆستەنتەنیيە دووبارە دەستی بە کاری شانۆ کردەوەو هاوکات لەگەڵ ئەوەش درێژەی بە کاری پێشووی خۆی واتە لەشفرۆشی دەدا. گێڕانەوەیەك سەبارەت بە چۆنیەتی ئاشنایی ژووستینیان لەگەڵ تیۆدۆرا ئەوەیە کە جینشین لەکاتی گەڕانێکی شەوانەدا ئەوی لەسەر تەختەی شانۆ بینیوەو دواییش بانگهێشتی کردووە بۆکۆشکی ئیمپراتۆری، بەلاّم داستانێك کە لەلایەن مێژوونووسی دەرباری بیزانس (پرۆکۆپیۆس)[16] گێردراوەتەوە ئەوەیە کە تیۆدۆرا بە راسپاردەی یەکێك لە ناسیاوانی ژووستینیان بۆ سکالاّ دەچێتە لای ئەوو ژۆستینیانیش هەرلە چاوپێکەوتنی یەکمدا ئاشقی دەبێت. تیۆدۆرا هەرچۆنێك بێت دەچێتە دەرباری ئیمپراتۆریو لە ماوەیەکی کورتدا وادەچێتە ناو دڵو رووحی ژۆستینیانەوە کە جێنشینی بیزانس هەست دەکات بە تەواوی هەستییەوە ئەڤیندارو هۆگری ئەو بووە. ژۆستینیان داوا لە تیۆدۆرا دەکات کە واز لەکاری شانۆ بێنێتو لە ماڵێکدا کە لە نێزیکی کۆشکی ئیمپراتۆریو لە کەناری دەریای مەرمەرە درووستی دەکات، نیشتەجێ بێت. ئەو خانووە رێگایەکی ژێرزەویی بۆ جێگای نیشتەجێ بوونی ژۆستینیان لە کۆشکی ئیمپراتۆری هەبووەو تیۆدۆرا هەموو شەوێك لەو رێگایەوە دەچێتە سەر جێگاخەوی ژۆستینیان. پرۆکۆپیۆس، مێژوونووسی بەناوبانگی بیزانس کە پێشتر ئاماژەی پێکرا لە ژیاننامەی تیۆدۆرادا دەنووسێ کە ئەو ژنە نەتەنیا جوانیو سەرنج راکێشییەکی لەرادەبەدەری هەبوو، بەڵکوو لەئاکامی شانۆکاریو نواندنی رۆڵی جۆراوجۆر لەسەر تەختەی شانۆ دەربڕینی بەهێزو کارتێکەری قسەی زۆر بەهێز بووو ژۆستینیان کە هێشتاش هەستی شوانکارەیی مابوو، پتر فریوی دەربڕینو شێوەی قسەکردنی ئەوی خوارد بوو. تیۆدۆرا کەم کەم لە مێشکی رۆ کرد کە بۆ حکوومەت کردن بەسەر خەڵکو زاڵ بوون بەسەریاندا سەرەتا دەبێ کۆمەڵگاکەی بناسێتو خۆی باشترین کەسێك بوو کە دەیتوانی ژۆستینیان لەو شتەی کە لە ناخی کۆمەڵگادایە ئاگادار بکاتەوە. لەو کاتانەدا کاری تیۆدۆرا ئەوە بوو کە رۆژانە دەچووە شوێنە جیاجیاکانی شارو لەشوێنە گشتییەکان ئامادە دەبوو و شەوانە ئەو شتانەی کە دەیبینیو دەیبیست بۆ ژۆستینیانی دەگێڕاوە. بەواتایەکیتر تیۆدۆرا کاری  ئەمرۆکەی هێزەکانی هەواڵگریی  بۆ حکوومەتی ئەوکات دەکردو نووسەرێکی فەڕەنسی بە حەق بە یەکەمین یاساوڵی هەواڵگری داناوە. تیۆدۆرا دوای ئەوە کە بە تەواوی ژۆستینیانی داگیر کرد، داوای لێکرد کە بە فەرمی پێکەوە زەماوەند بکەن.  لەم بارەیەوە ژوستینیان بە تەواوی رازی بوو بەلاّم چەند لەمپەرێکی گشتی لەسەر رێگای ژیانی هاوبەشی ئەو لەگەڵ تیۆدۆرا هەبوو. یەکەمینو گرنگترین

16-Procopius





لەمپەر، دژایەتی کردنی مەلیکە "ئۆفێمیا"[17] هاوسەری ژۆستین لەگەڵ ئەو زەماوەندە بوو. کەنێسەو سووپاش دژی ئەو زەماوەندە بوونو جگە لە مانەش، داب‌و نەریت‌و رەوشتی گشتی‌و ئەو یاسا نەنووسراوانەی کە بەسەر کۆمەڵگای ئەوکاتی بیزانسدا حکوومەتیان دەکرد، دژی زەماوەندی ئیمپراتۆری داهاتووی بیزانس بوون لەگەڵ ژنێکی شانۆکار کە ناوبانگی لەشفرۆشی هەبوو. بەلاّم لەروانگەی تیۆدۆراوە لابردنی هەموو ئەو لەمپەرانە کارێکی سادەوساکار بوو. تیۆدۆرا بۆ ئەوەی کە لە کۆمەڵگادا بە دیمەنێکی باشترەوە خۆی بنوێنێ، دوای دان پێدانان بە تاوانەکانی رابردووو تۆبە کردنو پارانەوە لەبەرامبەر ئەسقۆفی گەورەی قۆستەنتەنی‌یە، بەردەوام لە رێورەسمی نوێژو دووعا خوێنی‌یەکانی کەنیسەی شار ئامادە دەبوو. یارمەتییەکی دارایی زۆری دەکرد بە کەنێسە تا وای لێهات کە ئەسقۆفی گەورەو قەشەکانی قۆستەنتەنی‌یە لایەنگرییان لێدەکرد. هەڵبەت نووسەرانی وەك "ئاندۆرۆ-ئیوارت" لێکۆلەری ئینگلیزی کە لە روانگەیەکی نێگەتیڤەوە لە ژیانی تیۆدۆرایان کۆڵیوەتەوە، لەو بارەشەوە چەند بووختانێکی بە ناحەقیان لێداوەو نووسیویانە کە تیۆدۆرا بە کەڵك وەرگرتن لە راکێشانی سێکسی، ئەسقۆفی گەورەی قۆستەنتەنی‌یەی بەرەو خۆی راکێشاوەو لەماڵەکەی خۆیدا لەتەنیشت کۆشکی ئیمپراتۆری پێشوازی لێ کردووە[18]. پشتیوانی کەنێسە لە تیۆدۆرا دژایەتیی سەرکردەکانی سوپای بۆ زەماوەندی ژۆستینیانو تیۆدۆرا پووچەڵ کردەوەو لەو کاتەشدا مەلیکە ئۆفێمیا بەهۆی نەخۆشییەکی درێژخایەنەوە مرد. بەمردنی ئۆفێمیا، رازی کردنی ئیمپراتۆر ژۆستین بۆ زەماوەندی تیۆدۆراو ژۆستینیان کارێکی دژوار نەبوو. ئیمپراتۆر بۆ ئەوەی کە رێگە لەو دژایەتییە چاوەڕوانکراوانە بگرێت کە لەکاتی زەماوەندی جێنشینەکەی دەکرێتە سەریان، ئەمەش لەگەڵ ژنێك کە پێشینەو ناوبانگی لەشفرۆشی هەبوو، بە نووسراوە رەزامەندی خۆی لەسەر ئەو زەماوەندە راگەیاند، بەلاّم بە جێنشینەکەی راسپارد کە جێژنی زەماوەندی ئەوان زۆر سادەو ساکار بەرێوە بچێت. ئیمپراتۆری پیر کە نەخۆش‌و لەلێواری مردندا بوو، لەوە دەترسا کە بەرێوەچوونی جێژنی بووکێنی ژوستینیانو تیۆدورا بەشێوەیەکی تێرو تەسەل کاردانەوەیەکی خراپی لە کۆمەڵگادا هەبێت‌و پێگەی جێنشینەکەی لەسەرەتاکانی بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات لەرزۆك بکات. ریورەسمی زەماوەندەکە هەر بەو شێوەیەی کە ئیمپراتۆر ویستبووی لەوپەری سادەییدا بەرێوە چووو دوای تەواو کردنی رێورەسمی ئایینی لە کەنێسە، بە جێژنێکی تایبەتی‌و کورت لە کۆشکی

17-Euphemia

18-A Ewaar-The World's wiekednest women Odham Books.P82



ئیمپراتۆری قەناعەت کرا. بەلاّم پەیماننامەیەك کە لە رەوتی ئەو رێورەسمەدا لەنێوان ژۆستینیانو تیۆدۆرا واژۆ کرا، پتەوترینو بەنرخترین پێوەندی ژنو مێردایەتی بوو کە تا ئەو رێکەوتە لەنێوان ژنو مێردێکدا بەسترابوو. لەو پەیماننامە ژنو مێردایەتی‌و ژیانە هاوبەشییەدا، ژۆستینیان بەڵێنی دابوو کە هاوسەری لە هەموو شتێکداو تەنانەت لەدەسەلاّتیشدا هاوبەش بکات. رێورەسمی زەماوەندی ژۆستینیانو تیۆدۆرا لە بەهاری ساڵی ٥٢٧زایینیدا ئەنجام درا. لەو رێکەوتەدا ژۆستینیان ٤٠ساڵو تیۆدۆرا ٢٦ ساڵی تەمەن بوو. (ئەگەر رێکەوتی لەدایك بوونی ٥٠٨ی زایینی بێت)[19]. لە هاوینی ئەوساڵەدا ئێمپراتۆر ژۆستین مردو ئامادەبوونی تیۆدۆرا لە رێورەسمی بەخاك سپاردنی ئێمپراتۆر، رەسمیەتی دا بە پێگەی نوێی خۆی وەك هاوسەری جێنشینی ئیمپراتۆری کۆچکردوو.

بەلاّم تیۆدۆرا بەو رادەیە رازی نەبووو دەیەویست هەمووان بزانن کە ئەو لەوە بەدواوە لەکاری حکوومەت‌و دەسەلاّتدا شەریکی ئێمپراتۆری نوێیە. جێژنی تاج لەسەر نانی ئێمپراتۆری نوێ کە دوای بەرێوە چوونی رێورەسمی ماتەمینیی ئێمپراتۆری کۆچ کردوو بەرێوە چوو، بە باشترین دەرفەت بۆ ئەم کارە دەژمێردرا. لەجێژنی تاج لەسەرنانی ئێمپراتۆر ژۆستینیان کە لەشوێنی سێرکی قۆستەنتەنی‌یە بەرێوە چوو، زیاترلە شەست هەزارکەس بەشدارییان کرد. ئەو جێژنە بەشکۆیە کە تا ئەورێکەوتە هاوشێوەی لە قۆستەنتەنی‌یە نەبینرا بوو، لە راستیدا جێژنی تاج لەسەرنانی هاوبەشی ژۆشتینیانو تیۆدۆرا بوو. ژۆستینیان هەر وەك لەکاتی زەماوەندی لەگەڵ تیۆدۆرا بەڵێنی دابوو، تیۆدۆرای لە هەموو دەسەلاّتەکانی ئێمپراتۆری هاوبەش کردو نازناوێکی لەسەر دانا کە لەسەرچاوە ئینگلیزییەکاندا بە "ئێمپراتۆری هاوبەش"[20] یان شەریکی ئێمپراتۆری وەرگێردراوەتەوە. خەڵکی قۆستەنتەنی‌یەو بیزانس لەسەرەتادا لەو گومانەدا بوون کە ژۆستینیان بۆ بەستنی دەمی نەیارانو پتەوکردنی پێگەی تیۆدۆرا وەك شاژنی بیزانس، نازناوی شەریکی ئێمپراتۆری پێداوەو شاژن بەکردەوە رۆڵێکی ئەوتۆی لە بەرێوەبردنی‌کاروباری دەسەلاّتدا نابێت. بەلاّم دوای تێپەڕ بوونی ساڵێك بۆ هەمووان روون بۆوە کە تیۆدۆرا نە تەنیا شەریکی ئێمپراتۆرە بەڵکوو بەکردەوەش زاڵە بەسەریداو هیچ کارێك لەناو دەسەلاّتی ئێمپراتۆریەتی بیزانسدا بێ‌راوێژو بەباش زانینی ئەو ئەنجام نادرێ.

١٩- ئەگەر رێکەوتی لەدایکبوونی تیۆدۆرا ٥٠٨ی زایینی بێت، ئەو لەکاتی زەماوەندا تەمەنی ١٩ ساڵی بووە، بەلاّم رێکەوتی٥٠١ لە راستی نێزیکترە.

20-Co-Emperor





هێدی هێدی لەجیاتی ئەوەکە تیۆدۆرا بە شاژنو هاوسەری ئیمپراتۆر ناو بەرن، بە ئیمپراتۆریان دەگووت "مێردی شاژن" کە نیشانەی سووکایەتی پێکردنو زاڵ بوونی شاژن بە سەرمێردەکەی بوو. ئەگەر تیۆدۆرا لە رازاوە پەرەستیدا زێدەڕۆیی نەکردبوایەو بەگێڕانی بۆنەو ئاهەنگی جۆراوجۆر لە بەرچاوی خەڵك خۆنوێنی نەکردبوایە، رەنگە کۆمەڵگاش کەم کەم دانی بە پێگەو پلەی نوێی ئەو دابنابوایەو رابردووی ناحەزو سەرشۆڕانەی ئەویان لە بیر بکردایە، بەڵام تیۆدۆرا بۆ قەرەبوو کردنەوەی گرێیەکانی منداڵیو مێرمنداڵی، دەیەویست هەرچی زووتر دەسەڵاتو سامانو شکۆی ژیانی خۆی بە خەڵك بنوێنیو وانیشان بدا کە دەسەڵاتداری سەرەکی ئەوە. تیۆدۆرا لەو کارەدا تا ئەو جێگایە رۆیشتە پێشێ کە لە بۆنەو خوانە فەرمییەکاندا، دەسەڵاتدارانی حکوومەتو سەرکردەکانی سوپاو گەورە پیاوانی دەوڵەتی ناچار دەکرد کە لاقیماچ بکەنو لە سووکایەتی کردن بەگەورە پیاوانو کاربەدەستان زیاتر لە هەموو خۆشیو سەرگەرمییەك تامی وەردەگرت.



**تەنیا وێنەیەك کە لە تیۆدۆرا ماوەتەوە، ئەم وێنەیە لەسەر دیواری یەکێك لە کەنیسەکانی دەورانی ئیمپراتۆریەتی بیزانس کێشراوەتەوە**



یەکەم دژکردەوەی خەڵکی قۆستەنتەنییە لەبەرامبەر زێدەرۆییەکانی تیۆدۆرا، گێڕانەوەی داستانەکانی رابردووی ژیانی ئەوو پەرەپێدانی پرۆپاگەندە سەبارەت بە درێژە پێدانی ژیانی گەندەڵی شاژن لە چوارچێوەی کۆشکی ئیمپراتۆری بوو. کاتێك ئەو شتانە بە گوێی تیۆدۆرا گەیشت، لە نێو خەڵکدا چەند کەسێکی کردە سیخوڕو یاساوڵی هەواڵگریو کەم کەم رێکخراوێکی رێكو پێکی بۆ ئەو کارە دامەزراند کە رەنگە یەکەمین رێکخراوی هەواڵگری مێژوو بێت. تیۆدۆرا لەرێگای شۆفارەکانی، لەفاکتەرو هۆکارەکانی نارازی بوونی رۆژ لە دوا رۆژ زیاتری خەڵك ئاگادار بووو هانی مێردەکەی دا کە گرووپێك لە زانایانو شارەزایانی جۆراوجۆر بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتە گشتییانە بانگهێشت بکات. ئەو گرووپە هۆکاری سەرەکی نارازی بوونی خەڵکیان لە نەبوونی رێکوپێکی لە یاساو دەست درێژی پیاوانی حکوومەت بۆ سەر مافو نامووسی خەڵك دا دەبینیو ئەرکی کۆکردنەوەو نووسینەوەی یاسایەکیان گرتە ئەستۆ کە مافو ئەرکی خەڵکی بەرامبەر بە یەکتریو بەرامبەر بەدەوڵەت دیاری دەکرد. لەساڵی٥٢٩ی زایینیدا کە سەرەتای ساڵوەگەڕی سێهەمین ساڵی ئیمپراتۆریەتی ژۆستینیان بوو، یاسای مافە شارستانییەکان راگەیاندرا کە بە یەکەمین یاسا لە جۆری خۆی لەجیهان دەژمێردرێت،و بەناوی یاسای ژۆستینیان ناوبانگی دەرکرد. ئەو یاسایە کەبنەمای یاسا شارستانییەکانی ئەمڕۆی جیهانە، پتر لە هەموو داگیرکارییەکانی ژۆستینیان بە درێژایی ٣٧ ساڵ ئیمپراتۆریەت بووە هۆی ناوبانگو مانەوەی ناوی ئەو لەمێژوودا. ژمارەیەك لەسیخوڕانی تیۆدۆرا راپۆرتی باری خراپی سۆزانیەکانی قۆستەنتەنییەیان بەتیۆدۆرا راگەیاندو تیۆدۆراش بۆ رزگار کردنی هاوکارەکانی پێشووی خۆی لەو ژیانە مەرگەساتیە، بڕیاریدا ئەوان بخاتە ژێر سەرپەرشتی خۆی. بە فەرمانی مەلیکە تیۆدۆرا کەنێسەیەکیان بۆ نیشتەجێبوونی ٥٠٠ سۆزانی شار لە تەنیشت کەناری بۆسفۆڕ تەرخان کردو لەو کەنێسە گەورەیە کە نێویان نا "پەشیمانگە"، خواردنو جلوبەرگی باشیان بۆ سۆزانیەکانی دیاری کردو هەرکامیان کە بنەماڵەیان هەبوو لەگەڵ پێدانی چەند سکەیەك وەك یارمەتی، بەرێیان کردنەوە بۆ بنەماڵەکانیان. هەموو سۆزانیەکان لە رێورەسمێکی ئایینیدا تۆبەو داوای لێخۆشبوونیان لە تاوانەکانی رابردوویان کردو شاژن بۆ ئەو کەسانەی کە بنەماڵەیان نەبوو مێردی بۆ پەیدا کردنو لە جێژنی بووکێنییاندا بەشداری کرد. لەگەڵ ئەوەشدا تیۆدۆرا سەبارەت بەو دەنگۆو قسە خراپانەی کە لە دەوروبەری بلاو دەبۆوە، هەستیاری لەخۆی دەردەخستو یاساوڵە

هەواڵگرەکانی تیۆدۆرا ئەو کەسانەی کە قسەی خراپیان سەبارەت بە ژیانی رابردووو ئێستای شاژن دەکرد، دەبیندەوەو دەستبەسەریان دەکردن. هەواڵی بەدوادا گەڕانو گرتنی ئەو کەسانەی کە قسەی خراپیان سەبارەت بە شاژنە دەکردو پرۆپاگەندەی لەناوچوونی ئەو کەسانە، زۆر زوو لەشاری قۆستەنتەنی‌یە بلاّو بۆوەو کەم کەم دمەکانی داخست. بەلاّم ئەو شێوازە ریشەکانی نارەزایەتیی کە چەند ساڵ دواتر بووە هۆی راپەڕینی گشتی ئاودێری کرد. تیۆدۆرا نەیدەتوانی دەست لە پاوانخوازیو رازاوە پەرەستییەکانی خۆی هەڵگرێ. دروست کردنی کۆشكو بالاّخانەی نوێو رازاندنەوەیانو راسپاردنی جلوبەرگو گەوهەری بەنرخ، خەرجی قوورسی هەڵدەگرت کە بەشێوەی باج لەخەڵك وەردەگیرا. مەیلی جیهانگیریی ژۆستینیانو ئامادە کردنی هێز بۆ لەشکر کێشی بۆ رۆژهەلاّتو رۆژئاواش لەسەر رازاوەپەرەستیو کۆشکسازی تیۆدۆرا زیاد ببوو کە گووشاری لەسەر خەڵکی هەژار تاقەت پرووکێن دەکرد. یاساوڵە هەواڵ گرییەکانی شاژنیش کە پەشۆکاویو نارەزایەتی ئەویان لەو راپۆرتە دڵتەزێنانە بینیبوو، بۆ پاراستنی پێگەی خۆیان کەمتر لەو جۆرە هەوالاّنەیان پێرادەگەیاندو هەر بەم هۆیەشەوە ناوەرۆکی هەموو راپۆرتەکانیان کەمو زۆر رازی بوونو ئاسوودەیی خەڵکی تێدا رەنگی دابۆوەو ئەگەریش هەواڵی نارازی بوونی خەڵکی تێدابوایە دەیان خستە پاڵ چەند کەسێکی دیاریکراو. لەساڵی ٦٣١ی زایینی‌دا خراپی باری بەروبومو کەم بوونی خواردەنی کە بووە هۆی دابەش سازی هەندێك لە کەلو پەلی پێویست، نارەزایەتی خەڵکی پتر کردو باس نەکردنی ئەم بابەتە  لەلایەن یاساوڵە هەواڵ گرییەکان، ئێمپراتۆرو شاژنی خستە خەوی بێ‌ئاگایی. خەڵك نارازی بوونی خۆیان لەو بارە خراپە بە هۆنینەوەی شێعرو هۆنراوە دژی شاژن دەربڕی کە بە فاکتەری لەدەستدانی ئەقڵی ئێمپراتۆرو هۆکاری هەموو گیرو گرفتەکانی خۆیانیان دەزانی. یەکێك لەم هۆنراوانەی کە دم بەدم دەگەڕا بەو دێرە دەستی پێدەکرد کە "ئێستا ژۆستینیانی دلێر دیلی ژنێك بووە ..." رۆژی ١١ی ژانڤییەی ساڵی ٥٣٢ی زایینی بۆ یەکەمین جار لە شانۆیەکدا کە لەبەرامبەر ئێمپراتۆر و لە سێرکی گەورەی قۆستەنتەنی‌یە ئەنجام درابوو، چەند درووشمێك بە دژی ئێمپراتۆرو شاژن لەنێوان هەزاران کەس لە بینەران بەرز بۆوەو لە کۆتاییەکانی شانۆشدا هۆنراوەیەك کە هەزاران کەس دووپاتیان دەکردەوە، تەواوی پرۆگرامەکەی خستە ژێر پرسیار. ئەو هۆنراوەیە دژی شاژن بووو کەمو زۆر ئەم ناوەرۆکەی بووکە "تیۆدۆرا... تیۆدۆرا، ئەو رۆژانەت لەبیرە کە هەرکەسێك دەیتوانی بە سکەیەکی نیکل سوود لە جوانی وەربگرێ؟ و



ئێستاش ئەگەر ژۆستینیان بەرەڵات بکات نرخت لەوەش کەمتر دەبێت..." ژۆستینیان کە توانای بیستنی ئەو سووکایەتی پێکردنەی بە هاوسەری نەبوو، فەرمانی هێرش بردنە سەر بێژەرانی هۆنراوەکەو گرتنی هاندەرانی دەرکرد. ٧کەس لە بینەران کە بە هاندەری ئەوانی‌تر ناسران، دەست بە سەر کرانو ژۆستینیان فەرمانی‌دا کە بێ دادگایی کردنو لەبەر چاوی خەڵك لە سێدارە بدرێن. بەلاّم گوریسی ئەو دارەی کە بۆ بەڕێوەبردنی‌فەرمانەکە ئامادە کرابوو، بەهەڵکەوتو یان بە ئەنقەست رزی بووو هەموو تاوانبارەکان لە سێدارە کەوتنە خوارێو هەلاّتن. ئەو کەسانەی کە لەو رێورەسمەدا بەشدارییان کردبوو بەرەو کۆشکی ئێمپراتۆری وەرێکەوتنو لەنێوان رێگادا ئاگریان بەردایە زۆربەی ئەو بینا گەورانەی شار کە تایبەت بە دەوڵەمەندانو کاربەدەستانی دەوڵەتی. درووشمی ئەو جەماوەرەی کە خۆیان گەیاندبووە کۆشکی ئێمپراتۆری، ئەوە بوو کە "ئاگر لەو سۆزانی خانە زێڕینە بەردەن!". ژۆستینیان پەشۆکاوبوو نەیدەزانی لەبەرامبەر ئەو حەشیمەتە تووڕەو رق هەستاوە چ دژ کردەوەیەك ئەنجام بدات، بەلاّم تیۆدۆرا رێگای چارەسەری ئەو گرفتەی لە رووبەروو بوونەوەی خەڵكو قسە کردن لەگەڵ ئەوان دا دەبینیو لەسەر بەلەکۆنی قەسر بە خەڵکی گووت: ئەگەر دەست لە خۆپێشاندان هەڵگرن لەماوەی حەوتوویەکدا نانوخواردەمەنیی پێویستی ئەوان دابین دەکرێتو گوێ لە سکالاّکانیان دەگێردرێت. تیۆدۆرا هەڕەشەی ئەوەشی کرد کە ئەگەر خۆپێشاندانەکە درێژەی هەبێت ئەوە هێزە چەکدارەکان بلاّوەیان پێدەکەن. هەڕەشەی تیۆدۆرا لەو کاتەدا درۆ بوو، لەبەر ئەوەی گاردی ئێمپراتۆری ئامادەییو توانایی ئەوەی نەبوو کە بۆ پاراستنی کۆشکی ئێمپراتۆری لەبەرامبەر چەند هەزار خۆپێشاندەر خۆ راگرێ، بەلاّم ئەو هەڕەشەیە کاریگەر بووو حەشیمەتەکە وردە وردە بلاّوەیان کرد. بەڵێنی تیۆدۆراش سەبارەت بە دابینکردنی خواردەمەنی وچارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی خەڵك لە ماوەی حەوتوویەکدا لەراستی بەدوور بوو. لە بەر ئەوی نەدەتوانرا ئەو هەموو گیروگرفتە لەو ماوە کەمەدا چارەسەر بکرێتو ئەمجارەیان شۆڕشەکە بە توندو تیژیو بەرفراوانی‌یەکی پترەوە لەسەرتاسەری قۆستەنتەنی‌یەوە دەستی پێکردەوە. شۆڕشگێڕان بە درێژایی مانگی ژانڤییەی ساڵی ٥٣٢ی زایینی‌دا نیوەی شاری قۆستەنتەنی‌یەیان ئاگر تێبەرداو ژۆستینیان کە بە تەواوی خۆی دۆڕاندبوو بڕیاری هەلاّتنی دا. ژۆستینیان دەیەویست تەواوی زێڕو گەوهەرو شتە بەنرخەکانی کۆشکی ئێمپراتۆری لەگەڵ خۆی ببات. لەگەڵ ئەوەی کە شۆڕشەکە  لەسەرتاسەری شار درێژەی هەبوو، بەلاّم ئەو پاپۆڕانەی کە





له کەناری بسفۆڕ لەنگەریان گرتبوو لە سندوقی زێڕو گەوهەرو شتی بەنرخ کەڵەکە کران. لەو قۆناغە هەستیارەدا بوو کە تیۆدۆرا گەورەترین رۆڵی مێژوویی خۆی نواندو بە ئیرادەی خۆی رەوتی مێژووی جیهانی گۆڕی. لەکاتێکدا کە ژۆستینیان جگە لە هەڵاتن لەو ئاستەنگیەو رزگارکردنی گیانی خۆیو هاوسەری بیری لە هیچ شتێك نەدەکردەوە، تیۆدۆرا گەورە پیاوانی حکوومەتو سەرکردەکانی سوپای بۆ پێکهێنانی ئەنجوومەنێکی راوێژکاری لە کۆشکی ئێمپراتۆری بانگهێشت کردو لەو کۆبوونەوەیەدا وتارێکی بەرامبەر بە هاوسەرەکەی خوێندەوە کە لەریزی گرینگترین وتارەکانی مێژوودا تۆمار کراوە. لەو وتارەدا کە دەتوانین خاڵە بەر چاوەکانی لە ئینسکلۆپیدیا گەورەکانی جیهاندا لەژێرناوی مێژووی ئێمپراتۆریەتی بیزانس یان ژیانی ژۆستینیانوتیۆدۆرا بخوێنینەوە، تیۆدەرا بە ژۆستینیانی گووت: "ئەی ئێمپراتۆر...هەر پیاوێك تەنیا جارێك دەمرێو بۆ پاشایەك مردن لەوە باشترە کە لەسەرکار لاچێ یان دوور بخرێتەوە. ئەگەر دەتەوێ تەنیا گیانی خۆت دەرباز بکەی ئەوە پاپۆڕەکانو دەریاش کراوەیە، بەڵام ئەگەر ویستی منت دەوێ من لەگەڵ ئەو قسەیەی پێشینیان هاوڕام کە دەڵێن: "عەبای پاشایەك باشترین کفنیەتی"[21].

ناچار کردنی ژۆستینیان بۆ مانەوەو خۆڕاگری لەبەرامبەر شۆڕشێك کە جار لەگەڵ جار بەرفراوانتر دەبوو کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵام کاتێك تیۆدۆرا رایگەیاند کە لەو سەفەرەدا هاوڕێیەتی ئێمپراتۆر ناکات، ژۆستینیان لە بڕیارەکەی پێشووی پاشەگەز بۆوەو ئەرکی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانو دامرکاندنەوەی ئەو شۆڕشەی خستە ئەستۆی تیۆدۆرا. تیۆدۆرا بە یارمەتی سەرکردەکانی سوپا کە"بێلیساریۆس"[22]، سەرکردەی بەناوبانگی بیزانس لەشەڕەکانی دواتری ئێرانو رۆما لەسەرووی هەموویانەوە بوو، هێزە داڕماوو پەرتو بڵاوەکانی بیزانسی بۆ بەرەنگار بوونەوەی شۆڕشەکە رێك خستو لە رۆژێکدا سی هەزار کەسی لە یاخی بووان کوشت. شۆڕشەکە دوابەدوای ئەو کۆمەڵکوژییە کۆتایی پێهاتو ژۆستینیان ئەگەر لەو ئاستەنگییەدا هەڵاتبوایە، وەك لاوازترینو ترسنۆکترینو لەوانەیە وەك دوایین ئێمپراتۆری بیزانس ناوبانگی دەربکردایە. ژۆستینیان ٣٢ ساڵیتریش دەسەڵاتداری کردو بە داگیرکارییە گەورەکانی لە پاشماوەی ئێمپراتۆریەتی خۆیدا، وەك مەزنترین ئێمپراتۆری مێژووی

21-The Encyclopedia Americana.Vol.26.P.510
22-Belisarius



بیزانس ناسرا. بەڵام بەڕێوەبردنیبیزانس دوای ئەو شۆڕشەی کە ببووە هۆی وێرانی نیوەی شاری قۆستەنتەنییەو لەناوچوونی سەرچاوە گرینگەکانی سامانی وڵات، تەنیا بە بەکارهێنانی زەبرو زەنگ نەدەکرا. ژۆستینیان کە لەمانەوە لەسەرتەختو تاجی پاشایەتی خۆی بە قەرزداری تیۆدۆرا دەزانی، داوای لێکرد کە لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات رۆڵێکی بەرچاوتر ببینێو لەم رێکەوتەوە بەملاوە زۆربەی ئەرکەکانی کاروباری وڵاتو نۆژەن کردنەوەی دەوڵەت خرایە ئەستۆی تیۆدۆرا. تیۆدۆرا ئەنجوومەنێکی راوێژکاریی بۆ بەڕێوەبردنیکارەکان پێك هێناو بەر لە هەمووشتێك لەبیری دابینکردنی خواردەمەنیو پێداویستییەکانی خەڵك دابوو. ئەو پارەو زێڕانەی کە لە خەزێنەکاندا کەڵەکە کرابوو بۆ دابینکردنی ئەو پێداویستییانە بەکار هێندرانو شاژن کە لە رووداوەکانی پێشوو ئەزموونی وەرگرتبوو، کەمتر بەدوای دابینکردنی ویستو ئاواتەکانی خۆی دەکەوت. بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی قۆستەنتەنییە، بەناوبانگترین تەلارسازی ئەو کات کە پیاوێکی یۆنانی بەناوی "ئانتێمیۆس"[23] بوو، بانگ کرا. ئانتێمیۆس کە جگەلە مێعمار، ئەندازیارو زانای بیرەکاریش بوو، سەرپەرشتی پرۆگرامی دووبارە بنیاتنانەوەی قۆستەنتەنییەی گرتە ئەستۆو خۆی بە شێوەیەکی تایبەتی ئەرکی نۆژەن کردنەوەی باڵەخانەی کەنێسەی گەورەی سێن سۆفیای بەدەستەوە گرت. ئەو کەنێسە گەورەیە کە تا چەند سەدەیەك گەورەترین شانازی جیهانی مەسیح بوو لە رۆژی کریسمەسی ساڵی٥٣٧ی زایینی بنیات نرا. بە درێژایی ئەو پێنج ساڵەی کە نۆژەن کردنەوەی بینای کەنێسەی سێن سۆفیا درێژەی کێشا، سەدان باڵەخانەی نوێو دەیان کەنێسەیتر لە قۆستەنتەنییە درووست کرا کە دیمەنی شاری بەگشتی گۆڕی. هاوکات لەگەڵ کاری نۆژن کردنەوەی قۆستەنتەنییە، هێزەکانی بیزانس بە سەرکردایەتی بێلیساریۆس لە پێشدا ئەفریقاو کارتاژو دواییش رۆمایان خستەژێر دەسەڵاتی خۆیانو بۆیەکەمین جار لە دوای نێزیکەی ١٥٠ساڵ، رۆماو قۆستەنتەنییە کەوتنە ژێرچەتری یەك دەسەڵات. بە داگیر کردنی رۆما لەلایەن هێزەکانی بیزانس، ناوەندی مەسیحیەتی جیهانیش کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئێمپراتۆریەتی بیزانس. لە ژیاننامەی رێبەرانی دونیای مەسیحەتدا هاتووە کە "ویژیلیۆس"[24] لەساڵی ٥٣٧ی زایینیدا بە پشتیوانی راستەوخۆی تیۆدۆرا بوو بە پاپو تا ساڵی ٥٥٥ی زایینیش لەسەر ئەو پلەیە مایەوەو فەرمانی لە شاژنو

23-Anthemius
24-Vigilius





ئیمپراتۆر وەردەگرت!. ویژیلیۆس تەنیا جارێك ویستی لە فەرمانەکانی تیۆدۆرا سەرپێچی بکات، بەلاّم بەدەستووری ئەو گیراو بەند کراو بە دانی بەلێن کە ئیتر ئەو هەڵەیە دووپات نەکاتەوە، پلەوپایەکەی وەرگرتەوە. تیۆدۆرا لەتەمەنی ٤٠ ساڵیدا لەوپەڕی هێزو لە خۆڕازی بوون دابووو جگە لە ژووستینیان کە بە تەواوی بە سەریدا زاڵ بوو، ئامادە نەبوو کەسێکیتر لەدەسەلاّت بەشدار بکات. بەلاّم لەسەرەتاکانی دەیەی ٥٤٠ی زایینیدا، ناوبانگو خۆشەویستیی سەرکردەی بەناوبانگی بیزانسیش (بێلیساریۆس) کە دوای داگیر کردنی باکووری ئافریقاو کارتاژو رۆماو چەند سەرکەوتنێك بەسەر هێزەکانی ساسانی وردە وردە زۆر دەبوو، تیۆدۆرا لەلایەن ئەویشەوە هەستی بە مەترسی دەکرد. لەو میانەدا ملکەچ نەبوونی "ئانتۆنینا"ی هاوسەری بێلیساریۆسو بەرپرسی پێشووی تیۆدۆرا لەکاتی لەشفرۆشیدا لەبەرامبەر فەرمانی تیۆدۆرا سەبارەت بە پێك هێنانی ژیانی هاوسەرێتی کچەکەی لەگەڵ خوشکەزاکەی تیۆدۆرا، ئاگری رقو کینەی ئەوی پتر هەڵگیرساند. تیۆدۆرا کە پێی وابوو غرووری ئانتۆنینا لە پێگەی مێردەکەیەوە سەرچاوە دەگرێ، بڕیاریدا بە هەر نرخێك بێت بێلیساریۆس لە تەختی سەرکردایەتی بهێنێتە خوارێو لە ئاکامدا بە شێواندنو پیس کردنی دەروونی ژۆستینیان حووکمی لەسەر کار لابردنی ئەوی لەسەرکردایەتی سووپا لەلایەن ئیمپراتۆرەوە واژۆ کرد. دوای لەسەرکار لابردرانی بێلیساریۆس کە بووە هۆی ئالۆز بوونی هێزەکانی بیزانسو شکست هێنانیان لە قۆناغەکانی دواتری بەرەی شەڕی ئێران، رووداوێکی گەورەیتر چاوەڕوانی تیۆدۆرای بوو: رۆژێك پیاوێکی بە سالاّچووی خەڵکی ئانتیۆك (ئەنتاکیە) هاتە کۆشکی ئیمپراتۆریو گووتی بۆ ئاشکرا کردنی رازێك کە گرینگە بۆ شاژن دەبێ ببینم. تیۆدۆرا پیرە مێردەکەی بانگ کرد. ئەو پیاوە ئاشکرای کرد کە نزیکەی ١٧ساڵ سەرپەرشتیی لە تەنیا منداڵی تیۆدۆرا کردووەو ئێستاش ئەوی هێناوەتە قۆستەنتەنییە. تیۆدۆرا لە پیرەمێردەکەی پرسی کە ئەو منداڵە دایکی راستەقینەی خۆی دەناسێتەوە؟

پیرەمێردەکە ولاّمی "نا"ی پێداوەو داوای لێکرد بێ ئەوەی ئەو سرە بۆ منداڵەکەی ئاشکرا بکات، بیهێنێتە لای ئەو. کوڕی تیۆدۆرا جوانو رازاوە بوو. دەنگی خۆشو فلووتی باش دەژەنی. تیۆدۆرا پیرە مێردەکەی بە خەلاّتێکی باش بەڕێ کردو لاوەکەی لای خۆی راگرت. پیاوە گەنجەکە کە ناوی "جان" بوو بەهۆی ئەو دڵسۆزییە زۆرەی کە لە شاژنی بینی، ئاشقی بووو ئەشقی ئاگرینی خۆی سەبارەت بە ژنێك کە نەیدەزانی دایکێتی بە چەند نامەیەکی پڕ لە



سۆزو خۆشەویستی دەربڕی. تیۆدۆرا هێشتاش نەیدەزانی ئەو سرە چۆن بۆ کوڕەکەی بدرکێنێ، بەلاّم یاری چارەنووس دەرفەتی بۆ ئەم کارە نەهێشتەوە. یەکێك لەو نامە ئاشقانە گەیشتە دەستی ژۆسینیان. ئیمپراتۆر تووڕە بووو بێ ئەوەی ئەو شتە لەگەڵ هاوسەری باس بکات، فەرمانی ئەشکەنجەوکووشتنی ئەو لاوەی دەرکرد. شۆفارەکانی تیۆدۆرا فەرمانی ئیمپراتۆریان بە گوێی شاژن گەیاند. تیۆدۆرا بە پەلە خۆی گەیاندە ژۆستینیان تا رازەکەی بۆ بدرکێنێ. ژۆسینیان لە کردەوەکەی خۆی پەشیمان بۆوەو بە هەلاّتن بەرەو قەتڵگە وەڕێکەوت تا پێش بە بەڕێوە چوونی بڕیارەکە بگرێو تیۆدۆراش بە گریانەوە بەدوای ئەودا رای دەکرد، بەلاّم کاتێك گەیشتە قەتڵگەکە کە جەللاب شمشێرەکەی لە خوێنی ئەو لاوە بێتاوانە دەشووشتەوە. تیۆدۆرا کە نەیتوانیبوو منداڵێك بۆ ژۆستینیان بە دونیا بهێنێت، ئاواتی ئەوە بوو کە ئیمپراتۆر کوڕەکەی وەك زڕ کوڕ قەبووڵ بکاتو ئەگەر ئەو کارەساتە رووی نەدابوایە بێشك لە رازی کردنی هاوسەری سەرکەوتوو دەبوو. بەلاّم ئێستا سەری بڕاوی "جان" لە تەنیشت ئەوان بووو ئیمپراتۆرو شاژن هەردووکیان بۆ چارەنووسی کارەساتاوی لاوێك دەگریان کە رۆژێك دەیتوانی تاجی ئیمپراتۆری لەسەر بنێت. ئەو کارەساتە تیۆدۆرای بە تەواوی گۆڕیو ئەوی لەساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا کردە ژنێکی خێرخواز کە جگە لە کاروباری ئایینیو رازو نیاز لەگەڵ خوداو یارمەتی هەژارانو دەست کورتان، کارێکیتری نەدەکرد. تیۆدۆرا لە رۆژی ٢٩ی ژووەنی ساڵی ٥٤٨ی زایینی بە نەخۆشی شێرپەنجە مردو دوای مردنی بەهۆی کارە خێرخوازییەکانیو خزمەت بە کەنێسە نازناوی تیۆدۆرای پاکی (قدیس) پێ بەخشرا. بەفەرمانی ئیمپراتۆر ژۆستینیان کە حەوت ساڵ دوای تیۆدۆرا کۆچی دوایی کرد، کەنێسەیەکی بەشکۆ بەناوی تیۆدۆرای پاك لە قۆستەنتەنییە درووست کرا کە دوای رووخانی ئیمپراتۆری بیزانس لەژێر دەستی عوسمانییەکان کرا بە مزگەوت.





# ژنێکی فێڵەزان و دڵرەق کە بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ لە فەڕەنسە حوکمڕانی کرد و گەورەترین کوشتاری ئایینی لە مێژوودا وەڕێخست

بێ گومان لەنێوان ئەو ژنانەی کە بە درێژایی مێژوو بە دەسەلاّت گەیشتوون، کاترین دۆمێدیسی[1] یەکێك لە دزێوترینیان. ئەو ژنە نێزیکەی ٤٠ ساڵو بە درێژایی پاشایەتیی مێردو ٣ کوورەکەی دیمەنی زاڵی سیاسەتی ئەورووپا بوو. کەمو زۆر لەلایەن هەموو ئەو نووسەرانەی کە سەبارەت بە ژیانو کارەکانی ئەو ژنە قەڵەمیان کول کردووە (نووسیویانە) بەو تایبەتمەندییانەی وەك "بێ بەزەیی"و "بێهەستو سۆز"و"دڵرەق"و "خرابکار" ناسراوەو ژمارەیەك لەو نووسەرانەی کە وردەکارییەکانی ژیانی ئەویان روون کردووەتەوە، بە گەندەڵی رەوشتو هاوجنسبازی تاوانباریان کردووە. ژیانی کاترین لەنێوان هەموو نووسەرەکاندا، پتر جێگای سەرنجی نووسەرانی فەڕانسەوی بووەکە سەدان پەرتووكو داستانیان سەبارەت بەداستانە جۆراوجۆرەکانی ژیانی پڕ لە رووداو و درێژخایەنی ئەو نووسیوە. هیچکام لە نووسەرانی فەڕانسەوی لەبارەی ئەو ژنە ئیتالیاییە کە زیاتر لە ٤٠ ساڵ وەك شاژنو دایکی پاشاکانی فەڕانسە لەسەر ئەو ولاّتە حوکمڕانی کردووە، بە باشی یادیان نەکردووەتەوە. ڤۆلتێر[2] کە لە هەموویان نەرمو نیانتر لە بارەی ئەو قسەی کردووە، دەنووسێ: "دروشمی ئەو ئەوە بوو کە دووبەرەکی بنێوەو دەسەلاّتدارێتی بکە، ئەو ئامۆژگارییە زانایانەیە لەوەوە بە یادگار ماوەتەوە". بالزاك[3] لەو بڕوایە دایە کە "ئەو ژنە بێ مەکرو فێڵ نەیدەتوانی بژیت حکوومەتی ئەو لەسەر نانەوەی دووبەرەکیو ناکۆکیو هاندانو فیتنە راوەستابوو". لە کۆتاییشدا میشێل زۆڤاکۆ[4]، رۆمان نووسی بەناوبانگی فەڕانسەوی کە یەکێك لە پرفرۆشترین رۆمانە مێژووییەکانی خۆی لەسەر ژیانی کاترین نووسیوە، را دەردەبڕێ کە "ئەو هاوشارییەی ماکیاڤێلی باشترین شاگردو پێڕەوی بیرو بۆچوونەکانی ئەو بووەو بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆی لە هیچ تاوانێك تەنانەت لە نزیکترین کەسانی خۆی رووی وەر نەدەگێڕا".

1-Catherine de Medciis

2-Voltaire

3-Balzac

4-Michel Zevaco



ئەو رقو نەفرەتەی کە لە نووسراوەکانی نووسەرانی فەڕانسەوی سەبارەت بە کاترین هەستی پێدەکرێ لە نووسینەکانی مێژوونووسانی غەیرە فەڕانسەویشدا رەنگی داوەتەوە. بەلاّم نووسەرانی ولاّتانیتر لەو بارەیەوە کەمتر دمارگرژییان بەکار هێناوەو لایەنە باشەکانی ژیانی کاترینیشیان لەبەر چاو گر تووە. کاترین دۆمێدیسی لەهەموو پێشینیانی خۆی پتر هۆگری هونەرو ئەدەب بووەو لەبەرئەوەی کە ئاشقی زریقە وبریقەو بۆنەو ئاهەنگ گێڕان بوو، تەلارسازان و هونەرمەندانی هان دەداو پشتیوانی لێدەکردن. هەندێك لە بینایە مێژووییەکانی بەناوبانگی فڕانسە بۆ وێنە کۆشکی "تۆیلێری"[5]ش لەکاتی ئەوداو بەفەرمانی ئەو بنیات نراوە کە دوای تێپەڕبوونی چوار سەدە هێشتاش بە یەکێك لە جوانترین شوێنەوارەکانی مێعماری دەژمێردرێت.

***

بۆ لێکدانەوییەکی درووستو بێلایەن لەسەر ئەو "دزێوترین ژنی" دەبێ ژیاننامەی ئەو لەسەرەتای لەدایك بوونییەوە بخوێنینەوەو بزانین کە چ هۆکارێك ئەو ژنەی کردۆتە بێبەزەییو تۆڕەترین ژنی مێژووو ئەو تاوانو گەندەڵییانەی کە دراونەتە پاڵی، چ پاڵنەرێکی سەرەکی هەبووە. کاترین دۆمێدیسی لە رۆژی ١٣ی ئاپریلی ساڵی ١٥١٩ی زایینی لەشاری فلۆرانس هاتۆتە سەر دونیاو لەدایکبوونی ئەو یەکەمین کارەساتی بۆ بنەماڵەکەی خولقاند، لەبەر ئەوەی دایکی کە بەگ زادەیەکی فەڕانسەوی بوو، بەو زایینە لەتەمەنی لاوێتیدا گیانی لەدەست داو باوکیشی، دووك دۆربینۆ[6] کەدوایین پاشماوەی پیاوی خانەدانی مێدیسی بوو دوای مردنی هاوسەری، مالاّوایی لە ژیان کرد. کاترینیان کە هێشتا منداڵێکی شیرە خۆرە بوو لە فلۆرانس گواستەوە رۆماو پاپ کلێمێنتی[7] حەوتەم سەرپەرشتی ئەوی گرتە ئەستۆ. کاترین تا تەمەنی شەش ساڵی لە دەرباری پاپ مایەوەو لەئاکامدا پاپ کلێمێنتی حەوتەم لە ساڵی ١٥٢٥ بڕیاریدا کاترین بۆ فلۆرانس[8] بگەڕێنێتەوە تابەردەوام بوونی حکوومەتی خانەدانی مێدیسی مسۆگەر بکات. بەلاّم مشووری پاپ بۆ رێگرتن لەو راپەڕینەی کە گەرای لەفلۆرانس نرابۆوە،

5-Tuileries

6-Duc durbino

7-Clement

٨- لەسەدەی شازدەی زایینیدا ئیتالیای ئەمڕۆ بە چەند حکوومەتێکی سەربەخۆ دابەش ببوو و فلۆرانس یەکێك لەو حکوومەتانە بوو.





بێ‌کەڵك مایەوەو کۆماریخوازەکانی فلۆرانس لەساڵی ١٥٢٧بە دژی لایەنگرانی حکوومەتی مێدیسی شۆڕشیان کرد. شەڕو کێشەی فلۆرانس پتر لە سێ ساڵی خایاندو کاترینی کەم تەمەن لە تەواوی ئەو ماوەیەدا ماڵ بە ماڵ لەحاڵەتی هەلاتنو خۆشاردنەوە دابوو تا لەئاکامدا کەوتە بەر دەستی خۆپیشاندەرانو لەکڵێسایەکدا بەند کرا. پاپ کلیمێنتی حەوتەم کە لە ساڵی ١٥٣٠دا دەیەویست بە هەر نرخێك بێت شاری فلۆرانس بخاتە ژێر فەرمانی خۆی، سەرکردەکانی حکوومەتە هەرێمییەکانی لایەنگری خۆی ناچار بە کۆکردنەوەی هێزو گەمارۆدانی شاری فلۆرانس کرد. بەلاّم گەمارۆ دراوەکانی شاری فلۆرانس دەستیان لە بەرگریو بەرەنگار بوونەوەی پەلامارەدران هەڵنەگرت. برێسێتیو نەخۆشیو شەڕو کێشە دەستیان بە یەکەوە دابووو تەپۆڵکێکیان لە کووژراوەکان درووست کردبوو. بەدبەختیو چەرمەسەری کاترین تەنیا نەخۆشیو برسێتی نەبوو، لەبەرئەوەی یاخی بووان کە ئەویان وەك بارمتە راگرتبوو، ئازارو ئەشکەنجەیان دەداو ژمارەیەك لەسەرکردەکانیان بۆ تۆڵە سەندنەوە لەپاپ، پێشنیاری ئەوەیان کرد کە ئەو کچە ١١ساڵەیە ببەنە سۆزانی خانە بۆ ئەوەی پاپ دواتر نەتوانی لەو کچە وەك ئامێرێکی سیاسی بۆ ئەنجامدانی مەبەستەکانی کەڵك وەرگرێ. بەلاّم پێش ئەوەی ئەو پێشنیارە بگاتە قۆناغی ئەنجامدان، بەرگرییەکەی یاخی بووانی شار تێك شکاو کاترین کە زیندوو مابوو گەڕایەوە شاری رۆما. کاترین هێشتا چاردە ساڵی پتر تەمەن نەبوو کە پاپ بڕیاریدا زەماوەندێکی سیاسیی بۆ پێك بهێنێ‌و بۆ پتەوتر کردنی دۆستایەتیو یەکێتی خۆی لەگەڵ فرانسوای یەکەم شای فەڕانسە، کاترینی لە هانری کوڕی دووهەمی پاشای فەڕانسە مارە کرد. هانریش پتر لە ١٤ساڵی تەمەن نەبووو هێشتا خۆی نەناسیبوو. بەلاّم فرانسوای یەکەم پیشنیاری پاپی بۆ پێکهێنانی ژیانی هاوسەرێتی لەنێوان کوڕو کچە ١٤ساڵەکەی (کاترین) قەبوول کردو بووكو زاوا یەکەمین جار لە جێژنی بووکێنیدا یەکتریان بینی. پاپ خۆی خوتبەی مارە کردنی ئەوانی خوێندو رێورەسمێکی بە شکۆیان لە مارسەی بۆ پێك هێندرا کە تا ئەوکات هاوشێوەی نەبیندرا بوو. بەلاّم ئەو بووکێنییە بەشکۆیە بۆ کاترینی ١٤ساڵە سەرەتای چەرمەسەرییەکی١٠ساڵە بوو، لەبەر ئەوەی کە هاوسەری هەر لە رۆژی یەکەمەوە لەبەر ناشیرنی کاترین، هۆگریو خۆشەویستیی سەبارەت بەو نیشان نەدا. ئەو چەرمەسەرییە بە کارتێکەری ژنێکی جوانو دلڕفێن بەناوی "دیان دۆ پۆیتێرس"[٩] لە مێردی لای کاترین،

9-Dian de Poitiers



گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. دیان کە سەر بە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی رەسەنی فەڕانسە بوو، پێشتر ئاشقی فرانسوای یەکەم بوو بەلاّم دوای ئەوە کە تەمەنی پاشا چووە سەرێ، لە نەبوونی هۆگری هانری بە کاترین کەڵکی وەرگرتو ئەوی خستە ژێر کارتێکەری خۆی. لەو کاتەدا دیان پتر لە ٣٠ ساڵی تەمەن بوو کە ١٥ ساڵ لە کاترین گەورەتر بوو. بەلاّم جوانیو دلڕفێنی ئەو بە جۆرێك هانری لاوی خستبووە ژێر کاریگەری خۆیەوە کە تەنانەت بۆ کاتێکی کورتیش لە خەیاڵی ئەو نەدەهاتە دەرێو زۆربەی کاتەکانی لە تەنیشت ئەودا رادەبوارد



**پەیکەرێك لە کاترین کە تایبەتە بە تەمەنی گەنجێتی ئەو**

نەهامەتی گەورەی کاترین ئەوە بوو کە منداڵی نەدەبوو و مەودای نەزۆکی ئەو ١٠ ساڵ درێژەی کێشا. لەو ماوەیەدا براگەورەکەی هانری کە جێنشینی پاشای فەڕانسە بوو، مردو هانری دووهەم بوو بە جێنشینی فەڕانسە. تا ئەوکاتە کاترین سەرنجی دەرباری فەڕانسەی بۆ لای خۆی ڕانەدەکێشاو هەر لەبەر ئەوەش کەس ئیرەیی پێ نەدەبرد، بەلاّم کاتێك کوڕە گەورەکەی پاشا مردو مێردەکەی بوو بە جێنشین، ئەویش بوو بە شاژنی فەڕانسەو هەر بەو هۆیەشەوە کەوتە ژێر رقو ئیرەیی ئەوانیترو بەتایبەت ژنانی دەرباریو لەسەرووی هەموویانەوە دیان دۆپۆیتێرس. یەکەم دەنگۆی کە لە دەرباری فەڕانسە بە دژی کاترین دۆمێدیسی بلاّو بۆوە ئەوە بووکە ئەو لەمردنی لەنەکاوی جینشینی فەڕانسە رۆڵی بووەو برای مێردەکەی بۆ گەیشتن بە پلەی شاژنی فەڕانسە دەرمانداو کردووە. لە زۆربەی ئەو ژیاننامانەی لەسەر کاترین نووسراوە، ئەویان بەوە تۆمەتبار کردووە کە بۆ یەکەمین جار ژەهری بردۆتە دەرباری پاشاو لەو چەکە بۆ لەناو بردنی رکەبەرو نەیارەکانی کەڵکی وەرگرتووە. رەنگە ئەم بابەتە راست بێتو چەند بەڵگەیەك لەبەردەست دایە ئەوە دەسەلمێنێت کە کاترین دواتر لەو چەکە کەڵکی وەرگرتووە بۆ لەناو بردنی ئەو کەسانەی تەگەرەیان دەخستە سەر رێگای کاترین بۆ گەیشتن بە





ئامانجەکانی. بەڵام هیچ بەڵگەیەکی بەهێزو سەلمێنەر سەبارەت بە دەرمانداو کرانی جێنشینی فەڕانسە بەدەستی کاترین لەبەردەست دا نی‌یە، لەبەر ئەوی کاترین لەو کاتەدا ١٨ ساڵی تەمەن بووەو لە ئاستێکدا نەبووە بتوانێ ژەهر لە چێشتی جێنشینی فەڕانسە بکات. بە جێنشینی هانری، نەزۆکی کاترینیش گرینگی زیاتری پەیدا کردو دوابەدوای ئەو دەنگۆیانەی سەبارەت بە ڕۆڵی ئەو لە کۆچی ناوەختی کوڕی گەورەی پاشا بلاّو ببۆوە، هەندێك جوولاّنەوە لەلایەن مێردەکەیەوە بۆ تەلاّقدانی دەستی پێکرد. کاترین کە لە هەموو لایەکەوە کەوتبووە ژێر هێرش‌و بووختان، پەنای بردە بەر پاشا، و فرانسوای یەکەم کە گرینگییەکی زۆری دەدا بە دۆستایەتی‌و یەکێتی خۆی‌و پاپ، پشتیوانیی لە کاترین کرد. پاشا بە سەردانی غەیب گۆیان‌و پێشگۆیانی لێهاتوو کە لەو کاتەدا بە چینێکی تایبەت‌و بەرزی فەڕانسە دەژمێردران، بە خۆی‌و دەوروبەری بەڵێنی دا کە دەورانی نەزۆکی کاترین بە زوویی تێپەڕ دەبێ‌و خاوەنی منداڵی زۆر دەبێت. "نۆسترادامۆس"[10] بەناوبانگترین پێشگۆی ئەوکاتەو هەموو دەورانەکانی‌تر بوو کە لە داهاتووی کاترین دا تەمەنێکی درێژو منداڵی زۆری دەبینی‌و گووتبووی هەموو منداڵەکانی کاترین دەبنە پاشاو شاژن. ئەو پێشگۆییانە بوونە ڕاستی‌و کاترین لەتەمەنی ٢٥ ساڵیدا یەکەمین منداڵی کوڕی هێنایە سەر دونیا کە ناویان نا فرانسوا (ناوی باپیری بوو)و دواتر بەناوی فرانسوای دووهەم بوو بە پاشای فەڕانسە. لەوە بەملاوە کاترین بەردەوام سکی پڕ دەبووو لە دەورانی ژیانی هاوسەری‌دا دە منداڵی بوو کە سێ‌یان بە مردوویی هاتنە سەر دونیا، بەڵام ٤ کوڕو ٣ کچی زیندوو مانەوە.



**وینەی دیان دۆپۆیتێرس، رکەبەری سەرەکی کاترین**

10-Nostradamus



لەساڵی ١٥٤٧ی زایینی‌دا فرانسوای یەکەم مردو بەدەستپێکردنی پاشایەتی هانری دووهەم، کاترینیش لەتەمەنی ٢٨ساڵیدا بوو بە شاژنی فەڕانسە. بەڵام هانری دووهەم هێشتاش لەژێر کارتێکەری دیان دۆپۆیتێرس دابووو کاترین تەنیا ڕۆڵی هاوسەری یاسایی‌و تەشریفاتی پاشای دەنواند. دیان لەو کاتەدا پتر لە ٤٠ ساڵی تەمەن بوو بەڵام هەر جوان‌و سەرنج ڕاکێش بووو ساڵانێکی زۆری خایاند تا کاترین بە مەکرو فێڵ‌و خۆڕاگری ئەوی لەبەرچاوی پاشا خست. دووژمنانی کاترین سەبارەت بە ژیانی ئەو لە دەرباری فەڕانسە لەساڵی ١٥٣٣و تا ڕۆژێك بوو بە شاژنی فەڕانسەو بە درێژایی ئەو ساڵانەی کە هاوسەرەکەی هاوڕێیەتی ژنێکی‌تری پێخۆش بوو، نووسراوەی زۆریان هەیەو ئەویان بەوە تۆمەتبار کردووە کە جگە لەناحەزی، لەبواری سێکسیشەوە ژنێکی ناسرووشتی‌و نەخۆش بووەو لەگەڵ ئەو ژنانەی کە لە ئیتالیاوە وەك خزمەتکار هێناویەتی هاوجنس بازی کردووە. پڕۆپاگەندەی ئەوەش کراوە کە کاترین ئەو ڕەوشتە ناحەزەی تا تەمەنی پیریش تەرك نەکردووەو بەردەوام ژنی جوان‌و ڕێکوپێکی بۆ ئەم کارە هەڵبژاردووە. بەڵام لە تەنیشت ئەو تۆمەتانەی کە دراوەتە پاڵ کاترین، نووسەرانی ئەو ژیاننامانە لە خاڵێکدا هاوڕان، ئەویش ئەوەیە کە کاترین ژنێکی لە ڕادەبەدەر ژیرو زانا لە بواری بابەتەکانی سەردەمی خۆی بووە و هەر بەو زانست‌و زانیارییانەشەوە هاوسەری خستۆتە ژێر کاریگەری خۆیەوە. هانری سەرەڕای ئەو هەموو خۆشەویستی‌و هۆگرییەی کە بە دیانی هەبوو، وردە وردە بەو ئاکامە گەیشت کە لە کاروباری حکوومەت‌و پاشایەتی‌دا پێویستیی بە ڕاوێژو ڕێنوێنی هاوسەری هەیەو لەساڵی سێهەمی پاشایەتی خۆی‌دا ئەوی لەزۆربەی کارەکاندا بەشدار کرد. کاترینیش لە بەرانبەردا لەمەڕ پێوەندی هاوسەری لەگەڵ ژنێك کە وردەوردە پیر ببوو، هەستیاری زۆری دەر نەدەخست‌و دەیزانی تێپەڕ بوونی کات خۆی ئەم کێشەیە چارەسەر دەکات. خۆڕاگری‌و مشووری کاترین لە ئەنجامدا بە ئامانج گەیشت‌و لەساڵی ١٥٥٠ بەم لاوە بوو بە شەریکی دەسەڵاتی هاوسەری. لەساڵی ١٥٥٢دا هانری دووهەم ئەوی کردە جێگری پاشاو خۆی چوو بۆ شەڕ. کاترین لە ساڵەکانی ١٥٥٣و ١٥٥٤و ١٥٥٧یش ئەم پۆستەی گرتە ئەستۆو لەساڵی ١٥٥٩دا بە مردنی هانری دووهەم لەتەمەنی ٤٠ ساڵیدا بێوەژن کەوتەوە. دەورانی دەسەڵاتی ڕاستەقینەی کاترین لەسەر فەڕانسە لەو ڕێکەوتەوە دەست پێدەکات. لەبەر ئەوەی کاترین منداڵەکانی بە شێوەیەك بارهێنابوو کە بەبێ ئیزنی ئەو ئاویان نەدەخواردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە دەورانی کورتی پاشایەتی منداڵی یەکەمی‌دا (فرانسوای دووهەم) کە

لەتەمەنی ١٥ ساڵیدا بە دەسەڵات گەیشتو لەگەڵ ماری ئێستیۆرات شاژنی ئیسکاتلەندا زەماوەندی کرد، کارتێکەری بنەماڵەی "گیز"[١١] بەتایبەت دووك "دۆگیز"ی مامی ئێستیۆرات، کارتێکەری کاترینی لەسەر کوڕەکەی کەم کردەوە. بنەماڵەی گیز کە دەسەڵاتدارترین بنەماڵەی کاتۆلیکی فەڕانسە بوون، لەگەڵ بۆربۆنەکان کە پرۆتستان بوون رکەبەرییەکی توندو تیژیان هەبووو کاترین کە خۆی کاتۆلیك‌و برازای پاپ بوو بە نهێنی بۆدژایەتی کردنی بنەماڵەی گیز پشتیوانیی لە بۆربۆنەکان دەکرد. تا گەیشتنی فرانسوای دووهەم بە تەمەنی یاسایی دەبوایی جێگرێکی پاشا بۆ فەڕانسە دیاری بکرێت.



**وێنەی کاترین‌و هانریی دووهەم. کوڕی گەورەی کاترین "فرانسوای دووهەم" یش لەو وێنەیەدا دەبینرێت**

11-Guise



گەورەپیاوانی خانەدانی بۆربۆن سوور بوون لەسەر ئەوەی کە پلەی جێگری پاشا بدرێتە ئانتوان پاشای "ناڤار"[١٢] یان براکەی، "لوویی پرەنس دۆکۆندێ"[١٣]. کاترین بۆ کەم کردنەوەی دەسەڵاتی دۆگیز ئەم پێشنیارەی لا پەسند بوو، بەڵام پێش ئەوەی پلانەکە سەر بگرێ دووك دۆگیز سەرسپاردەیی خۆی بە کاترین راگەیاندو بەجێگەی دانانی جێگرێکی پاشا لەخانەدانی بۆربۆن، ئەنجوومەنێکی جێگری پاشایەتی بە بەشداری کاترین بەڕێوەبردنی دەوڵەتی گرتە ئەستۆ. بۆربۆنەکان ئامادە نەبوون پێڕەوی لە ئەنجوومەنی جێگری پاشایەتی بکەن‌و لەو کاتەشدا لە سێدارەدرانی دادوەرێکی پرۆتستان لەپاریس ئاگری دووبەرەکیی لەنێوان کاتۆلیکەکان‌و پرۆتستانەکان خۆشتر کرد. بەدەستپێکردنی شەڕ لەنێوان کاتۆلیکەکان‌و پرۆتستانەکان‌و دەنگۆی رفاندنی پاشا لەلایەن بۆربۆنەکانەوە، دەرباری فەڕانسە لەپاریسەوە گوازرایەوە بۆ قەڵای "ئامبۆیز"[١٤] لە کەناری رووباری "لوار"[١٥]. بەڵام داوێنی شەڕی ناوخۆیی گەیشتە ئامبۆیز. پرەنس دوکۆندێ لە جەنگەی ئەو شەڕو پێکدادانەدا بە دیل گیراو بە سەرکەوتنی کاتۆلیکەکان بە سەرکردایەتی دووك دۆگیز، فەڕانسە شایەتی یەکەمین دیمەنی کوشتاری پرۆتستانەکان بۆوە. ئەو کەسانەی لەو شۆڕشەدا دەستیان هەبوو بە شێوەیەکی ناجوامێرانەو ناحەز کوژران. ملی ژمارەیەکیان بڕی‌و کۆمەڵێکیان لە تاوەرو قەڵای ئامبۆیز لە سێدارە داو گوریسیان لە ژمارەیەکیشیان هاڵاندو خستیاننە ناو رووبار. کاترین بە رواڵەت لەو کوشتارەدا نەخشی نەبوو، بەڵام ئەوەش ئاشکرایە کە رێی لێ‌نەگرتو زۆرتر لەبیری کەڵك وەرگرتن لەو شەڕو کێشەو دووبەرەکییەی نێوان پرۆتستانەکان‌و کاتۆلیکەکان بوو. فڕانسوای دووهەم چەند مانگ دواتر تووشی نەخۆشی سیل هات‌و لەدێسەمبەری ساڵی ١٥٦٠دا کۆچی دوایی کرد. بەفەرمانی فرانسوای دووهەم دەسەڵاتەکان بە کوڕی دووهەمی کاترین ئەسپێردرا کە لەو کاتەدا ١٥ساڵان بوو. کاترین ئەوی بەناوی چاڕلی نۆیەم خستە سەر تەختی دەسەڵات‌و خۆشی وەك جێگری پاشا بوو بە دەسەڵاتداری راستەقینەی فەڕانسە. لەو کاتەدا بۆربۆنەکان دوابەدوای تێکشکانی ئەو شۆڕشەی کە بە پشتیوانی ئەوان سەری هەڵدا، لاواز ببوون‌و بنەماڵەی گیزیش کە بەهۆی مردنی فرانسوای دووهەم پێگەی پێشوویان لەدەست دابوو نەیاندەتوانی لەخزمایەتی خۆیان لەگەڵ شاژنی داهاتووی فەڕانسە کەڵك وەربگرن. لەو کاتەوە بەملاوە

١٢-( Navarre ) بەشی‌باکووری ئیسپانیایە کە تا کۆتاییەکانی‌سەدەی شازدەیەم، پاشایەتییەکی سەربەخۆ بوو.

13-Louis Prince de Conde

14-Amboise

15-Loire





کۆلینی کە لەو کاتەدا کارامەترین سەرکردەی سەربازی فەڕانسە بوو، بە پێچەوانەی سیاسەتی کاترین، شارلی نۆیەمی ناچار بە دەرکردنی فەرمانی شەڕ دژی هۆڵندا کرد، بەڵام کاترین بە مەبەستی بە ئاگاهێنانەوەی کوڕەکەیو تۆڵەئەستاندنەوە لەکۆلینی، بەناردنی پەیامنێرێك بۆلای هۆڵندبیەکانو ئاشکرا کردنی پیلانەکانی کۆلینی بووە هۆی تێکشکانی هێزەکانی فەڕانسە لەو شەڕە دا. لەم قۆناغەدا بوو کاترین بۆ نانەوەی دووبەرەکی لەنێوان پرۆتستانەکان، لەهانری دۆناڤار، کە دوای مردنی باوکی ببوو بە سەرکردەی خانەدانی بۆربۆن پاشای لاوی ناڤار نزیك بۆوە و پێشەکییەکانی زەماوەندی کچە بچووکەکەی لەگەڵ ئەو ئامادەکرد. تەنیا لەمپەری ئەو زەماوەندە دایکی هانری ( ژان دالبێرت)[19] بوو کە بەشێوەیەکی نائاسایو بەبێ نەخۆشی مرد. زۆربەی مێژوونووسان مردنی دایکی هانری دۆناڤاریش دەخەنە پاڵ کاترین. بەڕای مێژوونووسان ئامێری ئەم قەتڵەش دەسکێشێکی ژەهراوی بوو کە کاترین بۆ دایکی زاوای داهاتووی بە دیاری هێنابوو. ڕێوڕەسمی زەماوەندەکە بەهۆی مردنی دایکی زاوا دوومانگ دواخرا. ڕۆژی هەژدەی ئووتی ١٥٧٢ لە کەنیسەی نۆتێردامی پاریس ڕێوڕەسمەکە بە شکۆیەکی زۆرەوە بەڕێوە چووو هەر بەم بۆنەشەوە لەسەرتاسەری پێتەخت چواردە ڕۆژ جێژنو خۆشی ڕاگەیاندرا. لەو کاتەدا دایکی بووك پیلانێکیتری بەدەستەوە بوو. لە ڕۆژی ٢ی ئووت و دوای تەواوبوونی جێژنوشادی، کۆلینی کە دوای بەشداری لە کۆبوونەوەیەك لە کۆشکی "لۆڤێر" دەگەڕایەوە ماڵێ، لە ڕۆژی ڕووندا لە نێزیکی کۆشك تەقەی لێکراوو گوللەکان کە لەدەربیێجەیەك بەرەو کۆلینی هاوێژرا بوون بەسووکی بریندارییان کرد. شارلی نۆیەم لەم هەوڵە تێرۆرە زۆر تووڕە بووو هەر بۆ خۆشی چووە سەر جیۆبانی دەریاسالاری بریندار، بەڵام کاترین کە دەیزانی ئەو تۆمەتبار دەکرێت، دەستپێشخەری کردو لە دیمانەیەکی درێژدا لەگەڵ کوڕەکەی توانی ئەو ڕازی بکات کە کۆلینی پیلانی دژی حکوومەتی ئەو دارشتووەو دەیهەوێ جێگای ئەو بگرێتەوە. کاترین چەند شایەتێکی بۆ سەلماندنی قسەکانی ناساندو چەند بەڵگەو دیکۆمێنتێکی لەم بارەیەوە پیشان دا کە مێژوونووسان گومانیان لە ڕاست بوونی ئەم بەڵگانە هەیە.

تۆڵە سەندنەوەکانی لایەنگرانی کۆلینی دوای ڕووداوی هەوڵی تێرۆر، شارلی نۆیەمی کە پیاوێکی نەفس نزم بوو زۆرتر پەشۆکاندو بە هاندانەکانی دایکی بڕیاری گرتنو لە سێدارەدانی

19-Jeanne dalbert



کۆلینیو لایەنگرە ناسراوەکانی دەرکرد. گرتنی کۆلینیو لایەنگرانی لە نیوە شەوی ٢٣ی ئووت دەستی پێکردو لە پارشێودا تەرمەکانیان بەو کاتۆلیکە دەمارگرژانە ئەسپارد کە ڕقو بێزارییەکی زۆریان سەبارەت بە پرۆتستانەکان لە دڵدا بوو. کۆمەڵەی ڕق هەستاوی کاتۆلیك سەری کۆلینیو هاورێکانی ئەویان لە لەش جیا کردەوەو سەرە بڕاوەکانیان بە نێزەوە کردو تەرمە ڕووتو بێ سەرەکانیان لە شەقامەکاندا ڕادەکێشا. پاریس بە درێژایی ڕۆژی ٢٤ی ئووت یان ڕۆژی "ساینت بارتۆلۆمی"[20] گۆڕەپانی کوشتاری بێبەزەییانەی پرۆتستانەکان لەلایەن گرووپە دەمارگرژە کاتۆلیکەکان بوو کە هەتا چل ڕۆژ درێژەی کێشا. لەوماوەیەدا دەیان هەزار کەس لە پرۆتستانەکان لە ژنو پیاوو پیرو لاو کوژرانو تەنیا ئەو کەسانەی کە توانیان هەڵبێن، زیندوو مانەوە و ژمارەی کوژراوانی ئەو ڕووداوە کە بە کوشتاری بارتۆلۆمی ناسراوە بە بیست تا پەنجاهەزار کەس مەزندە کراوەو زۆربەی هەرە زۆری مێژوونووسانی جیهان کاترین بە بەرپرسیاری ڕاستەوخۆی ئەم کارەساتە دەزانن.

***

شارلی دوو ساڵ دوای ڕووداوی ساینت بارتۆلۆمی نۆیەم لەتەمەنی بیستو چوار ساڵیدا مرد. زۆربەی مێژوونووسان مردنی شارڵی لەتەمەنی لاویەتیدا بە سرووشتی نازاننو دوژمنەکانی کاترین جارێکیتر ئەو بە تاوانبار دەزاننو ئەو "دایکە بێسۆزە" بە بەرپرسیاری مردنی کوڕەکەی دەناسێنن. ئەوە گەورەترین تاوانێکە کە دەتوانرێت بخرێتە پاڵ دایکێك. بەڵام ئەو نووسەرانەی کە ئەژدیهایەکیان لە کاترین درووست کردووە دەڵێن: شارلی نۆیەم دوای ڕووداوی ساینت بارتۆلۆمی گرفتاری خەیاڵاتو گومان ببووو بە توندی شکی لەدایکی بوو و کاترین کە لە ئەنجامی کار دەترساو خۆی لە مەترسیدا دەبینی بە هەمان شێوازی خۆی ئەو مەترسییەی لەناو بردو درێژە پێدانی دەسەڵاتدارێتی خۆی هاوکات لەگەڵ پاشایەتی کوڕی سێهەمی مسۆگەر کرد. هانری سێهەم (سێهەمین کوڕی کاترین) لەساڵی ١٥٧٤ لەتەمەنی شازدە ساڵیدا لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتو بۆ ماوەی ١٥ ساڵ و تا کۆتایی ژیانی کاترین حوکمڕانی کرد. چوارەمین کوڕی کاترین (دووك دانژووا)[21] لەساڵی ١٥٨٤ لەتەمەنی

20-Saint bartolomey
21-Duc D'Angius





سی‌ویەك ساڵیدا مردو لەبەرئەوەی کە هانری سێیەم نەزۆك بوو، کێشەی جێنشینی ئەو گرینگترین سەر قاڵی فکری کاترین لە کۆتاییەکانی تەمەنی دابوو. جێنشینی یاسایی هانری سێیەم، هانری دۆناڤار (زاوای کاترین) بوو کە زەماوەندی ئەو لەگەڵ کچی کاترین بە رووداوی ساینت بارتۆلۆمی خوێناوی ببوو. هەر بۆیەش لەنێوان زاواو خەسوو هیچ کات خۆشەویستیو هۆگری دروست نەبوو. کاترین لە کۆتاییەکانی ژیانیدا زۆری هەوڵدا لەگەڵ زاواکەی پێوەندی نزیکی هەبێت. بەڵام هانری دۆناڤار هیچکات متمانەی پیٚنەکردو مارگاریٚتیش لەو بیٚمتمانەییو بەد گومانی‌یە لەگەڵ مێردەکەیدا بەشدار بوو. زویریو رقی کاترین لە کچەکەی کە دواتر بوو بە شاژنی فەڕانسە، لە وەسیەتنامەکەی دەردەکەوێت کە لەودا مارگارێت لە میراتو هەر جۆرە سامانێکی بنەماڵەیی بیٚ بەش دەکرێت.




**سیٚ کوری کاترین، فرانسوای دووهەم وشارڵی نۆهەمو هانری سێیەم**
**کە لە سەردەمی ژیانی ئەودا بە دەسەڵات گەیشتن**

کاترین کە لە ماوەی تەمەنی ٧٠ ساڵی خۆیدا مردنی مێردو هەشت منداڵی خۆی بە چاو بینیبووو بەردەوام رەش پۆش بوو، لە رۆژی پێنجەمی ژانڤییەی ساڵی ١٥٨٩ بە نەخۆشی ئەنفلۆانزا (ژات الريه) مرد. هانری سێیەم، دووایین کوڕی کاترین کە لەکاتی مردنی دایکی



لەسەر ژیان مابوو، ماوەیەك دوای مردنی دایکی مالاٚوایی لە ژیان کرد. هانری دۆناڤاری زاوای کاترین کە دوای مردنی هانری سێیەم وەك هانری چوارەم لەسەر تەختی پاشایەتی فەڕانسە دانیشت، لەسەرەتادا رووبەرووی هەندێك بەرگریو دژایەتی توندی زۆربەی کاتۆلیکەکانی فەڕانسە بۆوە کە ئامادەی پێڕەوی لە یاساکانی پرۆتستان نەبوونو لەئاکامدا لەساڵی ١٥٩٣ مەزهەبی کاتۆلیکی قەبووڵ کرد. هانری چوارەم ئازادیو هێمنی پرۆتستانەکانیشی دابین کردو ناوی ئەو وەك یەکێك لە خۆشەویسترین پاشاکانی فەڕانسە لە مێژوودا تۆمار کراوە. هاوسەرەکەی (مەلیکەمارگارێت) کچی کاترینیش لە هەموو منداڵەکانی کاترین تەمەن درێژتر بووەو لەساڵی ١٦١٥ لەتەمەنی ٦٢ ساڵیدا مرد.

# دوو خوشك كە بۆ ماوەی ٥٠ساڵ لە بەریتانیا حوكمڕانیان كرد

لەساڵی ١٥٥٣ تا ١٦٠٣ی زاینی دوو زڕ خوشك بۆ ماوەی ٥٠ ساڵ لە بریتانیا حوكمیان گێڕا كە یەكەمیان بەناوی "ماری خوێنمژ"[1] وەك یەكێك لە بێبەزەیی‌و تووڕەترین پاشاكانی بریتانیا ناسراو و دووهەمینیشیان وەك یەكێك لە بەهێزترین‌و سیاسی‌ترین پاشاكانی بریتانیا ناوی دەركردو سەردەمی پاشایەتی درێژخایەنی ئەو بە سەرەتای شكۆو گەورەیی ئیمپراتۆری بریتانیا دەژمێردرێ. "ماری تۆدۆر"[2] كە لەساڵی ١٥٥٣تا١٥٥٨ وەك مەلیكەماری لە ئینگلستان پاشایەتی كردو خوشكەكەی (ئیلیزابیتی یەكەم) كە لەساڵی ١٥٥٨تا ١٦٠٣ پاڵی بە تەختی دەسەڵاتی ئینگلستانەوەدا، كچی هانری هەشتەم، شای خوێنمژو ژنبازی ئینگلیس بوون كە لە ژنی یەكەم‌و دووهەمی ئەو بوون.

پێش روون كردنەوەو گێڕانەوە سەردەمی پاشایەتی ئەو دوو خوشكە پێویستە ئاماژەیەك بە بەسەرهاتی باوكیان بكرێت، لەبەرئەوەی كە بەسەرهاتی ئەو پیاوە خۆی بە بەشێك لە ژیانی منداڵەكانی دەژمێردرێت‌و شێوەی هەڵسوكەوتی ئەو لەگەڵ ژنەكان و منداڵەكانی گرینگترین فاكتەری گەشەسەندنی كەسایەتی ئەوان بووە.

هانری هەشتەم منداڵی هانری حەوتەم بوو كە پتر بە ناوەكانی هانڕی تۆدۆر یان سەر سیلسیلەی خانەدانی تۆدۆر ناوبانگی دەركردووە. ئەو لەساڵی ١٤٩١ لەشاری گرینویچ لەدایك بووەو لەماوەی دەرس خوێندنی‌دا، پتر بەهۆی هۆگری بە ئەدەبیات‌و مۆسیقا لەدەرباری بریتانیا گرینگی پێدراوە. هانری هەشتەم لەتەمەنی دوازدە ساڵیدا هۆنراوەی دەگوت‌و هەندێك لە ئاوازەكانی مۆسیقای بە باشی دەژەنی، بەڵام پێگەیشتنی خێراو پێوەندی ئاشقانەی هانری لەتەمەنی دوازدە ساڵیدا لەگەڵ هاوسەری برا گەورەكەی (ئارتوور) كاریگەرییەكی زۆر لەسەر ئەودانا.

1-Bloody Mary
2-Mary Tudor





**مەلیكەماری (لای چەپ)و ئێلیزابێتی یەكەم (لای راست)، دووخووشك كە٥٠ساڵ**

**لە بریتانیا حوكمیان گێڕا**

هاوسەری ئارتوور (كاترین ئاراگۆن)[3] كچی پاشای ئیسپانیا بوو كە لەساڵی ١٥٠١ بۆ زەماوەند لەگەڵ ئارتوور كە لەو كاتەدا جێنشینی بریتانیا بوو، رۆیشتە ئەو وڵاتە. بەڵام ئارتوور بەهۆی نەخۆشیەوە چەند مانگێك پاش زەماوەند مرد. كاترین لەكاتی مردنی ئارتوور ١٧ساڵان بووو لەبەرئەوەی كە زەماوەندی ئەو لەگەڵ جێنشینی بریتانیا لە پێناو بەرژەوەندی سیاسی‌و بۆ یەكگرتوویی نێوان ئیسپانیاو بریتانیا پێكهێنرا بوو، هانری حەوتەم بڕیاریدا كە بووكەكەی (كاترین ئاراگۆن) لە خۆی مارە بكات و هەروەها بۆ ئەوەش كە زەماوەندەكەیان دژایەتی یاساكانی كەنیسە نەكات، رایگەیاند كە بەهۆی نەخۆشی ئارتوور، لەنێوان ئارتووورو كاترین پێوەندی ژن‌و مێردایەتی (جووت بوون) نەگیراوەو هەر بەم هۆیەشەوە زەماوەندەكەیان بەكردەوە هەڵوەشاوەتەوە. بەڵام لەبەر چەند هۆیەك‌و رەنگە لەبەر رازی نەبوونی كاترین یان دژایەتی باوكی، (پاشای ئیسپانیا) ئەم زەماوەندە سەری نەگرت‌و هانری حەوتەم كاترینی كردە دەزگیرانی كوڕەكەی كە شەش ساڵ لەو بچووكتر بوو. هانری هەشتەم لەساڵی ١٥٠٩ دوای

3-Catrherine of Aragon

باوكی لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشتو دەستبەجێ لەگەڵ كاترین زەماوەندی كرد. هانری لەكاتی زەماوەندی ئەوان ١٨ساڵو كاترین ٢٤ ساڵان بوو.

یەكەمین منداڵی هانری هەشتەمو كاترین لەساڵی ١٥١٠ چاوی بە دونیا هەڵێنا. منداڵەكە كچێك بوو كە بە مردووی لە دایك بووو پاش ئەوە كاترین لە ماوەی شەش ساڵدا چوار كوڕی بوو كە هەر چواریان لە ماوەی چەند رۆژێ یان چەند حەوتوویەك مردن. لەئاكامدا لەساڵی ١٥١٦ كاترین كچێكی بوو كە زیندوو مایەوەو هەمان ئەو كچە بوو كە بەناوی مەلیكەماری رۆڵێكی گرینگی لە مێژووی بریتانیا نواند. ئەو كچە بەنازە لەتەمەنی دووساڵیدا وەك مۆرەیەكی سیاسی لەلایەن باوكییەوە كەڵكی لێ وەرگیراو لەو تەمەنەدا بۆ پێكهێنانی یەكگرتوویەكی نوێ لەنێوان فەرانسەو ئیسپانیا ئەویان كردە دەزگیرانی جێنشینی فەرانسە.

بەڵام دەزگیرانێتی ئەوان بەهۆی سەر هەڵدانی ناكۆكی لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتە شێواو ئەمجارەیان ماری بوو بە دەزگیرانی جێنشینی شای ئیسپانیا. جێنشینی شای ئیسپانیا كە لەساڵی ١٥٢٠ وەك شارڵی پێنجەم بوو بە سەركردەی ئیسپانیا، لەساڵی ١٥٢٢ سەفەری كرد بۆ بریتانیاو بۆ یەكەمین جار دەزگیرانەكەی بینی كە لەو كاتەدا شەش ساڵا بوو. بەڵام چارە نووسی ماری كە پێڕەوی بارودۆخی سیاسەتی رۆژ بووو هانری هەشتەمیش كەدیسان یەكگرتوویی لەگەڵ فەرانسە بە بەرژەوەندی دەزانی، دەزگیرانییەتی ماریو شارڵیی هەڵوەشاندەوەو بەهۆی ئەوەی كە جێنشینی شای فەرانسە لەو كاتەدا زەماوەندی كردبوو، ماریی دەساڵەی كردە دەزگیرانی برا بچووكەكەی جێنشینی شای فەرانسە بەناوی دووك دورلۆئان. هەڵبەت هیچكام لەم دەزگیرانەتیانە بە زەماوەند كۆتایی پێنەهاتو ماری تۆدۆر لە ئاكامدا بوو بە پاشاو دوای ئەوە كە لەسەر تەخت دانیشت، لەتەمەنی ٣٨ ساڵیدا شوی كرد.
هانری هەشتەم كە پیاوێكی هەوەسبازو خۆشگوزەران بوو جگە لە هاوسەرە یاساییەكەی، لەگەڵ ژنانی تریشدا پێوەندی هەبوو. ئەم ژنانە هیچ ناونیشانێكیان لە مێژوودا نەماوە، بەڵام پێوەندی یەكێك لەو ژنانە بەناوی "ئانیبۆلین"[4] لەگەڵ هانری هەشتەم گەیشتە جێگایەك كە هانری بڕیاری دا هاو سەرە یاساییەكەی تەڵاق بداو لەگەڵ ئانیبۆلین زەماوەند بكات. بەڵام هەڵوەشاندنەوەی زەماوەندی پاشای بریتانیا لەگەڵ ژنێك كە زیاتر لە بیست ساڵ ژیانی لەگەڵ

4-Anne Boleyn



كردووە، پێویستیی بە هۆكاری بەهێزو رازی كردنی پاپ هەبوو كە لەو سەردەمەدا رێبەری مەزهەبی بریتانیا بوو. ئەو بەڵگەیەی كە هانری هەشتەم بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم زەماوەندە خستیە روو ئەوە بوو كە كاترین بە پێچەوانەی قسەی پێشووی خۆی، لەكاتی زەماوەندی یەكەمیدا لەگەڵ هاوسەری پێشووی (ئارتوور برای گەورەی هانری) جووت بووەو كچ نەبووە. پاپ كلێمێنتی حەوتەم (مامی كاترین دۆمێدیسی) كە لە فەسڵی پێشوودا ئاماژەی پێكرا ئەم داواكارییەی قەبووڵ نەكرد. بەهۆی ئەوەكە ئەگەر قەبووڵی بكردایە جگە لەوەی پاشەگەز بوونەوە لە قسەی پێشووی خۆی بوو، دەبووایە ماری تۆدۆریشی وەك منداڵی زۆڵی هانریو كاترین بناساندبایە.

ئەو كێشەیە بۆ چەندین ساڵ درێژەی كێشا تا ئەوە كە هانری هەشتەم بڕیاریدا كە خۆی لە گرێی ملكەچی لە فەرمانەكانی پاپ رزگار بكاتو سەربەخۆیی مەزهەبی لە بریتانیا رابگەیێنێت. لەسەر بنەمای ئەو بڕیارە كە لەساڵی ١٥٣٣ راگەیاندرا، پاشای بریتانیا بوو بە سەرۆكو رێبەری مەزهەبی بریتانیاو هەڵبژاردنی پلە مەزهەبییەكانیش بە خوودی پاشا ئەسپێردرا. هانری هەشتەم رۆژی ٢٣ی مەی ساڵی ١٥٣٣ خۆی بەتەنیا گرێبەندی زەماوەندەكەی لەگەڵ كاترین ئاراگۆن هەڵوەشاندەوەو چەند رۆژ دواتر بەشێوەیەكی یاسایی لەگەڵ ئانی بۆلین زماوەندی كرد. هەڵبەت هانریو ئانی بۆلین پێشتر بە شێوەیەكی شاراوە زەماوەندیان كردبووو ئانی سكی لە هانری پڕ ببوو. شاژنی نوێ رۆژی حەوتەمی سێپتەمبەری ساڵی ١٥٣٣ واتە سەد رۆژ پاش زەماوەند لەگەڵ پاشای بریتانیا كچێكی بوو كە ناویان نا ئێلیزابێت. پاشان پەرلمانی بریتانیا لەساڵی ١٥٣٤ ئەوی كردە میراتگری یاسایی تاجو تەختی بریتانیا. لە پەرلمانی بریتانیاو لەنێوان دەسەڵاتدارانی مەزهەبی دەوڵەت هەندێك دژایەتی لە بەرانبەر ئەو بڕیارەی پاشا سەری هەڵدا. بەڵام هانری هەشتەم بە زەبرو زەنگێكی زۆرەوە ئەو دژایەتیو بەرگرییانەی سەركوت كردو سەری چەند كەسیشی بەتایبەت ئۆسقۆفی گەورە (جان فیشێر)[5] بڕی. لەساڵی ١٥٣٦ هانری هەشتەم كە لە هاوسەرە نوێیەكەی تێرو وەڕەز ببوو، ئەوی بە تۆمەتی خەیانەتو زیناح گرتو دوای بەندكردنی لە تاوەری لەندەنو دادگاییەكی خێرا فەرمانی سەربڕینی ئەوی دەركرد و لەگەڵ ژنێكی تر بەناوی "جاین سیمۆر"[6] زەماوەندی كرد.

5-John Fisher

6-Jane Seymour





جاین سیمۆر لەساڵی ١٥٣٧کوڕێکی بوو کە دواتر بەناوی ئێدواردی شەشەم بۆ ماوەی شەش ساڵ حکوومەتی کرد. بەڵام جاین دوابەدوای بەدنیا هێنانی کوڕەکەی مردو دەستی هانریی بۆ زەماوەندی دواتری ئاواڵا کرد. ناکۆکیی نێوان هانری هەشتەمو پاپ لە ماوەی ساڵەکانی ١٥٣٦تا ١٥٣٩ زیاتر پەرەی سەندو پەرلمانی بریتانیا بە فەرمانی هانری هەشتەم هەندێك یاسای پەسەند کرد کە بەپێی ئەو یاسایانە سۆمعەو کەنێسەکانی کاتۆلیك لەسەرانسەری بریتانیا داخرانو دەست بە سەر هەموو سەروەتو سامانیان داگیرا. ئۆسقۆفو قەشەکانی کاتۆلیکی بریتانیا کە تا ئەو کاتە نەچوو بوونە ژێرباری فەرمانی سەربەخۆیی مەزهەبی بریتانیاو ئامادە نەبوون پاشای بریتانیا وەك ڕێبەری مەزهەبی و یاسایی دەوڵەت بناسێنن، گیرانو ئەوانەی ڕۆڵی بەر چاویان هەبوو لە سێدارە دران.



**هانری هەشتەمو ژنەکانی:١.کاترین ئاراگۆن، دایکی مەلیکە ماری٢.ئانی بۆلین، دایکی مەلیکە ئێلیزابێتی یەکەم ٣.جاین سیمۆر ٤.ئانی دێکلێڤس ٥.کاترین هۆوارد**

هانری هەشتەم لەساڵی ١٥٤٠دا ژنی چوارەمی بەناوی "ئانی دێکلێڤس"٧ هێنا، بەڵام زۆر زوو تەڵاقی دا. شایانی باسە کە بەختی مەزنی ئەو ژنە ئەوە بووکە هانری هەشتەم لەو پەڕی دەسەڵاتو ناکۆکی خۆی دابوو لەگەڵ پاپو پێویستی بە تاوانبار کردنو سەر بڕینی ئەو نەبوو. ئەگەرچی هانری لەجێگای ئەو، سەری یەکێك لە ڕاوێژکارەکانی بڕی کە پێشەکییەکانی ئەو زەماوەندە ناپیرۆزەی پێك هێنا بوو. هانری دوای تەڵاقدانی ئانی دێکلێڤس، لەتەمەنی ٥٠

7-Compiegne



ساڵیدا لەگەڵ کچێکی تەمەن هەژدە ساڵ بەناوی "کاترین هۆوارد"٨ زەماوەندی کرد کە پێش ئەم زەماوەندە پێوەندییان پێکەوە هەبوو. بەڵام ئەم زەماوەندەش زیاتر لە دوو ساڵ درێژەی نەکێشاو هانری کە وردە وردە وەك شێتی لێهاتبوو، دڵپیسیی لەو ژنە جوانە دەکرد کە زیاتر لە سی ساڵ جیاوازی تەمەنیان هەبوو و ئەویشی بە تۆمەتی خەیانەتو زینا لە دەربار وەدەرنا. کاترین گیراو دوای بەند کرانو ئازارو ئەشکەنجە لە تاوەری لەندەنو دان پێدانان بە خەیانەتەکەی، لەتەمەنی بیست ساڵیدا سەریان لە لەشی جیاکردەوە.

هانری هەشتەم ساڵێك پاش سەر بڕینی کاترین هۆوارد لەگەڵ ژنێکیتر بەناوی "کاترین پار"٩ زەماوەندی کرد. بەڵام ئەمجارەیان پیریو نەخۆشی دەرفەتی بیانوو هێنانەوەو تاوانبار کردنی ئەوی پێ نەدا. هانری لەساڵی ١٥٤٧ مردو شەشەمین ژنەکەشی دوای مردنی ئەو لەگەڵ یەکێك لە وەزیرەکانی بەناوی "سێرتۆماس سیمۆر"١٠ زەماوەندی کرد. لەو شەش ژنەی هانری هەشتەم تەنیا کوڕێكو دوو کچ زیندوو مانەوەو کوڕەکەی لەساڵی ١٥٤٧تا ١٥٣٣ پاشایەتی کردو بریتانیا لە ماوەی حکوومەتی شەش ساڵەی ئەودا زۆر لاواز بوو. ئێدواردی شەشەم لەکاتی پاڵدان بە تەختی دەسەڵاتەوە منداڵێکی١٠ساڵەو نەخۆش بوو، هەربۆیەش لەژێر سەرپەرشتی دو خاڵەکانی بەناوی سێرتۆماس سیمۆرو ئێدواردسیمۆر دابووو لەراستیدا ئەو دوو کەسە بوون کە بەناوی ئێدواردی شەشەم جڵەوی دەسەڵاتیان لە بریتانیا بەدەستەوە بوو. بەڵام لەساڵی ١٥٥١ لەسەر بەدەستهێنانی دەسەڵاتی زیاتر ناکۆکی کەوتە نێوان ئەو دوو برایەو دوای ئەوە کە سێر تۆماس سیمۆر بەدەستی براکەی کوژرا، ئێدواردسیمۆریش بەدەست بەر هەڵستکارەکانی لەسەر دەسەڵات لابراو لە سێدرەدراو دەسەڵاتەکانی حکوومەت بەدەستی یەکێك لە ڕێبەرانی دەمارگرژی پرۆتستان بەناوی "جان دادلی"١١، دووکی نۆرتۆمبێرلەند کەوت. ماریو خوشکە بچووکەکەی (ئێلیزابێت) تا ئەو کاتە ژیانێکی کەم تا کورت هێمنانەیان هەبووو لەبەرئەوەی کە لە منداڵییەوە پێکەوە گەورە ببوون هۆگری یەکتر ببوونو زۆربەی کاتیش پێکەوە دەژیان. براکانی سیمۆر، بەراسپاردەیی شارلی شەشەم کە کوڕە خاڵو دەزگیرانی پێشوی ماری بوو مارییان، لەگەڵ ئەوەی کە پێڕەوی مەزهەبی کاتۆلیك بوو ئازار

8-Catherine Howard
9-Catherine parr
10-Sir Thomas Seymour
11-John Dudley, Duke of Northumberland

نەدەداو ئێلیزابێتیش لەژێر پشتیوانیو پشت ئەستووری زڕ خوشکەکەی لە جەزرەبەو ئازاردانی ئەوان لە ئەماندا بوو. بەلاَم دوای ئەوە کە جان دادلی دەسەلاَتی بەدەستەوە گرت، بەهۆی ئەم پێوەندییەو لەترسی ئەوەی کە دوای مردنی ئێدڤاردی شەشەم پێشەکییەکانی پاشایەتی ماری پێك بێت، تەنگەتاوی کرد تەنانەت خوشکەکەی لێجیا کردەوە.

لەو کاتەدا پاشای ئیسپانیا چەند پاپۆڕێکی ناردە کەنارەکانی بریتانیا بۆئەوەی ماری لەو دەولَەتە ببەندەدەریێو بیهێننە برۆکسل بۆ لای ئەو.١٢ بەلاَم ڕێبەرانی کاتۆلیكو دەستەو پێوەندییەکانی ماری بە لەبەرچاو گرتنی نەخوشی بۆماوەییو ئەگەری مردنی نێزیکی ئێدڤاردی شەشەم کە شانسی جێنشینی ماری لە ئارادابوو، نەیان هێشت لە بریتانیا بچێتەدەرەوە. جان دادلی بۆ ئەوەی شانسی ماری بۆ جێنشینی لەناوببات مشۆرێکی نوێیخواردو خوشکەزاکەی هانری هەشتەمی بەناوی "جاین گری"١٣ کە کچێکی جوانیحەڤدە ساڵی بوو بۆ جێنشینی پاشای لەسەرە مەرگ هەلَبژارد. دادلی کاتێك کە جاین گریی لە کوڕەکەی مارە کرد، بیری لەوە نەکردبۆوە کە ڕازی کردنی شۆڕای پاشایەتی بۆ ئەوەی جاین گری ببێتە شاژنی داهاتووی بریتانیا هاوکات لەگەلّ هەبوونی خوشکە بچوکەکەی ماری واتە ئێلیزابێت کارێکی ئاسان نییە. جان دادلی بۆ ئەوەی کە ڕێگای جێنشینی بووکەکەی خۆش بکات، پاشای١٦ ساڵەی بریتانیای ناچار کرد کە بەر لە مردنی وەسیەتنامەیەك واژۆ بکاتو لەودا خوشکەکانی لەمافی دەسەلاَت بێبەری بکاو جاین گری بۆ جێنشینی پێشنیار بکات.

ئێدڤاردی شەشەم مانگێك دوای واژۆی ئەو وەسیەتنامەیە لەڕۆژی شەشەمی ژوئییەی **١٥٥٣**دا مردوجان دادلی سێ ڕۆژ هەواڵی مردنی ئەوی شاردەوە تا ڕێگەی ڕازی کردنی ئەنجوومەنی پاشایەتی سەبارەت بە ڕاگەیاندنی بڕیاری شاژنیی جاین گری خۆش بکات. جان دادلی هاوکات لەگەلّ ئەو کارە سەرقالّی ئامادەکردنی هێزەکانو کۆکردنەوەیان لەخالّە گرینگەکانی شاری لەندەن بوو کە هەر چەشنە بەرگرییەکی چاوەڕوانکراو لە بەرانبەر ئەو بڕیارە تێك بشکێنێ. زۆربەی ئەندامانی ئەنجوومەنی پاشایەتی لەگەلّ پلانی جان دادلیو ناساندنی جاین گری وەك شاژنی بریتانیا ناکۆك بوون. بەلاَم لەو هەلومەرجە پڕ مەترسیو خۆفەی کە لەلایەن ئەوەوە

١٢- ئەوکات بێلجیکاوشاری برۆکسێل بەشێك لەئیمپراتۆری ئیسپانیا بوو

13-Jane Gray



دروست کرابوو، بە ناچاری ناوەڕۆکی وەسیەتنامەکەی هانرییان پەسەند کردو جاین گری لە ڕۆژی دەی ژوئییەی ساڵی **١٥٥٣** وەك شاژنی بریتانیا ناسرا.

هاوکات لەگەلّ ڕاگەیاندنی ئەم بڕیارە لەلایەن ئەنجوومەنی پاشایەتی بریتانیاوە لە ڕێوڕەسمێکی مەزهەبی کە لە کەنێسەی ساینت پۆل بەڕێوە چوو، ئۆسقۆف"ریدلی"[14] بە هاندانی جان دادلی هەردوو خوشکەکەی هانری هەشتەمی بە زۆلّ ناساندو ئاگری ڕقو تووڕەیی کاتۆلیکەکانی خۆش کرد. لەبەرئەوە کە لەڕووانگەی کاتۆلیکەکانەوە ماری نەتەنیا زۆلّ نەبوو بەلّکوو بە تەنیا منداڵی شەرعی هانری دەژمێردرا. ڕێبەرانی کاتۆلیکی بریتانیا هیچ کات لەو باوەڕەدا نەبون کە تەلاَقی دایکی ماریو زەماوەندەکانی دواتری هانری یاسایی بێت. بەیانیی ئەو ڕۆژەی کە بڕیاری هەلّبژاردنی جاین گری وەك شاژنی بریتانیا ڕاگەیاندرا، ماری بەیارمەتی ژمارەیەك لەلایەنگرەکانی لە شاری لەندەن چووە دەرەوە. ڕێبەرانی کاتۆلیك داوایان لەلایەنگرەکانیان کرد لە بەرانبەر حکوومەتی شاژنی نایاسایی بەرگری بکەنو هەربۆیەش لە "ئێست ئانگلیا"[15] ناوەندێکی بەرگرییان لە بەرانبەر ئەو حکوومەتە دامەزراند.

جان دادلی لە پێشەوەی هێزێکی سێ هەزارکەسی بەرەو ئەو بەشەی بریتانیا وەڕێکەوت تا هێزە لایەنگرەکانی ماری سەرکوتو خودی ماری دەستبەسەر بکاتو بیهێنێتەوە شاری لەندەن. هەروەها شەش پاپۆڕیشی بۆ پشتیوانی ئەو هێزانە ناردە بەشی کەناراوی ناوچەی کۆبوونەوەکانی لایەنگرانی ماری. ئەو پاپۆڕانە هەروەها ئەرکی ئەوەیان لە ئەستۆ بوو کە نەهێلّن ماری لە ڕێگای دەریاوە هەلّبێت. بەلاَم کارەساتەکان بە پێچەوانەی پلانەکانو تێبینییەکانی جان دادلی بوو. لەو پاپۆڕانەی کە بەرەو کەنارەکانی ڕۆژهەلاَت بەڕێوە بوون ڕاپەڕینێك بۆ لایەنگری لە ماری ڕوویداو هەر شەش پاپۆڕەکە پێوەندییان بەهێزەکانی لایەنگری مارییەوە گرت. جان دادلی لە کۆمبریج لەم کارە ئاگادار کرایەوەو لەکاتی گەڕانەوە بۆ لەندەن بوو کە پێیان ڕاگەیاند لە لەندەنیش خەلّك دژی حکوومەتی نوێ شۆڕشیان کردووە. لەگەلّ ئەوەی کە زۆربەی دانیشتووانی لەندەن پرۆتستان بوون، بەلاَم لە بەرانبەرشۆڕشی لایەنگرانی ماری زۆریان بەر گری نە کرد،ئەمەش بەهۆی ئەوە بووکە شێوازی دادلی لە

14-Bishop Ridley
15-East Anglia





بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات لەلایەن خەڵکەوە قەبووڵ نەدەکراو تەنانەت پرۆتستانەکانیش شکیان لە یاسایی بوونی حکوومەتی جاین گری هەبوو. جگە لەمەش هەوادارانی ماری لە زمانی مارییەوە دەیانگوت: ماری ڕێز لە ئازادی بیرو باوەڕی مەزهەبی خەڵك دەگریۆ هیچ جیاوازییەك ناکات لەنێوان کاتۆلیكو پرۆتستانەکان. ماریو خوشکەکەی لە گەرماوگەرمی ڕاپەڕینی دانیشتوانی لەندەن چوونە ناوشار. هاوڕێیەتی ئێلیزابێت لەگەڵ ماری متمانەی پرۆتستانەکانی زیاتر کرد، لەبەرئەوەی ئێلیزابێت پیڕەوی مەزهەبی پرۆتستان بووو ماری بە دەربرینی خۆشەویستی بەو، وای دەنواند کە ڕێز لە بیرو باوەڕەکانی ئەو دەگریۆ هیچ دەمار گرژییەکی مەزهەبی نی‌یە. دانیشتوانی لەندەن بە بەرزکردنەوەی درووشمەکانی "هەربمێنێ مەلیکە ماری"و"خوا مەلیکە ماری بپارێزێت" پێشوازییان لێکردو زۆربەی ئەندامانی ئەنجومەنی پاشایەتیش کە دوو حەوتوو پێشتر، جاین گرییان وەك شاژنی بریتانیا هەڵبژارد بوو، ڕایان گەیاند کە بە پێچەوانەی مەیل وخواستی خۆیان ملکەچی ئەو بڕیارە بوونو ئێستاش ماری، کچە گەورەکەی هانڕی هەشتەم وەك شاژنی یاسایی بریتانیا دەناسن. یەکەمین فەرمانی ماری دەرکردنی حوکمی دەستبە سەرکردنی جاین گریو مێردەکەی بوو. جان دادلیو هەوادارەکانی گیرانو گواسترانەوە بۆ شاری لەندەن. مەلیکە ماری هەوادارانی خۆی لەسەر پۆستەکانی مەزهەبیو دەوڵەتی دانا و"ئێستیڤێن گاردینێر"[16] (ئۆسقۆفی کاتۆلیك)یش کرا بە سەرۆکی وەزیران. لە دووهەمین حەوتووی پاشایەتی ماریدا ناوی ٢٧ کەس لەو کەسانەی کە دژی ئەو پیلانیان دارشتبووو دەیانەویست ڕێ لە دەسەڵاتی ئەو بگرن، پێشکەش بە ماری کرا. ئەو کەسانەی ئەو ناوانەیان دابوو بە ماری داوایان لێکرد لەکاتی دادگایی کردنیان تاوانی خەیانەتیان بخرێتە پاڵو سزای ئەم تاوانەش تەنیا ئێعدام بوو. مەلیکە ماری کە لەسەرەتای بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات شێوازێکی هێمنی گرتبووە بەرو نەیدەویست حوکمڕانییەکەی بە خوێنڕیژی دەست پێبکات، ناوی بیست کەس لەو پیلانگێڕانەی سڕییەوە کە پێشنیاری دادگایی کردنیان درا بووو تەنیا فەرمانیدادگایی کردنی حەوت کەسیانی دەرکرد. هەر حەوتیان کە جان دادلی لەسەرەوەی هەموویانەوە بوو مەحکووم بە ئێعدام کران. مەلیکە ماری دەیهەویست لە هەموویان خۆش بێت، بەڵام ڕاوێژکارەکانی ئەویان لەم کارە پاشەگەز کردەوەو وتیان هێمنیی بەم ڕادەیە دەبێتە هۆی نەترسانی بەرهەڵستکارەکانی تریش نەترسن. لە ئەنجامدا بە پێداگرتنی مەلیکە ماری چوار کەسیان لە مردن ڕزگاریان بووو تەنیا سێ کەس، جان دادلیو دوو هاوکارە سەرەکییەکەی لە سێدارە دران.

16-Phen Gardiner



دوو کەس لەو تاوانبارانەی کە بە پێداگری مەلیکە ماری لە مەرگ ڕزگاریان بوو، جاین گریو هاوسەرەکەی بوون کە لە تاوەری لەندەن زیندانی کرانو فەرمان درا لەدوو بەشی جیاو دووری تاوەرەکە بەند بکرێن. هۆکاری خۆپاراستنی مەلیکە لە قەبووڵ نەکردنی حوکمی کوشتنی جاین گری ومێردەکەی ئەوە بوو کە دەیزانی ئەو دووانە ئامێری دەستی جان دادلی بوون بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی و لەو باوەڕەدا بوو کە جاین لە ڕووی مەیلو ئیرادەوە خوازیاری پلەی پاشایەتی نەبووە. فەرمانی جیا لەیەك ڕاگرتنی ئەم ژنو مێردە کردەوەیەکی خۆپاراستن بوو تا نەوەك جووت بوونی ئەو دوانە ببێتە هۆی درووست بوونی منداڵێك کە لە داهاتوودا داوای پلەی پاشایەتی بریتانیا بکات !مەلیکە ماری لە سێپتەمبەری ساڵی ١٥٥٣ لە کەنیسەی "وێست مینستێر"[17] تاجی لەسەرناو یەکەمین ژن بوو کە دوای چوارسەد ساڵ بوو بە پاشای بریتانیا.

لەو کاتەدا ئەو کچێکی سی‌وحەوت ساڵان بوو کە ئاسەواری دەردو ڕەنجی درێژی ژیان لەژێر دەستی پێنج زڕ دایك، لە ڕوخسارو سەرو چاوی لاوازو زەردی دەبینرا. هەوادارانی مەلیکەماری هەر لەسەرەتاوە لە بیری پەیداکردنی مێردێکی باشو گونجاو بوون بۆی. بەڵام جیاوازی ڕا لەسەر ئەم بابەتە بووە هۆی سەرهەڵدانی بۆشاییو ناکۆکی لەنێوان شاژنو لایەنگرانی.

شاژن خوازبێنیی کەسایەتییە بەرچاو ڕێزدارەکانی بریتانیای کە داواکاری زەماوەند لەگەڵ ئەو بوون، قەبووڵ نەکردو لە جیاتی ئەوان پێشنیاری کوڕە خاڵەکەی (پاشای ئیسپانیا) بۆ زەماوەند لەگەڵ کوڕە گەورەکەی (فلیپ) قەبووڵ کرد کە دوازدە ساڵ لەو بچووکتر بوو. یەکەمین کەس کە دژی ئەم زەماوەندە ڕاوەستا، سەرۆك وەزیرانی شاژن بوو کە دەیزانی گەلی بریتانیا زەماوەندی شاژنو شازادەی ئیسپانیایان پێخۆش نی‌یەو بەتایبەت کە دایکی مەلیکەش ئیسپانیاییەو بەو زەماوەندە دەرباری بریتانیا دەکەوێتە ژێر کاریگەری دەرباری ئیسپانیا.

بەڵام ئامۆژگاریو ڕاسپاردەکانی گاردینێر(سەرۆکی وەزیران)و لایەنگرانی شاژن کاریگەر نەبووو مەلیکە ماری بە کەللەرەقییەکی زۆرەوە بۆ دابینکردنی ئاواتی دڵی هەڵویستی گرت. ڕۆژی دەی ژانڤییەی ساڵی ١٥٥٤نوێنەری دەرباری ئیسپانیا بە شێوەیەکی فەرمی بۆ بەستنی گرێبەندی زەماوەند هاتە لای مەلیکە ماری. شاژن بۆ بەدەست هێنانی ڕەزایەتی گەلی بریتانیا ئەو مەرجەی خستە نێو گرێبەندەکە کە مێردەکەی دەست لە کاروباری بریتانیا وەرنادات. بەڵام هیچ گرێنتییەك

17-Westminster





لە ئارادا نەبوو کە ئەم مەرجە جێبەجێبکرێت، لە بەرئەوەی مێردی شاژن هەر دەیتوانی لە رێگای ئەوەوە ئامانجەکانی دابین بکات. پێش ئەوەی رێورەسمی ئەو زەماوەندە بەرێوە بچێت، چەند جوولانەوەیەك لە دژی ئەو زەماوەندە لە لەندەنو بەشەکانی‌تری بریتانیا دەستی پێکرد. لەسەرووی ئەو جوولانەوە بەرهەڵستکارییانەدا چەند کەس لە کەسایەتییە ناسراوەکانی بریتانیا، وەك لۆرد "دیڤۆن"[18]و"سێر تۆماس ویات"[19]و "دووك سۆفولك"[20] راوەستا بوون. لۆرد دیڤۆن یەکێك لە داواکارەکانی زەماوەند لەگەڵ شاژن بووو سێرتۆماس ویات بە یەکێك لە ئازاترینو بەجەرگترین سەرکردەکانی سەربازی دەژمێردراو دووك سۆفۆلك، باوکی جاین گری لەگەڵ ئەو بەلایەی کە بە سەر کچەکەیدا هاتبوو هێشتاش متمانەو دەسەڵاتی زۆری هەبوو. هاوکات لەگەڵ شۆرشێك کە لە لەندەن دەستی پێکردو لۆرد دیڤۆنو دووك سۆفۆلك رۆڵێکی گرینگیان تێیدا هەبوو، سێر تۆماس ویاتیش بەهێزێکی پازدە هەزارکەسی بەرەو لەندەن وەرێکەوت. ئەنجوومەنی پاشایەتیش نەیتوانی بۆ بەرگری لە بەرانبەر ئەو مەترسییەدا هەڵوێست بگرێو هێزکانی شاژنیش دیسان داوایان لێدەکرد کە پاشەگەز بێتەوە لە بریارەکەی سەبارەت بە زەماوەند لەگەڵ شازادەی ئیسپانیایی. بەلام شاژن بە تەنیا بریاری بەرنگار بوونەوەی هێرش بەرانو یاخی بوانی دەرکردو بۆ پێشگیری لە هاتنە ژوورەوەی هێزەکانی ویات بۆ لەندەن، فەرمانی‌دا پردەکانی سەر رووباری تیمس بروخێنن. لەگەڵ ئەوەش حەوت هەزارکەس لە هێرش بەران توانیان لە رووباری تیمس بپەرنەوەو بچنە ناو شاری لەندەن. ئەنجوومەنی پاشایەتی کەوتە بیری ئاشتیو پێکهاتن، بەلام تەنیا مەرجی ویات بۆ ئاشتیو پێکهاتن ئەوە بوو کە شاژن بەڵێن بدات لەگەڵ کەسێکی بریتانی زەماوەند بکات. مەلیکە ماری ئەندامانی ئەنجوومەنی پاشایەتیی بانگ کردو ووتی هیچکەسێك ناتوانێ مێردێکی‌تری بە سەر دابسەپێنێو ئەگەر بریاربێت لە زەماوەند لەگەڵ ئەو پیاوە کە خۆی دەیهەوێ پاشەگەز بێتەوە هیچکات مێرد ناکات. لەو کاتەدا مەلیکە ماری بۆ بەرەنگاری هێرشبەرەکان هێزێکی دەهەزارکەسیو تۆپخانەیەكو ١٥ هەزار سواری ئامادە کردو لە هێرشێکی لەنەکاو خافڵگیرانەدا ئەوانی پەرش‌وبلاو کرد. سەدان کەس لەسەر کردە شۆرشگێرو هێرشبەرەکان دەستبەسەرو مەحکووم بە مەرگ کرانو بە ماوەی ١٥ رۆژ دانیشتوانی شاری لەندەن شایەتی لە سێدارەدرانی ئەوان لەشەقامە

18-Earl of Devon
19-Sir Thomas Wyatt
20-Duke of suffolk



سەرەکییەکانی شار بوون. دووك سۆفۆلك( باوکی جاین گری)و سێر تۆماس ویات لەو کەسانە بوون کە لە سێدارە دران. ماوەیەك دوای سەرکوتی شۆرش، مەلیکە ماری کە بە پێچەوانەی سەرەتاکانی پاشایەتی، شێوازی زەبرو زەنگو توورەیی گرتبووە پێش، فەرمانی کوشتنی جاین گریو مێردەکەی دەرکردو بۆ ئەم مەبەستەش رێگای توندو نامرۆڤانەی سەربرینی بەکار هێنا. ماری لەسەرەتای پاشایەتی بە پێشگیری لە جێبەجێکردنی حوکمی کوشتنی جاین گریو مێردە کەی، دانی بە بێ‌تاوانی ئەوان دانا بوو، بەلام سەربرینی ئەو ژنە جوانە هەژدەساڵەیە جگە لە هەستی تۆڵە سەندنەوەو قین لە دڵگرتن هۆیێکی‌تری نەبوو.

کارێکی‌تری مەلیکە ماری کە بووە هۆی توورەییو نارەزایی بەتایبەت لەنێوان پرۆتستانەکان، بریتی بوو لە دوورخستنەوەی ئێلیزابێتو دوایش بەند کردنی لە تاوەری لەندەن. ئێلیزابێت هیچ تاوانێکی نەبووو هۆی تاوانبارکرانی ئەو لە مەر پێوەندی بە یاخی بووانو بەرهەڵستکارانی شاژن درۆ بوو. بەپێی هەندێك بەڵگە کە دواتر بەدەست کەوت، روون بۆوە کە مەلیکە ماری لەژێر کاریگەریو بەگوێدا خوێندنی نێردراوی پاشای ئیسپانیا بۆی دەرکەوتووە کە بوونو مانەوەی خوشکەکەی لەدەربار دەبێتە مەترسی لەسەر دەسەڵاتی ئەو. لە هەندێك لەسەرچاوەکاندا نووسراوە کە نێردراوی پاشای ئیسپانیا (رێنارد)[21] بە مەلیکە ماریی وتووە هەتا ئێلیزابێت زیندوە تەختو تاجی ئەو لە مەترسیدا دەبێت، بەلام ماری ئامادە نەبووە بریاری کوشتنی خوشکی بداتو تەنیا بە بەندکردنی ئەو لە تاوەری لەندەن رازی بوو.



**وێنەی ئێلیزابێتی یەکەم لە سەرەتاکانی دەسەڵات**

21-Renard





پرەنس فلیپی دەزگیرانی مەلیکە ماری رۆژی بیستەمی ژووئیەی ساڵی ١٥٥٤ رۆیشتە بریتانیاو لە رۆژی ٢٤ی ژووئیەدا رێورەسمی زەماوەندی ئەوان بە جێژنێکی بەشکۆ بەرێوە چوو. ماری کە لەتەمەنی ٣٨ ساڵیدا ببوو بە بووك، زۆر هۆگرو ئاشقی مێردە ٢٦ ساڵەکەی بووو هەر بەو شێوەیەی کە چاوەروان دەکرا لەژێرکاریگەری تەڵقینەکانی ئەودا هەندێك کاری کرد کە بووە هۆی لاواز بوونی حکوومەتو بەدناوی ئەو تائەبەد. مەلیکە ماری بە پێچەوانەی ئەو بەڵێنانەی کە لەسەرەتای دەسەڵاتدا سەبارەت بەئازادی مەزهەب لە بریتانیا دابووی، لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٥٥٤ پەرلمانی بریتانیای ناچار کرد کە مەزهەبی کاتۆلیك بکاتە مەزهەبی رەسمی بریتانیا. دوابەدوای پەسەند کرانی ئەم یاسایە، ئازاری پرۆتستانەکانیش لەبریتانیا دەستی پێکردو قەشەکانو بانگەشەکەرانی پرۆتستان بە تاوانی کوفرو لادان لە دین راوەدوو نران. یەکەمین قەشە کە دەستبەسەر کراوو بە شێوەیێکی ناحەزو نامرۆڤانە بە زیندوویی ئاگری تێبەردرا "جان رۆجێرز"[22] بوو. دوای ئەو نۆبە گەیشتە چەند ئۆسقۆفێکی بەرچاوو لێهاتووی وەك "هۆپێر"[23]و"لاتیمێر"[24]و ریدلی کە هەرسێکیان دوای سووکایەتی پێکردنو ئەشکەنجە ئاگریان تێبەردرا. شاژن خۆی فەرمانی گرتنو کوشتنی ریدلیی دەرکرد. ئەمەش لەبەر ئەوەکە ریدلی هەمان ئەو ئۆسقۆفە بوو کە لە رێورەسمی راگەیاندنی جاین گری وەك شاژنی بریتانیا بەشداری کرد بووو ماریو ئێلیزابێتی بە زۆڵ ناساندبوو. لە سێسەد ئۆسقۆفو قەشەی پرۆتستان کە لە ماوەی دەسەلاتی مەلیکە ماری لە ئاگردا سوتان، بەسەرهاتی "تۆماس کرانمێر"[25]، ئۆسقۆفی گەورەی کاشێربووری لە هەمووان تراژێدیترو نامرۆڤانەتر بوو. ئۆسقۆف کرانمێر کارامەترینو بەرچاوترین رێبەری پرۆتستانەکانی بریتانیا بوو کە مەلیکە ماری پێی وابوو ئەگەر ئەو ناچاربە تۆبەو داوای لێبووردن و پاشەگەزبوونەوە لەمەزهەبی پرۆتستان بکات، پرۆتستانەکانی تری بریتانیاش پێرەوی لێ دەکەنو دەگەرێنەوە سەرمەزهەبی کاتۆلیك. کرانمێریان لەژێر ئەشکەنجە ناچارکرد حەوت جار لێبووردننامەکەی واژۆ بکاتو دوایش ئەویان لەبەرامبەر ئاگرێك داناو ئیختیاری هەڵبژاردنی سووتاندن یان خوێندنەوەی لێبووردننامەکەو رەدکردنەوەی مەزهەبی پرۆتستانیان لە بەرچاوی خەڵك پێدا. کرانمێر لەبەر چاوی دانیشتوان

22-John Rogers
23-Hooper
24-Latimer
25-Thomas Cranmer



هاواری کرد لێبووردننامەکەی لەژێر ئەشکەنجەو بە پێچەوانەی بیرو باوەری واژۆ کردووە. دواییش دەستی راستی بەرەو گری ئاگرەکە درێژکردەوەو لە کاتێکدا هاواری دەکرد "بسوتێ ئەودەستەی بەڵگەیەکی وەها سەر شۆرانەی واژۆ کردووە"، خۆی خستە نێو ئاگرەکە. ئەو مێژوونووسو سایکۆلیستانەی کەسەبارەت بە ژیانو کارەکانی ماری وەردبوونەتەوەو لێکۆڵینەوەیان کردووە، لە بەراورد کردنی رەوشتی هێمن ومرۆڤانەی ماری لەسەرەتاکانی پاشایەتیو زەبرو زەنگو توورەیی سێ ساڵی کۆتایی حکوومەتەکەی دەڵێن: تەواوی تاوانەکانی ئەو لە بەگوێدا خوێندنو لەمێشك رۆکردنەکانی مێردەکەی سەرچاوەی گرتووە. لەبەرئەوەی ماری لە رادەبەدەر ئەوی خۆش دەویستو پێی خۆش نەبوو یان نەیدەتوانی لە فەرمانەکانی ئەو لابدات. فیلیپ کە دواتر بوو بە پاشای ئیسپانیا، کردەوە ناحەزو چەپەڵەکانی دەورانی "ئەنکۆیزیسیۆن"[26]ی لە ئیسپانیاو بەشە داگیرکراوەکانیتری دووپات کردەوەو سرووشتی خۆی وەدەرخست. زۆری تەمەنی خاڵی لاوازی مەلیکە ماری لەبەرامبەر مێردەکەی، بوو کە لەکاتی زەماوەند لەگەڵ فیلیپ گەیشتبووە ٤٠ ساڵو دەیهەویست بەهەر نرخێك بێت مێردە لاوەکەی رازی بکات. بەلاّم فیلیپ کە بۆ دابینکردنی ئامانجە سیاسییەکانی باوکی ئەو زەماوەندەی کرد بووو کەمترین هۆگریو خۆشەویستیی سەبارەت بە ماری نەبوو، دوای ساڵێك ژیان لەگەڵ ماری لە هاونشینی ئەو وەرەز بووو بە بیانووی بینینی باوکی گەرایەوە ئیسپانیا. ئاواتی ماری سەبارەت بە دونیا هێنانی منداڵێك بۆ مێرد کەی نەهاتە دیو بەدڵتەنگی مالاّوایی لە فیلیپ کرد. دوای گەرانەوەی فیلیپ بۆ ئیسپانیا، پاشای ئیسپانیا بەقازانجی کورەکەی وازی لە تەختی دەسەلاّت هێناو فیلیپ بەناوی فیلیپی دووهەم لە ژانڤییەی ساڵی ١٥٥٦ لەسەر تەختی دەسەلاّت دانیشت.

فیلیپ بە بیانووی کێشەو گیروگرفتەکانی بەرێوبەرایەتیی دەسەلاّت، لە گەرانەوە بۆ بریتانیا خۆی دەپاراستو تەنانەت لەو ماوەیەی کە لە برۆکسێل بوو زەحمەتی سەفەری بۆ بریتانیاو بینینی هاوسەری بە خۆی نەدا. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بریارێکی گرینگ لە لەندەن بەبێ راوێژ

٢٦- Inquisition یانی لێپرسینەوەی بیروباوەرو ناوی دادگایەکی مەزهەبییە کە لە سەدەی ١٢ی زایینی بۆ لێپرسینەوەی بیرو باوەری خەڵكو بەدواداگەرانی ئەو کەسانەی بیرو باوەریان جیاواز بوو دامەزراو تا سەدەی حەڤدەیەم لە ئێمپراتۆریەتی ئیسپانیا دا مابوو.





لەگەڵ دەرباری ئیسپانیا نەدەدراو گەلی بریتانیاش لەوە کە بەکردەوە چووبونە ژێر فەرمانی ئیسپانیا زویر ببوون. لەو کاتانەدا پیلانێك بۆ کوشتنی شاژن ئاشکرا بوو. پیلانگێڕەکان کە ژمارەیەکیان لە لەئەندامانی دەربار بوون دەستبەسەرو دواتریش کوژران. مەلیکە ماری لەم ڕێکەوتەوە بەم لاوە لە ترسی گیانی لە کۆشکی تایبەتی خۆی کە بە توووندی دەپارێزرا نەدەهاتە دەرەوەو جگە لە چەند کەسێکی‌دیاریکراو، کەس دەستی پێی ڕانەدەگەیشت. لەو کاتەدا مەلیکە ماری بە پاڕانەوە داوای لە مێردەکەی دەکرد کە بۆ بینینی ئەو بگەڕێتەوە لەندەنو لە ئاکامدا فیلیپ لەمانگی مارسی ١٥٥٧ جارێکی‌تریش هەنگاوی نایە سەر خاکی بریتانیا. ئامانجی فیلیپ لەو سەفەرە بینینی ژنێك نی‌یە کە کەمترین هۆگری پێ نەبوو، بەڵکوو دەیهەویست لە کارتێکەرییەکەی لە هاوسەری کەڵك وەرگرێ هەتا بریتانیا لەگەڵ ئیسپانیا بۆ شەڕ لەگەڵ فەڕانسە ڕێك بخات. بەڵام گەلی بریتانیا بە هیچ شێوەیەك ڕازی نەبوون بەشداری لە شەڕێکدا بکەن کە هیچ قازانجێکی ئەوتۆی تێدا نییە بۆیان. بەڵام لەم کاتەدا خودی فەڕانسییەکانیش هەڵەیەکیان کردو ئەم هەڵەیەش یارمەتی دەربوو بۆ ئەوەی پیلانەکانی فلیپ لەمەڕهێنانە ناوەوەی بریتانیا بۆ شەڕی فەڕانسە سەربگرێت. گرووپێك لە بەرهەڵستکارانی ماری کە دژی درێژە کێشانی دەسەڵاتی ئیسپانیا لەسەر دەرباری بریتانیا بوونو چەند کەسێك لە نەجیب زادەکانی کاتۆلیکیشیان لەگەڵ بوو، بە پاپۆڕێکی فەڕانسی هاتنە کەنارەکانی بریتانیا و دوای داگیر کردنی قەڵاو سەنگەرەکانی ئەم ناوچەیە، گەلی بریتانیایان بۆ ڕاپەڕین دژی حکوومەتی شاژن هاندا.

بەڵام ژمارەی شۆڕشگێڕەکانو ئەو کەسانەی کە پێوەندییان پێوە گرتن کەم بوو. مەلیکە ماری دوای تێکشاندنی ئەو شۆڕشە فەرمانی‌دا سەری هەموو دیلکراوەکان بپەڕێنن. ماری لەسەرەتاکانی مانگی ژووەنی ساڵی ١٥٥٧ شەڕی دژی فەڕانسە ڕاگەیاندو فیلیپ کە مەبەستی خۆی گەیشتبوو مانگێك دواتر بە بیانووی سەرپەرشتی چالاکییەکانی شەڕی دژی فەڕانسە، ماریی بەجێهێشت. ماری بۆ بەرێکردنی فیلیپ چووە بەندەری "دۆڤێر"[27] و بە چاوی گریانەوە ماڵاوایی لە فیلیپ کرد. ئەوە دوایین دیمانەی ئەوان بوو، لەبەرئەوەی کە ماری ئیتر هەرگیز هاوسەرەکەی نەبینی‌یەوە. شەڕی بریتانیاو فەڕانسە لەسەرەتادا بە قازانجی بریتانیا

27-Dover



دەرۆیشتە پێشێو فەڕانسییەکان کە خافڵگیر ببوون بەشێك لە زەوییەکانی کەنارەیان لە دەست دا، بەڵام لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٥٥٧ بە هێرشە بەرپرچدەرەوەکانی هێزەکانی فەڕانسە، بریتانیاییەکان لە تەواوی بەرەکانی شەڕ ناچار بە پاشەکشە کرانو ڕۆژی هەشتەمی ژانڤییەی ساڵی ١٥٥٨ دوایین پێگەی بریتانیا لە خاکی فەڕانسە (کالایس)[28] کە پێش دەستپێکردنی شەڕیش هەر لە دەست بریتانیادا بوو، گیراو بەوەش بریتانیا ئیتر لە بەشی ئەورووپادا جێگایەکی نەما. داواکارییە یەك لە دوای یەکەکانی ماری لە فیلیپ بۆ ئەوەی کە یارمەتی بدات کالایس وەر گرێتەوە، بێ‌ئاکام مایەوەو ماری لەسەرەتاکانی پاییزی ساڵی ١٥٥٨ نەخۆش کەوتو لە ڕۆژی ١٧ ی نۆڤەمبەری ئەو ساڵەدا لە کاتێك کە ناوی فیلیپو کالایسی لەسەر زار بوو مرد.

***

مەلیکە ماری لەکاتی مردنیدا یەکێك لە دزێوترین پاشاکانی بریتانیا بوو کە نازناوی ماری خوێنخۆر یان ماری خوێنمژی بۆ ماوەتەو ئەمرۆکەش هەر لەسەر زمانە. بەو ڕقەی کە لە کارەکانی ماری لەنێوان خەڵك دروست ببوو، هەموو خەڵك چاویان بڕیبووە خوشکەکەیو ڕۆژی دوای مردنی ماری بۆ ئازاد کردنی ئێلیزابێت بەرەو تاوەری لەندەن وەرێکەوتن. پەرلمانی بریتانیاش کە لە کۆتاییەکانی دەسەڵاتی ماری بەکردەوە دەسەڵاتی نەمابوو، لەکۆبوونەوەیەکی نائاسایی‌دا ئێلیزابێتی وەك شاژنی بریتانیا هەڵبژاردو ئێلیزابێتیش دەستبەجێ لە کونجی بەندیخانەوە گوازرایەوە کۆشکی پاشایەتی. هەڵبژاردنی خێرای ئێلیزابێت وەك شاژنی بریتانیاو گواستنەوەی ئاسانی دەسەڵات بۆ ئەو، بەرهەمی چەند فاکتەر بوو کە گرینگترینیان بریتی بوو لە ئاڵۆزی باروودۆخی بریتانیا لە کۆتاییەکانی دەسەڵاتی ماریو پێویستیو مەیلی خەڵك بۆ جێگیر بوونی بارودۆخی وەڵات دوای مردنی ماری. جگەلەمەش لەکاتی مردنی مەلیکە ماری هیچ داواکارێکی‌تری تاجو تەخت لە بریتانیا نەمابوو. پەرلمانی بریتانیا لەو هەل ومەرجەدا وای دەبینی کە هەڵبژاردنی ئێلیزابێت وەك شاژنی بریتانیا باشترین ڕێگایە بۆ دابینکردنی یەکیەتیو یەك پارچەیی گەلی بریتانیا. تەنیا دڵە خوورپەی بەریتانیاییەکان لە هەلبژاردنی ئێلیزابێت وەك شاژنی ئەو وڵاتە ئەوە بوو کە ئەو ئازارو ئەشکەنجانەی کە لەکاتی حکوومەتی

28-Calais





مەلیکە ماری دەکرایە سەر پرۆتستانەکان ئەمجارەیان بکرێتە سەر کاتۆلیکەکان. ئێلیزابێت پێڕەوی مەزهەبی پرۆتستان بووو لەگەڵ پێداگری ماری بۆ ئەوەی کە ئێلیزابێت مەزهەبی کاتۆلیك قەبووڵ بکات، ئێلیزابێت قەت ئامادە نەبوو مەزهەبی کاتۆلیك قەبووڵ بکات. بەلاّم لایەنگرانی ئێلیزابێت لە پەرلمانی بریتانیا لە ڕێگای "ویلیام سیسیل"[29]، وەزیری ئێدواردی شەشەمو پیاوی ڕێزداری پرۆتستانەکانەوە توانیان پەرلمان ڕازی بکەن کە ئێلیزابێت ئازادی مەزهەب لە بریتانیا مسۆگەر دەکاتو هیچ بەر تەسکییەك بۆ پێڕەوانی مەزهەبی کاتۆلیك درووست نابێت. ویلیام سیسیلو گرووپێك لە پیاوانی پەرلمان بە سەرۆکایەتی ویلیام کە بۆ بینینی ئێلیزابێت ڕۆیشتنە تاوەری لەندەن، دوای ئەوەی پێیان ڕاگەیاند بۆ پۆستی پاشایەتی هەڵبژێردراوە، لەگەڵ خۆیان هێنایانە کۆشکی پاشایەتی بریتانیا. ویلیام سیسیل ئەو پەیمانەی کە وەك پرۆتستانێك سەبارەت بەئازادی مەزهەب لە بریتانیا دابووی بۆ ئێلیزابێتی دووپات کردەوەو ئێلیزابێتیش دوای پاڵپشتی کردنی ئەو پەیمانە نازناوی "لۆردبۆرگلی"[30] پێبەخشی. ئێلیزابێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو پەیمانەی کە دابووی بە لۆردبۆرگلی، (ڕاوێژکارە سەرەکیەکەی لە تەواوی دەورانی دەسەلاّت) لە یەکەمین وتاری خۆیدا وەك شاژنی بریتانیا، ئازادی بیروباوەڕی مەزهەبیی لەم ولاّتەدا ڕاگەیاندو تەنانەت لەگەڵ نووسینی نامەیەکی پڕ لە ڕێز بۆ پاپ ئامادەیی خۆی بۆ دانانی پێوەندی نێزیكو دۆستانە لەگەڵ پاپ ڕاگەیاند. ئێلیزابێت لەسەر ئەوە سووربوو کە یەکێك لە ئۆسقۆفەکانی کاتۆلیك لە ڕێوڕەسمی تاج لەسەرنان، تاجی لەسەر دابنێت.

بەلاّم تەنیا یەك ئۆسقۆفی کاتۆلیك ئامادە بوو لەو ڕێوڕەسمەدا بەشداری بکات. لەبەرئەوەی ئەو سوێندەی کە دەبوایە شاژن بیخواردبوایە نیشانەی دەسەلاّتی ئەو لەسەر کەنیسەی بریتانیا بووو هیچ مەرجێکی سەبارەت بە پێڕەوی شاژن لە پاپ نەدەگرتە خۆ. مەلیکە ئێلیزابێت کە لەمێژووی بریتانیا بەناوی مەلیکە ئێلیزابێتی یەکەم ناوبانگی هەیە لەسەرەتای دەسەلاّتدا بەکردەوە ڕێگای لەهەر جۆرە دەست تێوەردانێکی پاپ لە کاروباری بریتانیا گرت، بەلاّم بەو ڕێزو ڕەوشتە هێمنەی کەسەبارەت بە پێڕەوانی مەزهەبی کاتۆلیك لە بریتانیا بەکاری هێنا، ڕێگای لەسەر هەڵدانی شەڕێکی نوێی مەزهەبی گرت.

29-William Cecil
30-Lord Burghley





**ئێلیزابێتو دوو کەس لە وەزیرو ڕاوێژکارە کارامەکانی، "بۆرگلی"و "واڵسینگهام".**

بە کاربردنی ئەم سیاسەتە بە لەبەرچاو گرتنیئەو توورەییو دڕندەییانەی کە کاتۆلیکەکان لە دەورانی دەسەلاّتی مەلیکە ماری سەبارەت بە پرۆتستانەکان دەیان نوواندو هەستی تۆڵە سەندنەوە لەنێوان زۆربەی پرۆتستانەکان کارێکی ئاسان نەبوو، بەلاّم ئێلیزابێت بە مشوورو سیاسەتو یارمەتی ڕاوێژکارەکانی کە هەموویان لە کەسایەتییە ڕێزدارو دەستڕۆیشتووەکانی پرۆتستان بوون، توانی ئەو هەستانە لەژێر چاوە دێری خۆی بگرێو لە بەرێوەچوونی هەر چەشنە توندو تیژییەك سەبارەت بە کاتۆلیکەکان پێشگیری بکات.

کاتێك ئێلیزابێتی یەکەم تاجی دەسەلاّتی لەسەر نا بیستو پێنج ساڵان بوو کە بۆ ئافرەتێکی گەنج لەو پایەو پۆستەدا زەماوەندو پەیداکردنی هاوسەری شیاو بە گرینگترین بابەت بۆ ئەو دەژمێردرا. ئەو بابەتە نەتەنیا لەروانگەی تاك بەڵکوو لە ئاست تێڕوانینی سیاسیشەوە گرینگ بوو بۆ گەلی بریتانیا. لەبەرئەوەی شاژن دەیتوانی بە زەماوەندێکی سیاسی پێوەندییەکانی





هاوتا رووسییەکەی، کاترینی گەورە "کە لە بەشەکانی داهاتوو داباسی دەکرێت" بە رادەیەك لە هەڵسوکەوت لەگەڵ پیاوان مەتینو خۆپارێز بووە کە هیچکام لە مێژوونووسان نەیان توانیوە بە مکوڕی سەبارەت بە پێوەندی ئیلیزابێت لەگەڵ یەکێك لە پیاوانی هاوچاخی را دەربڕن.

***

ئێلیزابێتی یەکەم نێزیك بە ٤٥ ساڵ، لە سالانی ١٥٥٨تا١٦٠٣ ی زاینی پاشایەتی کردو لەتەمەنی ٧٠ ساڵیدا مرد. ئەو کاتێك بە دەسەلات گەیشت کە بریتانیا لەو پەڕی لاوازیو ئالۆزی دابوو، بەلاّم کاتێك مرد بە بەهێزترین ولاّتی دەورانی خۆی دەژمێردرا. یەکێك لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی ئێلیزابێت لەسەر دەسەلاّت، هەڵبژاردنی پیاوانی لێهاتووو کارامە بۆ بەڕێوەبردنی‌کارەکانو نەرمو نیانیو باوەڕ بە وتوویێژ بوو. هەرگیز رووی نەدا لە کاروباری گرینگی رامیاریو دەوڵەتیدا بەتەنیاو بێ لێکۆڵینەوەو ورد بوونەوەو راوێژ لەگەڵ خاوەن راکان بڕیارێك بدات. راوێژکارەکانی بەردەوام لە نێوان شارەزاترین پیاوەکان هەڵبژێردرا بوون کە لەنێوانیاندا جگە لە لۆرد بۆرگلی کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، دەتوانین ناوی "سێرفرانیسس والسینگهام"[33] و "فرانسیس بیکێن"[34]، فەیلەسوفو نووسەری بەناوبانگی بریتانیا بهێنین. لەسەردەمی دەسەلاّتی ئێلیزابێی یەکەم بریتانیا بوو بە گەورەترین هێزی دەرياییو دەریاوانانی بریتانیایی سەرانسەری جیهان گەڕان. یەکەمین دەریاوانی جیهان کە بە پاپۆرکەی بە دەوری گۆی زەویدا سووڕایەوە، "فرانسیس درەیکی"[35] بریتانی بوو کە لە رەوتی ئەو سەفەرە دەرياییەو پێش گەڕانەوە بۆ بریتانیا هێرشی کردە سەر پاپۆرێکی زێرهەڵگری ئیسپانیاییو زێرەکانی داگیر کرد. باڵوێزی ئیسپانیا لە بریتانیا نارەزایەتی لەو کارە دەربڕیو داوای دەستبەسەر کرانو سزادانی درەیکی کرد، بەلاّم ئێلیزابێتی یەکەم ولاّمی ئەو سکالاّیەی نەداوەو دوای گەڕانەوە نازناوی "سێر"ی پیّبەخشی. دۆزەرانی بریتانیا لەکاتی پاشایەتی ئێلیزابێتی یەکەمدا سەفەریان دەکردە دوورترین جێگاکانی جیهان لە ئاسیاو ئەفریقاو جەمسەری باکوورو قارەی تازە دۆزراوەی ئەمریکاو ئەو ولاّتانەی کە دەیان دۆزییەوە داگیریان دەکرد. ولاّتە نوێیە دۆزراوەکان بە هەرێمی دەسەلاّتی مەلیکە ئێلیزابێتی یەکەمەوە دەلکێنران

33-Sir Francis Walsingham
34-Francis Bacon
35-Francis Drake



بریتانیا لەگەڵ ولاّتانی‌تری ئەورووپا پتەوتر بکاتو لەوەش گرینگتر، بەو زەماوەندە میراتگرێکی یاسایی بۆ تاجو تەختی بریتانیا بە دونیا بێنێتو رێگا لە خوازەرانی ئەم پۆستە لە داهاتوودا بگرێت. یەکێك لە یەکەم خوازبێنی کەرەکانی ئێلیزابێتی یەکەم دوای پالّدانەوە بە تەختی دەسەلاّت فیلیپی دووهەم، پاشای ئیسپانیاو هاوسەری پێشوی ماری بووکە لە پێشنیاری زەماوەند لەگەڵ ئێلیزابێتیش وەك زەماوەندەکەی پێشوی مەبەستی سیاسی بوو. بەلاّم ئێلیزابێت کە ئاگاداری نەفرەتی گەلی بریتانیا لەو کەسە بوو، بە پەلە پێشنیارەکەی رەد کردەوە. دوایش نۆبە گەیشتە هانری سێهەم پاشای فەرانسە کە ١١ساڵ لەو بچووکتر بوو هەر بۆیەش ئێلیزابێت مەیلی نەبوو زەماوەندی لەگەڵ بکات. ئێلیزابێت پێشنیاری شازادەیەکی‌تری فەرانسەو نەجیب زادەیەکی بریتانیشی رەد کردەوەو کاتێك بە ساڵا چوو بە لایەنگرانی گوت ئیتر نایهەوێ زەماوەند بکاتو ئامادە نی‌یە گوێ بگرێ لە هیچ پێشنیارێکی‌تری زەماوەند. لەو رێکەوتەوە بەملاوە مەلیکە ئێلیزابێت نازناوی مەلیکەی "باکرە"ی وەرگرتو"سێروالتێررالّی"[31]، دۆزەری گەورەی بریتانیا لەسەردەمی ئەو کە یەکەم جار پێی خستە سەر رۆژی هەلاّتی ئەمریکا، ولاّتێکی نوێی دۆزییەوەو ناوی نا"ڤێرجینیا"[32] کە لە وشەی ویرجین بە واتای "باکرە" هاتووەو بەناوی شاژنی باکرە کراوە. مەلیکە ئێلیزابێت هەر وەك وتبووی تا کۆتایی ژیانی مێردی نەکردو نازناوی شاژنی باکیرەی پاراست، بەلاّم ئەم بابەتەی کە لە راستیدا لەگەڵ هیچ پیاوێك پێوەندی نەبووە جێگای گومانە. لە هەندێك لەسەرچاوە مێژووییەکان بۆ وێنە "دایرەالمعارف"ی ئەمریکا هاتووە کە ئێلیزابێت بەر لە گەیشتن بە تەمەنی بیست ساڵی لەگەڵ سێر تۆماس سیمۆر، کەسایەتی دەسەلاّتداری دەورانی پاشایەتی براکەی (ئێدواردی شەشەم) پێوەندی ئاشقانەی بووەو بە توندی لە کوژرانی ئەو بەدەست براکەی زویر بووە.

لە رواڵەتدا هەر ئەو پێکانە رووحیەو مەینەتییەکانی سالاّنی بەندیخانە لە تاوەری لەندەن ئێلیزابێتی بۆ هەمیشە لە بیری زەماوەند لاداوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێلیزابێتی یەکەم لە رەگەزی نێر بێزار نەبووەو بەدرێژایی دەورانی پاشایەتی ئەو، پیاوانی زۆر وەك پەپوولە بە دەوری مۆمی جەستەی دەسووڕانەوەو لەخۆشەویستیو مێهرەبانی تایبەتی ئەو بەهەرەمەند بوون کە سێروالتێر رالّی، دۆزەری ویرجینیا یەکێکە لەوان. لەگەڵ ئەوەشدا ئێلیزابێت بە پێچەوانەی

31-Sir Walter Raleigh
32-Virjinia





و ئەو چەکدارانەی کە بۆ هەر ئەرکێکی دۆزینەوە سەفەریان دەکردە بەشە جیاوازەکانی جیهان، لەو ولاّتانەی کە دەدۆزرانەوە جێگیر دەبوونو لەماوەیەکی کورتدا بەهێزێکی یارمەتیدەرو نەفەراتی تازە بەهێز دەکران. ئێمپراتۆریەتی گەورەی بریتانیا کە خۆر لەو دا ئاوا نابێت لەکاتی ئێمپراتۆریەتی ئێلیزابێتی یەکەمدا بناغەی دانراو دواتر جێنشینەکانی لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدەدا تەواویان کرد.



**وێنەی کۆبوونەوەکانی پەرلمانی بریتانیا لە بەرانبەر مەلیکە ئێلیزابێتی یەکەم**

گەورەترین رکەبەری هێزی دەریایی بریتانیا لەکاتی حوکمڕانی مەلیکە ئێلیزابێتی یەکەمدا، هێزی دەریایی ئیسپانیا بوو کە ئێلیزابێت شەڕی لەگەلّ کردنو هێزی گەورەی دەریایی ئیسپانیای لە گەڕان لە زەریاکان بێبەش کرد. شەڕە دەریاییەکانی بریتانیاو ئیسپانیا کەلەساڵی ١٥٨٨ دەستی پێکردو نێزیکی ١٥ساڵ و تا تەواو بوونی تەمەنی ئێلیزابێتی یەکەم درێژەی کێشا، بە سەرکەتنی هێزە دەریاییەکانی بریتانیا کۆتایی پێهات. [یەکێك لە گرینگترین رووداوەکانی سەردەمی پاشایەتی ئێلیزابێتی یەکەم گێرەو کێشەی درێژخایەنی ئەو لەگەلّ کچە مامەکەی (ماری ئێستۆراتی[36] شاژنی ئێسکاتلەندا) بوو] (***) کە دەستبەسەر

36-Mary Stuart



کراو دوایش کوژرا. ماری هاوسەری فەرانسوای دووهەمی پاشای فەڕانسە بوو کە لەتەمەنی هەژدە ساڵاندا هاوسەری لە دەست داو ساڵێك دوای مردنی هاوسەری لەساڵی ١٥٦١ گەڕایەوە ئیسکاتلەندا. ماری دوای ئێلیزابێت بەتەنیا میراتگری تاج وتەختی بریتانیا دەژمێردراو هەر بەو هۆیەشەوە ئێلیزابێتی یەکەم بە شكو نیگەرانییەوە چاوەدێری کارەکانی دەکرد. تا ئەوە کە دوای زەماوەندی دووبارەی ماری لەگەلّ کوڕە مامەکەی (هانری ئیستۆرات) کە ئەویش لەریزی دەسەلاّتخوازانی تاجو تەختی بریتانیا بووو بەتایبەتیش بە لەدایکبوونی کوڕێك لەو زەماوەندە کە بە میراتگری دواتری تاجو تەختی بریتانیا دەژمێردرا، دلّەخوورپەی ئێلیزابێتی یەکەم زیاتر بوو. پێوەندی شاراوەی ماری لەگەلّ مۆسیقازانێکی ئیتالیایی کە بووە هۆی کوژرانی ئەو لاوە بە دستی هانری ئێستۆارتو کوژرانی خودی هانریش دوای ئەو رووداوە کە دەوترا روون بۆوە خودی ماری لەم کوژرانەدا دەستی هەبووە، پێگەی ئەوی لەنێو خەلّکی ئیسکاتلەندا لەرزۆك کردو لە ئاکامدا زەماوەندی سێهەمی ماری لەگەلّ پیاوێکی پرۆتستانی بەناوی کۆنت "بوتۆل" لەساڵی ١٥٦٧ پتر لەجاران برواو پێگەی ئەوی لەنێوان گەلی ئیسکاتلەندا کەم کردەوەو ئەمەش بە جۆرێك بوو کە نەجیب زادەو گەورە پیاوانی ئیسکاتلەندا بە گژی داچوونو مارییان ناچار کرد کە بە قازانجی کوڕەکەی (جیمز) واز لە پۆستی شاژنی ئیسکاتلەندا بهێنێت. ماری ئێستۆارت دوای لەسەردەسەلاّت لاچوونیشی ماوەیەك لەبەندیخانەو لەژێر چاوەدێری دابوو و لەئاکامدا لەمانگی مەی ساڵی ١٥٦٨ هەلاّت بۆ بریتانیاو لەنامەیەکدا بۆ مەلیکە ئێلیزابێت، داوای پشتیوانیی لێکرد. ماری پێی وابوو کە دوای دوور کەوتنەوەی لە ئیسکاتلەندا ئێلیزابێت هەست بە هیچ مەترسییەکی ئەوتۆ لەلایەن ئەوەوە ناکات.

بەلاّم مەلیکە ئێلیزابیتی یەکەم بە رێنوێنی راوێژکارەکانی بەتایبەت لۆرد بۆرگلی، ئەوی خستە ژێر چاوەدێری. ماری ئێستۆارت نێزیکەی دە ساڵ زیندانیو لەژێر چاوە دێریدا بوو، بەلاّم لە ساڵی ١٥٨٧ بە بەشداری کردن لە پیلانێك بۆ کوشتنی مەلیکە ئێلیزابێتی یەکەمو دەستبەسەر داگرتنی تاجو تەختی بریتانا تاوانبار کرا.

(***) گێرەو کێشەی درێژخایەنی ئێلیزابیتی یەکەم لەگەلّ کچە مامەکەی (ماری ئێستۆراتی شاژنی ئیسکاتلەندا) یەکێك لە گرینگترین رووداوەکانی سەردەمی پاشایەتی ئەوبوو.







**ماری ئێستۆارت، شاژنی ئیسکاتلەندا کە بە فەرمانی مەلیکە ئێلیزابێتی یەکەم سەریان لە جەستەی جیا کردەوە.**

دادگایی کردنی ماری ئێستۆارتو ئەو بەرگرییە بوێرانەیەی ماری لەو دادگایی کردنەدا لەخۆی نیشاندا و لەکۆتاییشدا دیمەنی سەربڕینی ئەو لەکاتێکدا کە باشترینو جوانترین جلوبەرگەکانی لەبەر کردبووو بە رازاوییەکی زۆرەوە کە لەجاران جوانتر دەهاتە بەرچاو، بابەتی ئەو تراژێدیاو درامایانەیە کە دواتر بەقەڵەمی نووسەرانی بریتانیو فەرانسی نووسراوەو چەند جارێك هاتۆتە سەر پەردەی سینەماو تەختی شانۆ. لە زۆربەی ئەو داستانو نمایشانەدا مارییان بە بێ تاوان ناساندوەو واپێشان دەدرێ کە مەلیکە ئێلیزابێتی یەکەم بەهۆی لەمێشك ڕۆکردنی راوێژکارەکانی بەتایبەت لۆرد بۆرگلیو سێر فرانسیس والّسینگهام، فەرمانی کوشتنی ماری ئێستوارتی دەرکردووەو دواتر لەم کارە پەشیمان بۆتەوە.



**تابلۆیکوشتنی ماری**



لە سالآنی کۆتایی دەسەلآتی مەلیکە ئێلیزابێتی یەکەمیش چەند جار توندوتیژیو بێبەزەییی لێبیندراوە کە گرینگترینیان بەسەرهاتی سەرکردەیەکی لاوی بریتانی بەناوی "ڕۆبێرت دۆڤێرۆکس"[37]ە. مەلیکە ئێلیزابێت زۆر هۆگری ڕۆبێرت بوو بە جۆرێك لە هەندێك سەرچاوەکان ناوی ئەویان لە پێڕستی ناوی ئەو کەسانە تۆمار کردووە کە ڕەنگە مەلیکە ئێلیزابێت باسو خواستێکی لەگەڵ هەبووبێت. بەلآم مەلیکە ئێلیزابێت لەساڵی ١٦٠١دوای شکستی ڕۆبیرت لە ئەرکێکی پێ ئەسپێردراوی شەڕدا فەرمانی کوشتنی ئەو لاوەی دەرکرد. ڕۆبێرت دۆڤێرۆکس بەوە تاوانبار کرا بوو کە دوای شکست لەو شەڕە ویستوویەتی بە پاشماوەی هێزەکانی شۆڕشێکی چەکداری لە دژی مەلیکە ساز بکات ...

***

ئێلیزابێتی یەکەم لەگەڵ ئەوەی کە دەیزانی میراتگرو جێنشینی یاسایی ئەو (جیمز) کوڕی مارییە، دوای کوشتنی ماری ئێستۆارت لەدانانی جێنشین خۆی پاراستو دوای مردنی لەساڵی **١٦٠٣** جیمز بوو بە پاشای بریتانیاو **٢٢** ساڵ پاشایەتی کرد.

مێژوونووسان لەم بابەتە هاوبیرن کە ئێلیزابێتی یەکەم یەکێك لە بەهێزترینو سیاسەتمەدارترینو لەهەمان کاتیشدا ژیرترینو فێڵ بازترین ژنانی دەسەلآتداری جیهان بووە. ئەو تێکەلآوێکی سەیر لە وەردە کاریو توندوتیژیو نەرم ونیانیو کەللەرەقی بوو. وەك هەر ژنێك لەجوانکاریو تەرپۆشیو خۆرازاندنەوە چێژی وەردەگرت و دەگێڕنەوە کە زیاتر لە دووهەزار دەست جلوبەرگو هەزاران جووت پێلآوو دەستکێشی بووە کە هەندێکیان وەك ئاسەواری هونەری کوون لە مووزەخانەکاندا پارێزراون. لەگەڵ ئەوەشدا رەوشتی ئەو زۆر جاران لە پیاو توندوتیژتر بووو لە هەندێك جاریشدا زۆر کەللە رەق بوو. شەڕی **١٥**ساڵەی لەگەڵ ئیسپانیا کە تا کۆتایی تەمەنی ئامادە نەبوو دەستی لێهەڵگرێو دەرکردنی فەرمانی کوشتنی ژمارەیەك لەنێزیکترین خزمو کەسەکانی، وێنەیەکە لەو توندوتیژیو کەللەرەقییانەیە. دەورانی دەسەلآتی مەلیکە ئێلیزابێتی یەکەم سەردەمی گەشەسەندنی فەلسەفەو هونەرو ئەدەبیاتی بریتانیایە .

هەر وەك پێشتر ئاماژەیپێکرا، فرانسیس بیکێن فەیلەسۆفی گەورەی بریتانیا یەکێك لە راوێژکارە نزیکەکانی مەلیکە ئێلیزابێتی یەکەم بوو. ویلیام شێکسپێەر گەورەترین شاعیرو درامانووسی بریتانیایی، بەناوبانگترین نووسراوەکانی خۆی لەم سەردەمەدا نووسیوە. شاعیرانو هونەرمەندان لە دەرباری ئێلیزابێتی یەکەم ڕێزو گرینگییەکی تایبەتیان هەبووو هونەرو ئەدەبیاتی بریتانیا دوای مردنی ئێلیزابێتیش درێژەی بە گەشەسندنی دا.

37-robert devereux





# له ماری دۆمێدیسییەوە تا ماری ئانتوانت

له ماوەی دووسەد ساڵداو لەکاتی پاشایەتی هانری چوارەمەوە تا شۆڕشی گەورەی فەڕانسە لەساڵی ١٧٨٩ کە بووە هۆی رووخانی رژێمی پاشایەتی لەم ولأتە، پێنج پاشا لە فەڕانسە حوکمڕانیان کرد کە هەموویان زۆرو کەم لەژێرکارتێکەری دایك‌و هاوسەرو یان ئەڤیندارو خۆشەویستەکانیاندا بوون. هانری چوارەم یەکەم کەس لەو پاشایانە بوو کە لەگەڵ مارگارێت کچی بچووکی کاترین دۆمێدیسی زەماوەندی کردبوو. جێژن‌و زەماوەندی ئەو بەو جۆرەی کە لە بەسەرهاتی کاترین باسمان کرد بەرووداوی ناحەزی "ساینت بارتۆلۆمی" بە خوێن ئاوێتە بوو. هانری چەند ساڵ دوای دانیشتن لەسەر تەختی دەسەلأت مارگارێتی تەلأق داو لەتەمەنی ٤٧ ساڵیدا لەگەڵ کچێکی‌تر لە ماڵباتی دۆمێدیسی بەناوی ماری دۆمێدیسی زەماوەندی کرد.

ماری کاتی زەماوەند لەگەڵ هانری چوارەم ٢٧ ساڵی تەمەن بوو. "ماری دۆمێدیسی"١ کە کچێکی جوان‌و خاوەن کەسایەتی بوو هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی ژینی هاوبەشی لەگەڵ هانری چوارەم، ئەوی خستە ژێر کارتێکەری خۆی‌و تا ساڵی ١٦١٠کە هانری چوارەم کوژرا، راوێژکاری سەرەکی ئەو بوو. ماری دۆمێدیسی لە هانری سێ کوڕو سێ کچی هەبووو کوڕی یەکەمی ئەو بەناوی لوویی سێزدەیەم بوو بە جێنشنی باوکی‌و کوڕی دووهەمی بەناوی نیکۆلای مردو سێهەمین کوریشی بەناوی "گاستۆن دوورلیانس"٢ رۆڵێکی گرینگی لە رووداوەکانی دواتری فەڕانسە نەواند کە لە جێگای خۆیدا ئاماژەی پێدەکرێ. لە کچەکانی ماری دۆمێدیسی : یەکەمیان بەناوی ئێلیزابێت بوو بە شاژنی ئیسپانیاو دووهەمیان بەناوی کریستین لەگەڵ دووك "ساڤیۆ پییێ مۆنت"٣ زەماوەندی کردو نازناوی "دووشیز"ی وەرگرت‌و کچی سێهەمیشی بەناوی هانریت لەگەڵ چارلزی یەکەم، پاشای بریتانیا زەماوەندی کردو بوو بە شاژنی بریتانیا.

1-Marie demedicis

2-Gaston D Orleans

3-Savoie Piemont





**وێنەی جێژنی زەماوەندی ماری‌و هانری چوارەم**

دوای مردنی هانری چوارەم لەساڵی ١٦١٠ کوڕە گەورەکەی ماری دۆمێدیسی بەناوی لوویی سێزدەهەم کە ٩ ساڵی تەمەن بوو لەسەر تەختی پاشایەتی فەڕانسە دانیشت‌و دایکی لە پۆستی جێگری پاشادا هەوساری کارەکانی دەوڵەتی گرتە دەست. بەڕێوبردنی کاروباری فەڕانسە بۆ ماری دۆمێدیسی دژوار نەبوو، چوونکە ئەو بەکردەوە لە دە ساڵی کۆتایی پاشایەتی هانری چوارەمدا لە هەموو کاروبارەکانی دەوڵەت بەشداری‌و چاودێری دەکردو لە ناسینی کەسانی لێهاتوو شارەزا بووو لەسەر کاری دادەنان. گرینگترین گۆڕانکارییەك کە

لەسەردەمی منداڵی لوویی سێزدەهەم لە دەرباری فەڕانسە هاتە ئاراوە بریتی بوو لە هاتنی قەشەیەکی لاو بۆ کۆڕی دەرباریانو سپاردنی کاروباری سەربازیو سیاسەتی دەرەوەی وڵات بەدەستی ئەو. ئەو قەشە گەنجە کەدواتر بوو بە ئۆسقۆفی گەورەی فەڕانسەو نازناوی "کاردیناڵ ریشیلیۆ"[4]ی وەرگرت، پێش ئەوە کە ببێتە قەشە دەیهەویست بچێتە ئەرتەشی فەڕانسە، بەلاّم بە پێداگریو داواکاری دایکی کە دەیهەویست یەکێك لە منداڵەکانی جلوبەرگی ئایینی لە بەر بکات، چووە کەنێسە.

لەگەڵ ئەوەشدا ریشیلیۆ لە جلوبەرگی ئایینیدا هۆگری کاروباری دەوڵەتیو سەربازی بووو ناسیاری ئەو لەگەڵ ماری دۆمێدیسی ڕێگای بۆ سەرکەوتنی خێرای ئەو لە پۆستەکانی دەوڵەتیدا ئاوالّە کرد. هەڵبەت ئەوکەسانەی کە سەرکەوتنە خێراو لەنەکاوەکانی کەسایەتییەکان لە فاکتەرە نائاساییو نەناسراوەکاندا دەبینن، دانانی ئەم قەشە سی ساڵەیەش لە پۆستی گرینگی وەزیری شەڕو کاروباری سیاسەتی دەرەوەی فەڕانسە بە پێوەندییە تایبەتییەکانی لەگەڵ شاژنو خۆشەویستی ماری دۆمێدیسی دەلکێنن. بەلاّم ریشیلیۆ هەروەك دواتر سەلماندی، شایستەی ئەو پۆستانە بووەو دوای ناکۆکیو جیا بوونەوە لە ماری دۆمێدیسیش ئەو پلەو پێگەیەی پاراستووە. کاتێك کە لوویی سێزدەهەم گەیشتە تەمەنی چواردە ساڵی، ماری دۆمێدیسی ڕێوڕەسمی زەماوەندی ئەوی لەگەڵ "ئانی دۆتریش"[5]، کچی چواردە ساڵەی فیلیپی سێهەم (پاشای ئیسپانیا) سازدا و ئێلیزابێتی کچیشی لەجێنشینی پاشای ئیسپانیا مارە کرد. ئەو بووکە کەم تەمەنەش بەتەوای لەژێر کاریگەری خەسوەکەی دابوو. ماری دۆمێدیسی تا ساڵی ١٦١٧ کە بۆ یەکەم جار لەگەڵ کوڕەکەی ناکۆکی کەوتە نێوانیان، بە فەرمانڕەواو دەسەلاّتداری ڕەهای فەڕانسە دەژمێردرا. بە کەم بوونەوەی کارتێکەریو دەسەلاّتی ماری دۆمێدیسی، ریشیلیۆش پۆستی خۆی لە دەست دا. بەلاّم وردە وردە توانی متمانەی لوویی سێزدەهەم بەدەست بێنێو لەساڵی ١٦٢٠ توانی لووییو دایکی پێکەوە ئاشت بکاتەوە. لەو ساڵەوە تا ساڵی ١٦٣٠ ماریو ریشیلیۆ پێکەوەو بە هاوبەشی لەسەر فەڕانسە حوکمڕانیان کرد. بەلاّم ڕۆڵی ریشیلیۆ لە دەسەلاّتدا بەراورد لەگەڵ ماری بەرە بەرە بەرزتر دەبوو. ئانی دۆتریش شاژنی فەڕانسەو هاوسەری لوویی سێزدەهەم کە ئیتر

4-Richelieu
5-Anne d'Autriche



بووکێکی کەم تەمەن نەبوو، دەیهەویست ڕۆڵێکی بەرچاوی لە کاروباری حکوومەتدا هەبێتو بەو هۆیەشەوە هاتە نێو گۆڕەپانی سیاسەتەوە. ریشیلیۆ لەساڵی ١٦٢٢ لەلایەن پاپەوە بۆ پۆستی کاردیناڵی هەڵبژێردرا کە گرینگترین پلەی مەزهەبی لەنێوان کاتۆلیکەکان بووو هەروەها لە پۆستەکانی ڕێبەری سیاسیو مەزهەبیدا، هێزو دەسەلاّتی زیاتری بەدەست هێناو لە کاروباری حکوومەتیدا لێهاتوویيو تواناییەکی لەرادە بەدەری لەخۆی نیشان دا. لە بواری سیاسەتی نێوخۆییدا، دەسەلاّتە هەرێمیو نیوە فیۆداڵییەکانی لەناو بردو دەسەلاّتی حکوومەتی ناوەندیی لە سەرانسەری خاکی فەڕانسە جێگیرکردو لە بواری سیاسەتی دەرەکیشدا، هەرێمی دەسەلاّتی فەڕانسەی لەباکوورو باشوورەوە بەرفراوان کردو چەند بەشێکیشی لەخاکی ئیمپراتۆری ئیسپانیای بە خاکی حکوومەتی فەڕانسەوە لکاند. گەورەترین سەرکەوتنی ئەو، سەرکوتی ئۆتۆنۆمی خوازەکانی پرۆتستانو ناچار کردنیان بەملکەچی لەبەرانبە یاساو ڕێساکانی دەسەلاّتی ناوەندی بوو.



**وێنەی ماری دۆمێدیسی ، کێشانەوەی ڕۆبێنس**

ریشیلیۆ لەسەرکوتی پرۆتستانەکان کە تا ئەو ڕێکەوتە نەچوو بوونە ژێرباری دەسەلاّتی پاشاکانی کاتۆلیكو خۆیان بەملکەچی یاساو ڕێساکانی دەوڵەت نەدەزانی، توندو تیژییەکی زۆری بە کار هێنا. بەلاّم دوای سەرکەوتنی لەو شەڕەدا، بەهۆی فەرمانێك کە لەمانگی ژووەنی ساڵی ١٦٢٩ بە لوویی سێزدەهەمی مۆر کرد، ئازادیو یەکسانی مافەکانی پرۆتستانەکانی بە





مەرجی پێڕەوی کردنی ئەوان لەیاساو ڕێساکانی دەوڵەت مسۆگەر کردو بۆ هەمیشە کۆتایی بەشەڕی کاتۆلیکو پرۆتستانەکان هێنا.

هەرچی هێزو دەسەلاتی ریشیلیۆ پتر دەبوو، لە دەسەلاتو هێزی ماری دۆمێدیسی کەم دەبۆوەو ریشیلیۆ وردەوردە راسپاردەو فەرمانەکانی ماری دۆمێدیسیی جێبەجێ نەدەکرد. ماری لەو رووداوەدا بووکەکەی (ئانی دۆتریش) بە تاوانبار دەزانیو خۆی تەشەنەی بەو پرۆپاگەندە بێ بنەمایانە دەدا کە سەبارەت بە پەیوەندی ریشیلیۆ لەگەڵ ئانی دۆتریش بلاو ببۆوە. ریشیلیۆ بە پەرەسەندنی ئەو ناکۆکییانە وازی لەپۆستی خۆی وەك سەرۆك وەزیرانی فەرەنسە هێنا. بەلام ئەم کارە مانۆرێك بوو بۆ ناچارکردنی لوویی سێزدەهەم کە لەنێوان ئەو یان دایکی، یەکیان هەڵبژێری. لوویی سێزدەهەم لەنێوان دووڕێیانی هەڵبژاردنی دایکیو پیاوێك کە لە هەموو سەرکەوتنو شانازییەکانی قەرزداری ئەو بوو، دووهەمیانی هەڵبژاردو لە کۆبوونەوەیەکی درێژخایەن کە رۆژی دەی نۆڤەمبەری ساڵی١٦٣٠ بە ئامادە بوونی پاشاو مەلیکە ئانی دۆتریشو دایکی پاشاو ریشیلیۆ پێك هات، داوای لە دایکی کرد دەست لە کاروباری دەوڵەت وەرنەدات. لوویی بە پێدانەوەی دەسەلاتی تەواو بە ریشیلیۆ ئەوی وەك سەرۆك وەزیران هەڵبژاردو هەر لەو کۆبوونەوەیەدا ریشیلیۆ شکایەتی لە دارو دەستەو لایەنگرانی ماری دۆمێدیسی کرد کە کۆسپو تەگەرەیان دەخستە سەر کارەکانی حکوومەتەوەو لوویی فەرمانی لەسەرکار لابردنو دەستبەسەر کردنیانی دەرکرد. ئەو رۆژە کە بە سەرەتای گۆڕانکاری لەمێژووی فەرەنسە دەژمێردرێ، ناوی "رۆژی فریوو دراوەکان"[6]ی لێنراو بەرواڵەت هۆی ناودێرکرانی ئەو رۆژە ئەوەیەکە ماری دۆمێدیسی لەو رۆژەدا فریو درابووو هەروەها زەرەری پێکەوتبووو بە دەستی کەسێك کە خۆی ببوو بەهۆی سەرکەوتنو ناسراوی ئەو، لەسەر تەختی دەسەلات وەلانرابوو. ماری لەبەرامبەر بڕیاری لوویی سێزدەهەم دژکردەوەیەکی توندوتیژی لە خۆی پیشان داو لەجێگەی ئەوە کە ملکەچی بڕیاری ئەوبێتو لەدەست تێوەردان لە کاروباری دەوڵەت خۆبپارێزێ، درێژەی بە پیلانگێڕی دژی ریشیلیۆ داو لەو بەربەرەکانییەدا منداڵەکانیتری ماریش لایەنگرییان لە دایکیان دەکردو ژمارەیەکیش لە فەرەنسەوییەکان لەگەڵ ئەوەش کە ریشیلیۆ خزمەتی زۆری بە فەرەنسە کردبوو، لەسەرەرۆییەکانی ئەو

6-La Journée des Dupes



لەحکوومەت نارازی بوونو لەو بەربەرەکانییەدا هەوادارییان لە ماری کرد. بەلام ماری کە بەکردەوە لە قەلای "کۆمپێنی"[7] بەند کرابوو دەستی نەدەگەیشتە لایەنگرەکانی، لەمانگی ژوئییەی ساڵی ١٦٣١ بە یارمەتی کوڕەکەی تری (گاستۆن دوورلێئان) لە فەرەنسەچووە دەرێو لە برۆکسێل نیشتەجێ بوو. ماری دۆمێدیسی لەو بەرِوارەوە بەراشکاوی دژی حکوومەتی پاریس بەربەرەکانی کرد. ئامانجی ئەو لەو شەڕەدا تەنیا لەسەرکار لابردنی ریشیلیۆ نەبوو، بەڵکوو لەناوبردنی دەسەلاتی لوویی سێزدەهەمو راگەیاندنی پاشایەتی کوڕەکەیتری بەناوی گاستۆن دوورلێئان بوو کە پێڕەوی لەو دەکرد. [ماری لەو بەربەرەکانییەدا لە پاڵپشتی پاشاکانی بریتانیاو ئیسپانیا بەهرەمەند بوو کە هەردووکیان زاوای بوون][**]. هەر بەم هۆیەشەوە زۆربەی مێژوونووسانی فەرەنسەوی ئەویان بە خەیانەتو هاوپەیمان لەگەڵ دوژمنانی فەرەنسە تاوانبار کردووە. لەمانگی ژووەنی ١٦٣٢ گاستۆن دوورلێئان لەگەڵ ئەو هێزانەی کە بە یارمەتی پاشای ئیسپانیا کۆی کردبۆوە، هێرشی بردە سەر فەرەنسەو "دۆمونت مۆرێنسی"[8]ش کە یەکێك لە بەرهەڵستکارانی حکوومەتی ریشیلیۆ بوو پەیوەندی پێوەگرتن. ریشیلیۆ خۆی سەرکردایەتی هێزەکانی پاشایەتیی گرتە ئەستۆو سەرەڕای زۆر بوونی ژمارەی هێزە هاوبەشەکانی گاستۆنو دووك دۆمۆنت مۆرێنسی، لە کۆتاییەکانی هاوینی ١٦٣٣دا ئەوانی شکست دا. گاستۆن لە گۆڕەپانی شەڕەکە هەلاتو گەڕایەوە برۆکسێل. بەلام دووك دۆمۆنت مۆرێنسی بە برینداری بە دیل گیراو چەند مانگ دواتر پاش دادگایی کردنێکی رواڵەتی بەفەرمانی ریشیلیۆ سەریان لە جەستەی جیا کردەوە. ماری پاش چەندساڵ مانەوە لە برۆکسێل لەسەر بانگهێشتی کچەکەی، هانریت شاژنی بریتانیا رۆیشت بۆ لەندەنو چارلزی یەکەمی پاشای بریتانیا هەوڵیدا کە ئەو دایكو کوڕە پێکەوە ئاشت بکاتەوە. لوویی سێزدەهەم ئامادە بوو لەگەڵ دایکی ئاشتی بکات بە مەرجێك دایکی ئیتر نە گەڕێتەوە فەرەنسەو بە خەرجی ئەو لە زێدی خۆی لە ئیتالیا نیشتەجێ بێت! ئەو رێگا چارەسەرییەش ریشیلیۆ پێشنیاری کردبووو ئەوەش ئاسایی بوو ماری کە داخوازی بەدەست هێنانەوەی هێزو دەسەلاتی لە فەرەنسە بوو، نەچێتە ژێر باری ئەم رێگا چارەسەرییە.

7-Compiegne

[**]پاشاکانی بریتانیا و ئیسپانیا کە زاوای کاترین بوون لەو بەربەرەکانیەدا پاڵپشتیان لێ دەکرد.

8-Duc de Montmorency





ماری لەساڵی ١٦٤١دا کە بارودخی بریتانیا ئاڵۆز ببووو زەمینەی شۆرشێك کە بووە هۆی لەسەرکار لاچوونو سەربڕانی چارلزی یەکەم ئامادە دەبوو، لەندەنی بەجێ هێشتو ئەم جارەیان شاری کولنی ئەڵمانیای بۆ نیشتەجێ بوون هەڵبژارد. ماری لەو شارە لەپیلانێکدا کە لەلایەن "کۆنت دوسواسۆن"[9]ەوە لە دژی ریشیلیۆ ئامادەکرا بوو بەشداری کرد.

بەلاّم شۆڕشی کۆنت دوسواسۆن بە مردنی ئەو تێك شکاو دوایین پیلانی ماری بۆ لەناو بردنی ریشیلیۆ، پیلانی کوشتنی ئەو بەدەستی یەکێك لە ئەندامانی دەرباری فەڕانسە بەناوی "مارکی دۆسینك مارس"[10] بوو کە دوورلێئانیش لەو پیلانەدا بەشدار بوو، بەلاّم ئەم پیلانەش سەری نەگرتو ماری لە کاتێکدا کە بە تەواوی نائۆمێد ببوو لە رۆژی سێهەمی ژوئییەیساڵی١٦٤٤لە کۆلن مرد. بە هەڵکەوتی رۆژگار دووژمنە بێئەمەگەکەشی (ریشیلیۆش) پێنج مانگ دوای مردنی ماری لە رۆژی چواری دێسەمبەری ساڵی ١٦٤٤ لە پاریس مرد.



**کاردینال[7]"ریشیلۆ" دەسەلاّتداری بەناوبانگی فەڕەنسی کە لە ریّگای مارییەوە بە دەسەلاّت گەیشت بەلاّم دواتر بوو بە رەکەبەرو دوژمنی کەللەرەقی ئەو.**

***

ئانی دۆتریش کچی فیلیپی سێهەم پاشای ئیسپانیا کە لەتەمەنی چواردە ساڵیدا لەگەڵ لوویی سێزدەهەم پاشای فەڕانسە زەماوەندی کردبوو، لەسەرەتاکانی ژیانی هاوسەرێتیدا بەهۆی دەسترۆیشتوویی‌و دەسەلاّتی ماری‌و لە نیوەی دووهەمیشدا بەهۆی کارتێکەریی ریشیلیۆ لە

9-Conte de Soissons
10-Madquis de Cing_Mars



میردەکەی رۆڵی گرینگی لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاّت نەگێڕا. ریشیلیۆ لە قۆناغەکانی سەرەتای ناکۆکی لەگەڵ ماری دۆمێدیسی هەوڵیدا ئانی دۆتریش بخاتە بەرامبەر خەسووەکەی. بەلاّم دوای سەرکەوتنی مسۆگەری ریشیلیۆ لەو بەربەرەکانی‌یەو رۆیشتنەدەریی ماری دۆمێدیسی لە فەڕانسە ناکۆکیش لەنێوان ریشیلیۆو ئانی دۆتریش سەری هەڵداو ئەم ناکۆکییانەش زۆرتر لە دووژمنایەتی ریشیلۆ لەگەڵ ئیسپانیاو پێوەندی‌و هۆگری شاژن بە ئیسپانیاوە سەرچاوەی دەگرت. زەماوەندی ئانی دۆتریش‌و لوویی سێزدەهەم پوخت زەماوەندێکی سیاسی بوو. لەسەرەتای ژیانی هاوسەرێتی‌یەوە خۆشەویستییەکی ئەوتۆ لەنێوان ئەم دوو هاوسەرە دانەبوو. فاکتەرێکی‌تر کە ژینگەی ژیانی ئەوان ساردو سڕ کردبوو، نەزۆکی ئانی دۆتریش بوو کە تا بیستو دوو ساڵ پاش زەماوەند منداڵی نەبوو. ئەم بابەتە بەتایبەت دوای سەرهەڵدانی ناکۆکی لەنێوان ماری‌و ریشیلیۆو رۆیشتنی مەلیکەی دایك لەفەڕانسە گرینگی زۆرتری پەیدا کرد، لەبەرئەوەی گاستۆن دوورلێئان کە برای بچوکی لوویی سێزدەهەم بوو لەو بەربەرەکانی‌یەدا پاڵپشتی دایکی دەکردو بەراشکاوی دژی براکەی خۆی راوەستا. ئەگەر لوویی سێزدەهەم پێش ئەوی منداڵی بێت بمردبایە، جێنشینی بێ ئەملاوئەولای ئەو گاستۆن دوورلێئان دەبوو، بەلاّم ریشیلیۆ دەیهەویست بەهەرجۆرێك بێت پێش بەم رووداوە بگرێت. لەم ماوەیەدا ئانی دۆتریش دوو هەڵەی گەورەی ئەنجامدا کە هەر کامێکیان دەیتوانی ببێتە هۆی جیا بوونەوەی لە هاوسەرەکەی. هەڵەی یەکەمی بریتی بوو لە خۆشەویستی ئەو بەرامبەر بە سەرکردەیەکی ئازاو جوانی بریتانیایی بەناوی "چارلز ڤیلیە"[11] دووکی بووکینگهام. هەر چەند ئەم خۆشەویستییە لەقۆناغەکانی سەرەتاییەوە پێشی پێگیرا، بەلاّم ئاژاوەیەکی گەورەی ناوە. دووکی بووکینگهام کە لە گەیشتن بە خۆشەویستەکەی نائۆمێد ببوو، لەکاتی گەڕانەوە بۆ بریتانیا چارلزی یەکەمی هاندا تا یارمەتی پرۆتستانەکانی فەڕانسە بدات لە بەربەرەکانی دژی لوویی سێزدەهەم‌و حکوومەتی ریشیلیۆ و خۆشی لەپێشەوەی هێزێکی یارمەتی دەری بریتانیا لەبەرگریی پرۆتستانەکانی سەربازگەکانی فەڕانسە لە "لاروشێل"[12] بەشداری کرد.

11-charles Villiers Duke of Buckingham
12-La Rochelle

بەلاّم هەروەك پێشتر باسمان کرد ریشیلیۆ لەو شەڕەدا سەرکەوتو دووکی بووکینگهامیش لەساڵی ١٦٢٨ بەدەستی یەکێك لە ئەفسەرە لەسەرکار لاچووەکانی هێزەکەی کووژرا. دووهەمین هەڵەی ئانی دۆتریش کە لە روانگەی فەڕانسەوییەکانەوە لە هەڵەی یەکەمی گرینگتر بوو، ئەوە بوو کە ئانی لەکاتی شەڕی فەڕانسەو ئیسپانیا بە نهێنی پێوەندیی بە نێردراوەکانی دەرباری ئیسپانیاوە گرتبوو. ئانی دۆتریش بەهۆی ئەو پێوەندییە بە سیخووری کردن بۆ دووژمن تاوانبار کرا، بەلاّم لەو کاتەدا هەواڵی سکپڕی شاژن دوای ٢٢ ساڵ نەزۆکی رووداوی پێوەندی ئەوی لەگەڵ نێردراوەکانی ئیسپانیا خستە ژێر پرسیارەوە (کەم رەنگ کردەوە)و ریشیلیۆ کە لەخوودی لوویی سێزدەهەم پتر تامەزرۆو چاوەڕێی میراتگرێك بوو بۆ تاجو تەختی فەڕانسە، تووڕەیی پاشای لەو بابەتە خاو کردەوە. منداڵێك کە هەموو کەس چاوەڕێیان دەکرد لە ئاکامدا لە رۆژی سێهەمی سێپتەمبەری ساڵی ١٦٣٨ لە دایك بوو. منداڵەکە کوڕ بوو کە ناویان نا لوویی‌و دوای ئەوەش شاژن کوڕیکی‌تری بوو کە ناوی فیلیپپیان لەسەر دانا.

ئانی دۆتریش دوای ئەوە کە توانی میراتگرێك بۆ تاجو تەختی فەڕانسە بەدونیا بێنێت پێگەیەکی پتەوتری لەدەرباری فەڕانسە بەدەست هێناو هەر لەو سالاَنەدا، سەرهەڵدانی کەسایەتییەکی نوێ لە فەڕانسە کە سەرەتا سەبارەت بە شاژن پێوەندیو رێزێکی زۆری پیشان دەدا، یارمەتی شاژنی دا تا دەسەلاّتی زیاترو پێگەی پتەوتر بکات. ئەو کەسایەتییە نوێیە کە ریشیلیۆ ئەوی بۆ جێنشنی خۆی لە بەرچاو گرتبوو، کاردینالّ "مازارین"[13] بوو کە لەسەرەتا وەك نوێنەری پاپ چوو بۆ پاریسو لەسەر داواکاریو پێداگری ریشیلیۆ لە فەڕانسە مایەوە.



**مەلیکە ئانی "دۆتریش" و منداڵەکانی، لوویی‌و فیلیپ.لوویی کە لە لای چەپی وێنکە دەبینرێ دواتر بەناوی لوویی چواردەهەم بوو بە بەناوبانگترین پاشای فەڕانسە، ئەم تابڵۆیە لە مۆزەخانەی ڤێرسای راگیراوە.**

13-Cardinal Mazarin



مازارین کە ئیتالیایی‌و ناوی راستەقینەی "جۆلیۆ مازارینی"[14] بوو، دوای ئەوەی بوو بە هاوولاّتی فەڕانسە لەسەر پۆستە گرینگەکانی دەوڵەتی دانراو لەهەمان کاتیشدا پایەو پۆستەکانی مەزهەبی خۆشی پاراستو لەساڵی ١٦٤١ پلەی کاردینالّی وەرگرت. مازارین یەکەم جار لەرێگای ریشیلیۆوە بە شاژن ناسێندراو ریشیلیۆ لە رێوڕەسمی ناساندنی بە شاژن بە تەشەرەوە وتی: "وابزانم مازارین پەسەندی سرووشتی خاوەن شکۆ بێت، چوونکە لە بووکینگهام دەچێ!". ریشیلیۆ ئاماژەی بە بەسەرهاتی ئەشقی ئانی دۆتریش لەگەڵ بووکینگهام کرد کە سالاّنێکی زۆری بەسەردا تێپەڕی بوو بەلاّم هێشتاش لەبیر نەچوو بۆوە. ژمارەیەك لە مێژوونووسان ئەم شێوە ناساندنەی مازارین بە شاژنی فەڕانسە وا لێك دەدەنەوە کە ریشیلیۆ بە لەبەر چاوگرتنی ئەگەری مردنی لوویی سێزدەهەم پێش گەیشتنی کوڕەکەی بەتەمەنی خۆناسین (بلوغ)، ئانی دۆتریش وەك جێگری پاشا دەسەلاّت دەگرێتە دەستو بەو کارەش بەکردەوە دەیهەویست پێوەندییەکی نزیکتر لەنێوان شاژنو مازارین درووست بکاتو پێگەی ئەو وەك جێنشینی داهاتووی خۆی مسۆگەر بکات. بەهەڵکەوت پێشبینی‌یەکە هاتەدی و لوویی سێزدەهەم کەمتر لە شەش مانگی‌تر دوای مردنی ریشیلیۆ لەمانگی مەی ساڵی ١٦٤٣ دا مردو ئانی دۆتریش وەك جێگری پاشایەتی منداڵە پێنج ساڵەکەی دەسەلاّتەکانی حکوومەتی بەدەستەوە گرت. کاردینالّ مازارینی کە دوای مردنی ریشیلیۆ گرفتاری دژایەتی‌و رکەبەری لەلایەن دەست و پێوەندییەکانی لوویی سێزدەهەم ببۆوە ویستی بگەڕێتەوە ئیتالیا. بەلاّم بەهۆی نەخۆشی ومردنی لوویی سێزدەهەم گەڕانەوەکەی وەدوا داخست. بە بەرەوپێش چوونی نەخۆشییەکەی لوویی سێزدەهەم بە گوێهەڵکوتانی تووند بۆ پێشگرتن لە پێ‌ئەسپاردنی پۆستی جێگری پاشایەتی بە شاژن دەستی پێکردو پاشای لەسەرە مەرگیان رازی کرد: بەهۆی ئەوە کە شاژن لە نەتەوەی ئیسپانیاییەو لەرابردوودا پێوەندی پێوە گرتوون لەم پۆستە بێ‌بەشی بکات. بەلاّم مازارینی لەو بەربەرەکانی‌یەدا بە توندی پشتیوانی لە شاژن کردو لەئاکامدا ئەنجوومەنی پاشایەتیی ناچار کرد کە وەسیەتنامەکە پووچەڵ بکاتو پۆستی جێگری پاشایەتی بە دایکی پاشای داهاتووی فەڕانسە (لوویی چواردەهەم) بسپێرن. ئانی دۆتریش، مەلیکەی دایكو جێگری پاشای نوێی فەڕانسە هەر لەو رۆژەدا واتە ١٨ی مەی ساڵی ١٦٤٣ ولاّمی هەوڵو خزمەتی مازارینیی داوەو ئەوی کردە سەرۆك وەزیرانی فەڕانسە. مازارینی لەو رێکەوتەوە تا

14-Giulio Mazarini





کاتی مردنی لەساڵی ١٦٦١دا نزیك بە هەژدەساڵ لەسەر پۆستی سەرۆك وەزیرانی فەڕانسە مایەوەو بەراورد لەگەڵ ریشیلیۆ دەتوانین بڵێین خزمەتی زیاتری پێشکەش بە فەرانسە کرد.

**وێنەی کاردینال مازارینی**

ئانی دۆتریش کاتێك کە لە پۆستی جێگری پاشایەتی فەڕانسەدا دەسەڵاتی گرتەدەست، ٤٢ ساڵی تەمەن بوو بەلاّم ناسکیو جوانی ژنانەی خۆی تاڕادەیەکی زۆر پاراستبوو و مازارنیش کاتێك لەلایەن ئانی دۆتریشەوە کرا بە سەرۆك وەزیرانی فەڕانسە، ٤١ ساڵی تەمەن بووو سرنج راکێشیو جوانی پێویستی بۆ بەدەستهێنانی سەرنجی ژنێکی ٤٢ ساڵە هەبوو. مێژوونووسانی فەڕانسەوی وغەیرە فەڕانسەیی لەم بابەتەدا هاوبیرن کە لەنێوان ئانی دۆتریشو مازارینی پێوەندییەکی بەرزتر لە پێوەندی رەسمی نێوان جێگری پاشاو سەرۆك وەزیرانی هەبووەو لەهەندێك لەسەرچاوەکاندا تەنانەت ئاماژەبە زەماوەندی نهێنی ئەوان کراوە. ئەوەی سەلمێنراوە ئەوەیەکە مازارینی لەگەڵ هەبوونی پێوەندی ئاشقانە لەگەڵ ئانی دۆتریش، بەردەوام رێزی لەو وەك جێگری پاشا گرتووەو تاکۆتایی تەمەنی و تەنانەت دوای گەیشتنی کوڕەکەشی بە تەمەنی یاسایی پێی وەفادار ماوەتەوە. لوویی چواردەهەم دوای گەیشتن بەتەمەنی یاساییو تاکاتێك مازارینی لەژیاندا مابوو رۆڵێکی بەرچاوی لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت نەبوو. مازارینی بەردەوام لە بەڕێوەبردنی کارەکانی راوێژی لەگەڵ ئانیدۆتریش دەکرد کە ئیتر تەنیا پۆستی



شاژنی دایکی هەبوو. بەلاّم دوای مردنی مازارینی لەساڵی ١٦٦١ لوویی چواردەهەم بەکردەوە دەسەڵاتی گرتە دەستو دوای مازارینی لە دیاریکردنی سەرۆك وەزیران خۆی پاراست. ئانی دۆتریش پێنج ساڵ دوای مردنی مازارینی ژیاو کوڕەکەی لە زۆربەی کاروبارەکانی دەوڵەتدا راوێژی لەگەڵ دەکرد. لوویی چواردەهەم لەکاتی مردنی دایکیدا ووتی: " جێگای خۆیەتی مێژوو ناوی ئەو لەریزی یەکێك لە گەورەترین پاشاکانی فەڕانسە بنووسێ". لە بیرەوەرییەکانی کاردینال مازارینش کە دوای مردنی چاپ کرا، سەرۆك وەزیرانی بەناوبانگی فەڕانسە نووسیویەتی کە لە زۆربەی سەرکەوتنەکانی خۆی لەحکوومەتدا قەرزداری پشتیوانی دۆستانەی مەلیکە ئانیدۆتریش بووەو تەنانەت لەچەند بوارێکدا وەك شەڕ لەگەڵ ئیسپانیا کە دارایەتیی هەبوو لەگەڵ پێوەندییە خزمایەتییەکانی ئانی دۆتریش و دەرباری ئیسپانیا، ئانی بەرژەوەندییەکانی فەڕانسەی لەسەرووی بەرژەوەندییەکانی ئیسپانیا داناوەو پشتیوانیی لەپێوەلکانی بەشێك لەخاکی ئیسپانیا بە خاکی فەڕانسەوە کردووە. لەگەڵ ئەوەش ئانی دۆتریش بە پێکهێنانی زەماوەندی کوڕەکەی لەگەڵ ماریا ترێزا، کچی فیلیپی چوارەمی پاشای ئیسپانیا، پێوەندییەکانی دەرباری فەڕانسەو دەرباری ئیسپانیای پاراست، هەرچەند ئەو زەماوەند بووە هۆی ئەوە کە لوویی چواردەهەم داوای تاجو تەختی ئیسپانیا بکاتو نەوەکەی وەك فیلیپی پێنجەم بخاتە سەر تەختی دەسەلاّت.

***

لوویی چواردەهەم کە نازناوی پاشای گەورە یان "پاشای هەتاو"[١٥]ی پێدراوە، درێژترین دەورانی پاشایەتیی لە فرانسە کردو ماوەی ٧٢ ساڵ فەڕانسە حوکمڕانی کرد. هەروەك ئاماژەی پێکرا، لوویی چواردەهەم لەتەمەنی پێنج ساڵیدا جێگای باوکی گرتەوەو تا ساڵی ١٦٦١ کە دایکیو سەرۆك وەزیرە بەهێزەکەی (کاردینال مازارینی) لە فەڕانسە فەرمانڕەواییان دەکرد، رۆڵی گرینگی لە کاروباری دەوڵەتدا نەبوو، بەلاّم لەساڵی ١٦٦١ تا ساڵ ١٧١٧ کە لەتەمەنی ٧٧ ساڵیدا مرد، بە ماوەی ٥٤ ساڵ بەو پەڕی هێزوو دەسەلاّتەوە لە فەڕانسە حوکمڕانی کردو نەتەنیا مۆڵەتی دەربڕینی بیرو خۆدەرخستنی نەدەدایە خەڵك، بە ڵکو ئەو وەزیرانەی کە دەیان وێرا لەبەرامبەر بڕیارو فەرمانەکانی ئەودا را دەربڕن وەلادەناو سزای دەدانو ئەو رستە

15-Le Roi Soleil

بەناوبانگەشی دەگوت کە "دەوڵەت یانی من "[16]. لەگەڵ ئەمەشدا لوویی چواردەهەم پیاوێکی زۆر عەیاشو خۆشگوزەران بووو بە درێژایی دەسەلاتی خۆی دلدارو خۆشەویستی زۆری بووە کە ژمارەیەك لە دلدارەکانی ئەویان لەدانانی پۆستەکانی دەوڵەتیو بڕیارە رامیارییەکان دەخستە ژێر کاریگەریەوە. بە ناوبانگترین دلدارەکانی کە ئەیان خستۆتە ژێرکاریگەری خۆیان بریتین لە



**وێنەیەک لە لوویی چواردەهەم کە وێنەکێشێکی هاوچەرخی کێشاویەتەوە**

"دۆلاڤالیێر"[17]و مادام "دۆمۆنتێسپان"[18] ومادام "دۆماینتۆنۆن"[19] کە لەنێوانیاندا، مادام دۆماینتۆنۆن زیاتر لە هەموویان کارتێکەری لەسەر لوویی بووەو لەساڵی ١٦٨٤دا و لە دوای مردنی مەلیکە ترێزا زەماوەندی لەگەڵ کرد. مادام دۆماینتۆنۆن کە پێش زەماوەند لەگەڵ لوویی چواردەهەم هاوسەری شاعیرو هونەرمەندێکی کۆمێدی بەناوی "ئێسکاروون"[20] بوو، دوای مردنی هاوسەری لەساڵی ١٦٦٠دا کۆڕێکی ئەدەبیو هونەری دامەزراندو کەوتە بەر

16-L'Etat C'est Moi
17-L de La Valliere
18-Madam de Montespan
19-Madame de Maintenon
20-Scarron



سەرنجو پشتیوانی ئانی دۆتریشو لەرێگای ئەوەوە بە لوویی چواردەهەم ناسێندرا. مادام دۆماینتۆنۆن جگە لە جوانی، ژنێکی ئەدیبو خاوەن کەسایەتیو خۆش قسە بووو کەسایەتیو یاراوی قسەی ئەو ژنە پاشای فەڕانسەی کە ئیتر گوڕو تینی گەنجی نەمابوو زیاتر لەجوانی‌یەکەی خستە ژێر کاریگەرییەوە. لوویی چواردەهەم بەتەواو مانا ئاشقی ئەم ژنە بووو دوای زەماوەندی لەگەڵ ئەو ژنە ئیتر بە دەوروبەری ژنی‌تردا نەگەڕا. مادام دۆماینتۆنۆن کە نەیدەویست وەك شاژنی فەڕانسە بناسرێتو تامەزرۆی بەشداری لەرێوڕەسمەکانی دەرباری نەبوو، بەنازناوی "مارکیز"[21] رازی بووو بە هێمنیو سادەییەکی زۆرەوە لە ماوەی سێ ساڵدا، گیانێکی نوێی بەدەرباری فەڕانسە بەخشی. مادام دۆماینتۆنۆن لەساڵی ١٦٨٠وە تا مردنی لوویی چواردەهەم لەساڵی ١٧١٥، واتە سیو پێنج ساڵ پترلە هەموو کەسێك دوای پاشا لە سیاسەتی فەڕانسەدا کاریگەر بوو، بەڵام بەپێچەوانەی پێشینیانو کەسانی پاش خۆی هیچ کات ئەم دەسەلاتەی لە رێگای نادروست بە کار نەهێنا. ئەو لەتەمەنی لاویو پێش ئەوەی لەگەڵ لوویی چواردەهەم زەماوەند بکات، ژنێکی سەربەستو هەوەسباز بووو لەماوەی مردنی هاوسەری یەکەمی تا ناسیاریو زەماوەند لەگەڵ لوویی چواردەهەم، دۆستانی جۆراوجۆری بوو بەڵام لەو رۆژەی کە لەگەڵ لوویی چواردەهەم ناسیاری پەیداکردو خۆشەویستیو هۆگری ئەوی سەبارەت بە خۆی هەست پێکرد، ئیتر هەواو هەوەسی وەلاناو نێزیك بە چل ساڵی تەمەنی خۆی بۆ کاری خێروخوازی یارمەتی دەست کورتانو هەژاران دانا. دامەزراندنی دەزگایەکی خێرخۆازی گەورە لە "ساینت سیر"[22] کە کچانی هەژاری بێ سەرپەرشتی تێدا چاوەدێری دەکرا، وێنەیەك لەکارە مەزنەکانێتیو هەر ئەو دامەزراوانە بوو کە لەکاتی ناپلیۆن کرا بە قوتابخانەی سەربازی. کارتێکەری مادام دۆماینتۆنۆن لە پازدە ساڵی کۆتایی تەمەنی لوویی چواردەهەم گەیشتە ئەو پەڕی خۆیو لوویی چواردەهەم هیچ کارێکی گرینگی بێڕاوێژو بەباش زانینی ئەو نەدەکرد.

21-Marquise
22.Saint-Cyr







**مادام دۆماینتۆنۆن هاوسەری لوویی چواردەهەم کە لە هەموو کەسێك زیاتر بە سەر لوویی‌دا زاڵ بوو، بەڵام لە نازناوی شاژن‌و بۆنەکانی دەربار بێزار بوو. اوێنە لە ئینسای‌کلۆپیدیای لارۆس**

ئەمەش بوو کە مادام دۆماینتۆنۆن لە تەواوی کۆبوونەوە راوێژکارییەکانی پاشا لەگەڵ وەزیران‌و کاربەدەستانی حکوومەت بەشداری دەکردو لوویی چواردەیەم پێش دەرکردنی بڕیاری کۆتایی لەسەر هەر بابەتێك رووی دەکردە هاوسەرەکەی‌و دەیگووت: "بۆچوونی ئەو خانمە گەورەیە چیە؟"[23]. هەڵبەت مادام دۆماینتۆنۆن لەهەندێك کاروباری وەك کاروباری سەربازیدا رای دەرنەدەبڕی‌و سەبارەت بەم بابەتانە پتر جەختی لەسەر ئەم خاڵە دەکردەوە کە تا دەکرێت خۆ لە شەڕو خوێنرێژی رابگرن. مادام دۆماینتۆنۆن دوای مردنی لوویی چواردەیەم لەساڵی ١٧١٥، چوار ساڵ ژیاو لەو ماوەیەدا بە جێگای کۆشکی پاشایەتی، هەر لەو دەزگا خێرخوازییەی کە خۆی بنیادی نابوو ژیانی کردو لەساڵی ١٧١٩ هەر لەو جێگایە لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا مردو بەپێی وەسیەتەکەی هەر لەوێ بە خاك سپێردرا.

❊❊❊

٢٣- لوویی چواردیەم بە جێگەی Votre Majestee یان خاوەن شکۆ "علیا **حضرت**" کە بۆ بانگ کردنی شاژن بە کار دەهات زاراوەیVotre Solidit ی بۆ بانگ کردنی هاوسەری بە کار دەهێنا کە واتاکەی بریتی‌یە لە خاتوونی بەرێز یان خاتوونی گەورە.



دوای مردنی لوویی چواردەیەم، جێنشینی یاسایی ئەو کە وەك لوویی پازدەهەم لەسەر تەختی دەسەلات دانیشت شەش ساڵان بوو و"دووك دوورلێئان"[24] تا ساڵی ١٧٢٣ لە پۆستی جێگیری پاشایەتیدا هەوساری کاروباری حکوومەتی گرتە دەست. دوای دووك دوورلێئان ماوەیەکیش "دووك دوبۆربۆن"[25] لە فەڕانسە حوکمی گێڕا. بەڵام لەساڵی ١٧٢٦ لوویی پازدەهەم مامۆستاو سەرپەرشتەکەی بەناوی کاردینال فلۆری کردە سەرۆکی وەزیران‌و خۆشی تاکاتی مردنی لەساڵی ١٧٤٣ حوکمڕانی کرد. لوویی پازدەهەم دوای مردنی "کاردینال فلۆری"[26] جێنشینی بۆ هەڵنەبژاردو دەیهەویست وەك لوویی چواردەیەم بە تەنیاو بەهێزەوە لەسەر فەڕانسە حکوومەت بکات، بەڵام لەو زیاتر ژنبازو خۆشگوزەرانتر بووو زۆربەی کاتەکانی لە کۆڕی بەزم‌و رەزم‌و راو یان لە تەنیشت دڵدارەکانی تێپەر دەکرد. دەگێڕنەوە کە لە وەڵامی ژمارەیەك لە ئەندامانی دەرباو راوێژکارەکانی کە لەمەڕ مەترسییەکانی داهاتوو وەخەبەریان دەهێناوە، ئەم رستە بەناوبانگەی دەگوت کە"دوای مەن با سێلاو بێت"[27]. دەقی ئەم رستەیە لە فارسیدا کەم تا کورت ئەم پەندەیە کە "دوای مردنی من دنیا چ ئاو بێت‌و چ تراویلکە گرینگ نی‌یە". لوویی پازدەهەم لە بەرانبەر ژندا زۆر بێ ئیرادە بووو بە دڵدارەکانی کە بە راشکاوی وەك خۆشەویست‌و هۆگری پاشا هاتوو چووی دەرباریان دەکرد، ئیزنی دەست تێواوەردان لە کاروباری دەوڵەت‌و سیاسەتی پێدەدان. بە ناوبانگترینی ئەو ژنانە بریتی بوون لە مادام "پۆمپادۆر"[28] و مادام "دووباری"[29] کە لە دانان‌و لابردنی زۆربەی پۆستەکانی دەوڵەتی‌و سەبازی بەشداربوون‌و تەنانەت هەندێك لە دڵدارەکانی خۆشیان کە لەراستیدا رکەبەری خوودی پاشابوون، بەسەر ئەویان دادەسەپاند. مادام پۆمپادۆر کە پتر بەناوی مارکیز دوپۆمپادۆر ناسراوە لەساڵی ١٧٢١ لە ڤێرسای لە دایك بووو لەساڵی ١٧٧٤ لەتەمەنی چل وسێ ساڵیدا مرد.

24-Duc d'Orleans

25-Due de bourBon

26-Fluery

27-Apr'es moi le deluge

28.Pompadour

29-Madame du Barry





**لوویی پازدەهەم، وێنە کە لە ئینسکلۆپیدیای لارووس وەرگیراوە**

ئەو یەکێك لە جوانترین ژنەکانی سەردەمی خۆی بووو لەتەمەنی بیستو سێ ساڵیدا رۆیشتە دەرباری لوویی پازدەهەمو تا کاتی مردنی، واتە نزیك بە بیست ساڵ لە هەموو کەسێك زیاتر کارتێکەری لە پاشای فەڕانسە بووە. مادام پۆمپادۆر دەستبەجێ دوای مردنی کاردینال فلۆرێ (سەرۆك وەزیرانو راوێژکاری نێزیکی لوویی پازدەهەم ) چووە دەرباری فەڕانسەو لەسەرەتاکانی دۆستایەتیو هاودەمی لەگەڵ پاشای فەڕانسە دەستی لە کاروباری سیاسی وەرنەدەدا، بەلاّم دارودەستەی لوویی پازدەهەم کە کارتێکەری ئەویان لەسەر پاشا بۆ وەدەر کەوتبوو، وردە وەردە ئەویان تێکەلاّوی کاروباری سیاسیو دارایی کرد.



**وێنەی مادام پۆمپادۆر**

مادام پۆمپادۆر کە ژنێکی هەوەسباز بوو، لەگەڵ ئەفسەرانی لاوی فەڕانسەوی کە بەهۆی جوانیو کارتێکەری ئەو لە پاشا لێی نێزیك دەبوونەوە، پلانی دۆستایەتی دادەڕشتو ئەوانی بۆ بەرز کردنەوەی پلەو وەرگرتنی پۆستە گرینگەکانی سەربازی بە لوویی پازدەهەم رادەسپارد. لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆر لە کاربەدەستانو ئەفسەرانی کارامەو شیاوی فەڕانسەوی کە لە مادام پۆمپادۆر نێزیك نەبوون، وردە وردە دەوروبەری پاشایان چۆڵ کردو دەست و پێوەندییەکانی مادام پۆمپادۆر جێگای ئەوانیان گرتەوە. لەئاکامی ئەو کارەدا ژمارەیەکی زۆر لەکەسانی گەندەڵو ریاکارو ناشیاو لەسەرووی کارەکانی حکوومەتەوە دانیشتو هۆکارەکانی نارازی بوونی گشتیی خەڵکیان ئامادە کرد. ئەو ژێنراڵە لاوانەش کە جێگەی خۆشەویستیو هۆگری شاژن بوون، جێگای سەرکردە کۆنو بەئەزموونەکانی هێزی فەڕانسەیان گرتبۆوەو لەئاکامدا لەو شەڕانەی کە لەدەورانی پاشایەتی لوویی پازدەهەم لەنێوان فەڕانسەو دراوسێکانی روویدا، رووڕەشییەکی گەورەیان خولّقاند. مردنی ناوەختی خاتوو پۆمپادۆر لەتەمەنی ٤٣ ساڵیدا نەبووە هۆی داخو پەژارەی کەس جگە لە داروو دەستەکەیو تەنانەت لوویی پازدەهەمیش

لەگەڵ ئەو هۆگرییەی کە بەو ژنەی هەبوو، لە دەستێوەردانو داواکارییەکانی ئەو وەزاڵە هاتبوو و بەدوای ڕێگای چارە دەگەڕا کە مردنی لەنەکاوی مادام پۆمپادۆر ئەم بابەتەی بەشێوەیەکی سرووشتی چارەسەر کرد. بەڵام ماوەیەکی زۆر لە مردنی مادام پۆمپادۆر تێنەپەڕی بوو کە ژنێکیتری گەنجو جوان جێگای ئەوی لەدڵی لوویی‌دا گرتەوە. ئەویش کۆنتێس دووباری بووو کاتێك ڕۆیشتە دەرباری لوویی پازدەهەم لە گەرماو گەرمی لاویەتیو تەمەنی بیست ساڵیدا بوو. ئەم ژنە جوانو بە عیشوەیە پاشای ٥٥ ساڵەی کە دوای مردنی مادام پۆمپادۆر دڵدارێکیتری نەدیبوو، وەها خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە کە پاشا ئیتر جگە لە هاودەمی لەگەڵ ئەو بیری لە هیچ شتێکیتر نەدەکردەوە.



**وێنەی مادام دووباری**

ئەو ئەشقو ئەڤینە نێزیك بە دەساڵو تا مردنی لوویی پازدەهەم لەتەمەنی ٦٥ساڵیدا درێژەی کێشاو مادام دووباری لە تەواوی ئەو ماوەیەدا، چاوەدێریو بەشداری لە کاروباری گرینگی دەوڵەتیدا کرد. دەستێوەردانە بەردەوامەکانی مادام دووباری لە کاروباری سیاسیدا کە گەورەترین زیانی لەفەڕانسەدا، بریتی بوو لە ناکۆکیو نافەرمانی ئەو لەگەڵ "دووك دوشواسۆڵ"[٣٠]، وەزیری شیاوو ئاشتی خوازی لوویی پازدەهەم. دووك دوشواسۆڵ کە توانیبووی

30-Due de choiseul



بەشێك لە گەندەڵییەکانی مادام پۆمپادۆر قەرەبوو بکاتەوەو بە دووبارە بنیاتنانەوەی سوپای فەڕانسە پێگەی ئەم وەڵاتە لەنێوان دراوسێکانی پتەوتر بکات، لەساڵی ١٧٧٠ بەهۆی سیخوڕیو دووزمانیی مادام دووباری لەسەرکار لابردراو هەر بەم هۆیەشەوە شەپۆلی ناڕەزایی لەدوایین ساڵەکانی دەسەڵاتی لوویی پازدەهەمدا پەرەی سەند. لوویی پازدەهەم لەساڵی ١٧٧٤ مردو فەڕانسەی لە بارودۆخێکدا سپاردە نەوەکەی (لوویی شازدەهەم) کە هەل ومەرجی ناڕەزایەتی لە چینە جیاجیاکانی کۆمەڵگا ئامادە ببووو چینێکی مام ناوەندی نوێ درووست ببوو کە لە دابەشکردنی چینایەتی وەك "بوورژوا" نێویان دەهێنان. بوورژواکان لەڕاستیدا دەوڵەمەندانو کاسبکارانو خاوەن پیشەکانی شاری بوون و هەر چەند کەمو زۆر لە ئاسوودەییو هێمنیدا دەژیان، بەڵام ئیمتیازە تایبەتییەکانی دەوڵەمەندان و خاوەن زەویە گەورەکانیان نەبووو خوازیاری سەربەستیو ئیمکاناتی زۆرتر بوون بۆ بەرەو پێش بردنو بەرفراوان کردنی کارەکانیان. لە لایەکی ترەوە بە سەر هەڵدانی نووسەرانی گەورەی وەك "ڤۆلتێر"[٣١]،"ژان ژاك ڕۆسۆ"[٣٢] و "مۆنتسکیۆ"[٣٣] و تەشەنەو بلاّو بوو نەوەی نووسراوەو بیروباوەڕە ئازادیخوازانەکەیان، خەڵكو بەتایبەت چینی ڕووناکبیرو خوێندەواری کۆمەڵگا کە هەر لەناو چینی بوورژوا یان پیشەسازو کاسبکارو دەوڵەمەندانی شاری سەریان هەڵدابوو، دەستیان بە ڕەخنەو ناڕەزایەتی دەربڕین کردو ڕێگای دەستپێکردنی چەند بزاڤێکی نوێیان سەرەتا لە کۆمەڵگای شاریو دواتریش لەکۆمەڵگای لادێیی خۆش کرد. لوویی شازدەهەم کە لەم هەل ومەرجەو لەتەمەنی بیست ساڵیدا بوو بە پاشای فەڕانسە، بە باوەڕی زۆربەی مێژوونووسان پیاوێکی دەروون پاكو دڵساف بوو. ئەو نە دەیویست وەك لوویی چواردەهەم دیکتاتۆر بێتو نەوەك پێشینیانی خۆی پیاوێکی ژنبازو خۆشگوزەران بێ. بەڵام عەیبی گەورەی ئەو، بێ‌ئیرادەییو لاوازی لەبەرامبەر کەسانی دەربارو دەستو پێوەندییەکانی هاوسەری (ماری ئانتوانت) و دوودڵیو بێ بڕیاری لەبەرامبەر گرفتەکان بوو. لوویی شازدەهەم کاتێك بوو بە جێنشینی لوویی پازدەهەم، لەتەمەنی ١٦ ساڵیدا لەگەڵ ماری ئانتوانت کچی ئیمپراتۆری ئۆتریش (نەمسا) زەماوەندی کرد. ماری ئانتوانت کە لەو کاتەدا کچێکی پازدە ساڵەو ناز پەروەردە بوو، بەهۆی ئەو ناسکیو جوانی‌یە تایبەتییەی کە هەی بوو لەلایەن فەڕانسەوییەکان گرینگیو

31-Voltaire
32-J.J.Rousseau
33-Montesquieu





خۆشەویستییەکی زۆری هەبوو تا کاتێکیش کە هاوسەری جێنشینی فەڕانسە بوو، لای خەڵك خۆشەویست بوو و فەڕانسەوییەکان ئەویان بەبەراورد لەگەڵ دڵدارەکانی لوویی پازدەهەم بە ژنێکی بێتاوانو بێ زیان دەزانی. ماری ئانتوانت لەتەمەنی نۆزدە ساڵاندا بوو بە شاژنی فەڕانسە و چەند ساڵێکی دواتریش هەر لای خەڵك خۆشەویست بوو، بەڵام ژینگەی گەندەڵی دەرباری فەڕانسە ئەویشی گەندەڵ کرد. لەخۆرازی بوونو رازاوە پەرەستیی لەرادەبەدەری ئەو بووە هۆی ئەوە کە فەڕانسەوییەکانیش رووی لێوەرگێڕن. ئەفرادی دەرباری فەڕانسە کە کارتێکەرییەکانی شاژنیان لەسەر لوویی شازدەهەم بینی، هەمان ئەو کارانەی کە لەدەورانی دەسەلاتی لوویی شازدەهەم بەدەستی مادام پۆمپادۆرو کۆنتیس دووباری ئەنجامیان دەدا بەدەستی ئەویش کردیانو شاژنی ساویلکە، بەڵام پاوانخوازو رازاوە پەرەستیان بە گەندڵی کێشا. لوویی شازدەهەم لە یەکەمین ساڵەکانی پاشایەتی خۆیدا بۆ چاك سازی ئەو تەنگەژە ئابوورییەی کە لە ساڵەکانی کۆتایی حکوومەتی لوویی پازدەهەم بەرۆکی فەڕانسەی گرتبوو، پیاوێکی سەختگیرو ئەمینداری بەناوی "تۆرگۆ"[34] کردە وەزیری دارایی حکوومەت. تۆرگۆ چەند پرۆگرامێکی بۆ کەم کردنەوەی خەرجییەکانی دەوڵەتیو دووبارە پێدا چوونەوەی یاساو رێساکانی دارایی خستەگەر. بەڵام پرۆگرامەکانی لەگەڵ بەرگری دەوڵەمەندانو چینی تێرو حەساوەی کۆمەڵگا کە ئامادە نەبوون خراجی زیاتر بۆ دابینکردنی خەرجییەکانی دەوڵەت بدەن بەرەورروو بۆوەو تەنانەت چینی مام ناوەندی نوییێ کۆمەڵگاش (بوورژواکان) لەبەر ئەوەی کە یاسا نوێیەکان لەمپەر بوون لەبەرامبەر پێشکەوتنی کارەکانیان، دژی ئەو پرۆگرامانە هەڵوێستیان گرت. ئەگەر تۆرگۆ پشتیوانیوپاڵپشتی پاشای هەبوایە دەیتوانی لەبەرامبەر دەوڵەمەندانو چینی حەساوەی کۆمەڵگا راوەستێو بەرنامە چاکسازییەکانی جێبەجێبکات. بەڵام گرفتی سەرەکی تۆرگۆ ئەوە بوو کە ئەفرادی دەربارو لەسەرووی هەموویانەوە مەلیکەماری ئانتوانت لەگەڵ ئەو بەرنامانە کە هەندێك تەسك کردنەوەی سەبارەت بەوان تێدا بوو دژایەتیان دەکرد. تۆرگۆ لەساڵی ١٧٧٦ لە پۆستی خۆی دەستی کێشایەوەو کاتی دەست کێشانەوە بە لوویی شازدەهەمی گوت: چارلزی یەکەم پاشای بریتانیاش بەهۆی بێ ئیرادەییو بێبڕیاری خۆی لەناو برد.

34-Turgot



لوویی شازدەهەم دوای لەسەر کار لاچوونی"تۆرگۆ"، بانکدارێکی سویسریی بەناوی "ژاك نێکێر"[35] لەسەر جێگای ئەو دانا، بەڵام مشوورە پارێزگارانەکەی ئەویش بۆ چارەسەرکردنی گرفتە ئابوورییەکانی فەڕانسە دەرەنجامێکی ئەوتۆی لێنەکەوتەوەو چوونە ناوەوەی فەڕانسە لە شەڕی سەربەخۆیی خوازەکانی ئەمریکا دژی بریتانیا کە لەساڵی ١٧٧٨ دەستی پێکرد، هەرچەند بە سەرکەوتنی فەڕانسەو سەربەخۆیی خوازانی ئەمریکاو شکستی بریتانیا کۆتایی پێهات، گیرو گرفتەکانی لوویی شازدەهەمی لە دەسەلاتو حکوومەتدا زیاتر کرد.



**وێنەی لوویی شازدەهەم**

لەبەرئەوەی لە لایەکەوە بیری ئازادیخوازانەی سەربەخۆیخوازەکانی ئەمریکا لەنێو سەربازو ئەفسەرەکانی هێزی فەڕانسە تەشەنەی کردو بەگەڕانەوەیان بۆ فەڕانسە لەئاستێکی بەربلاودا لەنێو سەربازانو ئەفسەرەکانیتری فەڕانسە بلاو بۆوەو لەلایەکیترەوە خەرجییەکانی ئەو شەڕەکە بە سەر گەلی فەڕانسە داسەپێندرا بوو، نارەزایەتی گشتیی دوو بەرامبەر کرد. هەستی تۆڵە سەندنەوەو رقو کینەی بریتانیاییەکان دژی دەرباری فەڕانسەش هۆکارێکیتر بوو کە نابێت لە درووست بوونی شۆڕشی فەڕانسەو هاندانە پشتی پەردەو شاراوەکانی دژی دەرباری لوویی شازدەهەم لە بیربکرێت. "نێکێر"یش وەك تۆرگۆ رێگای چارەسەری گرفتە ئابوورییەکانی لە دەست پێوە گرتنو چاکسازی داراییو وەرگرتنی باجی زیاتر لە دەولەمەندانو چینی حەساوەو تێری کۆمەڵگادا دەبینی. بەڵام وەك تۆرگۆ بەهۆی دژایەتیو بەرگری

35-Jacques Necker





ڕوون کردنەوەی ڕووداوەکانی سالآنی کۆتایی دەسەلآتی لوویی شازدەهەمو ئەو ڕۆڵەی کە ماری ئانتوانت لەودا نواندی پەرتووکێکی سەربەخۆ هەڵدەگرێ، بەلآم ئەوەی کە دەبێ لێرەدا بە کورتی ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە کە کارتێکەری ماری ئانتوانت لەلوویی شازدەهەم کاریگەرترین فاکتەری دەرکردنی بڕیارە نادرووستەو دژکردەوە نەگونجاوەکانی لوویی لەبەرامبەر ڕووداوەکان بوو کە پێشەکییەکانی شۆڕشی گەورەی فەڕانسەو ژێراو ژوور بوونی ڕێژیمی پاشایەتیی لەو وڵاتە ئامادە کرد. لەسالی ١٧٨٨ لوویی شازدەهەم کە هەستی بە نارەزایەتی زۆر و جۆشو خرۆشی هەستی گشتی خەڵك دەکرد، بڕیاریدا هەندێك چاکسازی ئەنجام بداتو بۆ ئەم چاکسازییانەش سەرلەنوێ داوای لە نێکێری وەزیری لەسەرکارلابراوی دارایی سالی ١٧٨٨ کرد کە ئەو چاکسازییانەی بۆ ئەنجام بدات. نێکێر دەیزانی لەو چاکسازییانەی ئەو دیهەوێت ئەنجامی بدات توشی داژیەتی دەوڵەمەندانو پیاوانی ئاییینی دەبێتەوە، بۆیەش پێشنیاری کرد ئەنجومەنێکی سێقۆلی لە چینەکانی دەوڵەمەندانو پیاوانی ئایینیو خەڵکی ئاسایی یان چینی سێهەم پێك بهێندرێتو پرۆگرامە چاکسازییەکانی بەتایبەت لەبواری باجو دابینکردنی خەرجییەکانی دەوڵەت بە ڕاوێژی ئەو ئەنجوومەنە جێبەجێبکرێت. لوویی شازدەهەم ئەو پێشنیارەی قەبوڵ کردو نێکێریش بۆ ئەوەیکە هاوسەنگی لەنێوان نوێنەرانی چینەکان درووست بێتودوو چینی دەوڵەمەندانو ئایینییەکان زۆربەی کوورسییەکانی ئەنجوومەنەکە نەگرنە دەست، بڕیاریدا ژمارەی نوێنەرانی چینی سێهەم کە زۆربەی هەرەزۆری وڵات پێك دەهێنن بەرابەر بیت لەگەڵ نوێنەرانی دوو چینەکەیتر. ئەو ئەنجومەنەی مانگی مەی سالی ١٧٨٩ لە پاریس دامەزرێندراو ئەگەر ڕوانگەی نێکێر سەبارەت بە چۆنیەتی باسو ڕاوێژو بڕیاردانی ئەو ئەنجوومەنەو چوار چێوەو دەسەلآتەکانی جێبەجێ بکرابایە، ڕەنگە لە فەڕانسە شۆڕشێك ڕووی نەدابووایە، بەلآم لوویی شازدەهەم هەر لەسەرەتاوە لەژێر کارتێکەری شاژنو ئەفرادی دەستوپێوەندیداری ئەو لەبیری کەمکردنەوەی دەسەلآتەکانی ئەنجوومەنەکە کەوتو نوێنەرانی دەوڵەمەندانو ئایینییەکانیش ئامادە نەبوون بنەمای یەکسانی دەنگەکانی نوینەرانی چینی سێهەم قەبوڵ بکەن. ئەم بێسیاسەتییە بووە هۆی ئەوە کە نوێنەرانی چینی سێهەم لەگەڵ کار بەدەستانی حکوومەتو نوێنەرانی دەوڵەمەندانو ئایینییەکان ڕوو بە ڕوو ببنەوە. دووهەمین هەڵەی گەورەی لوویی شازدەهەم کە ئەویش لە تەڵقینەکانی ماری ئانتوانتو ئەفرادی دەستو پێوەندییەکانی ئەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، لەسەرکار لابردنی



دارودەستەی لوویی‌و مەلیکە ماری ئانتوانت نەیتوانی چارەسەری بکاتو لەسالی ١٧٨١ ناچار بوو دەست لە کار بکێشێتەوە. ماری ئانتوانت کە لەم بەرەوارەوە لە بەر چاوی گەلی فەڕانسە کەوتبووو بە جێگای ناوی شاژن پتر بە نازناوی "ژنی ئۆتریشی"[٣٦] سووکایەتی پێدەکرا، زیاتر لەجاران لای فەڕانسەوییەکان دزێوتر بووو ڕووداوی"ملوانکە" کە بەریتانییەکان ئاشکرایان کرد، ڕۆڵێکی کاریگەری لە زیاتر کردنی ڕقو دژایەتی گشتی سەبارەت بە شاژنو دەرباری لوویی نواند... ڕووداوی ملوانکە بەشێوەیەکی کورت بەم جۆرەیە کە لوویی شازدەهەم لە کۆتاییەکانی دەسەلآتیدا فەرمانی درووستکردنی ملوانکەیەك بە پێنج سەد پارچە ئەڵماس بۆ دڵدارەکەی، مادام دووباری دەداو ئامادەکردنی لەتە ئەڵماسەکانی پێویستی ئەو ملوانکەیە ماوەیەك دەخایێنێ. بەجۆرێك کە لەکاتی مردنی لوویی شازدەهەم لەتەمەنی ٦٤ سالیدا ئەو ملوانکەیە بەدرووست نەکراوی دەمێنێتەوەو بە چوونە دەرێی مادام دووباری لەکۆی ژنەکانی دەربار، ملوانکەکە لەسەردەستی درووستکەرانی ئەو ملوانکەیە دەمێنێتەوە.

ماری ئانتوانت دوای ئاگادار بوون لەو ملوانکەیە وەبیری داگیرکردنی دەکەوێتو یەکێك لەژنانی دەربار بەناوی "ژان دیلامۆت"[٣٧] دەبێتە دەلآلی ئەو مامەڵەیەو یەکێك لە کار بەدەستانی ئایینی فەڕانسەش (کاردینالْ دیرۆهام)[٣٨] لەلایەن ماری ئانتوانتەوە بەلێنیی پێدانی نرخی ئەو ملوانکەیە دەگرێتە ئەستۆ، بەلآم ژان دیلامۆتو مێردەکەی دوای بەدەستهێنانی ملوانکەکە خۆ دەشارنەوەو ماوەیەك دواتر هەوالی فرۆشتنی ئەو ملوانکە بەنرخە لە لەندەن ئاشکرا دەبێت .

گەوهەر فرۆشەکان کە بەهۆی متمانە بە کاردینالْ دێرۆهام ئەو ملوانەکەیە دەدەن بە دیلامۆت، لە دادگا شکایەتی لێدەکەن. کاردینالْ دێرۆهام دەستبەسەر دەکرێو بەئاشکرا بوونی ڕووداوی دادگا، ڕقو بێزراوی گشتی سەبارەت بە ماری ئانتوانت زیاتر دەبێت.

***

36-L'Autrichienne
37-Jeanne de Lamotte
38-Cardinal de Roham





دووبارەی نێکێرو دژایەتی کردنی لەگەڵ گۆڕینی ناوی ئەنجوومەنی چینە سێ قۆڵییەکان بۆ ئەنجوومەنی کاتی دامەزرێنەران بوو. نێکێر ڕۆژی یازدەی ژووئییەی ساڵی١٧٨٩ لەسەر کار لابردراو ڕۆژی دواتر خۆپیشاندانێك دژی دەرباری لوویی شازدەهەم دەستی پێکرد. ئەو خۆپیشاندانە لەڕۆژەکانی دواتر بەرفراوانتر بووو لەڕۆژی سێزدەی ژووئیەی هەمان ساڵ، خۆپیشاندەران کە سەرەتا چەکی ساردی وەك نێزەو تەوریان پێبوو بە هێرش کردنە سەر جبەخانەیەکی چەك‌و چۆڵ، چەکی گەرمیشیان بەدەست هێنا. ڕۆژی چواردەهەمی ژووئیە کە خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە مێژووی شۆڕشەکانی فەڕانسەو وەك ڕۆژی نەتەوەیی فەڕانسە جێژن دەگیرێ، گەلی تووڕەو ڕق هەستاوی فەڕانسە سەرەتا بە هێرش بردنە سەر ناوەندێکی سەربازی چەکی زۆرترو ژمارەیەکیشیان تۆپ بەدەست هێناو لەو ڕۆژەدا ژمارەیەکیش سەرباز پێوەندییان بە خەڵکەوە گرت‌و قەڵای بە ناوبانگی "باستیل"[39]یش بۆ وەدەست هێنانی چەك‌و ئازادکردنی چەند زیندانی‌یەکی سیاسی کەوتە بەر پەلامار. گیرانی باستیل‌و کوژرانی بەرپرسەکەی کە خەڵك سەریان بە نێزەوە کردبووو لە پێش خۆیان برد، نەتەنیا یەکەمین توندو تیژی‌و خوێنرێژی لە شۆڕشی فەڕانسە بەڵکو یەکەمین بۆشایش لەریزی سەربازەکانی فەڕانسە بوو کە لوویی شازدەهەمی زیاتر لەجاران ترساندو ناچارە کرد لەبەرامبەر شۆڕشگێڕانی فەڕانسە پاشەکشە بکات. نێکێر کە لەلای خەڵك‌و نوێنەران خۆشەویست بوو، لەڕۆژی شازدەهەمی ژووئییەدا سەرلەنوێ هاتەوە سەر کارو لە ڕۆژی حەڤدیەم بڕیاری گۆڕینی ناوی ئەنجوومەنی چینە سێ قۆڵییەکان یان ئەنجوومەنی نەتەوەیی بۆ ئەنجوومەنی کاتی دامەزرێنەران پەسند کرا کە بەمانای قەبووڵکردنی دەسەڵاتەکانی یاسا دانان لە لای ئەو ئەنجوومەنەوە بوو. ئەنجوومەنی کاتی دامەزرێنەران بیست ڕۆژ دوای ڕاپەڕینی ١٤ی ژووئییە بە پەسندکردنی یاسایەك، سیستەمی فیۆداڵی‌و ڕێژیمی دەرەبەگایەتیی لەفەڕانسە هەڵوەشاندەوەو زۆربەی ماف‌و دەسەڵاتەکانی دەوڵەمەندان‌و خاوەن زەویە گەورەکانی لەنێو برد. لایەنگرانی لوویی شازدەهەم‌و لەسەروی هەموویانەوە ماری ئانتوانت، لە گوێی لوییان خوێند کە ئەگەر ملکەچی ئەو بڕیارە بێت هەموو لایەنگرانی لەدەست دەدات. لوویی شازدەهەم هاوکات لەگەڵ ڕاگەیاندنی پووچەڵبوونی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی کاتی دامەزرێنەران، جەختی لەسەر ئەوە کردەوەکە هیچ یاسایەك بێ‌دان پێدانان‌و پەسندکردنی ئەو توانای جێبەجێکردنی نی‌یە. لە ڕۆژی پێنجەمی

39-Bastille



ئووتی ١٧٨٩ دا، واتە ڕۆژی دوای ڕەد کردنەوەی یاسای پەسندکراوی ئەنجوومەن لەلایەن پاشاوە، هەزاران ژن‌و پیاوی چەکدار بەرەو کۆشکی ڤێرسای (شوێنی نیشتەجێ بوونی ماڵباتی پاشا) وەڕێکەوتن.

بۆ وەڕێخستنی ئەو خۆپیشاندانە جگەلە بابەتی ڕەدکردنەوەی یاساکانی پەسندکراوی ئەنجوومەن بە فەرمانی پاشاو هەژاری‌و قات‌و قڕی‌و کەم بوونی نان‌و خواردەمەنی کە لە ئاژاوەو بێ سەروبەری لە گوندەکان‌و خراپی باری بەرهۆم سەرچاوەی گرتبوو، دەنگۆی لەژێر پێ شێلان‌و خستنی ئالای سێ‌ڕەنگی فەڕانسە لەلایەن ماری ئانتوانت (ژنی ئۆتریشی)و سووکایەتی کردن بە نەتەوەی فەڕانسە لە کۆڕی جێژنێك کە لەکۆشکی ڤێرسای گیرا بوو، ڕۆڵی کاریگەری هەبوو. خۆپیشاندەران کە زۆربەیان ژن بوون، دوای گەیشتن بە کۆشکی ڤێرسای لە دەوروبەری ئەو کۆشکە دەستیان بە درووشمدان کردو لەنێوان ئەو درووشمە جۆراوجۆرانەی کە بەلایەنگری لەسەربەستیی حکوومەتی نەتەوەیی بەرزیان دەکردەوە، زیاتر لە هەموویان درووشمی "ئێمە نانمان دەوێ" بە گوێ دەگەیشت. دەڵێن کاتێك مەلیکە ماری ئانتوانت هۆی ئەم خۆپیشاندان‌و قاوو قیژەیەی لەئەفرادی دەرباری پرسی، وتیان لەپاریس نان کەمەو ئەمانە نانیان دەوێت. ماری ئانتوانت ولامی داوە کە "ئەگەر نانیان نی‌یە کێك بخۆن!" ڕەنگە ئەم داستانە بۆ ماری ئانتوانت هەڵبەسترابێ، بەلام ئەم داستانەش وەك زۆربەی پڕۆپاگەندەکانی‌تر لە یادی خەڵك ماوەو کەوتە نێو کۆڕ و سەر زمانان‌و بووە هۆی سووکایەتی پێکردن بە ماری ئانتوانت‌و دەرباری فەڕانسە. خۆپیشاندانەکەی پێش کۆشکی ڤێرسای لە ڕۆژی شەشەمی ئووت بوو بە شۆڕشی چەکدارانەو خەڵك بەشکاندنی دیواری حەوشەی کۆشکی ڤێرسای‌و کوشتنی ژمارەیەك لەسەربازەکانی پارێزەری کۆشك، هێرشیان بردەسەر ئەو باڵەخانەیەی کە ماری ئانتوانتی تێدا نیشتەجێ بوو. بەلام ماری هەڵاتە بەشەکەی‌تری کۆشك کە تایبەت بە پاشا بوو. خۆپیشاندەران داوایان لە بنەماڵەی پاشا کرد کە ڤێرسای بە جێ بهێڵن‌و بێنە پاریس. لوویی شازدەهەم کە لە درێژەکێشانی شۆڕشەکە دەترسا ئەو داواکارییەی قەبووڵ کرد. بنەماڵەی پاشایەتی فەڕانسە دوای گوازرانەوە بۆ پاریس زیاتر لە جاران کەوتنە ژێر گووشارو لوویی شازدەهەم کە بەکردەوە دەسەلاتی لێ‌ئەستێندرا بۆوە، لە ئەنجامدا بڕیاریدا بە نهێنی لە پاریس بچێتە دەرەوەو لە بەشێکی‌تری خاکی فرانسە بۆ وەدەست هێنانەوەی هێزو دەسەڵاتەکانی هەوڵ بدات. زۆربەی مێژوونووسان ئەم بڕیارە ناشیانەش کە دوایین تیری لە بنەماکانی ڕێژیمی پاشایەتیی فەڕانسە





دا، دەخەنە پاڵ ماری ئانتوانتەوەو دەنووسن: ماری مێردەکەی رازی کرد بچێتە "مێتز"[40]و لەوێ پێوەندی لەگەڵ بەهێزەکانی یەکێك لە ئەفسەرانی پاشایەتی خواز بەناوی "مارکوس دووبلی"[41] بگرێ. لە هەندێك لەسەرچاوەکاندا هاتووە کە ماری ئانتوانت لە رێگای ئەو ئەفسەرە پاشایەتی خوازەوە کە سەرکردایەتی هێزەکانی فەڕانسەی لە سنوورەکانی ئۆتریش لە ئەستۆدا بوو، لەگەڵ بنەماڵکەی پێوەندی گرتووەو ویستوویەتی دوای رۆیشتنە دەرێ لەپاریس بەیارمەتی هێزەکانی ئۆتریش لەگەڵ حکوومەتی شۆڕشی پاریس شەڕ بکات.

لوویی شازدەهەمو ماری ئانتونتو ئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتی لە شەوی بیستەمی ژووەنی ساڵی ١٧٩١ بە کالیسکەیەکی گەورەوە لە پاریس چوونە دەرێ. بەلاّم لە نزیکی پاریس هێزە شۆڕشگێرەکان ئەوانیان ناسیو لەژێرچاوەدێری گەڕاندیاننەوە بۆ پاریس. گەڕانەوەی پاشاو خێزانی بۆ پاریس بە بیڕێزیو سووکایەتییەوە ئەنجام دراو ئاژاوەیەکی لێکەوتەوە کە بووە هۆی ئەوە کە لەوە بەملاوە بکەونە ژێر چاوەدێری زیاترو بەکردەوە لە کۆشکی "تۆیلێری" بەندکران. هەوڵ بۆ لابردنی لوویی شازدەهەمو هەڵوەشاندنەوەی رێژیمی پاشایەتی لەرۆژی دواتری رووداوەکە لە پاریس دەستی پێکردو ئەمجارەیان جگە لە تۆمەتەکانی پێشوو، تۆمەتی خەیانەتو پیلانگێڕان لەگەڵ بێگانەکان بە دژی فەڕانسەش لە بنەماڵەی پاشایەتی بەتایبەت ماری ئانتوانت درا. لە رۆژی بیستەمی ئاڤریلی ساڵی ١٧٩٢ ئەنجوومەنی کاتی فەڕانسە بریاری شەڕی لەگەڵ ئۆتریش دەرکرد. تێکشکانە سەرەتاییەکانی فەڕانسە لەو شەڕەداو ئەو پڕۆپاگەندانەی کە لەمەڕ پێدانی پلانەکانی شەڕ لەلایەن ماری ئانتوانتەوە بە دووژمن بلاّو ببۆوە، پەرێشانیو دژایەتی گشتی خەڵکی لەگەڵ رێژیمی پاشایەتی پتر کردو لەرۆژی بیستەمی ژووەن لە پاریس هەندێك خۆپیشاندان دژی رێژیم دەستی پێکرد کە وردەوردە بەرفراوانتر بوو. کۆشکی تۆیلێری لە رۆژی دەی ئووت لەلایەن شۆڕشگێڕە چەکدارەکانەوە کەوتە بەر هێرش. پارێزەرانی کۆشك کە هەموویان لەسەربازانی بە ئەمەگی پاشابوون لەبەرامبەر هێرش بەران بەرگرییان کرد، بەلاّم پاش چەند کاتژمێرێك شەڕ، تێکشکانو کۆشکەکە لەلایەن شۆڕشگێڕەکانەوە داگیر کرا. بەلاّم لوویی شازدەهەمو بنەماڵەکەی لە رەوتی شەڕو پێکدادانەکە

40-Metz

41-Marquis de Bouille



لە کۆشك هەلاّتنو پەنایان بۆ باڵەخانەکەی ئەنجوومەن برد. دوای ئەم رووداوە ئەنجوومەن لەدەی ئووت حوکمی هەڵپەساردنی لوویی شازدەهەمی پەسند کرد. بەلاّم پەسندکردنی بڕیاری کۆتایی سەبارەت بە چارەنووسی رێژیمی داهاتووی وڵاتی سپارد بە ئەنجوومەنێکیتر کە"کۆنڤانسیۆنی"[42] پێدەوترا. لوویی شازدەهەم و بنەماڵەکەی لەسەرەتادا لە لۆکزامبۆرگو دوایش لەقەلاّی "تێمپل"[43] بەند کرانو بەرپرسایەتی دەسەلاّتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت بە شۆڕایەکی کاتی پێدراو لەژێر سەرپەرشتی "دانتۆن"[44]. لەنیوەی سێپتەمبەر هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی نوێی فەڕانسە کە ناوی کۆنڤانسیۆن بوو کۆتایی پێهاتو کۆنڤانسیۆن لە رۆژی ٢١ ی سێپتەمبەری ساڵی ١٧٩٢ دا کۆبوونەوەیەکی پێك هێنا.

لە یەکەمین کۆبوونەوەی کۆنڤانسیۆن بابەتی رێژیمی داهاتووی وڵات کەوتە بەر باسو نوێنەرانی ئامادەبوو لە کۆبوونەوەکە بە تێکڕای دەنگ هەڵوەشاندنەوەی رێژیمی پاشایەتیو دامەزراندنی سیستەمێکی کۆمارییان پەسندکرد.

لەنێو ئەندامانی کۆنڤانسیۆن سەبارەت بە چۆنیەتی دیاریکردنی چارەنووسی بنەماڵەی پاشایەتی جیاوازی را هەبوو، بەلاّم باڵی توندڕەوی کۆنڤانسیۆن کە "رۆبێسپییەر"[45] لەسەرروویانەوە بوو، لەو بڕوایەدا بوو مانەوەی لوویی شازدەهەم لە داهاتوودا مەترسیی بۆسەر حکوومەتی کۆماری دەبێت. رۆبێسپییەر لە شازدەی ژانڤییەی ساڵی ١٧٩٣ بە ئامادە کردنی زەمینەی پێشوو، پێشنیاری لە سێدارەدرانی لوویی شازدەهەمی پێشکەش بە کۆنڤانسیۆن کردو لە وەتارێکدا گووتی: مانەوەی لوویی تەنانەت لە بەندیخانەو دوورخستنەوەشی مەترسی هەیە بۆ دەوڵەت. زۆربەی ئەندامانی کۆنڤانسیۆن لە بڕیاری لە سێدارەدرانی لوویی شازدەهەم رازی نەبوونو ئەگەر دەنگەکان بە نهێنی وەربگیرابوایە، دژی بڕیاری لەسێدارەدانی لوویی دەنگیان دەدا، بەلاّم رۆبێسپێەر پێشنیاری کرد کە نوێنەرانی کۆنڤانسیۆن یەکە یەکە بچنە پشت تریبوونو دەنگی خۆیان رابگەیێننو خۆی پێش هەموو نوێنەرەکانو وەك نوێنەری یەکەمی پاریس بۆ کوشتنی لوویی شازدەهەم دەنگیدا. کۆبوونەوەو باسی کۆنڤانسیۆن

42-Convention

43-Temple

44-Danton

45-Robespierre





سەبارەت بە دیاریکردنی چارەنووسی لوویی شازدەهەم بیست‌و چوار کاتژمێری خایاندو زۆرینەی ئەندامانی کۆنڤانسیۆن لەژێر گوشاری ترس‌و دڵەراوکەی ئەو خۆپیشاندانانەی کە لەتەواوی ماوەی کۆبوونەوەکەدا لە دەوروبەری بینایەی کۆنڤانسیۆن درێژەی هەبوو، بڕیاری کوشتنی لوویی شازدەهەمیان پەسندکردو ئەو نوێنەرانەی کە وێرابوویان دژی ئەو پێشنیارە دەنگ بدەن وێرای تاوانبارکردنی لوویی شازدەهەم، تەنیا خوازیاری دادگایی کردنی ئەو لە دادگایەکی دەسەڵاتدار بوون. لە ئاکامدا سەری لوویی شازدەهەمیان لە ڕۆژی ٢١ی ژانڤیەی ساڵی ١٧٩٣لەتەمەنی ٣٩ ساڵی‌و لە گۆرەپانێکدا کە ئەمڕۆ گۆرەپانی "کۆنکۆرد"[٤٦]ی پێدەوترێ بە گیوتین (مقصلە) لە جەستە جیا کردەوە. خاڵی سەر سووڕهێنەر ئەوەیە کە لوویی سەرەڕای ئەو هەموو بێ ئیرادەیی‌و لاوازییەی کە لە چارەسەرکردنی گیرو گرفتەکانی ژیانیدا هەی بوو، بە بوێری‌و هێمنی‌یەکی کەم وێنەوە بەرەو پێشوازی مردن چوو.

***

ماری ئانتوانت‌و کوڕە هەشت ساڵانەکەی (لوویی شارڵ) دوای کوژرانی لوویی شازدەهەم لە قەڵای تێمپڵ بەند کران، بەڵام دواتر ئەوانیان لێك جیا کردەوەو ماری ئانتوانت تا ڕۆژی دادگاییی کردنەکەی لە ڕۆژی چوارەدەی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٧٩٣ لە بەندیخانەی "کۆنسێرژری"[٤٧] بەند بوو. ماری ئانتوانت بە کراسێکی رەشی کۆنەوە کە لە ڕۆژی کوژرانی هاوسەری لە بەریدا بوو، لە کۆبوونەوەی دادگا ئامادە بووو دیمەنی تێکچرژاوو خەمۆکی، ئامادەبووانی دادگای مات‌و بێدەنگ کرد. ڕۆژێك کە ئانتوانت لە بەردەم "دادگای شۆڕشی تاوان" ئامادەبوو ٣٧ساڵی تەمەن بوو، بەڵام ساڵانی ترسناکی ١٧٩٠ تا ١٧٩٢و چوار مانگ بەندیخانەو پێکانی رووحی‌و کوژرانی مێردەکەی بەڕادەیەك ئەوی تێك شکاندبوو کە وەك ژنێکی شەست ساڵە یان زیاتر دەهاتە بەرچاو. زولفەکانی کەم‌و زۆر سپی ببوون‌و بەهۆی کزی‌و لاوازی زۆر، ئێسقانەکانی سەرو چاوی دەبیندران.

46-Concord
47-Conciergerie





**ماری ئانتوانت لە دەورانی دەسەڵاتدا**

داواکاری گشتی ئەم دادگایە،"فووکیە تینڤیل"[٤٨]ی شۆڕشگێر بوو کە داواکاری گشتی بەناوبانگی پاریس بووو هەزاران کەسی پێش ماری ئانتوانت بە تیخی گیوتین ئەسپارد بوو. تۆمەتەکانی ماری ئانتوانت کە لە داواکاری نامەکەی تینڤیل دا نووسرا بووو لەسەر بنەمای ئەو تۆمەتانە داوای توندترین سزا بۆ تاوانبار کرابوو بریتی بوون لە "بەشداری لەتاوانەکانی لوویی شازدەهەم‌و مەیلەو چوونی ئەو بۆ کوشتنی خەڵك‌و توندوتیژی لەگەڵ شۆڕشگێڕان‌و بە فیڕۆدانی سامانی نەتەوەیی‌و چەوت کەڵك وەرگرتن لە پێگەو هەروەها نامە گۆڕینەوە لەگەڵ دووژمنانی دەرەکی شۆڕشگێڕان‌و پیلانگێران دژی دەوڵەت بوو". ڕۆژی یەکەمی دادگا بە گوێ گرتن لە شایەتی‌و سوێند خواردنی گەواهیدەران تێپەڕی‌و ماری ئانتوانت زۆربەی ئەو شایەتانەی وەدرۆ خستەوە. ماری ئانتوانت لەو کۆبوونەوەیەی دادگادا بە هێمنی‌و لەسەرەخۆییەوە وەڵامی پرسیارەکانی سەرۆکی دادگاو قسەی شایەتەکانی دەداوەو تەنیا جارێك تووڕە بوو ئەوەش کاتێك بوو کە یەکێك لە شایەتەکان ئەوی بە ئەشقبازی لەگەڵ کوڕەکەی لە بەندیخانەی تێمپڵ تۆمەتبار کرد ماریش لە وەڵامدا گوتی ئەم تۆمەتە بەڕادەیەك ناحەزە کە ئامادەنی‌یە وەڵام بداتەوە.

48-Fouquier-Tinville







**ماری ئانتوانت لە ڕۆژەکانی کۆتایی تەمەنیدا**

سێشەممە ١٥ی ئۆکتۆبەر کە ڕۆژی دووهەمی دادگایی کردنی ماری بوو، کاتێك کە ماری ئانتوانتیان لە بەندیخانەوە دەهێنا بۆ دادگا بارانێکی بە خوڕ دەباریو زولفو جلوبەرگەکەی خووسابوو. پارمەتیدەری داواکاری گشتی لەسەرەتای کۆبوونەوەی دووهەمی دادگادا، دووپاکەتی داخراوی کردەوە کە لەکاتی گواستنەوەی ماری لە قەلای تێمپڵ لەنێوان کەلو پەلەکەی زەوت کرابوو. لە نێو ئەو پاکەتانەدا بڕێك قژو خشتەیەكو قووماشێکی بچووکی تێدا دەبیندرا کە دڵێکی تیر لێدراوی لێکێشرابوو. سەرۆکی دادگا داوای ڕوونکردنەوەی ئەو شتانەی نێو پاکەتەکانی کرد. ماریگوتی: " قژەکان هی مێردو منداڵە مردووەکەمە کە وەك یادگاری هەڵم گرتووە، خشتەکەشم بۆ فێرکردنی ژماردن بۆ کوڕەکەم ڕاگرتبوو ودڵەکەش بیرەوەری ڕابردوویە". فووکیە ووتی تاوانبار درۆ دەکات. ئەم دڵە تیر لێدراوە هێمایەکی دژی شۆڕشگێڕییە کە من لای زۆربەی نەیارانی شۆڕش دیومە.

دواییی (هێرمان)[٤٩] سەرۆکی دادگا دەستی بە قسە کردو چەند پرسیارێکی جیاجیای لە ماری ئانتوانت پرسی کە لە ڕواڵەتدا پێوەندییان بەیەکەوە نەبوو، بەڵام مەبەست لەو پرسیارانە

---

49-Herman



بەدەست هێنانی بەڵگە بوو بۆ سەلماندنی ئەو تۆمەتانەی کە لە داواکاری نامەکەی فووکیەدا نووسرا بوو. هەندێك لەو پرسیارو وەڵامانە بەم شێوەیەی خوارەوەیە.

-ئەم پارەو پوولانەی کە لە خۆشڕابواردنو میوانییەکانی خۆتان خەرجتان دەکرد لە کوێوە بە دستان دەهێنا ؟

- خەرجی میوانییەکانی دەربار لە شوێنی یاسایی‌دابین دەکراو هیچ شتێك لە دەوڵەت شاراوە نەبوو.

- ئایا تۆ لە دانانی وەزیرو پۆستە گرینگەکانی دەوڵەتی بەشداریت دەکرد؟

-نەخێر.

-ئایا تۆ کەسانی جێمتمانەی خۆت بۆ پێ ئەسپاردنی پۆستە گرینگەکان بە سەر وەزیرەکان دادەسەپاند؟

-نە خێر.

-ئایا تۆ وەزیرەکانی داراییت ناچار نەدەکرد کە بۆ دابینکردنی خەرجییە تایبەتەکانی خۆت، هەندێك پارەت بۆ تەرخان بکەن ؟

-هیچ کات .

ماری ئانتوانت وەڵامی ڕەدی بە تەواوی پرسیارەکانی تایبەت بە پێوەندی لەگەڵ بێگانەکانو شۆفاری بۆ دوژمنانی فەڕانسە داوەو لە ئەنجامدا فووکیە کە لەو پرسیارو وەڵامانە جاڕز ببوو، خۆی درێژەی قسەی گرتە دەستو دوای ئەوە کە دووبارە ماری ئانتوانتی بە پێوەندی گرتن بە بێگانەکانو سیخوڕی بۆ دوژمنانی فەڕانسە تۆمەتبار کرد، ووتی:

- نکۆڵی کردنی تۆ سەبارەت بە چەوت کەڵك وەرگرتن لە دارایی‌و داسەپاندنی دەسەڵات بەسەر کار بەدەستانی دەوڵەت ناتوانێ ڕاستییەکان بشارێتەوە. ئایا دەتوانی حاشا لەوەش بکەی کە لەکاروباری سیاسیدا ڕاوێژت لەگەڵ هاوسەرت کردووەو لە دانانو لەسەرکار لابردنی وەزیرانو پۆستە گرینگەکانی دەوڵەت بەشداریت کردووە؟

ماری ئانتوانت لە وەڵامدا وتی: "ڕاوێژکردن لەگەڵ داسەپاندنی دەسەڵاتو دەست تێوەردان جیاوازی هەیەو من لە هەندێك بواردا تەنیا ڕوانگەی خۆم وەتووەو لە جێبەجێکردنیدا ڕۆڵێکم نەبووە".





فووکیه درێژەی به بابەتەکەداو گووتی: "ئەوبەڵگانەی کە لەبەردست دایەو ئەو قسانەی شایەتەکان هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە کە تۆ دەستت لە کاروباری دانانو لەسەر کارلابردنی وەزیران و بڕیارە گرینگەکانی حکوومەت وەرداوەو لە بەرپرسیارێتی زۆربەی کارە ناحەزو خراپەکان هاوبەشی. هەندێك بەڵگە لەبەردەست دایە کە کاتێك "لوویی کاپێت"[٥٠] سەبارەت بە کارەکان دوودڵ دەبوو، وەزیرەکان بۆ ئەنجامدانی ئەوکارانە پەنایان دەبردە بەر تۆو ئێوەش بە کەڵك وەرگرتن لە بێئیرادەییو بێدەسەلاتی هاوسەرت ئەوتان ناچار دەکرد کە خواستو ئامانجەکانت جێبەجێ بکات". ماری ئانتوانت وڵامی بنەڕەتی تۆمەتەکەی فووکیەی نەداوەو تەنیا ووتی: "هاوسەرم هیچکات بێئیرادەو نەفس نزم نەبووەو هەمووکات ئەوشتانەی کە من وەتوومە جێبەجێی نەکردووە". سەرۆکی دادگا بۆ چەند خولکێك پشوودان دادگاییەکەی راگرتو ماری ئانتوانت کاتێك کە لەنێوان هاتو هاوارو سوکایەتی پێکردنی بینەران لە هۆڵەکە دەچووە دەرێ ورەی لە دست دابوو. داویین کۆبوونەوەی دادگا شەو دەستی پێکرد. لە سووچو قوژبنی هۆڵی دادگا چەند مۆمێکیان داگیرساندبووو دوو چراش لە پشتی دەستەی سوێند خۆران داندرابوو کە پێش دادگاو جێگای دانیشتنی تاوانباری رووناك دەکرد. بەڵام هۆڵی دادگا تاڕادەیەکی زۆر تاریكو ترسناك بوو. سەرۆکی دادگا کۆبوونەوەکەی دەست پێکردو بە ماری ئانتوانتی گووت کە تۆ داواکاری نامەکەی داواکاری گشتی و سوێندی شایەتەکانت بیستو لەبابەتی تۆمەتەکانت ئاگادارکرای. ئایا قسەیترت هەیە بۆ بەرگری کردن لە خۆت؟ ماری ئانتوانت لەسەر جێگای خۆی هەستاو گوتی: "من تا دوێنێ نە بابەتی تۆمەتەکانی خۆم دەزانیو نە شایەتەکانم دەناسی. بەڵام بە دڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم کە نە ئەو تۆمەتانەی لەمن دراوە بنەمایەکی راستو پتەوی هەیەو نە سوێند خواردنی شایەتەکان بەڵگەی بەهێزو سەلمێنەرن. من هیچ تاوانێکم نییە مەگەر ئەوەی کە ژنی لوویی شازدەهەم بوونم بۆ بکەن بە تاوانێکی نەبەخشراوە، ئەگەر ئەوەش تەنیا تاوانی من بێت وەك ژنو بەپێی یاساو دابو نەریتە هیچ رێگایەکم جگە لە ملکەچیو هاودەردی لەگەڵ هاوسەرم نەبووە". فووکیە دوای وتە کورتەکەی ماری ئانتوانت درێژەی قسەی گرتە دەستو لە وتارێکی چڕو پڕدا تەواوی تۆمەتەکانی "بێوەژنی لوویی کاپێتی" خوێندەوەو هەوڵیدا تەواوی ئەو تۆمەتانە بە پاڵپشتی قسەی شایەتەکانو ئەو بەڵگانەی کە لە بەر دەستدا هەبوو بسەلمێنێ. فووکیە

٥٠- Capet ناوی بنەماڵەیی ئاباو ئەژدادی ماڵباتی پاشایەتی فەڕانسە بوو کە شۆڕشگێڕانی فەڕانسە بۆ سووکایەتی پێکردنی لوویی شازدەهەم، ئەو نێوەیان بەکار دەهێنا .



وتە تێرو تەسەلەکانی خۆی بەم رستانە تەواو کرد کە "تاوانبار یەکێك لە دووژمنە ناسراوەکانی نەتەوەی فەڕانسەو یەکێك لە هاندەرە سەرەکییەکانی ئەو تاوانانەیە کە گەلی فەڕانسە بە درێژایی چواردە ساڵی رابردوو دیویانە. ئانتوانت لەو کارەساتانەی کە مردنی هەزارن کەس لێکەوتۆتەوە دەستی هەبووەو دەبێ بە سزای تاوانەکانی خۆی بگات".

کاتێك نۆبەی دوایین بەرگریی یاسایی لە ماری ئانتوانت گەیشتە پارێزەرەکانی، کاتژمێر لە نیوە شەو تێپەڕی بوو. ئەوانیش بۆ رەدکردنەوەی داواکاری نامەکەی فووکیەو وەدرۆخستنەوەی سوێندی شایەتەکان لە دەوروبەری ٢ کاتژمێر قسەیان کرد. لەتەواوی ئەو ماوەیەدا فووکیە بەرقو تووڕەییەوە چاوی لە پارێزەرەکان دەکردو کاتێك کە قسەکانیان تەواو بوو، فەرمانی دەستبەسەر کردنیانی دەرکرد. لەو کاتەدا کە جەندرمەکانی دادگا پارێزەرەکانیان لە هۆڵی دادگا دەبردە دەرێ، هێرمان (سەرۆکی دادگا) بە ئەندامانی دەستەی سوێند خۆرانی گووت: "ئەم دادگایە وێنەیەکی بەرچاوی لەسەربەستیو دادپەروەری بۆ خەڵکی جیهان خستۆتە روو. ئەو ژنەی کە ماوەیەك بەر لە ئێستا شانازی بە دونیا دەفرۆشتو شکۆو زۆرداری ئەو چاوەکانی دەحەپەساند، ئێستا لەسەر کورسی تاوانو لەبەرامبەر گەل دانیشتووەو بەزوویی بە سزای کارەکانی خۆی دەگات. ئێوە ئەندامانی دەستەی سوێند خۆران دەبێ لەکاتی راوێژ، نەتەنیا دەقی داواکاری نامەو رەوتی دادگایی کردنەکە، بەڵکوو تەواوی ژیانی سیاسیو رۆڵێکی کە ئەو ژنە لەتەنیشت هاوسەری وەك دوایین شاژنی فەڕانسە نواندوویەتی لەبەرچاوبگرن. هەروەها پێویستە لەکاتی پەسندکردنی بڕیارەکەتان، پێوەندی تۆمەتبار لەگەڵ وەزیرو ژێنراڵە خایینەکانو رۆڵی ئەو لەمەڕ پێوەندی لەگەڵ پاشا زۆردارەکانی بێگانە کە ئەمرۆ دژی ئازادی ئێمە پیلان دەگێرن لە بەرچاوتان بێت. دەستەی سوێند خۆران کاتژمێر سێی نیوە شەو دەستی بە راوێژ کرد، بەڵام بە لەبەرچاو گرتنی وتەکانی سەرۆکی دادگاو چارەنووسی پارێزەرانی ماری ئانتوانت لەسەرەتاوە ئەنجامی راوێژەکەیان دیار بوو. ئەندامانی دەستەی سوێند خۆران لە ماوەی کەمتر لە کاتژمێرێك بڕیاری خۆیان پەسندکردو رۆژی ١٦ ی ئۆکتۆبەرو کاتژمێر چواری بەیانی کۆبوونەوەی دادگا بۆ راگەیاندنی بڕیاری دەستەی سوێند خۆران پێك هات. هێرمان سەرۆکی دادگا بەم شێوەیە بڕیارە پەسندکراوەکەی خوێندەوە:







AU NOM DE LA REPUBLIQUE

L'ACCUSATEUR PUBLIC, près le Tribunal criminel-révolutionnaire, établi à Paris par la loi du 10 mars 1793, exécution du jugement du Tribunal requiert le citoyen commandant-général de la force armée parisienne, de prêter main-forte et mettre sur pied la force publique, nécessaire à l'exécution dudit jugement rendu contre et qui la condamne à la peine de mort laquelle exécution aura lieu aujourd'huy a Dix heures du matin sur la place publique de la Revolution de cette ville. Le citoyen commandant-général est requis d'envoyer ladite force publique, cour du Palais, ledit jour, à huit heures précises du matin

FAIT à Paris, le 25 l'an de la République française, une et indivisible.

ACCUSATEUR PUBLIC

**بڕیاری کوشتنی ماری ئانتوانت کە داواکاری گشتیی بەناوبانگی فەڕانسە، "فووکیە تینڤیل"ی شۆڕشگێڕ واژۆی کرد**

*"دادگای شۆڕشی تاوان بە لە بەر چاوگرتنی بڕیاری دەرکراوی دەستەی سوێند خۆران کە بە تێکڕای دەنگ پەسند کراوە، تاوانبار ماری ئانتوانت لۆرین دۆتریش بێوەژنی لوویی کاپێت بە مەرگ مەحکووم دەکات. لەسەر بنەمای یاسای پەسندکراوی دەیەمی مارسی پێشوو دەستبەسەر ماڵو مڵکو داراییەکانی بە قازانجی دەوڵەت دادەگیرێ. دادگا داوا لە داواکاری گشتی دەکات کە ئەم بڕیارە لە گۆرەپانی کۆماری جێبەجێ بکات".*

ماری ئانتوانت چاوەکانی لەسەریەك داناو چیتر قسەی نەکرد. ئەو دیهەویست لەبەرامبەر بڕیارێك کە رەنگە خۆشی چاوەڕوانی دەکرد، هێمنیو لەسەرەخۆیی خۆی بپارێزێو بە غرورو ورەوە بچێتە پێشوازی مەرگ، بەلاّم کاتێك ئەویان لە هۆڵی دادگا دەبردە دەرێ ئیتر توانای رێگا رۆیشتنی نەمابوو. ئەو ئەفسەرە گەنجەی کە بەرپرسی پارێزگاری لەو بوو باسکی گرتو ئەوی لە هەوای ساردی پاییزیدا تا هۆدەکەی رێنوێنی کرد. فووکیە کاتژمێر دەی بەیانی ئەو رۆژەی بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکە دیاری کردو شاژنی بەخت وەرگەڕاوەی فەڕانسە تەنیا چەند کاتژمێرێکی دەرفەت بوو کە وەسیەتنامەکەی بنووسێ. بەلاّم جگە لەم چەند دێڕە چیتری بۆ نەنووسرا.

خوای من بەزەییت پێم بێ: منداڵە بەستەزمانەکانی من... چاوەکانم ئیتر ئەسرینێکی نی‌یە بۆتان ببارێنێت. خواتان لەگەڵ. خواتان لەگەڵ.





**دیمەنی کوشتنی ماری ئانتوانت کە کاری یەکێك لە وێنە کێشەکانی ئەو کاتەیە**

***

رۆژی شازدەی ئۆکتۆبەری ساڵی ۱۷۹۳ کاتژمێر ۱۰ی بەیانی سەری ماری ئانتوانتیان بە تیخی گیوتین لە جەستەی جیاکردەوە. ئەویش وەك مێردەکەی بە لەسەرەخوییو بوێری بە پێشوازی مەرگەوە چوو. ماری ئانتوانت دووکوڕی بوو کە یەکەمیان لەساڵی ۱۷۸۹دا مردو کوڕی دووهەمیشی کە جێنشینی فەڕانسە بوو، تەنیا دووساڵ دوای مردنی دایکی ژیا. لوویی شارڵ کە لە مێژووی فەڕانسە بە لوویی حەڤدەهەم ناسراوە، کاتێك کە لەگەڵ دایكو باوکی لە قەڵای تێمپڵ بەند کرا تەنیا حەوت ساڵی بووو هەر لەم بەندیخانەیەش لەتەمەنی ۱۰ ساڵیدا مرد. هەڵبەت دواتر چەند دەنگۆیەك سەبارەت بە درۆ بوونی هەواڵی مردنی لوویی حەڤدەهەمو هەلاّتنی لە زیندان بە یارمەتی پاشایەتی خوازەکان بلاّو بۆوەو چەند کەسێکیش بەناوی لوویی حەڤدەهەم داوای تاجو تەختی فەڕانسەیان کرد، بەلاّم داواکارییەکانی هیچکامێکیان نەسەلمێندرا.

# له كاترینی یەكەمەوە تا كاترینی گەورە

پێنج ژن لە مێژووی پڕكارەساتی رووسیا بۆماوەی نێزیك حەفتا ساڵ لەم وڵاتە پانو بەرینە حوكمڕانیان كردووە كە لەنێوانیاندا كاترینی دووهەم یان كاترینی گەورە لە هەموویان ناوبانگی پتر رۆیشتووە. كاترینی گەورە بە تەواوی هێزو دەسەڵاتەوە بۆ ماوەی ٣٤ ساڵ لە رووسیا حوكمی گێڕا. پێش ئەویش چوار ژن بۆ ماوەی ٣٥ساڵ دەسەڵاتداری رووسیا بوون كە هەركامیان چارەنووسێكی سەرنج راكێشیان هەیە. كاترینی یەكەم، هاوسەری پیتەری گەورە (ئێپراتۆری بەناوبانگی رووسیا) یەكەم ژن بوو كە لە رووسیا حوكمڕانی كرد. ناوی ئەسڵی ئەو "مارتا ئێسكاڤرۆنسكی"[1] بوو كە لەبنەماڵەیەكی هەژاری لیتوانی هاتە سەر دونیاو لەسەردەمی داگیركرانی لیتوانی لەلایەن سویدییەكانەوە لەگەڵ ئەفسەرێكی سویدی زەماوەندی كرد بوو. كاتێك رووسەكان لەساڵی ١٧٠٢ دەستیان بەسەر لیتوانی داگرت، مێردی مارتاو سەربازەكانی‌تری سویدی هەڵاتنو مارتاش كە بەدیل گیرابوو لە ماڵی پرەنس ئالێكساندێر مێنشیكۆڤدا خەریكی كلفەتی بوو. ئەو شەوێك چووە ماڵی پرەنس "مێنشیكۆڤ"[2] و چاوی بە مارتا كەوت. پیتەری گەورە كە خۆشی لەم خزمەتكارە جوانو لاوە هاتبوو ئەو شەوە لەگەڵی خەوتو ئەوی خاوەن ئەو تایبەتمەندییانە بینی كە لای پەسندبوو و لەگەڵ ئەوەش كە ژنی هەبوو ئەوی بردە كۆشكەكەی. مارتا لە پیتەری گەورە خاوەنی شەش منداڵ بوو كە تەنیا دوانیان بەناوەكانی ئاننا و ئێلیزابێت پێگەیشتن. مارتا بە فریودانی سەرۆك وەزیرانی عوسمانی پیتەری گەورەی كە لە ساڵی ١٧١١ كە لە شەڕلەگەڵ هێزەكانی عوسمانی لە كەناری رووباری "پرۆت"[3] كەوتبووە ژێر گەمارۆو رێگای دەرباز بوونی نەمابوو رزگار كردو پیتەریش كە پێشتر هاوسەرەكەی تەڵاق دابوو لەساڵی ١٧١٢ بە پاداشتی ئەو خزمەتە بە شێوەیەكی فەرمی لەگەڵ مارتا زەماوەندی كردو دوای زەماوەندەكە ناوی گۆڕدرا بۆ كاترین.

1-Martha Skavronsky

2-Alexander Menshikov

3-Prut





**وێنەی پیتەری گەورە و كاترین كە بەناوی كاترینی یەكەم بوو بەشاژنی رووسیا لەگەڵ كچەكانی، ئاننا و ئێلیزابێت**

پیتەری گەورە دەساڵ دواتر واتە لەساڵی ١٧٢٢دا نەریتی كۆنی هەڵبژاردنی كوڕی گەورە بۆ جێنشینی باوكی تێك داو رایگەیاند لەمە بەدواوە خوودی تێزار جێنشینی خۆی دیاری دەكات. پیتەری گەورە كەئەم بڕیارەی لەژێر كاریگەری دەمێشك رۆكردنی هاوسەری پەسندكرد بوو دوای راگەیاندنی ئەو بڕیارە ئەوی بە جێنشینی خۆی هەڵبژارد. لەرۆژی حەوتەمی مانگی مەیی ساڵی١٧٣٤دا رێوڕەسمی تاج لەسەرنانی كاترینی یەكەم وەك شاژنی رووسیا بەشكۆو گەورەییەكی زۆرەوە لە مۆسكۆ بەڕێوە چووو ئەو تاجەی كە لەسەر ئەو كچە جووتیارو خزمەتكارەی پێشوویان دانا لە ٢٥٠٠ پارچە گەوهەر پێك هاتبوو و كە لەناوەندی ئەو تاجەدا یاقووتێك بەدرشتی هێلكەیەكی مریشك دەدرەوشایەوە. كاترین لەگەڵ ئەو هەموو سەركەوتنو شنازییانەی كە لەژێر سێبەری پیتەری گەورە وەدەستی كەوتبوو، نەیتوانی بەسەر هەواو هەوەسیدا زاڵ بێتو لەهەمان ساڵی تاج لەسەرنان لەگەڵ خزمەتكارێكی تایبەتی دەرباری پیتەر بەناوی "ویلیام مۆنس"[4] كە

4-William Mons





لاوێکی جوانو بە جەرگ بوو پێوەندی گرت. پیتەری گەورە کە لەم رووداوە ئاگادار کرایەوە فەرمانیدا سەری خزمەتکارەکەی ببڕنو سەرە بڕاوەکەی بخەنە نێو شووشەی ئەلکۆلو لە شوێنێکی بەر چاوی کۆشکی ئیمپراتۆری هەڵیواسن تا هەموان لەچارەنووسی ئەو خزمەتکارە خائینە بەئاگا بێنەوەو ئەزموون وەرگرن. بەلاّم خاڵی سەر سووڕهێنەری ئەم رووداوە ئەوە بوو کە هاوسەرە خەیانەتکارو سپڵەکەی پیتەری گەورە سزا نەدراو کاترین بە مەکرو عیشوە هەروەك جاران ئەشقو خۆشەویستی پیتەری سەبارەت بە خۆی پاراست. پیتەری گەورە دوای ئەو رووداوە زیاتر لە ساڵێك نەژیاو لەساڵی ١٧٢٥دا کاترین بە بێ شەڕو کێشە بوو بە سەرۆکی رووسیا. کاترینی یەکەم لە تەمەنی چل ساڵی بوو بە دەسەلاّتداری رووسیا و حوکمڕانی ئەو لە رووسیا زیاتر لەدوو ساڵی نەخایاند، بەلاّم لەوماوە کورتەدا کاری بەرچاوی ئەنجامدا. راوێژکاری کاترین لە کاروباری حکوومەتدا خاوەنکارەکەی پێشووی (پرەنس مێنشیکۆڤ) بوو کە تا رادەیەك هۆگری بوو. چەند وێنەیەك لە گرینگترین کارەکانی کاترینی یەکەم لەوماوە کەمەی دەسەلاّتیدا بریتی بوولە دامەزراندنی ئەنجومەنێکی شەش کەسی لەنەجیب زادەو شازادەکانی رووسیا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری رووسیاو هەروەها دامەزراندنی فەرهەنگستانێکی زانست بۆ هاندانی پسپۆڕانو داهێنەران بوو. ئەنجومەنی پاشایەتی کە داهێنەری سەرەکی ئەو پرەنس مێنشیکۆڤ بوو لەراستیدا ئەرکەکانی دەوڵەتی لەئەستۆ بووو بۆ یەکەمین جار لەمێژووی رووسیادا یاساو رێسایەکی بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی دەوڵەت دانا. کاترینی یەکەم هەڵبژاردنی جێنشینی خۆشی بەو ئەنجومەنە ئەسپاردو ئەنجومەنی پاشایەتی دوای مردنی لەنەکاوی کاترین لەساڵی ١٧٢٧، کوڕی دووهەمی پیتەری گەورەی کە لە ژنی یەکەمی بوو بە جێنشینی ئەو هەڵبژارد. ئەنجومەنی پاشایەتی لەراستیدا بە هەڵبژاردنی پیتەری دووهەم کە هێشتا خۆی نەناسی بوو درێژەی سەرکردایەتی خۆی لەسەر رووسیا مسۆگەر کرد، بەلاّم پیتەری دووهەم سیٚساڵ دواتر بە نەخۆشی ئاوڵە (خروێکە) مردو دیسان لەسەرجێنشینی ناکۆکی درووست بۆوە. دوای مردنی پیتەر دووکەس بۆ جێنشینی ئەو پاڵێوراوبوون. نیوەی ئەندامانی ئەنجومەنی پاشایەتی لایەنگری "ئێلیزابێت پێترۆڤنا"[5]ی کچی کاترینو پیتەریگەورە بۆ پۆستی دەسەلاّت بوونو نیوەکەی تریش لایەنگرییان لە "ئاننا ایڤانۆڤا "[6] دەکرد.

5-Elizabeth Petrovna

6-Anna Ivanova



لە ئەنجامدا لەسەر هەڵبژاردنی ئاننا رێك کەوتن، ئەمەش بە مەرجێك بوو کە ئاننا بە نووسراوە بەڵێن بدات کە دان بە دەسەلاّتەکانی ئەنجومەن دادەنێت. ئاننا ئەو مەرجەی قەبووڵ کرد، بەلاّم هەر کە جێگەپێی پتەو کردو لەپاڵپشتی گاردی پاشایەتیو هێزە چەکدارەکان دڵنیا بوو ئەنجومەنەکەی هەڵوەشاندەوەو دەسەلاّتی بیٚسنووری لەپاوانی خۆی گرت. ئاننا لەکاتی بەدەست هێنانی پۆستی پاشایەتی سیوحەوت ساڵی تەمەنی بووو نزیك بە یازدە ساڵ لەسەر تەختی دەسەلاّت دانیشتو لەساڵی ١٧٤٠ لەتەمەنی ٤٧ ساڵیدا مرد. سەردەمی دەسەلاّتدارێتی ئاننا ئیڤانۆڤ یەکێك لە تاریکترین دەورانەکانی مێژووی رووسیا بوو، بەهۆی ئەوە کە ئەو ژنێکی نەزانو هەوەسبازو لە هەمان کاتیشدا تووڕەو دڵ رەق بوو. لەسەردەمی دەسەلاّتی ئەو نەتەنیا رووسیا هیچ پێشکەوتنێکی بەخۆیەوە نەبینی، بەڵکوو چەند ساڵێکیش گەڕایەوە دواوە. هەژاریو نەهامەتیو کەمو کوڕی سەرانسەری رووسیای گرتبۆوەو ئانناش بۆ پێش گرتن لە راپەرینی جەماوەری، بە تووڕەییو بیٚبەزەییەکی زۆرەوە هەر بانگەوازێکی نارەزایەتی دەکوژانەوە. ئاننا لە هەوەسبازیو تێرکردنی هەوەسەکانیدا زۆر ریسواو زێدەڕۆ بووو لە ئەنجامیشدا راشکاوانە بە هەڵبژاردنی دڵدارێکی ئەڵمانی بەناوی "یووهان بیڕن"[7] سووکایەتیی بە گەلی رووسیا کرد. بەهۆی ئەم پێوەندییە نا یاساییەو ئەو کارتێکەریەی کە بیڕن لەسەر ئەو شاژنە گەندەڵەی هەبوو، وردە وردە پۆستەگرینگەکانی دەوڵەتی وسەربازی بە ئەڵمانییەکان سپێردراو لەئەنجامدا رقو تووڕەیی دژی ئانناو بیڕن توندوتیژی بە خۆوەگرت. ئاننا بەر لە مردن، نەوەی خوشکەکەی کە مەلۆتکەیەك بوو، کرد بە میراتگری تاجو تەختی رووسیاو ئەم پیاوە سووکە ئەڵمانییەشی(بیڕن) بە جێگری پاشایەتی رووسیا هەڵبژارد. لەساڵی ١٧٤٠ دوای مردنی ئاننا ئەو منداڵە دوومانگە بەناوی ئیڤانی شەشەم بوو بە تێزاری رووسیاو بیڕنیش وەك جێگری پاشا دەسەلاّتی بەدەستەوەگرت. بەلاّم دایکی ئیڤان کە ئەویش ناوی ئاننا بوو بە یارمەتی ژمارەیەك لەسەربازو سەرکردەکانی سوپاو بە کەڵك وەرگرتن لە رقو کینەی گشتی خەڵك لە بیڕن، ئەوی لەسەر تەختی دەسەلاّت هێنایە خوارو خۆی وەك جێگری پاشا دەسەلاّتی بەدەستەوە گرت.

7-Ernest Johann Biren





بەڵام حکوومەتی "ئاننا لیو پۆڵدڤان"[8]یش زیاتر لەساڵێکی درێژە نەکێشاو ئەفرادی گاردی پاشایەتی کە ئەویان بە دەسەڵات گەیاندبوو، دژی ڕاپەڕینو ئێلیزابێتی کچی پیتەری گەورەو کاترینی یەکەمیان کە لەدەورانی حوکمڕانی مەلیکە ئانناو خووشکەزاکەی لە ترسی تۆڵە ئەستاندنەوەی ئەوان دوور کەوتبۆوە بە پاشا هەڵبژارد.



**ئێلیزابێت کچی پیتەری گەورەو کاترینی یەکەم کەدوای دایكو باوکی لەسەر رووسیا فەرمانڕەوایی کرد**

ئێلیزابێت پێترۆنا لەساڵی ١٧٤٢ لەتەمەنی ٣٢ ساڵیدا لەسەر تەختی دەسەڵاتی رووسیا دانیشتو تا ساڵی ١٧٦٢ زیاتر لە بیست ساڵ حوکمڕانی کرد.

یەکەمین کاری ئەو لە پۆستی شاژنی رووسیادا بریتی بوو لە دوور خستنەوەی پاشای لەسەر کار لابراوی یەك ساڵەو دایکی بۆ سیبری. ئاننا لیۆپۆلدۆڤنا ساڵی دواتر مردو کوڕەکەشی، ئیڤانی شەشەم بە درێژایی ماوەی دەسەڵاتی ئێلیزابێت لە بەندیخانەدا مایەوەو لەتەمەنی ٢٢

8-Anna Leopoldovna



ساڵیدا مرد. ئیڤانی شەشەم لە مێژوودا وەك چارەرەشترین پاشا ناسێندراوە. بەهۆی ئەوە کە تەواوی تەمەنی لە گرتووخانەدا تێپەڕ کردو لەو ماوەیەشدا کە تێزاری (قەیسەر) رووسیا بوو منداڵێکی شیرەخۆرە بوو. ئێلیزابێت کەسایەتییەکی دوولایەنی هەبوو. ئەو لەلایەکەوە مرۆڤێکی خوێندەوارو هاندەری زانستو هونەر بووو لەلایەکی تریشەوە دەسەڵاتدرێکی زاڵمو زۆردارو دڵڕەق بە هەژمار دەهات. زانکۆی مۆسکۆو پەیمانگای هونەرەجوانەکانی "ساینت پیتەرزبۆرگ" لەسەردەمی دەسەڵاتدارێتی ئەو دامەزرا. ئێلیزابێت پێترۆنا لەگەڵ نووسەرانی هاوکاتی خۆیدا بۆ وێنە ڤۆلتێر، نووسەری بەناوبانگی فەڕانسە نامە گۆڕینەوەی هەبووو سەرچاوە سەرەکییەکانی پەرتووکی "ژیانی پیتەری گەورە"ی دابەدەستی ڤۆلتێر. لەگەڵ ئەوەشدا حکوومەتێکی دیکتاتۆری بەسام وترسناك لە ماوەی بیست ساڵ دەسەڵاتداری ئێلیزابێت لەسەر رووسیا حاکم بوو. لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دژی زوڵمو زۆرداریەکانی دەسەڵاتی دیکتاتۆری ئەو رادەوەستان بەو پەڕی دڵڕەقیو بێ بەزەییەوە مامەڵەی دەکرد. ئەو وەك پێشینیانی خۆی ژنێکی هەوەسباز بوو، بەڵام وەك کاترینی گەورە کە دوای ئەو هاتە سەر دسەڵات لەهەڵبژاردنی ئەو پیاوانەی کە ئیزنی هاودەمیو قسەکردنی پێدەدان، وەردبینیو وردەکارییەکی زۆری بەکاردەهێنا. لە بواری جوانیشەوە، جوانترین ژنی سەردەمی خۆی بووو ئەو جوانیەشی لەدایکییەوە (کاترینی‌یەکەم) بۆ مابۆوە کە پیاوێکی وەك پیتەری گەورەی بەخسیری خۆی کردبوو. بارودۆخی رووسیا لەماوەی دەسەڵاتدارێتی ئێلیزابێت بەراورد لەگەڵ ساڵەکانی دوای مردنی پیتەری گەورە باشتر بۆوەو بە بەهێز کردنی سوپا، رووسیا لە شەڕە دەرەکییەکاندا چەند سەرکەوتنێکی نوێی بەدەست هێناو پێوەندییەکانی رووسیاش بەرفراوانتر بوو. نهێنی سەرکەوتوویی ئێلیزابێت لە کاروباری حکوومەتدا جگە لە ژیری، هەڵبژاردنی کەسانی کارامەو شارەزا بوو بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت کە لەسەرووی هەموویانەوە دەبێت ناوی بەناوبانگترین کاربەدەستی سەردەمی ئەو، "ریۆمین"[9] بهێندرێت. ئێلیزابێت لەیەکەمین ساڵی حوکمڕانی خۆیدا پیتەری کە کوڕی خوشکەکەی (ئاننا) بوو بە جێنشینی رووسیا هەڵبژاردو ساڵی دواتر پرەنسیس "یوهاننا"[10]ی کە یەکێك لەخزمەکانی زاواکەی بوو

9-Ryumin

10-Johanna





لەگەڵ کچەکەی (سۆفیا) بۆ رووسیا بانگهێشتن کرد تا پێشەکییەکانی ناسیاویو دوایش زەماوەندی سۆفیاو پیتەر ئامادە بکات.

پرەنسیس سۆفیا کە لەمێژووی جیهاندا بەناوی کاترینی گەورە ناسراوە لەساڵی ١٧٢٩ لە بەندەری "ئەشتین"[11]ی ئەڵمانیا لە دایك بوو. باوکی ئەفسەری سوپای پێروس بووو دایکیشی کە کچی یەکێك لە شازادەکانی ئەڵمانیا بوو لەگەڵ مێردی پرەنسیس "ئاننا"ی کچی کاترینو پیتەری گەورە خزمایەتییەکی نزیکی هەبوو. سۆفیا لە تەمەنی پازدەساڵیدا لەگەڵ دایکی چوو بۆ رووسیا و کچێکی زۆر بە دەماخو جوان بوو. ئێلیزابێت شاژنی رووسیا ئەوی پەسندکردو لەساڵی ١٧٤٥ رێورەسمی زەماوەندی پیتەری سێیەم، جێنشینی رووسیاو پرەنسیس سۆفیا کە بەپێی ویستو داخوازی مەلیکە ئێلیزابێت نازناوی کاترینی پێدرا بەرێوە چوو. لەسەرەتادا پێوەندییەکانی سۆفیا (کاترین)و مێردەکەی بەپێی ئەو شتانەی کە خۆی نووسیویەتی، ئەڤیندارانەو تێگەیشتوانە نەبووە. بیرەوەرییەکانی کاترینی گەورە کە تەواوی رووداوە گرینگەکانی ژیانی ئەوی تیدایە یەکێك لەگرینگترین بەڵگەکانی پەیوەست بە مێژووی رووسیایە. کاترین ئەم بیرەوەرییانەی لە پاکەتێکی لاكو مۆرکراو بە ناونیشانی کورەکەی لەناو سندوقێکی دانا بوو کە لەساڵی ١٧٩٦ و دوای مردنی کەوتە بەردەستی کورەکەی واتە جێنشینی رووسیا. پۆل دوای خوێندنەوەی ئەو بیرەوەرییانە ئەوانی بە ئەمانەت لە لای برادەرێکی دانا. بەلاّم برادەرەکەی کە زیاتر بەهای ئەو نووسراوانەی دەزانی پێش ئەوەی دووبارە لاكو مۆریان بکاتەوە کۆپیەکی لێهەڵگرتنەوە. دوای مردنی پۆل لەساڵی ١٨٢٥ بیرەوەرییەکانی کاترین کەوتە بەردەستی کورەکەیتری بەناوی تێزار نیکۆلای یەکەم. بەلاّم تا ئەو کاتە لەو بیرەوەرییانەی کاترین کە دەست بەدەست گەرابوو چەند کۆپییەکیان هەڵگرتبوّوە. بە جۆرێك کە "ئەلکساندێر هەرزێن"[12] نووسەری بەناوبانگی رووسیا کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم لە رووسیا دوور خسترایەوە، توانی ئەو بیرەوەرییانە کۆبکاتەوەو لە ساڵی ١٨٥٩ لە لەندەن بلاّوی بکاتەوە. کاترین بیرەوەرییەکانی خۆی بە زمانی فەرانسەوی نووسیبوّوە کە هەرزین دەقە ئەسڵییەکەی بەهەمان ناوە فەرانسەییەکەی[13]و وەرگێرانی رووسی بلاّوکردەوە. وەرگێرانە ئینگیزییەکەی ئەم بیرەوەرییانە چەند ساڵ دواتر لە ٣٩٠ لاپەرە لە لەندەن بلاّو بوّوە. بەشی هەرە زۆری نووسینەکانی

11-Stettin

12-Alexsander Harzen

13-Memoires de L'Imperatrice Catherine II



کاترین تایبەتە بە ژیانی تاکەکەسی خۆی، بۆ وێنە سەبارەت بە یەکەم چاوپێکەوتنی لەگەڵ هاوسەری داهاتووی (پیتەر) دەنووسێ: "کاتێك بۆ یەکەمجار پیتەرم بینی ئەوم وەك لاوێکی نەفامو منداڵ هاتە بەرچاو، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەوەکە متمانەم پیێبکات بە وردبینیو بێدەنگی گوێم لە قسەکانی رادەگرت و ئەویش هەر لەچاوپێکەوتنی یەکەمدا رازی دڵی بۆ درکاندم. پیتەر ووتی کە من پێشتر ئاشقی یەکێك لە ژنەکانی دەربار بوومەو لەگەڵ ئەوەش کە تۆ زۆر لەو گەنجو جوانتری بەلاّم ناتوانم لەو ئەشقە دەست هەڵگرم. لەگەڵ ئەوەش درێژەی پێدا کە ناتوانێ لە بەرانبەر ئیرادەو بڕیاری پووریدا راوەستێو بۆیە زەماوەندم لەگەڵ دەکات. هەروەك پیتەر گوتبووی بە پێچەوانەی ویستی دەروونی خۆی لەگەڵ پرەنسیس سۆفیا شاژنی داهاتووی رووسیا زەماوەندی کرد. کاترین سەبارەت بەو زەماوەندە لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ: "دڵی من خەبەری دەدا کە لە ژیان لەگەڵ پیتەر بەختەوەر نابم، بەلاّم دەسەلاّتخوازیو زریقەو بریقەی دەرباری رووسیا بەری چاوی گرتبوومو دڵنیاش بووم رۆژێك دەبمە سەرکردەو دەسەلاّتداری رووسیا". کاترین بە هیوای ئەوە رۆژێك دەرفەتی جێبەجێکردنی ئاواتەکانی بۆ برەخسێ، خۆی لەبەرامبەر چەرمەسەریو ناکۆکییەکانی سەرەتای ژیانی هاوسەرێتیدا راگرت. هاوسەری کە خووو رەوشتی منداڵانەو بیرێکی دواکەوتووی بوو، بەردەوام یاری منداڵانەی لەگەڵ هاواڵانو تەنانەت خزمەتکارەکانیشی دەکردو جاری واش هەبوو ئەوانی ناچاردەکرد بە روپۆشو جل وبەرگی سەیرو سەمەرەوە لەدیوی خەوتنیان سەماو هەڵپەرکێ بکەن. یەکێك لە رەوشتە ناحەزەکانی پیتەر ئەوە بوو کە هۆگرییەکی زۆری بە سەگ هەبووو بەجۆرێك کە کاترین لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ: پیتەر سەگەکانی لەژووری تەنیشت ژووری خەوتنیان رادەگرتو کاترین لە وەڕینی سەگەکانو بۆنی ناخۆشی ئەوان تەواو جاڕز ببوو.



**پیتەری سێهەم تەنیا هاوسەری یاسایی کاترینی گەورە بوو کە باوکی هیچ کام لەمنداڵەکانی ئەو نەبوو.**





پیتەرو کاترین تا چەند ساڵ دوای زەماوەند منداڵیان نەبوو. ئێلیزابێت کە لەم بابەتە بە پەرۆش بوو فەرمانیدا کاترینو پیتەر بخەنە ژێر چاودێری پزیشکی. بە رواڵەت هیچیان کەمو کورتیان نەبووو هەر بۆیەش مەلیکە یەکێك لە خزمەتکارەکانی بەناوی "ماریا چۆگلۆکۆڤا"[14] راسپارد کە چاودێری پێوەندییە ژنو مێردایەتییەکانی(سێکسی) کاترینو پیتەر بکات. ماریا پاش ئەوە کە هەندێك کاترینی رێنوێنی کرد لە کونێکەوە چاودێری چونیەتی بەرێوە چوونی رێنماییەکانی دەکردو کاترینیش دەیزانی کە کردەوەکانی لەسەر پێخەفیش کۆنترۆڵ دەکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا کاترین تا ٩ساڵ دوای زەماوەند منداڵی نەبووو لەو ساڵەشدا کاتێك کە کوڕی (پۆل) بوو، شكو گومانێکی زۆر هاتە ئاراوە سەبارەت بەوە کە باوکی ئەسڵی ئەو منداڵە کێیە. بە رواڵەت خوودی پیتەر دەیزانی کەباوکی ئەسڵی پۆل نییە بەلاّم نەیدەتوانی ئەم رووڕەشیە ئاشکرا بکات. یاداشتەکانی کاترین کە بەراشکاوی ئاماژە بە پێوەندی ئاشقانەی کاترین لەگەڵ نەجیب زادەیەکی رووسی بەناوی "سێرجی-سۆلیتکۆڤ"[15] لە دەوروبەری ساڵێك پێش لەدایکبوونی پۆل دەکات، کەم تا کورت هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە کە باوکی راستەقینەی پۆل کێیەو کاترینیش ئەو بابەتەی بۆ ئەوە نووسیوە کە کوورەکەی لەئەسڵو رەسەنی خۆی ئاگاداربێت. تەنیا خاڵی نادیاری ئەم بابەتە ئەوەیە کە بەچ شێوەیەك کاترین توانیویەتی لەگەڵ ئەو هەمموو چاوەدێرییەی ماریا کە رۆڵی زیندانوانی ئەوی دەگێرا پێوەندی بە سۆلیتکۆڤەوە بگرێ؟ ولاّمی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە کاترین بە ئەگەرێکی بەهێز لە رێگەی رازی کردنو رێککەوتن لەگەڵ ماریا توانیویەتی پێوەندی بە سۆلیتکۆڤەوە بگرێو هۆی ئەمەش جگە لە بە تەماح خستنی ماری، لە وانەیە ئەم خاڵەش بێت کە ماریا بۆ خۆشی لە تووڕە بوونی کاترین سەبارەت بە نەزۆکی پیتەر رەنجی کێشاوەو ویستوویەتی بە دووگیان بوونی کاترین کۆتایی بەم زویرو تووڕەییە بهێنێ! باوکی راستەقینەی پۆل ساڵێك دوای لەدایکبوونی پۆل وەك وەزیری دەرەوەی رووسیا لە هامبۆرگ بۆ دەرەوەی رووسیا بەرێ کرا. بەلاّم کاترین کە بوێرییەکی پتری بەدەست هێنا بوو پیاوێکیتری بۆ خۆی دۆزییەوە. ناوی ئەو پیاوە "سێرچارلز ویلیامز"[16]، باڵوێزی لاوی بریتانیا لە رووسیا بوو کە لە نامەکانیاندا ئەشقو هۆگری ئەو

---

14-M aria choglokova

15-Serge Soltikov

16-Sircharles H anbury W illiam s



دووانە بۆ یەکتر دەر دەکەوێ. کۆکراوەی ئەو نامانەلەساڵی ١٩٢٨ لە لەندەن بلاّو بۆوە. سێرچارلز لەیەکێك لەنامەکانیدا بۆ کاترین دەنووسێ: "من جوانیو هەستو خۆڕاگری ئێوە ستایش دەکەم. رۆژ لە رۆژ زیاتر ئەویینداری ئێوە دەبمو جگە لە تۆ یاوەرو رێنمایەکەم نییە. ئێوە بۆ حوکمڕانی کردنو فەرمان دەرکردن دروست کراونو من بە تەواوی بووبمەوە لەژێردەستی ئێوەدام. فەرمانەکانی ئێوە بۆ من وەك یاسا وایەو پشتیوانیو متمانەی ئێوە بە من گەورەترین خەلاّتە بۆ من... پێت ماچ دەکەم". نامەیەکیتری کاترین بۆ سێرچارلز کە لەم کۆکراوەیەدا چاپ کراوە ئەوە دەردەخات کە باڵوێزی بریتانیا نهێنی پارێزی سرەکانی کاترین بووەو لە پلانەکانی ئەو بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەلاّت ئاگادار بووە. سێرچارلز لەم نامەیەدا دەنووسێ: "لە من دڵنیابە، من هەرگیز رازەکانی ئێوە بۆ کەس ئاشکرا ناکەمو جگە لە راستی هیچیتر بە ئێوە ناڵێم. دڵۆ رەوانو ژیانی من بۆ ئێوەیە، لە هەموو شتێکدا ئێوە لە خۆم بە باشتر دەزانمو لە شایستە بوونی خۆم بۆ بەدەست هێنانی خۆشەویستیو ئەویینداری ئێوە گومانم هەیە، هیوادرم ئەو رۆژەی کە لەسەر تەختی دەسەلاّت دادەنیشی لێرەبمو ئەگەریش لێرە نەبووم تەنانەت جارێکیش بێت ئەو شانازییەم پێبدەی کە بێم بۆ بینینی ئێوە. من ئێوەم تارادەی پەرست خۆش دەوێو لەو باوەڕەدا نیم لە تەواوی جیهاندا ژنێکی بەرادەی ئێوە جوانو خوێن شیرینو بەهەستو سۆز هەبێت". کەم تا کورت لە تەواوی نامەکانی بالوێزی بریتانیا لە رووسیا کە لە کۆکراوەی نامەکانی ئەو لەگەڵ کاترین چاپ کراوە ئەم شێوە پێدا هەڵگوتنە دەبیندرێو چارلز بەردەوام ئاماژە بەو خاڵە دەکات کە لەبەرامبەر زانستو ئاست بەرزیو ژیری کاترین خۆی بە بچوکترو سووکتر دادەنێت. رەنگە خوێنەر ئەم پرسیارە لەخۆی بکات کە ئایا ئەو هەموو تاریفو پێدا هەڵگوتنە جۆرێك لە ریاو بانگەشە نییە بۆ بەدەست هێنانی خۆشەویستیو بەردەوام بوونی ئەم پێوەندییە ئاشقانەیە یان راستییەکیشی تێدا شاراوەیە؟ ئەو مێژوونووسانەی کە لە ژیانو بەسەرهاتی کاترینی گەورە کۆڵینەتەوە، لەم خاڵەدا هاوبیرن کە کاترینی گەورە یەکێك لە باشترینە پسپۆڕەکانی چاخی خۆی بووە.

نووسەرو مێژوونووسی بەناوبانگی رووس (ئۆڵدێنبۆرگ)[17] لە وەش زیاتر پێدادەگرێو دەنووسێ کە لە نێو ئەو ژنانەی بەدرێژایی مێژوو بەدەسەلاّت گەیشتوون هیچیان بەرادەی کاترینی گەورە

---

17-Z .O ldenbourg





پەرتووکیان نەخوێندۆتەوەو زانستو تێگەیشتوویی ئەویان نەبووە. کاترین پێش سی ساڵیو کەم تا کورت لەو ساڵانەی کە باڵوێزی بریتانیا لەروسیە بوو پەرتووکەکانی وەك رووحی یاساکانی "مۆنتێسکیۆ"و بەرهەمی نووسەرانی بەرچاوی فەڕانسەویی وەك ڤۆلتێرو رۆسۆ و"دیدرۆت"[18]ی خوێندۆتەوەو کاتێك بە دەسەڵات گەیشت، لەگەڵ ژمارەیەك لە نووسەرانو بیرمەندانی بەرچاوی سەردەمی خۆی وەکوو ڤۆلتێرو دیدرۆت و"گریم"[19] نامە گۆڕینەوەی هەبوو. کاترینی گەورە جگە لە زمانی دایکی کە ئەڵمانی بوو بە تەواوی بەسەر زمانی فەڕانسەییدا زاڵ بووو بە زمانی رووسیو ئینگلیزیش بە سانایی قسەی دەکرد. بەڵام وای پێ باش بوو کە بە زمانی فەڕانسەیی بنووسێو یاداشتەکانی رۆژانەو زۆربەی هەرە زۆری نامەکانی بەم زمانە دەنووسی. هەندێك لە دیرۆك نووسان لەو باوەڕەدان کە تەنانەت خاڵە لاوازە سەرەکییەکەی کاترینی گەورە، واتە مەیلەو چوونو گوڕو تینی ئەو بۆ هاودەمیو هاونشینی لەگەڵ پیاوانیش هەر لەوە سەرچاوە دەگرێ کە ئەو پێی وابوو ژنانی دەوروبەری بیرتەسکنو ناتوانێ هاودەمێك بۆ خۆی ببینێتەوە.

مێردەکەشی هەروەك ئاماژەی پێکرا پیاوێکی بیر تەسك بووو کاترین لەهاودەمی ئەو وەزاڵە هاتبوو. هەڵبەت ئەو بەڵگانە ناتوانێ پاساو بهێنێتەوە بۆ هاودەمیو هاونشینی کاترین لەگەڵ پیاوانی جۆراوجۆر بەتایبەت لە ساڵانی پیریو بە هەرحاڵ دەبێ ئەو راستییە قەبووڵ بکەین کە ئەگەر کاترین هەر وەك لە روانگەی ئەقڵەوە ژنێکی نموونە بووە لەروانگەی جەستەو مەیلەو چوونی سێکسیش ژنێکی ئاسایی نەبووە.

***

کاترین دوای ئەوەی کە سێرچارلز ویلیام گەڕایەوە بۆ بریتانیا، کۆنتێکی گەنجو جوانی پۆڵۆنیا بەناوی"ئێستانیلاس پۆنیاتۆوسکی"[20] بۆ هاودەمیو ئەڤین هەڵبژارد.

کاترین لەساڵی ١٧٥٨داو ساڵێك دوای ئەم پێوەندییە کچێکی بوو. پیتەریش لەم بارەیەوە بە یەکێك لە دۆستەکانی ووت: "خوا دەزانێ باوکی ئەو منداڵە کێیە بەڵام ناچارم باوکایەتی ئەو

18-Diderot
19-Baron von Grimm
20-Stanislas Poniatowsky



منداڵەش قەبووڵ بکەم!" پیتەر دوایی زانی کە باوکی دووهەمی منداڵی کاترین کێیە بەڵام وای بە باش زانی کە دەنگو پەنگی ئەو بابەتە دەرنەهێنێو تەنانەت لەگەڵ پۆنیاتۆوسکی بوو بە هاواڵ. هەڵبەت کاترینیش کاری بەم پێوەندییە نەبووو جۆرێ "لەیەك گەیشتنی دوولایەنە!" لەنێوانیاندا دروست ببوو. پۆنیا تۆوسکیش هەر وەك سێرچارلز ویلیامز بوو بە ئاشقی کاترین و ئەو نامانەی کە بۆ کاترینی ناردبووو ئێستاش لەبەردەست دایە گوڕو تینی ئەو ئەشقو خۆشەویستیە وەدەر دەخات. لەگەڵ ئەوەشدا دەورانی ئەشقو دڵداری کاترینو پۆنیا تۆوسکی زۆری نەخایاند.



**ئێستانیلاس پۆنیاتۆوسکی یەکەمین**

**دڵداری کاترین کە لەلایەن**

**ئەوەوە بوو بە پاشای پۆڵانیا**

بەڵام پۆنیا تۆوسکی تەنانەت دوای ئەوەش کە جێگای خۆی دا بە پیاوێکیتر هەر جێگای سەرنجی کاترین بوو، تا ئەو جێگایە کە دوای داگیر کرانی پۆڵانیا بەدەستی رووسیاو لە دەورانی دەسەڵاتدارێتی کاترینی گەورە بوو بە پاشای پۆڵانیا. کاترین دڵدارەکەی دواتری بەمەبەستی سیاسیو بۆ گەیشتن بە دەسەڵات هەڵبژارد. ئەو دڵدارە ناوی "فلۆی گریگۆری ئۆرلۆف"[21] بوو. ئەو ئەفسەرێکی ئازاو چوارشانە بوو کە لەگاردی پاشایەتی رووسیا خزمەتی دەکردو هەر چوار براکەشی ئەفسەر بوون. کاترین بە هەڵبژاردنی ئەو ئەفسەرە لاوە نەتەنیا پیاوی دڵخوازی خۆی بەدەست هێنا بوو بەڵکوو دەیتوانی لەکاتی پێویست لەیارمەتی ئەوو براکانی کەڵك وەرگرێ. کاترین لەساڵی ١٧٦١ منداڵی سێهەمیشی بەدونیا هێناو ئەم جارەیان

21-Gregory Orlov





کەمتر کەسێك گوومانی لە کەسایەتی باوکی ئەو منداڵە هەبوو. هەموو کەس دەیزانی ئەو منداڵە کوڕی ئۆرلۆفەو تەنانەت کاترینیش هیچکات پێداگری ئەوە نەبوو کە پیتەر باوکی ئەو منداڵەیە. ئەگەرچی پیتەر هەر وەك دوومنداڵەکەیتری کاترین بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەکی لێ بکەوێتەوە منداڵی سێهەمیشی کردە کوڕی خۆی!

***

لەرۆژی پێنجەمی ساڵی ١٧٦٢مەلیکە ئێلیزابێت مردو پیتەر بەناوی پیتەری سیهەم لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت. دڵدارەکەی پیتەر کە خۆی لەبەرامبەر تەواوی ئەو ناخۆشیو چەرمەسەرییانەی لەگەڵ ئەو پیاوە کەم ئەقڵە بۆ رۆژێکی ئاوا راگرتبوو، پیتەری هاندا کە لە کاترین جیابێتەوەو لەگەڵ ئەو زەماوەند بکات. بەڵام شكو دوودڵی پیتەر بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە (جیابوونەوە) هەلی بۆ کاترین رەخساند کە بەیارمەتی ئۆرلۆفو براکانی دژی پیتەر کودتا بکات. لەسەرەتا هێزە چەکدارەکان لەمۆسکۆو دواتریش لەساینت پیتەرزبوورگ بە دژی پیتەری سێهەم راپەڕینو وەفادارییان بە کاترین راگەیاند.

لەکاتێکدا کەهێشتا شەش مانگ لە پاشایەتی پیتەر تێنەپەڕیبوو، لەژێر فشاری هێزە چەکدارەکانی رووسیا پیتەر ناچار کرا واز لەدەسەڵات بهێنێو بەفەرمانی کاترین لە رۆژی نۆیەمی ژووئیەی ساڵی١٧٦٢ دا دەستبەسەر کراو لە قەڵایەکی دەوروبەری شاری ساینت پیتەرزبۆرگ بەند کرا. هەڵبەت مردنی ئەو سروشتی نەبووو زۆربەی دیرۆك نووسان دەڵێن کە پیتەری سێهەم لە بەندیخانەدا بەدەستی یەکێك لە براکانی دڵداری کاترین بەناوی ئالێکسی ئۆرلۆف خنکاوە. کاترین ماوەیەکی کورت دوای مردنی هاوسەری کە هەوڵیدا ئەو مردنە سرووشتی بێتە بەرچاو، لە رێوڕەسمێکی پڕ شکۆدا کە تا ئەو کاتە هاوشێوەی لەرووسیا نەبیندرابوو، تاجی لەسەرناو ئۆرلۆفو براکانی بە پاداشی ئەو خزمەتانەی کە بە کاترینیان کردبوو پۆستی بەرزیان وەرگرت. گریگۆری چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە شاژن بەفەرمی زەماوەندی لەگەڵ بکاتو هەوساری کاروباری دەوڵەت بداتە دەستی، بەڵام کاترین نەیدەویست دەسەڵاتی خۆی دابەش بکات. کاترین کە لەمە بەملاوە بەناوی کاترینی دووهەم یان کاترینی گەورە باسی دەکەین بۆ پتەوتر کردنی دەسەڵات، پێش هەموو کارێك مافو ئیمتیازەکانی ئەندامانی سوپای رووسیاو ئەفسەرەکانی پتر کردو لە قۆناغی دواتر بڕیاریدا شەڕە



دەرەکییەکانی رووسیا زیاتر بکاتو لە دەرەوەی هەرێمی حکوومەتی پێشینیانی خۆی حوکمڕانی بکات. کاترینی دووهەم کە بەهۆی داگیرکارییەکانی سوپای رووسیاو بەرفراوان بوونی هەرێمی دەسەڵاتی ئێمپراتۆریەتی رووسیا دواتر بە کاترینی گەورە ناوبانگی دەرکرد لەساڵی شەشەمی پاشایەتی خۆیدا ئەنجوومەنێکی راوێژکاریی لەسەر شێوەی پەرلمانی بریتانیا دامەزراند، بەڵام ٥٦٥ نوێنەرەکەی ئەو ئەنجوومەنە پێشتر دیاری کرا بوون. کاترین ئەو ئەنجوومەنە راوێژکارییەی راسپارد کە هەندێك یاسا بۆ رووسیا پەسند بکەن. بەڵام هەژدەمانگ دواتر ئەنجوومەنەکەی هەڵوەشاندەوەو ژمارەی راوێژکارەکانی بۆ دانانی یاساو رێسا زۆر کەم کردەوە بە جۆرێك کە لەژمارەی پەنجەکانی مرۆڤ کەمتر بوو. لەساڵی ١٧٧٥ گۆڕانکارییەکی زۆرو بەرچاو لە سیستەمی بەڕێوەبەرایەتی حکوومەت ئەنجامدراو وڵات بە ٥١ ئەیالەت دابەش کراو لەلایەن کاترینی گەورەوە بۆ هەر ئەیالەتێك حاکمێك دیاری کرا. لەساڵی ١٧٦٨دا داگیرکارییەکانی رووسیا لەسەردەمی کاترینەوە بە شەڕ لەگەڵ تورکەکان کە چوار ساڵ درێژەی کێشا، دەستی پێکردو لەئەنجامدا رووسەکان لەساڵی ١٧٧٢دا لەگەڵ ئەوەیکە بەشێك لەخاکی عوسمانییەکانیان داگیر کرد، مافی هات وچۆی پاپۆڕەکانیشیان لە دەریای رەش بەدەست هێنا. رووسەکان دواتر نیمچە دوورگەی کەریمەشیان کە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا بوو بەخاکی خۆیانەوە لکاندو لەساڵەکانی ١٧٨٧ تا ١٧٩١دا بە بەهێزترکردنی هێزی دەریایی رووسیا بە سەرکردایەتی "گریگۆری پۆتێمکین"[22] سەرکردەی بەناوبانگی رووسیا، چەند بەشێکیتری خاکی ئێمپراتۆری عوسمانییان داگیر کرد. لەلایەکیترەوە کاترینی گەورە ئێستانیلاس پۆنیا تۆوسکی، دڵدارە پۆڵانییەکەی کرد بەپاشای پۆڵانیا لە ساڵەکانی١٧٧٢،١٧٩٣و ١٧٩٥دا بەپێی چەند پەیماننامەیەك کە لەگەڵ ئۆتریش (نەمسا)و پیڕوسی (ئەڵمانیای ئەمڕۆ) واژۆکرد، چەند بەشێکیتری خاکی لەهێستانی بە ئێمپراتۆریەتی رووسییەوە لکاند.

***

کاترین لەتەمەنی ٣٣ ساڵیدا لەسەر تەختی دەسەڵاتی رووسیا دانیشتو بۆ ماوەی ٣٤ ساڵ لە رووسیا حوکمی گێڕا و لەتەواوی ئەو ماوەیەدا چاوەدێری وردو بەردەوامی لەسەر کاروباری سیاسیو ئیداریو سەربازی کرد. کاترین رۆژانە ١٢تا١٣ کاتژمێر کاری دەکردو لەگەڵ ئەوەش

22-Grogory Potemkin

که له کاروباری حکوومەتدا باوەڕی بە ڕاوێژ لەگەڵ کەسانی شارەزا هەبوو، بەلاّم خۆی بڕیاری کۆتایی پەسند دەکرد. یەکێك لەکارەکانی ڕۆژانەی کاترین ئاڵو گۆڕکردنی نامە بوو لەگەڵ پاشاو دەسەلاّتدارانو نووسەرانی بەناوبانگی هاوچاخی خۆیو لە هەندێك لە نامەکانی خۆیدا بۆ نووسەرانی بەناوبانگی ئەوکات سەبارەت بە دوایین بەرهەمی ئەوان کە بەوردی دەیخوێندەوە رای دەردەبڕی. کاترین هەندێك لەو نامانەی لە ١٠تا٢٠ پەڕی گەورەدا دەنووسیو بە بەراوردی یەکێك لە نووسەران، ئەگەر نامەو یاداشتەکانی ئەو کۆبکرێتەوە، قەبارەی ئەو نووسینانە لە کۆی نووسینەکانی پڕکارترین نووسەرانی جیهان وەك ئەلکساندێر دووماش گەورەتر دەبێت. کاترینی گەورە لەگەڵ ئەوەی کە کارو سەرقالی زۆر بووەو ڕۆژانە کاتی زۆری بۆخوێندنەوەو نووسین داناوە، لە رابواردنی شەوانەش دەستی هەڵنەدەگرتو تەنانەت لەتەمەنی پیریشدا لە عەیاشیو هەوەسبازی دەستی هەڵنەگرت. لە ساڵەکانی یەکەمی دەسەلاّتیدا تەنیا ئۆرلۆف دڵداری بوو بەلاّم دواتر ئەفسەرێکی بەناوبانگ و کارامەی ڕووسی بەناوی



**وینەی لە کاترین کە تایبەتە بە ساڵەکانی نێوەڕاستی دەسەلاّتی**



"پوتێمکین"کە پێشتر ئاماژەی پێکرا سەرنجی کاترینی بۆلای خۆی راکێشاو ئۆرلۆف کە پیاوێکی عەیاشو خۆشگوزەران بوو هاوکات لەگەڵ وەفاداری بە شاژن لە خزمەتی تایبەتی ئەو هاتەدەرێ. پێوەندییەکانی کاترینو پوتێمکین دووساڵی خایاندو لەو ماوەیەدا لەگەڵ ئەوەش کە هەموو ڕۆژێك ئەو دوانە یەکتریان دەبینی، بەلاّم بۆ کاترین نامە نووسین بۆ پوتێمکین وەك سەرقاڵییەکی خۆشی لێهاتبوو. ٣٥٧ نامەی ئاشقانەی کاترین بۆ پوتێمکین بەزمانی ڕووسیو فەڕانسەوی لە بەر دەست دایە کە لە بواری ئەدەبیاتیش بەنرخن. ژمارەی ئەو نامانەی کە لەو دوو ساڵەدا نووسراوە، نیشان دەدات کە کاترین نێزیکەی دوو ڕۆژ جارێك نامەی بۆ دڵدارەکەی نووسیوە. پوتێمکین یەکێك لە ئەویندارە تایبەتییەکانی کاترینە. لە بەرئەوەی کە پوتێمکین خۆی دوای پچڕانی پێوەندییە ئاشقانەکەی لەگەڵ کاترین، چەند "دلدارێکی شایانی"! بە کاترین ناساند کە یەك لەدوای یەك لەخزمەتی شاژندا بوون. پوتێمکین دوای چەند سەرکەوتنێکی بەرچاوو پڕشەنگدار لە شەڕ لەگەڵ عوسمانییەکان، لەتەمەنی ٥٥ساڵیدا مردو کاترین لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ کە ڕۆژی مردنی پوتێمکین یەکێك لە تاڵترین ڕۆژەکانی ژیانێتی. دوای مردنی پوتێمکین زۆربەی ئەو پیاوانەی کە کاترین بۆ هاودەمیو هاونشینی هەڵیبژاردن زیاتر لە چەند مانگ یا ساڵێك بەردەوام نەدەبوونو هەرچی تەمەنی کاترین زیاتر بەرەو سەرێ دەرۆیشت، مەیلی بۆ گۆڕانو نوێ کردنەوەی پیاوان زۆرتر دەبوو. خاڵێکی سەرسووڕ هێنەرو بێزارکەری ژیانی کاترین لەدەورانی دەسەلاّتی لەسەر ڕووسیا کە "ئاندرۆ ئیوارت"ی لێکۆلەری بریتانی بە پاڵپشتی نووسراو باوەڕە پێکراوەکانی مێژوویی ئاماژەی پێدەکات، ئەوەیە کە کاترین یەکێك لە ژنەکانی دەرباریی بەناوی "کۆنتیس برۆس"[23] وەك راوێژکاری سێکسی خۆی بۆ تاقی کردنەوەی ئەو پیاوانەی کە خوازیاری هاودەمیو جووت بوون لەگەڵ ئەون هەڵبژارد بوو. کۆنتێس برۆس ئەو پیاوانەی کە بۆ هاودەمیو هاونشینی شاژن دەناسێندران لەبورای ساغیو توانایی جنسی "سێکس"و رەوشتو هەڵسوکەوتیان لەژووری خەو تاقی دەکردەوەو دوای ئەوە کە پەسەندی دەکردن بە شاژنی ئاشنا دەکردن. کۆنتێس برۆس

---

23-Countess Bruce





پۆل لەماوەی دەسەڵاتی دایکی نەتەنیا هیچ خۆشەویستیو دڵسۆزییەکی لە دایکی نەدیبوو بەڵکوو بە پێچەوانەشەوە زۆر سووکایەتی پێکرابوو، هەر بۆیەش دوای مردنی دایکی گرینگییەکی ئەوتۆی بە پاراستنو شاردنەوەی سڕەکانی ژیانی تایبەتی دایکی نەدا. بەو جۆرەی کە پێشتر ئاماژەی پێکرا روونووسی یاداشتو نامە تایبەتییەکانی دایکی دەست بەدەست گەڕاو رازگەلێکی شاراوەی زۆر لە زمانی کەسانی دەربارو دارو دەستەکەی ئاشکرا کراو بڵاو بۆوە. هەڵبەت ئاشکرا بوونی ئەم نهێنیانە بە زیانی پۆلیش بوو، لەبەرئەوەی هیچ گوومانێك نەما کە پۆل یەکێك لە کوڕە زۆڵە کانی کاترینە. بە پاڵپشتی ئەو بەڵگانەی کە لە بەر دەست دایە، بەتایبەت بیرەوەریو یاداشتەکانی کاترینو ئەو بابەتانەی کە لە زمانی ئەندامانی دەربارو کەسانی دەستو پێوەنداری کاترین گێڕدراوەتەوە، ژمارەی ئەو پیاوانەی کە کاترین بە درێژایی تەمەنی پێوەندی ئاشقانەی لەگەڵیان هەبووە سەر لەهەشتا کەس دەدات کە ناوی ٢١ کەسیان روونو ئاشکرایە. زۆربەی دڵدارەکانی کاترین لەکاتی مەرگی ئەو لەژیاندا مابوونو لەژێر سێبەری خۆشەویستیو بەخششی کاترین چ کاتی هاودەمیو هاونشینیو چ دوای مردنی، پلەو پێگەی بەرزو سامانی زۆریان هەبوو. کاترینی گەورە لە یاداشتەکانی خویدا ئاماژە بە خاڵێکی سەرنج راکێش سەبارەت بە هاودەمیو هاونشینی لەگەڵ پیاوانی جۆراوجۆر دەکاتو دەڵێت کە ئەگەر مێردە یاساییەکەی پیاوێکی شایستە بوایە پێی وەفادار دەماو هەرگیز دوای هەوەسو ئەشقبازی نەدەکەوت. ئەو هەروەها دان بەوە دادەنێ کە هیچکام لەو پیاوانەی هاودەمو خۆشەویستی ئەو بوونە بەتەواوی لە بەر دڵی نەبوون، لەبەرئەوەی کە ئەگەر کەسێکی لە ئاست ویستو داخوازی خۆی بدۆزیبوایەتەوە زەماوەندی لەگەڵ دەکرد. کاترین لەم بارەیەوە پتر ئاماژەی بە زانستو زانیارییەکانی ئەو پیاوانە کردووە کە رووبەرووی بوونەتەوەو دەیهەوێ بڵێت کە هیچ یەك لەوانە لەو ئاستەدا نەبوون کە شتێکی فێربکەنو بە واتایەکیتر هیچ پیاوێکی باشترو بەرزتر لە خۆی نەدیوەتەوە کە شایستەی هاوسەری ئەوبێت. لە مێژووی جیهانو رووسیادا لە کاترین وەك یەکێك لە بەهێزترینو شایستەترین ژنی دەسەڵاتداری جیهان نێودەبەن. تەنانەت مێژوونووسانی کۆمۆنیستی رووسیاش بە گەورەییو شکۆو شانازییەوە یادی دەکەنەوە. ئاسەواری ئەو شتانەی کە لە پاشی بەجێ ماوەتەوەو تەنانەت جلكو پێلاوەکانیشی لە مۆزەخانە مێژووییەکانی مۆسکۆو لێنینگراد خراونەتە بەرچاو. ئەو ژنە زۆردارو هەوەسبازە هەرچەند توانی بە پشتیوانی سوپاو دەسەڵاتخوازەییەکانی خۆی هەرێمی



سالانێکی زۆر ئەم ئەرکەی بەو پەڕی راستگۆیی ئەنجامدا تا ئەوە کە رۆژێك خۆی ئاشقی یەکێك لە خوازیارەکانی شاژن بەناوی "کۆرساکۆڤ "[24]بووو بە شێوەیەکی نهێنی پێوەندی لەگەڵ سازکرد. کاترین کاتێك لەم پێوەندییە ئاگادار بۆوە کۆنتێسی لەسەرکار لابرد بەڵام دوای کۆتایی پێهاتنی هاودەمیو هاونشینی کۆرساکۆڤ دووبارە ئەوی خستەوە سەر کار، لەبەرئەوەی کە هیچکەسێك شارەزاییو لێهاتوویيو ئەزموونی ئەوی لەم کارە جوانە!! نەبوو.[25] کاترین هەرچی پیرتر دەبوو، مەیلەو چوونی بۆ هاودەمیو هاونشینی پیاوانی گەنج زیاتر دەبوو بە جۆرێك کە دوایین دڵداری کاترین لەتەمەنی سەروی شەستساڵیدا لاوێکی جوان بەناوی "زۆبۆڤ "[26] بوو کە بەکەڵك وەرگرتن لەخۆشەویستیو سەرنجی کاترین رۆڵێکی گرینگی لە شێواندنو ئاڵۆز کردنی کاروباری رووسیا نواند. کاترینی گەورە رۆژی حەڤدەی نۆڤەمبەری ساڵی ١٧٩٦ لەتەمەنی ٦٧ ساڵیدا مردو کوڕەکەی، "پۆل" کە لە تەواوی دەورانی دەسەڵاتی کاترین تەنیاو بێدەنگ بوو لەتەمەنی ٤٢ ساڵیدا لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت.



**کاترینی گەورە لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا**

24-Korsakow
25-Andrew Ewart-the Wolds Wickedest Women.pp 200-201
26-Zudov

ئێمپراتۆریەتی رووسیا بەرفراوانتر بکات، بەڵام جیاوازی چینایەتیو هەژاریو چەرمەسەری زۆربەی گەلی نەداری رووسیای زۆرتر کردو بواری بۆ یەکەمین بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی گەلی رووسیا لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم رەخساند. مەگەر ئەو خزمەتەی کاترین کە رێخۆشکەر بوو بۆ دەستپێکردنی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی رووسیا بکەین بە پاساو بۆ ئەوەی لەلایەن مێژوو نووسە کۆمۆنیستییەکانی رووسیا رێزی لێ بگیردرێت دانی پێدابنێین! شۆڕشی گەورەی فەڕانسە لە دوایین ساڵەکانی دەسەڵاتدارێتی کاترینی گەورە روویداو لە بەشەکانی کۆتایی یاداشتەکانی کاترین سەر سووڕمانو ترسی ئەومان لە روودانی ئەو شۆڕشە بۆ دەردەکەوی. رەنگە ئەگەر کاترین ماوەیەکی زیاتر ژیانی بکردایە لەو شۆڕشە مەزنە ئەزموونی وەردەگرتو کۆمەڵێك چاکسازی بنەڕەتیی ئەنجام دەدا، بەڵام مردن رێگەی پێ نەداو کاردانەوەکانی شۆڕشی مەزنی فەڕانسەو سەر هەڵدانی ناپلیۆن داوێنگیری جێنشینەکانی بۆوە.







## ژۆزێفین، ئەو ژنەی کە یەکێك لە بەهێزترین پیاوەکانی مێژووی هاوچەرخی ئەسیری ئەشقی خۆی کرد

یەکەمین شاژن یان "ئێمپراتۆریس"ی فەڕانسەی دوای شۆڕش ژۆزێفین بوو کە لەدەیەی یەکەمەمی سەدەی نۆزدەهەم بە بەهێزترین‌و دەسەلاّتدارترین ژنی جیهان بە ئەژمار دەهات. ئەو ژنە هاوسەری ناپلیۆن بۆناپارت، بەهێزترین پیاوی ئەورووپاو جیهان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم‌و دایکی سەرۆکی ئیتالیاو شاژنی هۆڵندای ئەو سەردەمە بوو. کچە زاکەشی لەنیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بەناوی ناپلیۆنی سێهەم بە دەسەلاّت گەیشت‌و زیاتر لە بیست ساڵ سەرۆکی رەهای فەڕانسە بوو. ناوی ئەسڵی ژۆزێفین "ماری ژۆزێف رۆز تاچێر دێلا پاژێری"[1]بوو. ژۆزێفین کچە گەورەی جوتیارێکی قامیشی شەکر بووکە لە دوورگەی"مارتێنیك"[2]، یەکێك لە مووستەعمەرەکانی فەڕانسە لە رۆژئاوای هێند دەژیا. ژۆزێفین ناوێکە کە ناپلیۆن لەسەری داناوەو لەبەرئەوەی کە لە مێژووی فەڕانسە بەو ناوە ناوبانگی هەیە ئێمەش هەر لەسەرەتای منداڵییەوەو پێش ئەوەکە بە مەلیکە ژۆزێفین ناوبانگ دەرکات، هەر بەم ناوە باسی دەکەین. ژۆزێفین لە رۆژی بیست‌و سێهەمی ژووەنی ساڵی ١٧٦٢ لە مارتێنیك هاتە سەر دونیاو دوای نزیکەی چوار ساڵ ژیان لەو دوورگەیە رۆیشتە پاریس. ژۆزێفین لەساڵی ١٧٧٩دا کاتێك کچێکی شازدە ساڵاّن بوو لەگەڵ نەجیب زادەیەکی فەڕانسەوی بەناوی "ئەلکساندێر دوبۆهارنیێ"[3] کە کوڕی مارکی دوبۆهارنێی فەرماندەری پێشووی مارتێنیك بوو زەماوەندی کرد. ئەلکساندێر دوبۆهارنیێ یەکەم جار ژۆزێفینی لە مارتێنیك بینی بووو کاتێك بۆ جاری دووهەم ئەوی لە پاریس بینی دڵی بەو کچە جوانە دۆڕاند کە سەرنج راکێشییەکی تایبەتی‌و بیٚوێنەی هەبوو. منداڵی یەکەمیان کە کوڕ بوو دوو ساڵ دوای زماوەند لە دایك بوو و ناوی "ئۆژێن"[4]یان لەسەر داناو ئەو منداڵە دواتر بەرزترین پۆستەکانی سەربازیی بەدەست هێنا. لەساڵی ١٧٨٣ منداڵی دووهەمیشیان کە کچ بوو هاتە سەر دونیاو

1-Marie joseph Rose Tascher de LA PAGERIE
2-Martinique
3-Alexander de Beauharnais
4-Eugene



ژۆزێفین ناوێکی ناباوی (هۆرتێنس)[5] لەسەر دانا. ئەلکساندێر ساڵێك پێش لەدایکبوونی ئەو کچە دڵپیسی لەهاوسەری دەکردو کاتێك هۆرتێنس لە دایك بوو هاوسەری بەوە تۆمەتبار کرد کە ئەو منداڵە زۆڵەو لە پێوەندییەکانی ژۆزێفین لەگەڵ پیاوانی‌تر کەوتۆتەوە. کێشەی ئەوان چووە پەرلمان‌و لە ئەنجامدا پەرلمان بڕیاری جیابوونەوەیانی دەرکرد. ئۆژێن بەپێی بڕیاری پەرلمانی پاریس[6] لای باوکی مایەوەو سەرپەرشتی هۆرتێنسیش بە ژۆزێفین ئەسپێردرا. ژۆزێفین دوای ئەم رووداوە پەنای بردە بەر کەنێسەی "پانتێمۆنت"[7] لە پاریس‌و ١٥ مانگ لەوێ مایەوە. ١٥مانگ ژیان لە کەنێسەی پانتێمۆنت وانەی نوێی لەژیان فێری ژۆزێفین کرد. ژۆزێفین لەو کەنێسەیە لەگەڵ ئەو ژنانەی کە بەهۆی خەیانەت بە مێردەکانیان جیاو بیٚ سەر پەرشت مابوونەوە یان دایکانێك کە پێش زەماوەند دووگیان ببون‌و لە ماڵ دەرکرابوون‌و ژمارەیەك لە ژنانی خراپکار کە پەنایان بۆ کەنێسە هێنا بوو ئاشنابوو. تەوەری قسەکانیان پتر پەیوەست بەداستانەکانی تایبەت بە پێوەندی هەرکامێکیان لەگەڵ پیاوانی جۆراوجۆر بوو. بەم شێوەیە ژیان لە کەنێسە ژۆزێفینی بەرێگای راست رێنوێنی نەکردو پتر وانەی عیشوە گەری‌و شێوازکانی فریودان‌و لەداو نانی پیاوان فێربوو. دوای ئەوە کە ژۆزێفین لە کەنیسە رۆیشتە دەریٚ باوکی لەگەڵ خۆی بردییەوە بۆ مارتێنیك، بەلاّم زیاتر لەدووساڵ لەو دوورگە گەرم‌و شێدارە لای دایك‌و باوکی نەماو لەسەرەتاکانی شۆڕشی فەڕانسە گەڕایەوە بۆ پاریس. ژۆزێفین لەو بەڕوارەدا ژنێکی ٢٥ساڵاّن بوو کە بە پێستێکی سەوزەو سەرنج راکێشییەکی تایبەت بە ژنانی ناوچەکانی گەرمێن‌و چاوانێکی جادوویی هەر پیاوێکی بە نیگای یەکەم بۆلای خۆی رادەکێشا. ژۆزێفین ئیتر لە پێوەندی لەگەڵ پیاوانی جۆراوجۆر هیچ ترسێکی نەبوو بەلاّم دیسان چاوی لە ئەلکساندێری مێردی یەکەمی بوو کە ئاشقانەو لە قوولاّیی دڵەوە خۆشی دەویست.

ئەلکساندێر کە بە نوێنەری ئەنجوومەنی نەتەوەیی فەڕانسە هەڵبژێردرا بووو لە کەسایەتییە بەرچاوەکانی شۆڕش بە ئەژماردەهات، جارێکی‌تر پێوەندی بە ژۆزێفینەوە گرت بەلاّم ئامادە نەبوو جارێکی‌تر لەگەڵ ژۆزێفین زەماوەند بکات. ژۆزێفین‌و ئەلکساندێر لە ساڵە تۆفانی‌یەکانی

5-Hortense

٦- لەم رێکەوتەدا ئەرکی پیٚراگەیشتن بە ناکۆکی‌و کێشەکانی‌ماف‌و دادپەروەری خەڵکی فەڕانسە بە پەرلمانە هەرێمییەکان ئەسپێردرا بوو.

7-Panthemont





شۆڕشی فەڕانسە جارجارێك یەكتریان دەبینی تا ئەوەكە ئەلكساندێر بوو بەسەرۆكی ئەنجوومەنی نەتەوەیی فەڕانسەو لەساڵی١٧٩٢ بە پلەی ژێنراڵییەوە بۆ شەڕ لەگەڵ بەرهەڵستكارانی ڕێژیمی شۆڕشی فەڕانسە بەرەو ناوچەی ڕاین وەڕێكەوت. لەساڵی١٧٩٣ دا هێزەكانی ژێر فەرمانی ئەلكساندێر بە پەسندكرانی یاسایەك دژبە نەجیب زادەكان لە ئەنجوومەنی فەڕانسە دەستیان بەپاشەكشە كردو شاری "ماینز"[٨] یان تەسلیم بە دوژمن كرد.



**وێنەی ژۆزێفین كە تایبەتە بە سەردەمی لاوێتی**

ئەم هەرەسهێنانو پاشەكشەیە دەرەنجامی سەركەوتنو ئاستی بەرزی هێزە هاوپەیانەكانی ئۆتریش(نەمسا)و پێرۆس بوو، بەڵام ڕۆبێسپیەر كە لەو كاتەدا سەرۆكی ڕەهای فەڕانسەبوو ئەلكساندێری بە خەیانەت تۆمەتبار كردو دادگای شۆڕشی پاریس بڕیاری كوشتنی ئەوی دەركرد. ڕۆژی بیستوسێهەمی ژووئیەی ساڵی ١٧٩٤ سەری ئەلكساندێر دوبۆهارنێ لەتەمەنی

8-Mainz



٣٤ ساڵیدا بە تیخی گیوتین لە جەستەی جیاكراوەو ژۆزێفینیش كە بە هاوكاریو پێوەندی لەگەڵ هاوسەری پێشووی تۆمەتبار كرابوو، دەستبەسەر كراو خرایە بەندیخانە.



**ئەلكساندێر دوبۆهارنێ، هاوسەری یەكەمی ژۆزێفین**

ڕەنگە بەندكرانی ژۆزێفین لەو بارودۆخەدا گەورەترین بەختی ژیانی ئەو بێت. لەبەرئەوەی كە تەواوی ئەو ڕووداوو بەسەرهاتانەی كە ڕەوتی ژیانی ژۆزێفینی گۆڕیو هەروەها ناسیاریو دواییش زەماوەندی ئەو لەگەڵ ناپلیۆن بناپارتی ئێمپراتۆری داهاتووی فەڕانسە لەم بەندكرانەوە دەستی پێكرد. هەڵبەت ئەم شانسە (بەندكران) لەوانە بوو ببێتە خراپترین چارەنووسی ژیانی ژۆزێفین، بەهۆی ئەوە كە ئەگەر بەخت یاوەری نەبوایەو هۆكارەكانی لەناوچوونی دەسەڵاتی ڕۆبێسپیەر ئامادە نەبوایە سەری ژۆزێفینیش وەكوو سەری ئەلكساندێر بە تیخی گیوتین لەجەستەی جیا دەكرایەوە. گەورەترین بەخت ژیانی ژۆزێفین ئەوە بوو كە كاتێك لەسووچی بەندیخانەی "كارمێز"[٩]دا چاوەڕووانی ڕۆژی دادگاییو كوژرانی بوو، دەرگای ژوورەكەیان كردەوەو ژنێكی گەنجو جوانیان خستە ناو ژوورەكەی. ئەو ژنە "ترێزا كابارۆس"[١٠] بووكە

9-Carmes
10-Theresia Cabarrus

لەسەرەتادا بۆ پێزانینو تێگەیشتنی رۆڵی ئەو ژنە لە رزگاریو گۆڕینی رەوتی چارەنووسی ژۆزێفین، پێویستە باسی ژیانو بەسەرهاتی ئەو بکەین. ترێزا لە دایكو باوكێكی ئیسپانیۆلی بوو کە لەسەرەتای شۆڕش لەگەڵ "مارکی دوفۆنتنای"[11] لەپاریس زەماوەندی کرد. ژیانی هاوسەرێتی ئەوان زیاتر لە چوار ساڵی نەخایاندو لەساڵی١٧٩٣ لێك جیابوونەوەو لەرێگای گەڕانەوە بۆ ئیسپانیا، لە "بۆردۆ" لەلایەن هێزە شۆڕشگێرەکان دەستبەسەرکراو خستیانە بەندیخانە. فەرماندەری هێزە شۆڕشگێڕەکانی بۆردۆ کە بۆ سەرکوتی بەرهەڵستکارانی رێژیمی نوێی فەڕانسە نێردرابووە ئەو شارە، ناوی "ژان لامبێرت تالین"[12] بوو کە کاتی بەسەرکردنەوەی بەندیخانەی بۆردۆ ترێزای بینی. ترێزا کە لەو کاتەدا ژنێکی گەنجی ٢٠ساڵان بوو بڕیاریدا بە نازو دلڕفێنی خۆی رزگار بکاتو تالینیش کە لاوێکی بیست وشەش ساڵەبوو، نەیتوانی لەبەرامبەر ئەو ژنەدا "پاکی شۆڕشگێڕی" خۆی بپارێزێ. ترێزا لەبەندیخانەوە رۆیشتە ماڵی تالینو لە داری ژیانی هاوبەشی ئەوان بەرهەمی ئەشقو زەماوەندی لێکەوتەوە. تالین شۆڕشگێڕێکی توندڕەو بوو کە پێش ئاشنایی لەگەڵ ترێزا سەری هەزاران کەسی بڕیبوو، بەڵام ئەشقو خۆشەویستی ترێزا ئەوی بە تەواوی گۆڕیو ترێزا بە کەڵك وەرگرتن لە کارتێکەری خۆی لەسەر تالین توانی پێش بە کوشتنو خوێنرێژی ئەو بگرێو تەنانەت ئەو پڕوپاگەندیە بلاو بۆوە کە بەیارمەتی ئەو سەدان بەندی گرتووخانەکانی شۆڕش کە چاوەڕووانی گیوتینیان دەکرد ئازاد کراون یان لە بەندیخانە هەڵاتوون. ترێزا نازناوی فریشتەی رزگاری وەرگرتو یاساوڵەکانی رۆبێسپیەر ئەورووداوەو هۆی بەر کار نەهێنانی گیوتینیان بە گوێ ئەو گەیاند. تالین بۆ پاریس بانگهێشتن کراو لەگەڵ ترێزا کە ئیتر خانمی تالینیان (مادام تاڵین) پێدەگووت رۆیشتن بۆ پاریس. کاتێك کە تالین بۆ بینینی رۆبێسپیەرو بەشداری لە کۆبوونەوەی کۆنڤانسیۆن لە شوێنی نیشتەجێ بوونی رۆیشتە دەرێ، هاوسەرەکەی لەلایەن هێزەکانی شۆڕشگێر دەستبەسەرو بەندکرا.

لە بەندیخانەی کارمێز ژوری چۆڵی تێدا نەمابووو هەربۆیەش ترێزایان لە ژۆری ژۆزێفین تاچێر بەندکرد. تالین دوای گیرانی ترێزا دەیتوانی ئەو چارەنووسە ناحەزو شوومە پێشبینی بکات کە چاوەڕوانی بوو. دووکەسیتر لە یاساوڵەکانی سەرکوتکەری ویلایەتەکان بەناوی "باڕاس"[13]، جەلادی مارسەیو "فۆشێت"[14] جەلادی لیۆن بۆ پاریس بانگهێشت کران. ئەوانیش وەك تالین لە کوشتو کوشتاری خەڵك کۆتاییان نەکردبوو بەلاّم ئەوان پێشینەیەکیان لەگەڵ رۆبێسپیەر هەبووو لەهەستی تۆڵە سەندنەوەی ئەو دەترسان. ژۆزێف فۆشێت کە پێشتر قەشە بوو، ماوەیەك دڵداری شارلۆتی خۆشکی رۆبێسپیەر بوو و بەرواڵەت بەهۆی دژایەتی رۆبێسپیەر زەماوەندیان نکرد. پۆل بارۆسیش بەهۆی پێوەندی دۆستانە لەگەڵ دانتۆنو لایەنگرەکانیو چەند کێشەو گرفتێك کە لە ئەنجوومەنی نەتەوەییو کۆنڤانسیۆن لەگەڵ رۆبێسپیەری هەبوو، لە رقو کینەی ئەو دەترسا. لە ئێوارەی رۆژی بیستو پێنجەمی ژووئییەی ساڵی١٧٩٤ دا کاتێك کە تالینو فۆشێت لە باخچەی تۆیلێری پیاسەیان دەکردو بیریان لە رێگا چارەیەك دەکردەوە کە گرفتەکەیان چارەسەر بکات، لەنەکاو پیاوێك لێیان نێزیك دەبێتەوەو نامەیەك دەدا بەدەستی تالین. تالین نامەکە دەکاتەوەو دەستنووسی ترێزا دەناسێتەوە. ترێزا لەو بەندیخانەیەشدا توانی بەچەکی جوانی پاسەوانێکی بەندیخانە فریو بداو رازی بکات ئەو نامەیەی بۆ بداتە تالین. ترێزا لە نامەکەدا نووسیبووی کە سبەینێ دادگایی دەکەرێو لە سێدارە دەدرێو دوایش نۆبە دەگاتە ئەو. هەروەها ترێزا دەنووسێ: "ئەگەر ورە بدەیتە بەرخۆتو لەبەرامبەر ئەو جەلادە راوەستی، رەنگە هەردووکمان لە مردن رزگارمان بێتو ئەگەریش سەر نەکەوی مردنی سەربەرزانە باشترە لە مردنی سەرشۆڕانە". تالین لەو کاتەدا خوێنی هەڵدەچێتو ئامادەیی خۆی بۆ بەرنگار بوونەوە لەگەڵ رۆبێسپیەر رادەگەێنێ، فۆشێتیش هەر بەم جۆرەو پێکەوە دەچنە لای بارۆسو ئەویش ئامادەیی خۆی رادەگەێنێ. فۆشێت بەڵێن دەدا بەتالین کە لە رێگای ئەو لایەنگرانەی کە لە دادگاکانی شۆڕشدا هەیەتی رێکەوتی دادگایی کردنی ترێزا دوو رۆژ وەدوا بخات، بەڵام کات کەمەو پێویستە بەهەر نرخێك بێت ئەم کارە روون بکرێتەوە. تالینو باڕاسو فۆشێت لەگەڵ چەند کەسیتر لە نوێنەرانی کۆنڤانسیۆن کە روانگەیەکی باشیان سەبارەت بە رۆبێسپیەر نەبوو، دانووساندن دەکەنو لەئێوارەی رۆژی بیستو شەشەمی ژۆئییەدا بۆ یەکەمین جار لەدەورانی تێرۆرو لەکاتێکدا کە رۆبێسپیەر لە پشت تریبوونی کۆنڤانسیۆن وتاری دەخوێندەوە، بانگەوازگەلێکی دژایەتیو ناڕەزایەتی بەرز دەبێتەوە. چەندکەس لەلایەنگرەکانی رۆبێسپیەر دژیان رادەوەستن بەلاّم زۆرینەی ئەندامانو نوێنەرانی کۆنڤانسیۆن بێدەنگ دەبنو رۆبێسپیەر کە غافڵگیر ببوو لەکۆبوونەوەکە دەچێتەدەرێو بڕیار دەدا بۆ رۆژی دواتر وتارێکی توندوتیژتر دژی

11-Marquis de Fontenay

12-Jean Lambert tallien

13-Barras

14-Fuchet







خەیانەتکارەکان بداو داوا لە کۆنڤانسیۆن بکات سزایان بدات. بەلاّم تالینو باڕاسو نوێنەرەکانیتر کە وێرابوویان لە کۆبوونەوەکەی کۆنڤانسیۆندا رەخنە لە رۆبێسپیەر بگرن، دەیانزانی ئەگەر درەنگ بجوولێنەوە چ چارەنووسێك چاوەڕێیان دەکات. بەدرێژای شەو هەولّی ئامادەکردنی هێز بۆ بەرنگار بوونەوە لە کۆبوونەوەی سبەینێی کۆنڤانسیۆن دەدرێت، بەلاّم بەدەستهێنانی دەنگی زۆرینەی نوێنەران لەو بەگژدا چوونەوەیەدا پێویستی بە دلێریو لەخۆبردوویی بەرهەلّستکاران هەیە. رۆژی مێژوویی **٢٧**ی ژووئییە (یان نۆیەمی تۆرمیدۆر بەپێی رۆژ ژمێری نوێی شۆڕش) دەگاتیو رۆبێسپیەر لەگەلّ ژمارەیەك لە ئەندامانی کۆمەلّەی رزگاری نەتەوەیی ئامادە دەبێت کە لایەنگری دەمارگرژی ئەو بوون. کاتێك کە رۆبێسپیەر بەرەو تریبوون وەڕێ دەکەوێت، تالینو باڕاسو ژمارەیەك لە نوێنەران بەهاودەنگی هێرشیان بردەسەریو تالین لەنێوان سەرسووڕمانی نوێنەرەکانیتری کۆنڤانسیۆن خەنجێرێکی لەژێرجلوبەرگەکەی دەرهێناو هاواری کرد "ئەم جەللادە نیشتیمانی لە خاكو خوێن هەلّکێشاوەو دەبێ دادگایی بکرێ. ئەگەر کۆنڤانسیۆن ناوێرێ سزای بدات من بەم خەنجێرە سینگی دەدرم!". لەو کاتەدا ئەندامانی کۆنڤانسیۆن کە تا ئەو رۆژە نەیان وێرابوو لە ئاست رۆبێسپیەر هەناسە هەلّکێشن، وەجۆشو خرۆش دێنو لە هەرلایەکەوە هاوارەکانی "ستەمکار... مرۆڤکوژ... دادگایی... سزا" بەرز دەبێتەوە. رۆبێسپیەر بەزمانی شەڕو جنێوەوە داوای وتووێژی کرد لەسەرۆکی کۆنڤانسیۆن کە ناتوانێ یان نایهەوێ رێکوپێکیو دیسیپلینی کۆبوونەوەکە راگرێ. بەلاّم سەرۆکی کۆنڤانسیۆن بۆ دژکردەوە لە ئاست ئەو جنێوو سووکایەتییە پێشنیاری دەستبەسەرو دادگایی کردنی رۆبێسپیەرو لایەنگرانی خستە بەر دەنگدان. زۆرینەی نوێنەرانی کۆنڤانسیۆن ئەو پێشنیارە پەسند دەکەنو هەر ئەوشەوە رۆبێسپیەرو لایەنگرانو هاوڕێیانی نزیکی لەلایەن سەربازەکانی جێگیر لە کۆنڤانسیۆن دەگیرێنو دەگواسترێنەوە بۆ بەندیخانە. دوای دادگاییەکی خێرا سەری رۆبێسپیەرو هاوڕێیانی بەو گیوتنەی کە سەری لوویی شازدەهەمو ماریئانتوانتو دانتۆنیان پیبڕی لەجەستە جیا دەکەنەوەو لەشەوی بیستو حەفتەمی ژووئییەی سالّی ١٧٩٤ بەهۆی تەواو بوونی حکوومەتی تێرۆر لە پاریس جێژن دەگیرێ. تالینو باڕاس لەو شەوەی کە سەری رۆبێسپیەرو هاوڕێیانی لە جەستە جیادەکرێتەوە بۆ ئازاد کردنی ترێزا دەڕۆنە بەندیخانەی کارمێزو ژۆزێفینیش لەگەلّ ترێزا ئازاد دەکرێت.





**ئەم تابلّۆیە دیمەنی مێژوویی کۆبوونەوەی کۆنڤانسیۆن لەکاتی هێرشی تالین بۆ سەر رۆبێسپیەر پیشان دەدات**

باڕاس هەر لە نیگای یەکەمدا ئاشقی ژۆزێفین دەبێتو بانگهێشتی دەکات بۆ مالّی خۆیو ژۆزێفینیش کە ئاگاداری پێگەو پۆستی باڕاسە بەخێراییو بیّ دوودلّی ئەم بانگهێشتە قەبوولّ دەکات.

***

ئاشنایی ژۆزێفینو باڕاسو پێوەندی ئاشقانەی ئەوان کە زیاتر لە سالّێك درێژەی کێشا خالّێکی وەرچەرخان بوو لەژیانی ژۆزێفینو سەرکەوتنی ئەوی تا پۆستی یەکەمینی فەڕانسە (ئیمپراتۆریس) مسۆگەر کرد. باڕاس لەکۆتاییەکانی سالّی ١٧٩٤دا دەبێتە سەرۆکی کۆنڤانسیۆنو لەسەرەتاکانی سالّی **١٧٩٥** یاسایەکی بنەڕەتیی نویّ کە تێکەلاّوێك لە یاسای بنەڕەتی سالّی**١٧١٩**ی فەڕانسەو یاسای بنەڕەتی ئەمریکا بوو لەلایەن کۆنڤانسیۆنەوە پەسند دەکریّ. کۆنڤانسیۆن بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەولّەت، شاندێکی بەڕێوبەرایەتی پێنج کەسی هەلّدەبژێریّ کە تا سالّی **١٧٩٩** لە فەڕانسە حوکمڕانی کرد.

ئەو سەردەمە بە دەورانی حکوومەتی شاندی بەڕێوەبەرایەتی یان "دایرێکتوار"[15] بەناوبانگە. پۆل باڕاس بەسەرۆکی شاندی بەڕێوەبەرایەتی هەلّبژێردراو بەهۆی ئەو دەسەلاّتە بەرفراوانەی کە لەکاتی حکوومەت لەسەر فەڕانسە هەی بوو بە "پاشای کۆماری" ناوبانگی دەرکرد. دۆستایەتی نێوان ژۆزێفینو ترێزا کەئیتر بەناوی مادام تالین ناوبانگی دەرکردبوو لە دەورانیحکوومەتی شاندی بەڕێوبەرایەتی گۆڕابوو بۆ جۆرێك رکابەرایەتی ژنانە. لەبەرئەوەی کە هەرچەند نازناوی "پاشای کۆماری" بە پۆل باڕاسی دلّداری ژۆزێفین درا بوو، بەلاّم مادام تالین نازناوی "شاژنی کۆماری"ی وەرگرتبوو. مادام تالین کە پێش شۆڕشی گەورەی فەڕانسە بەناوی مارکیز دوفۆنتنای لە نێو کۆڕە

15-Directoire





كۆمەلایەتییەكانی پاریس ناوبانگی هەبوو، ئێستا بەناوی هاوسەری یەكێك لە ئەندامانی دەسەلاتداری حكوومەتی شاندی بەڕێوەبەرایەتی سەرنجی خەلكی بۆ لای خۆی راكێشا بوو، لەكاتێكدا ژۆزێفین هاوسەری یاسایی "پاشای كۆماری" نەبووو باڕاس هەولیدەدا پێوەندییەكانی ئەو بە نهێنی بپارێزێت. لە ئۆكتۆبەری سالی ١٧٩٥دا راپەڕینێك لە پاریس روویدا كە دەگوترا لەلایەن پاشایەتی خوازەكانەوە رێكخراوەو پالپشتی دووژمنانی دەرەكی حكوومەتی شۆڕشیی فەڕانسەشی لەگەل بووە. باڕاس بۆ سەركوتی ئەو راپەڕینە یارمەتیی لە ئەفسەرێك بەناوی ناپلیۆن بۆناپارت وەرگرت كە بە تۆمەتی لایەنگری لە رۆبێسپییەر كەوتبووە بەررق وبێزاری. ناپلیۆن بە سەركوتی ئەو راپەڕینە خزمەتێكی زۆری بە باڕاس كردو لەتەمەنی ٢٦ سالیدا بە پلەی ژێنڕالی گەیشت. ناپلیۆن لە رەوتی هات وچوو بۆ مالی باڕاس ئاشقی دلدارەكەی باڕاس بووو ژۆزێفینیش لەبەرانبەردا هۆگری ئەو ئەفسەرە لاوو بەجموجۆلە بوو. باڕاس كە پیاوێكی ژنباز بووو دەیهەویست دلدارێكیتر بەجێگەی ژۆزێفین بدۆزێتەوە، خۆی گەشەی بەو پێوەندییە داو پێشوازی لە زەماوەندی ناپلیۆنو ژۆزێفین كرد. لە رۆژی نۆیەمی مارسی سالی١٧٩٦دا رێوڕەسمی زەماوەندی ناپلیۆنو ژۆزێفین لە هۆلی شارەوانی پاریس بەڕێوە چووو باڕاس خۆی یەكێك لە شایەتەكانی گرێبەستی زەماوەندی ئەوان بوو. زاوا ٢٧ سالانو بووكیش شەش سال لەو بەتەمنترو دایكی دوو مندالی مێردی پێشووی بوو. بەلام لە بەلگەكانی تایبەت بە زەماوەندەكەدا تەمەنی هەردووكیان ٢٨ سال نووسی!". مانگی هەنگوینی ناپلیۆنو ژۆزێفین بەهۆی رەوانەكرانی ناپلیۆن لە لایەن باڕاسەوە بۆ شەڕێكی دەرەكی لەگەل ئیتالیا تەنیا ٣٦ كاتژمێری خایاند.



**وێنەیەك لە ناپلیۆن كە تایبەتە بە سەرەتاكانی دەسەلاتی ئەو لەسەر فەڕانسەو پێش گەیشتن بە پلەی ئێمپراتۆری**



ناپلیۆن لە یەكەم شەوی زەماوەندیدا ناچار بوو یەكەمین داواكاری نابەجێی ژوزێفین قەبوول بكاتو ئەویش ئەوە بوو كە سەگە خۆشەویستەكەی ژۆزێفین (فۆرتۆنیێ)[16] لە ژووری خەوی ئەوان بمێنێتەوە. ناپلیۆن لەسەرەتادا نەدەچووە ژێرباری ئەو داواركارییە، بەلام ژۆزێفین پێی گوت كە ئەگەر ناتوانێ لەبەرامبەر مانەوەی فۆرتۆنی خۆڕابگری دەتوانی لەژوورێكیتردا بخەویت! ناپلیۆن بە ناچاری قەبوولی كردو فۆرتۆنیێ تا بەیانی سێجار ناپلیۆنی لەسەر جێخەو گەست. لەگەل ئەوەشدا ژۆزێفین لە هونەری ئەشقبازی ئەوەندە شارەزاو لێهاتوو بوو كە توانی لەو ماوە كەمەدا ناپلیۆن شەیداو هۆگری خۆی بكات. ناپلیۆن دواتر لە تاراوگەی خۆی لە ساینت هێلێن گووتبووی لە تەواوی ژیانیدا ژنێكی نەبینیوە وەكوو ژۆزێفین بەلارو لەنجەو جوان و لەش نلسك و رێك و پێك بێت. هیچ یەك لەو ژنە جۆراوجۆرانەی كە بە درێژایی تەمەنی پێوەندی لەگەل گرتوون وەك ژۆزێفین شارەزای نهێنییەكانی ئەشق نەبوون. ناپلیۆن لە ماوەی نزیك بە ٢٠ سال كە بەردەوام لە بەرەی شەڕلە دژی ئیتالیا بوو، جگە لە ماوەیەكی كورت كە ژۆزێفین بە پێداگری ناپلیۆن لە بنكەی سەربازی ئەو لە نزێك بەرەی شەڕ مایەوە، بەلانی كەمەوە رۆژێ نامەیەك "وجاری وایە doonامە"ی بۆ هاوسەری دەنووسیو ئەو نامانەی لەگەل نامەبەر سەربازی دەنارده پاریس. چلو دوونامە لە كۆی ئەو نامانە لە بەر دەست دایە، جگە لەمە كە گەرمو گوڕی ئەشقو خۆشەویستی ناپلیۆن سەبارەت بە ژۆزێفین دەردەخات، ناسێنەری كەسایەتیو هزرەكانی ئەو پیاوەیە كەرەوتی مێژووی ئەورووپاو جیهانی گۆڕی. هەروەها ئەو نامانە نیشان دەدەن كە تامەزرۆیی ناپلیۆن لە گەڕانەوە بۆ پاریسو هاودەمی ژۆزێفین (ورەنگە ئیرەییو دلەخوورپەی ئەو لەبێوەفاییو خەیانەتی ژۆزێفین) تا چ رادەیەك لە وەدەر خستنی بوێری لە رادە بەدەرو بەپەلەییو خێرایی ناپلیۆن لە بەدەستهێنانی سەركەوتنو داگیركردن كاریگەر بووە.

ناپلیۆن لە یەكێك لە نامە سەرەتاییەكانی خۆی بۆ ژۆزێفین كە لەرێگای چوونە شەڕ لەگەل ئیتالیا نووسیبووی ، ژۆزێفین بە "ئەشقی مەزنیو شایەنی پەرەستین" ناو دەباو دەنووسێ: "هەردەم كە لە تۆ دوور دەكەومەوە، هەست دەكەم تواناییم بۆ خۆڕاگری لە ئاست دووری تۆ كەمتر دەبێتەوە. بە تەواوی بوونمەوە بیر لە تۆ دەكەمەوەو جگە لە دیمەنی جوانی تۆ هیچ شتێكیتر لە بەر چاو نابینم... هەردەم لەوە بیردەكەمەوە كە تۆ لەچ دۆخێك دای... لە خەیالی

16-Fortune





ئەوەکە تۆ خەمۆکو لە دڵەراوکێ دای دڵم توند دەبێتو بەو خەیاڵە کە تۆ بە دەماخو بەبزەی، دیسان دڵم دەگیرێ کە بۆچی منت لە بیر چووەو دووری من هیچ کاریگەری نەبووە لەسەر تۆ..."

ناپلیۆن لە رۆژی سێهەمی مارس ١٧٩٦دا، واتە سێ حەوتوو دوای زەماوەند نامەیەکی تر بۆ ژۆزێفین دەنێرێو لەو نامەیە دا دەنووسێ: "رۆژ نییە بە یادی ئەشقی تۆوە شەو نەکەمەوەو شەو نییە بە خەیاڵی تۆوە نەخەوم. تەنانەت لە دونیای خەویشدا لەگەڵ تۆ دامو هەرکات لە خەو هەڵدەستم دیمەنی تۆ دەخەمە بەرچاوم. تۆ ژیانو گیانو هەمووشتێکی منی. تەنانەت لە نێو گۆڕەپانی شەڕو لەگەرماو گەرمی شەڕدا لە بەر چاوەکانم دوورناکەویتەوە. دڵی من بۆ تۆو بەیادی تۆ لێدەدات.

زۆربەی شەوەکان لەکاتێکدا کە تەنیا پاسەوانەکان بەخەبەرن، لەسەر جێ هەڵدەستمو خەریکی کێشانەوەو دانانی پلانی نوێ دەبم تا بە سەرکەتنی هەرچیخێراتر زووتر تۆ لە باوەش بگرم... ئەی ئەشقی مەزنی من... زۆربەی سەر کەوتنەکانم لە بەرەی شەڕدا بەهۆی ئەشقی تۆوە بووە...". لە نامەیەکیتری ناپلیۆن بۆ ژۆزێفین دەخوێنینەوە "ژۆزێفینی بێهاوتای من، بەهۆی دووری تۆ ئۆقرەییو بەختەوەریم نەماوە. بە دووری تۆ دنیا بۆ من وەك بیابان قاقرو بێ بەروبۆمە... من بۆ تۆ دەژیم بۆ تۆش شەڕ دەکەم... ئەی رووحو ژیانی من هەرکات پەیکێك (نامەبەر) هات بۆ لات نامەیەکم بۆ بنووسە. نامەکانی تۆ گیانێکی تازەم پێ دەبەخشێ... ژیان بۆ من بەبێ ئەڤینو خۆشەویستی تۆو دڵنیا بوون لەوەکە تۆ منت خۆش دەوی، هیچ واتایەکی نییە..."



**وێنەیەك لە دەستنووس و نامەکانی ناپلیۆن بۆ ژۆزێفین**



ناپلیۆن لەنامەیەکیتر بۆ ژۆزێفین دەنووسێ، ئەو نامەبەرەی کە ئەو نامەیەت بۆ دەهێنێت چاوەڕوان دەمێنێتەوە تا وڵامی نامەکەم بدەیەوەو دوایش درێژەی پێدەداو دەڵێت: "ئەی ئازێزترین کەسی من ئەگەر زۆربڵێیی دەکەم ببوورە. ئەشقی تۆ ئەقڵو هۆشی لێبڕیوم... من لە مۆتەکەی هەمیشەیی خۆمدا دەژیم و بە نەبوونی تۆ زیاتر لە ژیانو زیاتر لە حەسانەوەو زیاتر لە هێمنیو بەختەوەریم لە دەست داوەو ئەگەر نەیەی بۆ لام هیچ کارێکم پێ ناکرێ... بۆم بنووسە کە دێی بۆ لام. بنووسە کە هەست بە قووڵایی ئەشقی من سەبارەت بە خۆت دەکەی. بنووسە کە باوەڕ دەکەم کە دەمێك لە بیرو خەیاڵی تۆ دەر ناچمو بێ تۆ ژیان بەهای بەردەوام بوونی نییە... هەموو شتێکی من بۆ تۆیە. من بەشێك لە هەستی تۆمو ئەو رۆژەی هەست بکەم کە جێگەیەکم لە دڵی تۆدا نەماوە زیاتر لە مردوویەك نیم..." بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەو هەموو هەستە بە تینەی ناپلیۆنو ئەو سەرنج راکێشیە زۆرەی ژۆزێفین، دوو هێزی لێك جیاکەرەوە ئەوان لە یەك دوور دەخاتەوە: یەکەمیان دژایەتی ماڵباتی ناپلیۆن لەگەڵ ژۆزێفینو دووهەمیشیان بریتیە لەرەوشتی هەوسبازانەی ژۆزێفینو ئەو دەنگۆیانەی کە سەبارەت بە چیرۆکەکانی ئەشقی ئەو لەنەبوونی ناپلیۆن لە پاریس دا بڵاو بۆتەوە. دایكو برا گەورەکەی ناپلیۆن لەوەکە ناپلیۆن بەپێچەوانەی دابو نەریتی بنەماڵەییو بێ ئاگاداریو بەدەستهێنانی رەزایەتی پێشووی ئەوان زەماوەندی کردووە نارازی بوون و ژۆزێفینییان بەهۆی ئەو پێشینەیەی کە هەی بووو هەمووکەس کەمو زۆر لێی ئاگادارن بە بووکێکی شایەنی بنەماڵەکەیان نەدەزانی. خووشکەکانی ناپلیۆنیش لەوەکە ئەم ژنە رووحو دڵی براکەیانی داگیرکردووە ئیرەییان پێ دەبرد و پەرەیان بەو دەنگۆ ناحەزانە دەدا کە لەبارەی ژۆزێفینەوە بڵاو ببۆوە. ژۆزێفین بۆ پووچەڵ کردنی ئەو دەنگۆو پیلانانەی کە لەلایەن بنەماڵەی ناپلیۆنەوە دژی ئەنجام دەدرا، رەنجو دەردی سەفەری ژووانی هاوسەری لەناوچەکانی شەڕ قەبووڵ کردو لە شەوێکدا هەرچی بنەماڵەی ناپلیۆن رەستبوویان کردیەوە بە خوری. ناپلیۆن تەنانەت لەو ماوە کورتانەی کە بۆ بەشداری لەشەڕ، لە ژۆزێفین دوور دەکەوتەوە، نامەی ئاشقانەی بۆ دەنووسێ. ناپلیۆن لە یەکێك لە نامەکانیدا دوای پێدا هەڵگوتنی جوانیو خۆشەویستیو هونەری ئەشق بازی ژۆزێفین دەنووسێ: "ئەشقی من، داوات لێدەکەم ئەوەندە جوانو باشو دڵڕفێنو بە بەزەیی مەبە، بهێڵە نەختێك کەمو کوورتی لە تۆدا ببینم تا بتوانم بۆ ساتێکیش بێت لە بیری خۆمت بەرمەوە". ناپلیۆن دوای سەرکەوتنێکی مەزن لەشەڕەکانی بەرەی ئیتالیا گەڕایەوە پاریسو وەك

قارەمانێك پێشوازی لێكرا.. ئەم جارەیان حكومەتی شاندی بەڕێوەبەرایەتی ئەركی داگیركردنی بریتانیای پێ ئەسپاردو بۆ ئەو مەبەستەش پلانگەلێكیان بۆ پەڕینەوە لە دەریای مانشو دابەزاندنی هێز لە دوورگەی بریتانیا ئامادە كرد. بەڵام ناپلیۆن ئەو پلانەی بە لەبەرچاو گرتنی هێزی دەریایی بریتانیا بەباشو كاریگەر نەزانیو پێشنیاری پلانی عەمەلیاتی میسری بۆ بڕینی پێوەندی بریتانیا بە موستەعمەراتەكەی لەهیندوستان كرد. ناپلیۆن لەمانگی مەی ساڵی١٧٩٨دا بەهێزێكی دەریایی مەزن كە لە ٥٥ پاپۆڕی شەڕكەرو ٢٨٠ پاپۆڕی هێزبەر كە ٣٨٠٠٠ سەربازو ١٢٠٠ ئەسبو چەكو تەقەمەنیی لێ بار كردبوو بەرەو میسر وەڕێكەوتو قۆناغە سەرەتاییەكانی ئەم عەمەلیاتەی بە سەركەوتن بڕی.

بەڵام هێزی دەریایی بریتانیا بە سەركردایەتی دەریا سالار "نیلسۆن"[17] لە شەڕێكی دەریاییدا لەگەڵ فەڕانسەو لەكەنارەكانی میسر، هێزە دەریاییەكانی فەڕانسەی تێك شكاندو هێزی پیادەی فەڕانسەشی لەمیسردا گەمارۆ دا. ناپلیۆن كەئیتر هیچ شانسێكی سەركەوتنی لەشەڕەدا نەدەبینی، لەڕۆژی بیستو چوارەمی ئووتی ساڵی ١٧٩٩ هێڵی گەمارۆی پاپۆڕەكانی بریتانیای شكاندو ڕۆژی نۆهەمی ئۆكتۆبەری هەمان ساڵ گەڕایەوە فەڕانسە. شەڕو پێكدادانە بێ ئاكامەكانی میسر نێزیك بەساڵو نیوێك درێژەی كێشاو لەو ماوەیەدا پێوەندی ناپلیۆنو ژۆزێفین وەك رابردوو گەرمو گوڕ نەبوو. ژۆزێفین دەیهەویست لەگەڵ ناپلیۆن بڕوا بۆمیسر بەڵام ناپلیۆن كە ئاشقی هاوسەری یەكێك لە ئەفسەرەكانی ببوو سەفەری هاوسەرەكەی بۆ داهاتوو وەدوا داو دواتریش هیچ مەیلەو چوونێكی بۆ ئەو سەفەرە (سەفەری ژۆزێفین لەگەڵ ناپلیۆن بۆ میسر) لەخۆی پیشان نەدا. ژۆزێفینیش كە ئاگاداری ڕووداوەكە بۆوە دەستی بە هەوەسبازییەكانی رابردووی كردەوەو تەنانەت دەنگۆی ئەوە بڵاوبۆوە كە سەرلەنوێ پێوەندیی بە كۆڕی دڵدارەكانی پێشووی باڕاس (سەرۆكی حكومەتی شاندی بەڕێوەبەرایەتی) گرتۆتەوە. ئەو پڕۆپاگەندانە لەمیسر بە گوێی ناپلیۆنیش گەیشتو لە گەڕانەوەی بۆ پاریس هەڵسوكەوتێكی توندو تیژ لەنێوانیاندا ڕوویداو ئەمەش بە شێوەیەك بوو كە دایكو خۆشكەكانی ناپلیۆن كە پێشەكییەكانی ئەم شەڕو ئاژاوەیان ئامادە كردبوو وایان دەزانی جیابوونەوەیان مسۆگەرە. بەڵام ژۆزێفین تەنیا لە یەك شەودا توانی تەواوی ئەو شتانەی كە

17-Nelson



بنەماڵەی ناپلیۆن بۆیان ساز كرد بوو پووچەڵ بكاتەوەو دڵی ناپلیۆن بەدەست بهێنێتەوە. ئاڵۆزی بارودۆخی فەڕانسە لەماوەی نەبوونی ناپلیۆن لەپاریس دەرفەتی بۆهەندێك ئاڵ وگۆڕی لە فەڕانسە رەخساندبوو. باو بوونی گەندەڵی لە كۆتاییەكانی حوكمڕانی شاندی بەڕێوەبەرایەتیو قەیرانی دارایی كە بەهۆی بێ سەرەو بەریی ناوخۆییو شەڕە دەرەكییەكانی فەڕانسەوە سەری هەڵدابوو، هەلومەرجی بۆ ڕوودانی شۆڕشێكی نوێ ئامادە دەكرد. ئەنجوومەنی یاسادانان كە بە ئەنجوومەنی پێنسەد كەسی ناوبانگیهەبوو، چەند ئاڵ وگۆڕییەكی لەپێكهاتەی شاندی بەڕێوەبەرایەتی ئەنجامدا. بەڵام قەیرانەكە هەردرێژەی هەبووو ناپلیۆنیش لەو هەل ومەرجە دا بوو كە بیری لە ئەنجامدانی كودتایەكی سەربازی كردەوە. ئەمجارەیان قەشە "سی یێس"[18]، ئەندامی دەسەڵاتداری حكومەتی شاندی بەڕێوەبەرایەتی بە هیوای ئەوە كە دوای كودتا دەسەڵاتەكانی حكومەت بگرێتە دەست، دەستی یەكگرتوویی بۆ ناپلیۆن درێژكردەوەو حكومەتی شاندی بەڕێوەبەرایەتی لە ڕۆژی نۆهەمی نۆڤەمبەری ساڵی ١٧٩٩ دا تێك رما. ئەنجوومەنی پێنسەد كەسی لەسەرەتادا لە ئاست ناپلیۆن بەرگری كرد بەڵام سەربازەكانی ناپلیۆن نوێنەرە بەرهەڵستكارەكانی ئەویان لەهۆڵی كۆبوونەوەكە دەركردو پاشماوەی نوێنەرەكانیتر كە زندەقیان چوو بوو، گەڵاڵەی (تەرح) پێشنیاری ناپلیۆنیان سەبارەت بەدامەزراندنی حكومەتێكی كۆنسوولی (شابەندەری) پەسند كرد. بەپێی ئەو پرۆگرامە شاندی بەڕێوەبەرایەتیی پێنج كەسی گۆڕا بۆ شاندی سێكەسیو ناپلیۆن لەپۆستی شابەندەری یەكەمدا هەوساری كاروباری دەوڵەتی بەدەستەوە گرت. قەشە سی یێس كە پێی وابوو دەبێتە سەرۆكی حكومەتی نوێ وەك شابەندەری دووهەم لە پۆستی دووهەمی حكومەتدا جێی گرت. بەڵام ناپلیۆن وەردە وەردە دەسەڵاتەكانی دەوڵەتی گرتە دەست خۆیو قەشە سییێسو ئەندامەكانیتری لە گۆڕەپانی دەسەڵات دەر كرد.

***

ناپلیۆن لە ساڵەكانی ١٧٩٩تا١٨٠٤و بەدرێژایی ئەو پێنج ساڵەی حكومەتی شابەندەری، (حكومەتیكۆنسوولی) كاردرووستایی دامەزراندنی حكومەتی رەهای دیكتاتۆری خۆی ئامادە كردو ئەنجوومەنی فەڕانسە كە بەكردەوە هیچ دەسەڵاتێكی نەمابوو لەمانگی مەی

18-Sieyes





ساڵی ١٨٠٤ دا به پەسندکردنی گەلاڵەیەك، پێشنیاری گۆڕانی ڕێژیمی کۆماریی بۆ ئیمپراتۆری خستە بەردەنگدانی گشتی. لەو راپرسییەدا **٣,٥٧٢,٣٢٩**کەس دەنگیان بەدامەزراندنی ڕێژیمی ئیمپراتۆری واتە گەڕانەوە بۆ ڕێژیمی پاشایەتی میراتگری داو تەنیا **٢٥٧٩** دەنگ بۆ مانەوەی ڕێژیمی کۆماری خسترایە ناو سندووقەکانی دەنگدان.

ناپلیۆن بۆناپارت لە ڕۆژی دووهەمی دیسەمبەری ساڵی١٨٠٤ بەناوی ئیمپراتۆری فەڕانسە تاجی لەسەرناو بەدەستی خۆشی تاجی "ئیمپراتۆریس" یان هاوسەری ئیمپراتۆری فەڕانسەی لەسەر ژۆزێفین دانا. ڕێوڕەسمی تاج لەسەرنان لە کەنیسەی "نۆتێردایم"[19]ی پاریس بەڕێوە چووو ناپلیۆن پاپیشی ناچار کرد کە لەو ڕێوڕەسمەدا بەشداری بکاتو پاپ خۆی تاجی ئیمپراتۆری فەڕانسەی لەسەرناپلیۆن داناو ڕێوڕەسمی زەماوەندی ناپلیۆنو ژۆزێفینیش کە بەپێی یاساکانی شۆڕشو بەبێ بۆنەکانی مەزهەبی ئەنجام درابوو، بە دابو ڕەسمێکی پوخت مەزهەبی دووپات بۆوە. ئەم ڕێوڕەسمە کە بە پێداگرتنی پاپ ئەنجام درابوو، پێگەو هەڵکەوتی ژۆزێفینی لە پۆستی ئیمپراتۆریسی فەڕانسە جێگیرو پتەوتر کرد. ژۆزێفین لە تەمەنی ٤١ ساڵیدا تاجی هاوسەری ئیمپراتۆری یان شاژنی فەڕانسەی لەسەرنا، بەڵام جوانیو سەرنج ڕاکێشی خۆی هەر پارستبوو. کارتێکەری ئەو لەسەر هاوسەری چ لەدەورانی شابەندەری ناپلیۆنو چ لەو ماوە پێنج ساڵەی کە شاژن بووو تەنانەت دوای ئەوەش کە بە ڕێککەوتن جیابوونەوە، کاریگەریی لەسەر بڕیارەکانی ناپلیۆن لە سیاسەتی ناوخۆییو دەرەکی فەڕانسە دادەنا. ژۆزێفین لەگەڵ ئەوەش کە خوشکەکانی ناپلیۆن ڕازی نەبوون، ئەوی ناچار کرد کە کچەکەی، هۆرتێنس لە برابچوکەکەی خۆی (لوویی ناپلیۆن) مارە بکات. لوویی ناپلیۆن دوای داگیرکردنی هۆڵندا لەژێر دەستی سەربازەکانی ناپلیۆن بوو بەپاشای هۆڵنداو هۆرتێنسیش پۆستی شاژنی هۆڵندای وەرگرت. پاشان یەکێك لە سێ کوڕەکەی لوویی ناپلیۆنو هۆرتێنس دواتر بەناوی ناپلیۆنی سێهەم بیست ساڵ لە فەڕانسە حوکمڕانی کرد.

---

19-NoterDame





**ژۆزێفین دوای ئەوەی کە تاجی ئیمپراتۆریسی فەڕانسەی لەسەرنا**

کوڕی دووهەمی ژۆزێفین کە لەساڵی ١٧٩٦دا لەگەڵ ناپلیۆن لەشەڕەکانی بەرەی ئیتالیاو میسر بەشداری کرد بوو، دوای زەماوەندی ناپلیۆنو ژۆزێفین لەساڵی ١٨٠٥ لەلایەن ناپلیۆنەوە نازناوی "پرێنس"ی وەرگرتو بوو بەفەرماندەری ئیتالیا. ئۆژێن لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی وەك جێگری پاشاو فەرمانڕەوایی لە ئیتالیا، لێهاتوویی و کارامەییەکی زۆری لەخۆی نیشان دا. ئۆژێن دوای تەواوبوونی ئەرکە پێ سپێردراوەکانی لە ئیتالیا، لەپلەی ژێنراڵیدا لەپەنا ناپلیۆن لە شەڕگەلێکی جۆراوجۆر بەشداری کردو یەکێ لەو کەسانەبوو کە لەگەڵ ناپلیۆن تا مۆسکۆ ڕۆیشتە پێشێ. گەورەترین خاڵی لاوازی ژۆزێفین لە ئاست بنەماڵەی ناپلیۆنو ئەو کەسانەی کە ئیرەییان پێدەبرد ئەوە بوو کە نەیدەتوانی منداڵێکی لە ناپلیۆن هەبێ. ئەو نەزۆکی‌یە بەتایبەت دوای ئەوە کە ناپلیۆن بە پۆستی ئیمپراتۆری گەیشتو بابەتی جێنشینی ئەو زەق بۆوە گرینگییەکی پتری پەیدا کرد. ژۆزێفین لەبەرئەوەی کە دوومنداڵی لەهاوسەری پێشوی هەبوو خۆی بە نەزۆك نەدەزانیو تۆمەتی نەزۆکیی دەخستە پاڵ ناپلیۆنو زانستی پزیشکیش لەو کاتەدا ئەوەندە پێشکەوتوو نەبوو ئەو بابەتە بسەلمێنێ. ژۆزێفین تەنانەت بیرەی ئەوەی لە مێشکی ناپلیۆن ڕۆکرد بوو کە ئۆژێن وەك جێنشینی خۆی هەڵبژێرێ. بەڵام ناپلیۆن وێرای دان پێدانان بە توانایی و لێهاتوویی ئۆژێن، لەبەر هەبوونی چەند براو برازا ئەو داواکارییەی ژۆزێفینی ڕەد کردەوە. دووکەس لە دڵدارەکانی ناپلیۆن وتیان کە منداڵێکیان لە





ناپلیۆن بووە بەلاّم ناپلیۆن کە لە پێوەندی ئەوان لەگەڵ پیاوانی‌تر دڵگرمیّ بوو، ئەو داواکارییەی ئەوانی بە دەسەلاّتخوازی‌و ئامانجی داگیرکردنی تاج‌و تەختی فەڕانسە لێك داوەو لەرەوتی شەڕی داگیرکردنی لەهێستان (پۆڵندا) ئاشقی کۆنتێکی لەهێستانی بەناوی "ماری والۆسکا"[٢٠] بوو. ماری والۆسکا بە سانایی ملکەچی ئەشقی ناپلیۆن نەبوو بەلاّم ئەم بەرگری‌و زوو خۆبەدەستەوە نەدانەی ماری والۆسکا کە راکێشانێکی بەهێزی لەگەڵ بوو، ناپلیۆنی زۆر بە توندی هۆگری ئەو کرد. بە جۆرێك کە ناپلیۆن دیسان دەستی بە نووسینی نامەی ئاشقانەو پرسۆز کردەوە. ناوەڕۆکی ئەو نامانەی بۆ ماری والۆسکای نووسیبووو ئێستا لەبەردەستدایە کەم‌و زۆر هەمان ناوەڕۆکی ئەو نامەگەلەی هەیە کە لەسەرەتای ئاشناییی‌و زەماوەندی لەگەڵ ژۆزێفین نووسیبووی. ئەو نامە پڕسۆزانەو پێداگرتن‌و سووربوونی ناپلیۆن لەم ئەشقە لەئاکامدا کاریگەری دەبێت‌و لەنێوانیاندا پێوەندی ئاشقانە دروست دەبێت. ناپلیۆن دوای گەڕانەوە لە "ڤۆرشۆ"ش ئەڤیندارەکەی لە بیر نەکردو دوای سەرکەوتنە مەزنەکەی لە شەڕی "واگرام"[٢١] لە ساڵی ١٨٠٩ و لەکاتی وتووێژ لەگەڵ ئۆتریشیەکان لەڤیەن، نامەیەکی بۆ ماری والۆسکا نووسی‌و ئەوی بانگهێشت کرد. ماری ئەو بانگهێشتەی قەبووڵ کردو لە ڤیەن بە ناپلیۆنی گوت کە دووگیانەو منداڵەکەیان لەسەرەتاکانی مانگی مەی ساڵی ١٨١٠ لە دایك دەبیّ.

شادی‌و کەیفخۆشی ناپلیۆن لە بیستنی ئەو هەواڵە کەمتر لە دەماخی شادی دوای سەرکەوتنی لە شەڕەکانی "ئۆستێرلیتز"[٢٢] و "واگرام" نەبوو. ناپلیۆن ئیتر گومانی نەبوو کە ئەو منداڵە هی خۆیەتی‌و لەوە کە دەیتوانی ببێتە باوك زۆر خۆشحاڵ بوو بە شێوەیەك کە شایی لە دڵدا دەگەڕا. بە فەرمانی ناپلیۆن ماری والۆسکایان خستە ژێر چاوەدێری تایبەت بۆ ئەوەی نەوەك ئەو منداڵە تووشی مەترسی بێت. هەر لەو رۆژانەدا بوو کە ناپلیۆن بڕیاریدا ژۆزێفین تەلاّق بداو لەگەڵ ماری زەماوەند بکات. ناپلیۆن لە رۆژی سێهەمی نۆڤەمبەرداو دوای گەڕانەوەی بۆ پاریس ئەو بڕیارەی لەگەڵ ژۆزێفین باس کرد.

---

20-Marie Walewska
21-Wagram
22-Austerlit





**ماری والۆسکای ئەڤینداری لەهێستانیی ناپلیۆن کەمنداڵێکی لە ناپلیۆن بوو. ئەم تابلۆیە بەرهەمی شێوەکاری بەناوبانگی (ژرار- ژۆسی) ئەو کاتەیە**

بەسەرهاتێك لە ژیاننامەی ناپلیۆن کە لە زمانی خۆی گێڕدراوەتەوە ئەوەیە کە ناپلیۆن لە شەوی سێهەمی نۆڤەمبەرداو دوای خواردنی نانی شەو لە کۆشکی تۆیلێری کە ژمارەیەك لەلایەنگرانی ئیمپراتۆریشی لیّ بوو، لە جێگەیەکی چۆڵ لەگەڵ ژۆزێفین دانیشتبووو دەستەکانی ئەوی بە دڵسۆزی‌و خۆشەویستییەوە لەناو دەستی گرتبووو پێی‌دەڵێت: "ئازیزم تۆ باش دەزانی کە چەندەم خۆش دەوێی.. باشترین خۆشییەکان‌و شیرینترین کاتەکانی ژیانم بەهۆی تۆوە بووە، بەلاّم هەمووکات ئەو شتەی کە چارەنووس بۆی دیاری کردووم لەگەڵ ویست‌و ئاواتە دەروونی‌یەکانم یەك ناگرێتەوە. من ناچارم ئەشق‌و سۆزی خۆم لە پێناو بەرژەوەندییەکانی فەڕانسەو بەردەوام بوونی ئێمپراتۆریەتی مەزنی فەڕانسە دابنێم.." پێش ئەوەی ناپلیۆن کۆتایی بە قسەکانی بێنێت، ئەسرین لە چاوەکانی ژۆزێفین دێتە خواریّ‌و کەمێك دواتر دەکەوێتە سەر زەوی.. ناپلیۆن کە حەپەسا بوو داوای یارمەتی لە هاورێکانی دەکات‌و دەڵێت خێرا هۆرتێنس (کچی ژۆزێفین) کە لەو کاتەدا لە پاریس بوو، ئاگاداربکەنەوە. کاتێك کە هۆرتێنس دەگاتە لای دایکی، ژۆزێفین هاتبۆوە هۆش بەلاّم زۆر بە توندی دەگریا. ناپلیۆن بە هۆرتێنسی گوت: "بە دایکت بڵیّ من بڕیاری خۆم داوە. ئەو بڕیارەم لەبەر بەرژەوەندییەکانی فەڕانسە داوەو فرمێسکەکانی ئەو بڕیاری من ناگۆڕێت". هۆرتنێس بە ئاوازێکی ساردو وەشك





ولاّمی داوە: "من لەو قسانەی تۆ سەرم سووڕدەمێنێ... بۆ دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بی دایکم دوای ١٥ساڵ ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵ تۆ لە بەر ئەم بڕیارە لەنەکاوەی تۆ نەگری... بەلاّم دڵنیابە گریانی ئەو هێمای ملکەچ بوونی لەبەرامبەر تۆ نییە. ئێمە لێرە دەڕۆینو هەرگیز خۆشەویستیو دڵسۆزییەکانت سەبارەت بە خۆمان لە بیرناکەین ..."

ناپلیۆن لە قسەکانی هۆرتێنس شەرمەزار بۆوەو لە کاتێکدا کە دەیهەویست ژۆزێفین هێمن کاتەوە گوتی کە تەواوی کەرستەو پێداویستییەکانی ژیانێکی تێرو حەساوەی بۆ دابین دەکەمو بەردەوام سەردانی دەکەم. ناپلیۆن بۆ نیشتەجێ بوونو مانەوەی ژۆزێفین، شاری ڕۆمای دیاری کرد بوو، بەلاّم ژۆزێفین بە گریانەوە گوتی:"نا"من ئامادە نیم لە فەڕانسە بچمە دەرێو تەنانەت لە پاریسیش دوور ناکەومەوە... من ناتوانم لە تۆ دوور کەومەوە..."

لە ئاکامدا ڕۆژی یازدەهەمی دێسەمبەری ساڵی ١٨٠٩دا بڕیاری جیابوونەوەی ناپلیۆنو ژۆزێفین لە دوو ڕاگەیاندراوی جیا دا بەئامادەبوونی ئەندامانی پایە بەرزی ئێمپراتۆریو بنەماڵەکەیان خوێندرایەوە. ناپلیۆن لە ڕاگەیاندراوێکدا کە خۆی خوێندییەوە وتی: "خوادەزانێ ڕاگەیاندنی بڕیارێکی ئاوا بەژان تاج ڕادەیەك لەسەر دڵم گرانە... من بەرزترینو بەرێزترین ئەشقو ئازیزترین هەستو سۆزی خۆم فیدای بەرژەوەندییەکانی فەڕانسە دەکەم، بەلاّم هۆگریو خۆشەویستی من سەبارەت بە هاوسەری خۆشەویستم کە پازدە ساڵ ژیانی منی بە دڵسۆزییەکانی خۆی شیرینو ڕازاوە کرد، هەمیشەییو ئەبەدیە. یادو ئەشقی ئەو هەمیشە لەدلمدا زیندووە... ئەگەر چی لەمەوبەدوا هاوسەری من نییە بەلاّم بۆ هەمیشە باشترینو ئازیزترین ڕفیقو هاوالّی من دەبێت." دوای ناپلیۆن نۆبەی ژۆزێفین بوو کە ڕاگەیاندراوەکەی بخوێنێتەوە، بەلاّم بەهۆی کینەو بووغزەوە ڕاگەیاندراوەکەی خۆی دا بە سەرۆکی ئاهەنگو بۆنەگێڕی ئێمپراتۆری کە لە تەنیشتی ڕاوەستا بوو تا بیخوێنێتەوە. لەو ڕاگەیاندراوەدا هاتبوو: "لەسەر مۆڵەتی هاوسەری ئازیزو بەرێزم ڕادەگەیێنم کە ئیتر هیوام نەماوە منداڵێك بۆ هاوسەرم بە دنیا بێنمو مانەوەو بەردەوام بوونی ئەم ئێمپراتۆریەتەش لە بەرژەوەندی فەڕانسە دایە و هەر بۆیەش بۆ دەربڕینی ئەوپەڕی خۆشەویستیو هۆگریم بۆ هاوسەرمو پیشاندانی ئەمەگناسیم بۆ گەلی فەڕانسە ئەو لەمپەرەی کە  لەسەر ڕێگای بەردەوام بوونی ئێمپراتۆری لە بنەماڵەی ئەم پیاوە مەزنەدا هەیە، بە هەلّوەشاندنەوەی ئەم زەماوەندە  لەسەر ڕێگا لادەبەم...



من ئەوپەڕی سپاسو ئەمەگناسی خۆم سەبارەت بە هاوسەرم کە بەدەستی خۆی تاجی لەسەرنامو منی  لەسەر تەختی دەسەلاّت داناو سەبارەت بە گەلی فەڕانسەش کە سەبارەت بە من خۆشەویستیو دڵسۆزییان هەبووە دەردەبڕمو جەختی لەسەر دەکەمەوە کە هەلّوەشاندنەوەی پەیمانی هاوسەرێتی ئێمە بە هیچ جۆرێك لە خۆشەویستیو هەستی قووڵی من سەبارەت بە ئێمپراتۆر کەم ناکاتەوەو هەروەها ئەو یەکێك لە خۆشەویسترین کەسانی من دەبێت..



**پۆستکارتێکی ناوداری ناپلیۆن کە لە نێو برازاو خوشکەزاکانی دانیشتووە. ئەو منداڵەی کە لەسەر ئەژنۆی ناپلیۆن دانیشتووە نەوەی ژۆزێفینو ناپلیۆنی سێهەمی داهاتووە**

... من نازانم ئەم بڕیارە کە بە تێبینی سیاسی پەسندکراوە تاج ڕادەیەك دڵی ناپلیۆن وەژان دەهێنێ، بەلاّم ئێمە شانازی دەکەین کە ئەشق وخۆشەویستی خۆمان لە پێناو بەرژەوەندیو قازانجەکانی گەلی فەڕانسەو نیشتمانەکەمان دادەنێین". ناپلیۆن هەروەك بەڵێنی دابوو خانوویەکی بە شکۆی لە "مالمایسۆن"[٢٣] لە دەوروبەری پاریس بۆ ژۆزێفین تەرخان کردو پارەیەکی بەرچاوی بۆ دابینکردنی خەرجییەکانی ژیانی ئەو دیاری کرد. ژۆزێفین دوای جیا بوونەوە لە ناپلیۆن خۆشەویستی زیاتری بەراورد لەگەڵ سەردەمی شاژنی خۆی، لەنێوان فەڕانسەوییەکان بەدەست هێنا. ماڵی ئەو جێگەی هات وچۆی گەورە پیاوانو نووسەرانو هونەرمەندانی فەڕانسە بوو. ناپلیۆنیش بەردەوام سەردانی دەکردو سەبارەت بە منداڵەکانی وەکوو ڕابردوو دڵسۆز بوو. بەلاّم ناپلیۆن دوای تەلاّقدانی ژۆزێفین سەبارەت بە ئەشقی ماری والۆسکاش وەفادار نەماو لەژێرکاریگەری دۆستانو لایەنگرەکانی زەماوەندێکی سیاسیی کرد.

23-M alm aison





ناپلیۆن دوای ژۆزێفین زەماوەندی لەگەڵ کچی پاشای ئۆتریش بەناوی پرەنسێس "ماری لۆئیز"[٢٤] کرد. ماری لۆئیز دواتر کوڕێکی لە ناپلیۆن بوو، بەڵام تەمەنی ئیمپراتۆریەتی ئەویش (ناپلیۆن) بەهۆی تێکشکانی هێزەکانی فەڕانسە لە شەڕی بێ ئاکامو چارەنووس سازی رووسیاو شکستە یەك لەدوای یەکەکانی فەڕانسە لە ساڵەکانی ١٨١٣و ١٨١٤ تەواو بووو ئەو کوڕەی کە لەمێژوودا بەناوی ناپلیۆنی دووهەم ناوبانگی هەیە هەرگیز بە دەسەڵات نەگەیشت[٢٥].

ماری لۆئیز پاش گەڕانەوە بۆ ڤیەن لە ئاپریلی ساڵی ١٨١٤داو دوای لەسەرکار لاچوونی ناپلیۆن لە پۆستی ئێمپراتۆریو دوورخستنەوەی بۆ دوورگەی "ئێلێب" ئامادە نەبوو سەردانی هاوسەرەکەی لەو دوورگەیە بکات، بەڵام ماری والۆسکا لەگەڵ کوڕەکەی کەمنداڵی ناپلیۆن بوو سەردانی ناپلیۆنی لەو دوورگەیە کرد. کوڕەکەی ماری والۆسکا کە ناوبانگی بنەماڵەیی دایکی (والۆسکی) هەبوو، دواتر بوو بە دانیشتووی فەڕانسەو لەکاتی حکوومەتی ناپلیۆنی سێهەم بە پۆستی وەزیری کاروباری دەرەوەو سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی فەڕانسە گەیشت.

ژۆزێفین دوای ئەوە کە ناپلیۆن دەسەڵاتی لەدەست دا، هەر رێزو خۆشەویستییەکی زۆری هەبووو دەسەڵاتدارانی وڵاتە سەرکەوتووەکانو رێژیمی پاشایەتی نوێی فەڕانسەش هەر سەردانیان دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا داواکاری ژۆزێفین سەبارەت بەسەفەر بۆ دوورگەی ئێلێبو ژوانی هاوسەری پێشووی قەبووڵ نەکراو ژۆزێفین لە رۆژی ٢٩ی مەی ساڵی ١٨١٤ لەتەمەنی پەنجاویەك ساڵیدا مردو دەسەڵاتدارانی رێژیمی نوێو وڵاتە سەرکەوتووەکان لە رێورەسمی بە خاك سپاردنی ئەودا بەشدارییان کرد. ئامادەبوونی دەیان هەزارکەس لەخەڵکی پاریس لەو رێورەسمەدا نیشانەی رێزێکی زۆر بوو کە گەلی پاریس بۆ ژۆزێفینیان دادەنا. ناپلیۆن دوومانگ دوای مردنی ژۆزێفین لە تاراوگەکەی خۆی لەدوورگەی ئێلێب هەڵات و دووبارە حکوومەتی گرتەوە دەست و دواتر، رۆیشتە سەر گۆڕی ژۆزێفینو بە قسەگەلێك کە لەقووڵایی هەستو

24-Marie-Louise

٢٥- کوڕی ناپلیۆنو ماری لۆئیز کە لەساڵی ١٨١١ لەکاتی لەدایکبوونیدا وەك پاشای رۆما ناسێندراو دوای شکستو دوورخرانەوەی ناپلیۆن لەساڵی ١٨١٤ لەگەڵ دایکی رۆیشت بۆ ڤیەنو هەرگیز نەگەڕایەوە بۆ فەڕانسەو لەتەمەنی ٢١ ساڵیدا بە نەخۆشی سیل مرد.



سۆزییەوە سەبارەت بە ژنێك کە وەك تەنیا ئەشقی مەزنی ژیانی ناوی دەبرد سەرچاوەی گرتبوو، یادو بیرەوەری ژۆزێفینی بەرز نرخاند.



**مەلیکە ماری لوئیزو تابلۆیەکی بەناوبانگ کە ناپلیۆنو منداڵەکانی نیشاندەدات**

بەڵام حکوومەتی نوێی ناپلیۆن کە بە"حکوومەتی سەد رۆژە" بەناوبانگە، بە تێکشکانی هێزەکانی ناپلیۆن لە شەڕ لەگەڵ هێزە هاوپەیمانەکانی بریتانیاو پێروس لە "واتێرلۆ"[٢٦] رووخا. ناپلیۆن ئەم جارەیان خۆی تەسلیمی دڵڕەقترین دووژمنی خۆی واتە بریتانیا کرد. بریتانییەکانیش ئەویان بۆ دوورگەی دوورە دەستی "ساینت هێلێن"[٢٧] لەباشووری زەریای ئەتڵەس دوورخستەوە. ناپلیۆن شەش ساڵ لەو دوورگەیە مایەوەو دوای نەخۆشییەکی درێژخایەن لە رۆژی پێنجەمی مەی ساڵی ١٨٢١ لەتەمەنی ٥٢ ساڵیدا مرد.

26-Waterloo
27-Sanit- Helena





# ژنێك كە نزیكەی شەست و چوار ساڵ لە بریتانیا حوكمڕانی كرد و ئیمپراتۆریەتی بریتانیای گەیاندە ئەو پەڕی هێزو گەورەیی خۆی

مەلیكە ڤیكتۆریا بەناوبانگترین ژنە كە لە مێژووی بریتانیا بە دەسەڵات گەیشتووەو بەراورد لەگەڵ تەواوی پاشاكانی بریتانیا چ ژنو چ پیاو لە هەموویان پتر لەسەر رەوتی مێژووی بریتانیا شوێنپنجەی داناوە. هەروەها ئەو درێژترین دەورانی پاشایەتی یان شاژنیی بریتانیای لە دەستدا بووەو سەردەمی ٦٤ساڵەی دەسەڵاتی ئەو كە بەسەردەمی ڤیكتۆریا ناوبانگی هەیە بە درەوشاوەترین دەورەی مێژووی ئێمپراتۆریەتی بریتانیا دەژمێردێت. مەلیكە ڤیكتۆریا كە ناوی تەواوی ئەو "ئەلێكساندرینا ڤیكتۆریا"[1]یە لەساڵی ١٨١٩ لە لەندەن لەدایك بوو. ناوی باوكی "ئێدوارد دووك ئاف كێنت"[2]ە كە كوڕی چوارەمی جۆرجی سێهەمی پاشای بریتانیا بوو. ماڵباتی ڤیكتۆریا بەهۆی هەڵەخەرجیو گیرو گرفتی دارایی دووكی كێنت، لەدۆخێكی باشدا نەبوونو باوكی ڤیكتۆریا لەساڵی١٨٢٠ قەرزێكی زۆری بۆ بنەماڵەكەی بە جێهێشت. ڤیكتۆریا لەكاتی مردنی بابی منداڵێكی یەك ساڵە بوو و كەوتە ژێر چاوەدێریو سەرپەرشتی مامی (جۆرجی چوارەم) كە دوای جۆرجی سێهەم لەسەر تەختی ئێمپراتۆری بریتانیا دانیشتبوو. ڤیكتۆریا لەسەرەتای لەدایكبوونیدا بە میراتگری تاجو تەختی بریتانیا دەژمێردرا، لەبەرئەوەی جۆرجی چوارەم دوای مردنی كچەكەی (شارلۆت) ئیتر میراتگرێكی نەبووو كوڕی دووهەمی جۆرجی سێهەم بەناوی فریدریك لەساڵی ١٨٠٢ مرد بووو كوڕی سێهەمیشی بەناوی ویلیام كە جێنشینی جۆرجی چوارەم بەئەژمار دەهات نەزۆك بوو. باوكی ڤیكتۆریا لە دڵدارە فەڕانسەییەكەی بەناوی مادام دێساینت لۆرێن[3] چەند منداڵی هەبوو كە نەیاندەتوانی داوای تاجو تەختی بریتانیا بكەن. دووكی كێنت لەساڵی ١٨١٨و لەتەمەنی پەنجا ساڵیدا لەگەڵ پرەنسیسێكی ئەڵمانی بەناوی ڤیكتۆریا ماریا لوییز[4] كە بێوەژنێكی سیدوو

1-Alexandrina victoria

2-Edward Duke of Kent

3-Madame de saint-Laurent

4-Victoria Maria Louisa



ساڵان بوو، زەماوەندی كردو ڤیكتۆریاش لەو دایكە ئەڵمانییە بوو كە لەساڵی ١٨١٩ دا، واتە ساڵێك بەر لە مردنی باوكی هاتە سەر دونیا. ڤیكتۆریاو دایكی كە بە نازناوی "دووشیزی كێنت"[5] ناوبانگی هەبوو، دوای مردنی دووكی كێنت بۆ كۆشكی "كێنزینگتۆن"[6] گوازرانەوەو بەشێك لە كۆشكەكە بۆ نیشتەجێ بوونی ئەوانو هاورێكانی تەرخان كرا. مەلیكە ڤیكتۆریا كە لەتەمەنی سێزدە ساڵیدا دەستی بە نووسینی بیرەوەرییەكانی ژیانی رۆژانەی كرد، لەپێشەكی ئەم بیرەوەرییانەدا بە ناخۆشیو تاڵی باس لەسەردەمی منداڵی خۆی دەكاتو دەنووسێ: لە كۆشكی پاشایەتی لە هەموو یارییەكانی منداڵان بێ بەش بووم و بە بێ ئیزن نەمدەتوانی لە ژوورەكەم بچمە دەرێ. مەلیكە ڤیكتۆریا بەتایبەت بە خراپە باسی "سێرجان كۆنرۆی"[7] دەكات كە یەكێك لەدۆستە نێزیكەكانی باوكی بووەو دووكی كێنت پێش مرن ئەوی وەك چاوەدێرو سەرپەرشتی بنەماڵەكەی هەڵبژارد بوو. مەلیكە ڤیكتۆریا لە یاداشتەكانی خۆیدا ئاماژە بە پێوەندییە نهێنییەكانی دایكیو سێرجان كۆنرۆی ناكات، بەڵام سەرچاوە باوەڕ پێكراوە مێژووییەكان بۆ وێنە ژیاننامەی تەواوی مەلیكە ڤیكتۆریا كە بە كەڵك وەرگرتن لەهەموو بەڵگە مێژووییەكانی ژیانی ئەو نوسراوەتەوەو لەساڵی ١٩٢٤ لە لەندەن چاپ كراوە، بەراشكاوی ئاماژە بەوە كراوە كە سێرجان كۆنرۆی لەگەڵ دووشیزی كێنت پێوەندی ئاشقانەی هەبووەو رقو كینەی مەلیكە ڤیكتۆریاش سەبارەت بەو پتر بەهۆی ئەم بابەتە بووە[8]. هەڵسوكەوتی سێرجان كۆنرۆی بەدڵی جۆرجی چوارەمو لایەنگرانی ئەو نەبووو هەربەم هۆیەشەوە هەندێك شەڕو ناكۆكی لەنێوان دایكیو مامی رووی داوە كە مەلیكە ڤیكتۆریا لە بیرەوەرییەكانیدا ئاماژەی پێكردووە. ئەو ناكۆكییانە دوای مردنی جۆرجی چوارەم لەساڵی١٨٣٠و دوای هاتنە سەركاری مامێكیتری ڤیكتۆریا بەناوی ویلیامی چوارەم توندو تیژتر بوو. مەلیكە ڤیكتۆریا خۆی شایەتی هەندێك جنێوو دەمەتەقێی دایكیو مامی بووە كە بە تاڵی لە یاداشتەكانیدا باسی دەكات. دەنگۆی پیلانی دزین یان دەرمانداو كردنی ڤیكتۆریا كە لە دەورانی دەسەڵاتی كورتی ویلیامی چوارەم لەلایەن سێرجان كۆنرۆیەوە بڵاو بووەو ناخۆشییەكی زۆر خستە نێوان دایكو مامی، یەكێك لە ناخۆشترینو تاڵترین بیرەوەرییەكانی

5-Duchess of kent

6-Kensington

7-Sir john Conroy

8-Victoria R .I. Elizabeth Longford. Pan Books.

سەردەمی منداڵی ئەوە. هەروەها کۆنرۆی مامێکی‌تری ڤیکتۆریای بەناوی "ئارنێست، دووکی کۆمبێرلەند"[9] کە کوڕی پێنجەمی جۆرجی سێهەمو برابچووکی باوکی ڤیکتۆریا بوو، بەوە تۆمەتبار کردبوو کە ئەم پیلانە ئەو دای ڕشتووە تا بە لابردنی ڤیکتۆریا خۆی بە دەسەڵات بگات. بە گشتی ئەو دەنگۆیە هەر لە بنەڕەتدا درۆ بووو ئامانجی سێرجان کۆنرۆی لە بلاّوە پێکردنی ئەو دەنگۆیە جگە لە شەڕو ناکۆکی لەگەڵ دووکی کۆمبێرلەند، ئەوە بوو کە بە بیانووی پارێزگاری لە ڤیکتۆریا پتر ئەو بخاتە ژێر چاوەدێریو کۆنترۆڵی خۆی. ڤیکتۆریا بەو رادەیەی کە رقی لە سێرجان کۆنرۆی بوو، بە هەمان رادەش خزمەتکارە ئەڵمانی‌یەکەی خۆی بەناوی "بارۆنز لیزێن"[10] خۆش دەویست. لیزێن زمانەکانی ئەڵمانیو فەڕانسەویو مووسیقاو سەمای فێری ڤیکتۆریا کردو سەمای جوانی "بالێتی" ئەو لەکۆڕی جێژنێك کە بە بۆنەی یازدەهەمین ساڵرۆژی لەدایکبوونی پێکهێندرا بوو، سەر سووڕمانو سەرنجی بەشداربووانی بۆ لای خۆی راکێشا. ڤیکتۆریا دوای تەمەنی یازدە ساڵی دەستی بە هەندێك سەفەرو گەڕان بۆ بەشە جیاجیاکانی بریتانیا کردو پێش ئەوەی ببێتە پاشا، زۆربەی بەشە جۆراوجۆرەکانی بریتانیای بەسەر کردبۆوەو شارەزا ببوو. ویلیامی چوارەم لە رۆژی بیستەمی ژووەنی ساڵی ١٨٣٧ مردو پرنسێس ڤیکتۆریا لەتەمەنی ١٨ ساڵیدا بوو بە شاژنی بریتانیا. لەسەرەتای دەسەڵاتی مەلیکە ڤیکتۆریا دوو حیزبی سیاسیی سەرەکی لە بریتانیادا هەبوو کە ناوی یەکەمیان حیزبی "ویگ"[11] و دووهەمیشیان حیزبی "تۆری"[12] بوو و دواتر یەکەمیان بەناوی حیزبی لیبراڵو دووهەمیشیان بەناوی حیزبی پارێزگاران (محافزەکاران) ناوبانگیان دەرکرد. لەسەرەتای دەسەڵاتی مەلیکە ڤیکتۆریا، "لۆرد مێلبۆرن"[13]ئەندامی حیزبی ویگو سەرۆك وەزیرانی بریتانیا بوو کە سێ ساڵ دوای دانیشتنی مەلیکە ڤیکتۆریا لەسەرکار مایەوەو هاریکاری شاژنی گەنجی کرد لە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانەی کە هێشتا لێی شارەزا نەبوو. شاژنی گەنج متمانەیەکی زۆری بە لۆرد مێلبۆرن دەکردو پێوەندییەکانی ئەوان ئەوەندە دۆستانە بوو کە ژمارەیەك لە ئەندامانی حیزبی تۆری شاژنیان بە شکاندنی یاسای بێلایەنی

9-Ernest Duke of Cumberland
10-Baroness Lehzen
11-Whig
12-Tory
13-Lord Melbourne



لەپۆستی دەسەڵاتو لایەنگری لە حیزبی ویگ تۆمەتبار کرد. مەلیکە ڤیکتۆریا لە کاتێکدا کە تەنیا بیست ساڵی تەمەن بوو لەگەڵ یەکەمین قەیرانی سەردەمی دەسەڵاتی خۆی رووبەروو بۆوەو بە متمانەو ورەیەکی کەم وێنەوە کە هیچکەس لە کچێکی‌بیست ساڵەی رانەدەدی، بەرنگاری ئەو قەیرانە بۆوەو زاڵ بوو بەسەری دا.



**تابلۆیەکی بەناوبانگی مەلیکە ڤیکتۆریا لەو کاتەی کە لەسەر تەختی دەسەڵات دادەنیشێ**

قەیرانەکە لە نێوکۆشکی مەلیکەوە دەستی پێکرد، ئەمەش لەو کاتەدا بوو کە دەنگۆی سك پڕی "لیدی‌فلۆرا هاستینگز"[14]ی خزمەتکاری دایکی ڤیکتۆریا لە سێرجان کۆنرۆی بلاّو بۆوە. ئەم دەنگۆیە کە دواتر وەدەرکەوت درۆ بوو، هاتو هاوارێکی زۆری لە بریتانیا وەرێخست، لەبەرئەوەی کە پێشتریش دەنگۆگەلێگ سەبارەت بە پێوەندی سێرجان کۆنرۆیو دووشیزی کێنت (دایکی‌شاژن)و پرەنسێس سۆفیا (ئاخرین کچی جۆرجی سێهەمو مامی شاژن) بلاّو ببۆوە.



**سێرجان کۆنرۆیو لیدی فلۆرا کە رووداوی ئەوان ئاژاوەو هاتو هاوارێکی زۆری لەسەرەتای پاشایەتی ڤیکتۆریا وەرێخست**

14-Flora Hastings

لۆرد مێلبۆرن كه له دوای ئه‌و رووداوه له‌گه‌ڵ ره‌خنه‌ی توندو تیژی په‌رله‌مان رووبه‌روو بۆوه‌، وازی له‌پۆستی سه‌رۆك وه‌زیرانی هینا. مه‌لیكه ڤیكتۆریا كه لۆرد مێلبۆرنی به دۆستو یاوه‌ری سه‌ره‌كی خۆی ده‌زانی، به داخ‌و كه‌سه‌رێكی زۆره‌وه‌و له كاتێدا كه فرمێسك به سه‌ر گۆناكانی‌یه‌وه ده‌هاته خوارێ چاوپێكه‌وتنی له‌گه‌ڵ ئه‌نجامداو به رێنوێنی‌و راسپارده‌یی خودی مێلبۆرن، ركه‌به‌ری ئه‌وی به‌ناوی "سێر رۆبێرت پیل"[15] كه رێبه‌ری حیزبی پارێزگاران بوو راسپارد تا كابینه‌ی حكوومه‌ت (ئه‌نجوومه‌نی وه‌زیران) پێك بهێنێت. سێر رۆبێرت بۆ پێكهێنانی ئه‌نجوومه‌نی وه‌زیران مه‌رج گه‌لێكی خسته‌روو و ڤیكتۆریا هه‌موویانی په‌سند كرد. به‌لاَم كاتێك كه پیل دوایین مه‌رجی خۆی سه‌باره‌ت به ته‌رخان كردنی خزمه‌تكاری نوێ بۆ مه‌لیكه‌و دایكی راگه‌یاند، شاژن له ئاست ئه‌و مه‌رجه خۆڕاگری كردو ولاَمی كۆتایی ئه‌و مه‌رجه‌ی خسته رۆژی دواتر. مه‌لیكه ڤیكتۆریا دوای كۆتایی هاتنی یه‌كه‌مین دیمانه‌كه‌ی له‌گه‌ڵ پیل، ره‌وتی دانووساندنه‌كه‌ی بۆ لۆرد مێلبۆرن گێراوه‌و سه‌باره‌ت به ولاَمی كۆتایی پێشنیاره‌كه‌ی پیل راوێژی له‌گه‌ڵ كرد. لۆرد مێلبۆرن هانی ڤیكتۆریای دا كه ئه‌و پێشنیاره قه‌بوول نه‌كات‌و گوتی نابێت ئیزن به سه‌رۆك وه‌زیران بدات ده‌ست له كاروباری ناوخۆی كۆشك وه‌ردات. مه‌لیكه ڤیكتۆریاش ئه‌و راسپارده‌یه‌ی سه‌رۆك وه‌زیرانی پێشوی جێبه‌جێ‌كردو پیلیش له پێكهێنای ئه‌نجوومه‌نی وه‌زیران خۆی پاراست. مه‌لیكه ڤیكتۆریا دیسان ئه‌ركی پێكهێنانی ئه‌نجوومه‌نی وه‌زیرانی به مێلبۆرن ئه‌سپاردو ئه‌ویش به پالپشتی مه‌لیكه درێژه‌ی به ده‌سه‌لاَتی خۆی دا. بوێری شاژنی گه‌نج له رووبه‌روو بوونه‌وه‌ی سیاسه‌توانی كۆنه‌كاری وه‌ك سێر رۆبێرت پیل پێگه‌و متمانه‌یه‌كی نوێی پی‌به‌خشی، به‌لاَم پێداگری ڤیكتۆریا له‌پشتیوانی كردنی لایه‌نگرانو دارو ده‌سته‌كه‌ی خۆی كه له‌ناو خه‌ڵكدا ناوبانگی باشیان نه‌بوو، پێگه‌و متمانه‌ی ئه‌وی به‌رته‌سك كرده‌وه‌و بزاڤی "چارتیسم"[16] هه‌ر له‌و كاته‌وه سه‌ری هه‌ڵدا كه ئامانجه‌كانی بریتی بوون له ته‌سك كردنه‌وه‌ی ده‌سه‌لاَته‌كانی پاشا یان شاژن له هه‌ڵبژاردنی سه‌رۆكی حكوومه‌تو ئه‌سپاردنی ئه‌و ده‌سه‌لاَته به په‌رله‌مانو زۆر كردنی رۆڵی په‌رله‌مان له به‌ڕێوبردنی كاروباری حكوومه‌تو دووباره پێدا چوونه‌وه له‌چۆنیه‌تی هه‌ڵبژاردنی نوێنه‌رانی په‌رله‌مان. لۆرد مێلبۆرن بۆ چاره‌سه‌ر كردنی ئه‌و گرفته كه داوێنگیری شاژن ببۆوه‌، سه‌ره‌تا هۆكاره‌كانی له‌سه‌ركار لابردنی سێرجان كۆنرۆی له‌ده‌ربار ئاماده كردو دواییش بیری له په‌یداكردنی هاوسه‌رێكی گونجاو بۆ مه‌لیكه ڤیكتۆریا كرده‌وه‌، له‌به‌رئه‌وه‌ی كه

15-Sir Robert peel
16-Chartism



زه‌ماوه‌ندی شاژن له‌گه‌ڵ پیاوێكی شایان ده‌یتوانی زۆربه‌ی ئه‌و گیرو گرفتانه چاره‌سه‌ر بكات. مێلبۆرن به به‌ڵێنیی پێدانی پله‌ی لۆردی به سێرجان كۆنرۆی ئه‌وی رازی كرد واز له ده‌ربار بهێنێت، به‌لاَم ئه‌و به‌ڵێنه به‌هۆی گه‌نده‌ڵكاری‌و چه‌وت كه‌ڵك وه‌رگرتن‌و دزییه‌كانی ئه‌و له‌ماوه‌ی خزمه‌تی وه‌ك چاوه‌دێری كاروباری دارایی دایكی مه‌لیكه جێبه‌جێ‌نه‌كرا. لۆرد مێلبۆرن سه‌باره‌ت به زه‌ماوه‌ندی مه‌لیكه ڤیكتۆریا یارمه‌تیی له‌خاڵی ئه‌و به‌ناوی لیۆپۆڵدا، پاشای به‌لجیكا وه‌رگرت كه كارتێكه‌رییه‌كی زۆری له‌سه‌ر شاژنی لاو هه‌بوو. پره‌نس ئاڵبێرتی برازای دووشیزی كێنت‌و لیۆپۆڵد یه‌كێك له داواكارانی زه‌ماوه‌ند له‌گه‌ڵ مه‌لیكه ڤیكتۆریا بوو كه‌شاژن ئه‌وی له‌ته‌مه‌نی حه‌ڤده‌ساڵیدا بینی بووو له‌نامه‌یه‌كدا بۆ خاڵی زۆری تاریف كردبوو. به‌لاَم زه‌ماوه‌ندی ئه‌وان پێویستی به دیمانه‌یه‌كی‌تر له‌نێوانیاندا هه‌بوو، له‌به‌رئه‌وه‌ی ده‌بوایه شاژن له پێگه‌ی نوێ‌و له‌ته‌مه‌نی٢٠ساڵیدا شاره‌زای تایبه‌ته‌ندییه ره‌وشتیه‌كانی ئه‌و پیاوه بێت كه ده‌یهه‌وێت زه‌ماوه‌ندی له‌گه‌ڵ بكات‌و جگه له‌وه لۆرد مێلبۆرنیش خۆی ده‌یهه‌ویست له نزیكه‌وه پره‌نس ئاڵبێرت هه‌ڵسه‌نگێنێ. پێشه‌كییه‌كانی ئه‌م كاره له‌لایه‌ن لیۆپۆڵدای پاشای به‌لجیكاوه ئاماده‌كراو پره‌نس ئاڵبێرت كه ته‌قریبه‌ن هاوته‌مه‌نی مه‌لیكه ڤیكتۆریا بوو به‌رووالَه‌ت بۆ بینینی پووری (دووشیزی‌كێنت)و له‌راستیدا بۆ بینینی دووباره‌ی ڤیكتۆریا رۆیشته له‌نده‌ن. پره‌نس ئاڵبێرت لاوێكی جوان‌و رێكوپێك بوو و كه‌سایه‌تی‌و ره‌وشتی ئه‌و لۆرد مێلبۆرنی خسته ژێركاریگه‌ری خۆی. ئالبێرت جارێك له‌كۆرێك‌و جارێكی‌تریش به‌ته‌نیایی ژوانی له‌گه‌ڵ شاژنی گه‌نج كرد. مه‌لیكه ڤیكتۆریا هه‌روه‌ك له یاداشته‌كانی رۆژانه‌ی خۆیدا نووسیویه‌تی، هه‌ر له‌و چاوپێكه‌وتنه‌دا ئاشقی ئه‌و ده‌بێت. لۆرد مێلبۆرن له‌رۆژی پازده‌ی ئۆكتۆبه‌ری ساڵی ١٨٣٩ روانگه‌ی شاژنی له باره‌ی ئاڵبێرت پرسی‌و مه‌لیكه‌ش پێش ئه‌وه‌ی ولاَمی ئه‌و پرسیاره بداته‌وه روانگه‌ی سه‌رۆك وه‌زیرانی سه‌باره‌ت به‌و پرسی.

لۆرد مێلبۆرن گوتی كه ئاڵبێرت ته‌واو شایانی هاوسه‌رێتی شاژنه‌و مه‌لیكه ڤیكتۆریاش كه هێشتا كچێكی شه‌رمن بوو له كاتێكدا كه له شه‌رمان سوور هه‌ڵگه‌رابوو وتی ئه‌ویش پرنس ئاڵبێرتی په‌سند كردووه‌. به‌پێی داب‌و نه‌ریتی ده‌رباری بریتانیا هیچكه‌س نه‌یده‌توانی خوازبێنی له شاژنی بریتانیا بكات، بۆیه‌ش پێویست بوو مه‌لیكه ڤیكتۆریا پێشنیاری زه‌ماوه‌ند به ئاڵبێرت بدات.







**مەلیکە ڤیکتۆریا  لەسەرەتاکانی پاشایەتیو پێش زەماوەند لەگەڵ ئاڵبێرت**

مەلیکە ڤیکتۆریا رۆژی پازدەیەمی ئۆکتۆبەری ساڵی ۱۸۳۹ پێشنیاری زەماوەندی بە ئاڵبێرت کردو پرنس لە کاتێکدا کە دەیگووت: "لەوە کە مەلیکە ڤیکتۆریا ئەو بە شایستەی هاوسەرێتی خۆی دەزانی، پەشۆکاوە"، پێشنیاری شاژنی قەبووڵ کرد. مەلیکە ڤیکتۆریا داوای لەهاوسەری داهاتووی کرد ئەو بابەتە ئاشکرا نەکات تا ئەو رۆژەی کە لەلایەن دەوڵەتەوە بەرەسمی رادەگەیێندرێتو بەتایبەتیش داوای لێکرد ئەو رووداوە لەگەڵ دایکی (واتە دووشیزی کێنت) باس نەکات. مەلیکە ڤیکتۆریا وتی کە دایکی ناتوانێ هیچ سرێك لەدڵیدا راگرێتو کاتێك ئەم بابەتە ببیستێتەوە لای کەسانیتر باسی دەکات. پرەنس ئاڵبێرت گەڕایەوە بۆ ئەڵمانو لە یەکەمین نامەیدا بۆ مەلیکە ڤیکتۆریا دەنووسێت: "یادی تۆ بۆ ساتێك لە دەروونم دوور ناکەوێتەوە.. ئەشقی تۆ تەواوی دەروونمی پڕ کردووە ". پرەنس ئاڵبێرت ناوی خۆی بەم رستانە واژۆ کردبوو: "کەسێك کە لەشو گیانی لە دەست تۆ دایە.. خزمەتکاری وەفاداری تۆ ئاڵبێرت". مەلیکە ڤیکتۆریا لە رۆژی بیستو سێهەمی نۆڤەمبەری ساڵی ۱۸۳۹و لە



حاڵێکدا کە لە شەرمان سوور هەڵگەڕابووو دەستەکانی لەکاتی خوێندنەوەی ئەو راگەیاندراوەی کە لەدەستی دابوو دەلەرزی، روو بەرووی ئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتیو شاندی دەوڵەتی بریتانیا رایگەیاند کە دەیهەوێت لەگەڵ ئاڵبێرت زەماوەند بکات. پەرلمانی بریتانیا شایستەیی پرەنس ئاڵبێرتی بۆ زەماوەند لەگەڵ مەلیکە ڤیکتۆریا  قەبووڵ کرد، بەڵام پێشنیاری دەوڵەتی بۆ تەرخان کردنی ساڵانە ٥٠٠٠٠ لیرە بۆ هاوسەری شاژنی پەسند نەکردو پەرلمان ئەو بڕەی بۆ ٣٠٠٠٠ لیرە کەم کردەوە. ئەو بڕیارەی پەرلمان پتر دەرئەنجامی هەوڵەکانی نوێنەرانی حیزبی پارێزگارو دژکردەوەیەك لە ئاست ئەو مەیلە وچوونە ئاشکرایەی شاژن بۆ لای حیزبی ویگو پشتیوانیی نائاسایی ئەو لە لۆرد مێلبۆرن بوو. رێوڕەسمی زەماوەندی شاژنو پرەنس ئاڵبێرت رۆژی دەی فێبریەی ساڵی ۱۸٤۰ لە لەندەن بەڕێوە چوو. شاژن وڵامی"بەڵێ"ی داوە بەو پرسیارەی ئۆسقۆف کانتێربۆری کە ئایا ئامادەی لە ماوەی ژیانی هاوسەرێتیدا پێڕەوی لە هاوسەرت بکەی؟ هەڵبەت ئەو پرسیارە لە رێوڕەسمی زەماوەندا باو بووو پێویست بوو وڵامی "بەڵێ" بداتەوە، بەڵام بەپێی یاساکانی بریتانیا ئەوە ئاڵبێرت بوو کە دەبوایە ببێتە هاووڵاتی بریتانیاو پێڕەویی لەشاژن بکردایە!



**پرەنس ئاڵبێرت، هاوسەری مەلیکە ڤیکتۆریا لە یەکەمین ساڵی ژیانی هاوبەشی لەگەڵ شاژنی بریتانیا**

مەلیکە ڤیکتۆریا ئاشقانە مێردەکەی خۆش دەویستو ئەو خۆشەویستییە بە تێپەر بوونی کات قوڵتر دەبوو، بەڵام پرەنس ئاڵبێرت لەوە بێزار دەبوو کە هاوسەری ڕێگای پێنەدەدا لە کاروباری حکوومەتو سیاسەتدا راوێژی لەگەڵ بکاتو جارێکیان بە راشکاوی بە شاژنی گوت"واهەست دەکەم کە نەتەنیا لەسەرۆك وەزیرەکەت بەڵکوو لەخانمی لێزێنیش (خزمەتکاری مەلیکە) لە کاروباری سیاسەتدا کەمتر متمانەم پێدەکەی". مەلیکە ڤیکتۆریا بەو وتە سیاسییە وڵامی هاوسەری داوە کە "من بە درێژایی رۆژو بە رادەیەکی زۆر باس لەسیاسەت دەکەمو پێم خۆشە لە کاتێکدا لەگەڵ تۆم باس لە شت گەلێکیترو بەتایبەت باس لە خۆمان بکەم". لەمانگی نۆڤەمبەری ساڵی ۱۸٤۰دا یەکەمین منداڵی مەلیکە ڤیکتۆریا کە کچ بوو، لە دایك بووو ناوی دایکی ڤیکتۆریایان لەسەر دانا.

ساڵی دواتر دووهەمین منداڵی ئەوان کە کوڕ بوو چاوی بەدونیا هەڵێناو ناویان نا "ئاڵبێرت ئێدوارد"کە لەتەمەنی شەست ساڵیدا بەناوی ئێدواردی حەوتەم لەسەر تەختی پاشایەتی بریتانیا دانیشت. مەلیکە ڤیکتۆریاو هاوسەری دوای ئەم دوو منداڵە خاوەنی چوار کچو سێ کوڕیتر بوون کە هەموویان لەگەڵ بنەماڵە پاشایەتییەکانی ئەورووپا زەماوەندیان کردو پێوەندییەکانی بریتانیایان لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپی سەقامگیرترو پتەوتر کرد. گرینگترین ئاڵ وگۆڕی سیاسی کە دوای زەماوەندی مەلیکە ڤیکتۆریا لە بریتانیادا هاتە ئاراوە، سەرنەکەوتنی حیزبی ویگ لە هەڵبژاردنەکانی ساڵ ۱۸٤۱و لەسەرکار لاچوونی لۆرد مێلبۆرن لەپۆستی سەرۆکایەتی وەزیران بوو. مەلیکە ڤیکتۆریا لە دەرەنجامی ئەو هەڵبژاردنە رازی نەبوو بەڵام چارەیەکیتری جگە لە ملکەچی لە ئاست دەنگەکانی گشتی خەڵكو دانانی سێر رۆبێرت پیل بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی نەبوو. مەلیکە ڤیکتۆریا بە لەسەرکار لاچوونی لۆرد مێلبۆرن لەپۆستی سەرۆکایەتی وەزیران نزکترین رفیقو راوێژکاری سیاسی خۆی لە دەست داو لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا ئەم رووداوە بەیەکێك لە تاڵترین رووداوەکانی ژیانی خۆی ناو دەبا. بەڵام ئەو رووداوە تاڵە دەرفەتێکی لە باری بۆ ئاڵبێرت رەخساند بۆئەوەی جێگەی چۆڵی مێلبۆرن لای هاوسەری پڕکاتەوەو وەردە وەردە وەك راوێژکاری نزێكو باوەڕپێکراوی ئەوی لە کاروباری سیاسیدا لێبێت. سەرۆك وەزیرانیی رۆبێرت پیل سەرەتایەکی خۆشی نەبوو، لەبەرئەوەی کە مەلیکە ڤیکتۆریا بە بێ هیچ هۆیەکی تایبەتو رەنگە تەنیا بەهۆی هۆگری و خۆشەویستی بۆ مێلبۆرن متمانەی بە پیل نەدەکرد. پیل جارێکیتر دوای بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك



وەزیرانی لە شاژنی دووپات کردەوە کە باشتر وایە ئاڵو گۆڕێك لە تێکەڵاوی خزمەتکارەکانی کۆشكو خزمەتکارەکانی خۆی بدات، بەڵام بە لە بەرچاو گرتنی هەستیاری شاژن بەو بابەتە زۆری پێدانەگرتو بڕیاری کۆتایی دا بە شاژن.

بەهەڵکەوت پرەنس ئاڵبێرتیش لەو بابەتەدا لەگەڵ پیل هاوبیر بوو و شاژنی بۆ ڕەچاوکردنی ئەو راسپاردانەی سەرۆك وەزیرانی نوێ هان دەدا. بارۆنس لێزێنی خزمەتکاری تایبەتی شاژن کە ئاگاداری ئەو بابەتە بوو، بۆ چارەسەر کردنی ئەو گرفتە پێشدەستی کردو بە بیانووی شەکەت بوونو نەخۆشی دەستی لەکار کێشاوەو لەساڵی ۱۸٤۲ بریتانیای بەجێهێشت. بە رۆیشتنی لێزێن پێگەی ئاڵبێرت پتەوتر بوو، لەبەرئەوەی ڤیکتۆریا راوێژکارو هاودەمی جێگای متمانەی جگە لە هاوسەری نەمابوو. پرەنس ئاڵبێرت رۆڵێکی گرینگی لە پێکهێنانو تێگەیشتنو متمانەی دوولایەن لەنێوان شاژنو سێر رۆبێرت پیل نواند. پیل کە یەکێك لە بەرچاوترینو کارامەترین کاربەدەستانی بریتانیا بوو، بەهۆی ئەنجامدانی هەندێك چاکسازی گرینگ لەسیستەمی بەڕێوبەرایەتیو ئابووری بریتانیا، متمانەو پشتیوانی شاژنی بەدەست هێنا. بەو چاکسازییانەی کە پیل لە سیستەمی حکوومەتدا ئەنجامی داو هێشتاش هەر لەبریتانیا کاری پێدەکرێت، رێگەی لە هەموو ناکۆکییەکی نێوان پاشا یان شاژنو پەرلمانی بریتانیا سەبارەت بەهەڵبژاردنی سەرۆك وەزیرانو دیاریکردنی وەزیرانی کابینەی دەوڵەت گرت. لەسەر ئەو بنەمایە، رێبەری هەرحیزبێك کە لەهەڵبژاردنە گشتییەکاندا زۆرینەی کورسییەکان بەدەست بهێنێ لەلایەن پۆستی دەسەڵاتەوە (پاشا یان شاژن) وەك سەرۆك وەزیران دەست نیشان دەکرێتو وەزیرانی خۆشی لەنێوان ئەندامانی حیزب کە وەك نوێنەرانی پەرلمان هەڵبژێردراون دەستنیشان دەکات. گۆڕینی سەرۆك وەزیرانیش کاتێك دەبێت کە پەرلمان دەنگی متمانەی پێنەدات یان خۆی دەست لە کار بکێشێتەوەو شاژن یان پاشا ناتوانن بە ئیرادەی خۆیان بڕیاری گۆڕینی دەوڵەتو دانانی سەرۆك وەزیرانێکیتر دەرکەن. بە سەرنەکەوتنی حیزبی پارێزگارانی بریتانیا لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۸٤٦دا رێبەری لیبراڵەکان بەناوی "جان رۆسێل"[17] بوو بە سەرۆك وەزیرانو تا ساڵی ۱۸٥۲ لەسەر کار مایەوە. گرینگترین رووداوەکانی سەردەمی ئەو بریتی بوون لە شۆڕشەکانی ساڵی ۱۸٤۸ی بەشە جیاجیاکانی ئەورووپا کە داوێنگیری

17-John Russel





بریتانیاش بووە. چارتیستەکان یان لایەنگرانی ئاڵۆ گۆڕی بنەرەتی لە سیستەمی دەسەڵاتو هەڵبژاردنەکانی پەرلمان کە پێشتر ئاماژەی پێکرا هەندێك خۆپیشاندانیان لە بەشە جیاجیاکانی بریتانیا وەڕێخست. خۆپیشاندانی رۆژی دەی ئاپریلی ساڵی ١٨٤٨ ی لەندەن خاڵی بەرزی ئەو بزووتنەوەیە بوو کە مەلیکە ڤیکتۆریا پێشتر دەوڵەتی سەبارەت بە ئەگەری سەرهەڵدانی هەندێك ئاژاوەو بشێوی لە دوای ئەو خۆپیشاندانانە ئاگادار کردبۆوەو جان رۆسێلیش بە رێنمایی مەلیکە ڤیکتۆریا "وێلینگتۆن"[18]ی کە سەرکردەی سەرکەوتووی شەڕەکانی واتێرلۆ بوو کردە سەرکردەی هێزە چکدارەکان. وێلینگتۆن کە بەدووکی ئاسنین ناوبانگی دەر کردبوو، هێزە چەکدارەکانی لە دەوروبەری لەندەن بڵاو کردەوەو فەرمانی ئامادەباشی پێدانو هەر ئەو کارەش بووە هۆی کەم بوونەوەی ژمارەی خۆپیشاندەرانو پێشگیری لەهەرجۆرە ئاژاوە گێرییەك لە لەندەن. یەکێك لەرووداوە گرینگەکانی سەردەمی حکوومەتی جان رۆسێل لەپێوەندی لەگەڵ مەلیکە



**یەکێك لە تابلۆ بەناوبانگەکانی مەلیکە**

**ڤیکتۆریا لەتەمەنی گەنجیدا**

18-Duke of Wellington



ڤیکتۆریا ئەوەیە کە شاژن دژی شێوازی وەزیری دەرەوەی حکوومەتەکەی جان رۆسێلی بەناوی "لۆرد پاڵمێرستۆن"[19] کردبوو و لەئاکامدا ئەم دژایەتی کردنە بووە هۆی لەسەر کار لابردنی ئەو لە پۆستی وەزیری دەرەوە. پاڵمێرستۆن پشتیوانیی لە ئامانجی شۆڕشەکانی ساڵی١٨٤٨ی ئەورووپاو سەقامگیر بوونی دێمۆکراسی دەکرد لەو ولاٹانەی کە پێشتر بە شێوازی زۆرداریو دیکتاتۆری بەڕێوە دەچوون، ئەویش لەبارودۆخێکدا کە مەلیکە ڤیکتۆریا لەگەڵ بنەماڵە پاشایەتییەکانی ئەورووپا کە دوای شۆڕشەکانی ١٨٤٨ لەناو چوون یان لاواز ببوون پێوەندییەکی نزیکی هەبوو.

شاژن لە کاروباری پەیوەست بە سیاسەتی دەرەوەی بریتانیا هەندێك روانگەی ژیرانەی هەبوو کە زۆربەیان درووستو لە بەرژەوەندی بریتانیادا بوون، بەلاّم پاڵمێرستۆن ئەو بۆچوونانەی شاژنی لە بەرچاو نەدەگرت و درێژە پێدانی ئەو شێوازە بووە هۆی ئەوە کە شاژن لێبڕاوانە داوا لەسەرۆك وەزیران بکات پاڵمێرستۆن لەسەر پۆستی وەزیری دەرەوە لابەرێت. بەلاّم لۆرد رۆسێل کە هیچ هۆیەکی بۆ لەسەر کار لابردنی پاڵمێرستۆن بەدەستەوە نەبوو، لەبەرامبەر ئەو داواکارییەی شاژن راوەستا، تا ئەوە کە پاڵمێرستۆن بە لایەنگری کردن لە حکوومەتی ناپلیۆنی سێهەم لە فەڕانسە کە بێ راوێژ لەگەڵ سەرۆك وەزیرانو بەدەستهێنانی دەنگی زۆرینەی پەرلمان ئەو کارەی ئەنجام دابوو، بۆخۆی بیانوویەکی لە باری بۆ لەسەر کار لابردنی دا بەدەست لۆرد رۆسێلەوە. لۆرد رۆسێل دواتر دانی بەوە دانا بوو کە پاڵمێرستۆن بە پێچەوانەی سیاسەتی گشتی دەوڵەت کاری نەکردبووو ئەوی بۆ دابین کردنو بەجێ گەیاندنی بۆچوونی ڤیکتۆریا لەسەرکار لابردووە. لەساڵی ١٨٥٢ لۆرد رۆسێل جێگەی خۆی بە "لۆرد دێربی"[20]، ریبەری حیزبی پارێزگارانی بریتانیادا بەلاّم حکوومەتی ئەو زۆری خۆڕانەگرتو پێش تەوابوونی ساڵی ١٨٥٢حکوومەتێکی هاوبەند بەسەرۆکایەتی "ئابێردین"[21] هەوساری کاروباری دەسەلاّتی بەدەستەوە گرت. شەڕی کەریمە کە یەکەمین شەڕی دەرەکی بریتانیا لەسەردەمی ئێمپراتۆریەتی مەلیکە ڤیکتۆریا بوو لەکاتی حکوومەتی ئابێردین دەستی پێکرد. ئەو شەڕە کە لەساڵی ١٨٥٣ تا ١٨٥٦ درێژەی کێشا، لەنێوان رووسیاو ئێمپراتۆریەتی عوسمانی دەستی پێکرد. بەلاّم فەڕانسەو بریتانیا کە بەهۆی سەرکەوتنی رووسەکانو تێکشکانی هێزە دەریاییەکانی عوسمانی لە قۆناغە سەرەتاییەکانی شەڕ، لە بەرفراوان بوونی هەرێمی دەسەلاّتی

19-Palmerston

20-Derby

21-Aberdeen





پالمێرستۆن تا ساڵی ١٨٦٥ واتە نزیك بە دە ساڵ (تا كاتی مردنی) پۆستی سەرۆك وەزیرانی بریتانیای پاراست. یەكێك لە گرینگترین ڕووداوەكانی سەردەمی حكوومەتی پالمێرستۆن بریتی بوو لەشۆڕشی گەورەی هێندییەكان لەدژی دەسەڵاتی داگیركەری بریتانیاو شەڕی ئێران‌و بریتانیا كە ڕوونكردنەوەیەكی كورت سەبارەت بە هەر دوو ڕووداوەكە پێویستە. شەڕی ئێران‌و بریتانیا لەسەر داگیر كردنی هەرات لەساڵی ١٨٥٦ لەلایەن هێزەكانی ئێرانەوە ڕوویدا. ناسرەدین شا بە هاندان‌و لەگوێدا خوێندنی ڕووسەكان كە لەشەڕی كەریمە لەگەڵ بەریتانی‌یەكان شكستیان خواردبوو، هێرشی كردە سەر هەرات‌و ئەو شارەی بە كەڵك وەرگرتن لە گرفتارییەكانی بریتانیا لەشەڕی كەریمە داگیر كرد. هەڵبەت پێوەندییەكانی ئێران‌و بریتانیا پێش ئەو شەڕە بەهۆی چەوت كەڵك وەرگرتن لە سیاسەت‌و كردەوە گەلێكی ناحەزی ڕەوشتی لەلایەن باڵوێزی ئەوكاتەی بریتانیا (سێرچارلزمۆرای)[22] زۆر بەتووندی ڕەش ببووو مۆرای بۆ دەربڕینی نارەزایەتی، باڵوێزخانەی بریتانیای لەتاران داخست‌و خۆی ڕۆیشتە بەغدا. مۆرای دوای بە جێهێشتنی تاران لە نامەگەلێكدا كە بۆ پالمێرستۆن‌و "كلارێندۆن"[23]ی وەزیری ئەو كاتەی دەرەوەی بریتانیای نووسیبوو، داوای لە بریتانیا كردبوو هێرش بكاتە سەر ئێران. ئەو بەڵگانەی كە لە ئارشیڤی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا بەدەست كەوت‌و دواتر بلاوكرایەوە دەری دەخات كە دەوڵەتی بریتانیا تەنانەت پێش داگیركردنی هەراتیش پلانی هێرش بردنە سەر ئێرانی دارشتووەو پێشەكییەكانی هێرش بردن بۆ سەر بەندەرەكان‌و دوورگەكانی ئێرانی ئامادە كردووە. دەوڵەتی بریتانیا هەر لەو ڕۆژەی كە هەرات داگیرا كرا، (یەكەمی نۆڤەمبەری ساڵی ١٨٥٦) شەڕی لە دژ ئێران ڕاگەیاندو دەستبەجێ ٨پاپۆڕی شەڕكەری بریتانیا لەگەڵ ژمارەیەك پاپۆڕی هەڵمی‌و چارۆكەدار بەرەو ئێران وەڕێكەوتن‌و هێرشیان كردە سەر بەندەرو دوورگەكانی ئێران لە كەنداوی فارس‌و تاكۆتایی ساڵی ١٨٥٦ دوورگەی خارك‌و بەندەری بووشەهریان داگیر كرد. لەساڵی ١٨٥٧ سەربازەكانی بریتانیاو هێندی لەناو خاكی ئێران دەستیان كرد بە پێشڕەوی‌و تا بەرازجانیان داگیر كرد.

هێزەكانی بریتانیا هەر لەو كاتەدا لە نزیكی خۆڕەم شار دابەزین‌و پاپۆرە شەڕكەرەكانی بریتانیا چوونە ناو "شط العرب"و توانیان شاری ئەهواز داگیر بكەن. ناسرەدین شا كە لە

22-Sir Charles Murray
23-clarendun



ڕووسیا لە ئەورووپادا دەترسان، هاریكاری هێزەكانی عوسمانییان كردو دوای چەند شەڕو پێكدادانێكی دەریایی بەشێك لە كەنارەكانی باكووری دەریای ڕەشیان داگیر كرد. ڕووسیا دوای تێكشكان لەو شەڕەدا دەستی لەداواكارییەكانی سەبارەت بە ئێمپراتۆری عوسمانی هەڵگرت‌و دەسەڵاتە كۆنەكەی لەسەر ئەورووپای ڕۆژهەلاتو بەشی باكووری ناوچەی بەلكان لە دەست دا.

ناپلیۆنی سێهەم لەم شەڕەدا لە هەموانی زیاتر دەسكەوت بەدەست هێناو بریتانیاش بە دانی زۆرترین كوژراو لەو شەڕەدا، (نێزیكەی ٢٤٠٠٠ كەس) دەسكەوت‌و ئیمتیازێكی ئەوتۆی وەدەست نەكەوت.

ڕازی نەبوونی گەلی بریتانیا لەدەرەنجامەكانی شەڕی كەریمە بووە هۆی لەسەركار لابردنی ئابێردین‌و هاتنە سەركاری پالمێرستۆن، ڕێبەری لیبراڵەكان‌و وەزیری پێشووی دەرەوەی بریتانیا. مەلیكە ڤیكتۆریا بەهۆی ئەوەكە پالمێرستۆن پێشینەیەكی باشی لە پۆستی سەرۆكایەتی وەزارەتی دەرەوە نەبوو، پێشوازیی لەپۆستی نوێی ئەو وەك سەرۆك وەزیران نەكرد. بەلاّم پالمێرستۆن توانی بە لەپێشگرتنی نەرم‌و نیانییەكی تایبەت لەئاست مەلیكە ڤیكتۆریا، ناكۆكییەكانی ڕابردوو لە زەینی شاژن بسڕێتەوەو وردە وردە لەگەڵ هەبوونی هەندێك جیاوازی كە جاروبار لە ڕوانگەكانیاندا سەری هەڵدەدا متمانەی شاژن بەدەست هێنا.



**مەلیكە ڤیكتۆریا لەگەڵ هاوسەری‌و كوڕەگەورەكەی (ئێدوارد) كە لەتەمەنی شەست ساڵیدا بەپاشایەتی گەیشت.**

دەرەنجامەکانی ئەو شەڕە دەترسا، فەرۆخ خانی "امین الملك"ی کە راسپێردراوی وتووێژ لەگەڵ باڵوێزی بریتانیا لە دەرباری عوسمانی بوو، ناردە پاریسو داوای لە ناپلیۆنی سێهەم کرد کە رۆڵی نێوبژیوانی بگێڕی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی ئێرانو بریتانیا. ناپلیۆن ئەو داواکارییەی قەبووڵ کردو دوای کۆتایی هاتنی ئەو وتووێژانەی کە بە نێوبژیوانی ناپلیۆنی سێهەم لەنێوان ئێرانو بریتانیا ئەنجام درا، لە رۆژی چواردەهەمی مارسی ساڵی ١٨٥٧ پەیماننامەیەك لەنێوان ئەم دوو حکوومەتە واژۆ کرا. بەپێی ئەو پەیماننامەیە ئێران بەڵێنی دابوو کە لەبەرامبەر رۆیشتنە دەرێی هێزەکانی بریتانیا، یەکەمجار دەستبەجێ هێزەکانی خۆی لەهەرات بکێشێتەوەو دەست لە هەرجۆرە داواکارییەکی دەسەڵاتداری لەسەر ئەفغانستان هەڵگرێتو دووهەمیش ساڵانە بەندەر عەباسو چابەهار لەبەرامبەر شازدە هەزار تمەن بە کرێ بدا بە پێشەوای مەسقەت (بابەتێك کە هیچ پێوەندییەکی بە ناکۆکییەکانی ئێرانو بریتانیاوە نەبوو). هەروەها دەوڵەتی ئێران ئەو مەرجە شەرشۆڕانەیەشی قەبووڵ کرد کە بۆ گەڕانەوەی بە رێزانەی مۆرایو داوای لێبووردنی لەلایەن کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران دیاری کرابوو. ئەو مەرجانە لە پرۆتۆکۆلێکدا خرایە نێو دەقی پەیماننامەکە.

بریتانیا دوومانگ دوای داسەپاندنی ئەو پەیماننامەیە بە سەر دەوڵەتی ئێران، لەگەڵ شۆڕشێکی گەورەی هێندییەکان رووبەروو بۆوە. ئەو شۆڕشە لەنێو سەربازە هێندییەکانی سوپای داگیرکەری بریتانیا دەستی پێکردو شۆڕشگێڕەکان لەمانگی مەی ساڵی١٨٥٧ شاری دێهلیان داگیر کردەوەو بەهادۆر پاشای دووهەمیان کە پاشماوەی پاشاکانی مەغۆلی هێندووستان بوو بە رێبەری خۆیان هەڵبژارد. شۆڕشگێڕەکان بەدرێژایی هاوینی ساڵی١٨٥٧لە دۆڵی گۆنگو ناوچە ناوەندییەکانی هێندووستان پێشڕەوییان کرد. بەڵام بریتانیا بە ناردنی هێزی یارمەتیدەر پاشەکشەی پێکردنو شۆڕشگێڕەکان لە بەهاری ساڵی ١٨٥٨ دوای لێکەوتنی زەرەدو زیانێکی زۆری مرۆڤی کۆتاییان بە شۆڕشەکەیان هێنا. ئەو شەڕانە کوشتارێکی زۆرو بێ بەزەییانەی هێندییەکانی لێکەوتەوەو بریتانیاییەکان دوای کۆتایی پێهێنانی ئەو شەڕانە، بە جێگەی کۆمپانیای هێندی رۆژهەڵات کە تا ئەو رێکەوتە سیاسەتەکانی ئیستعماری بریتانیای بەڕێوە دەبرد، راستەوخۆ بەڕێوەبەرایەتی هێندووستانیان بەدەستەوە گرت.

***



لەساڵی ١٨٥٧ مەلیکە ڤیکتۆریا نۆهەمینو دواین منداڵی کە کچ بوو بە دنیا هێناو لە ژانویە ساڵی ١٨٥٨ یەکەم کچی خۆی (ڤیکتۆریای) بە شوو دا. بووك ١٨ ساڵانو زاواش کە جێنشینی پاشای ئەڵمان بوو٢٠ ساڵی تەمەن بوو.

لەساڵی ١٨٥٩ یەکەم نەوەی مەلیکە ڤیکتۆریا کە ناوی ویلهۆڵم بوو هاوکات لەگەڵ چلەمین ساڵوەگەڕی لەدایکبوونی مەلیکە ڤیکتۆریا لە دایك بوو. ئەو نەوەیە کە لای مەلیکە ڤیکتۆریا زۆر خۆشەویست بوو، دوای ئەوە کە بەناوی ویلهۆڵمی دووهەم لەسەر تەختی ئیمپراتۆریەتی ئەڵمان دانیشت، شەڕی جیهانی یەکەمی دژی بریتانیا وەرێخست. مردنی پرەنس ئالبێرت لە دیسەمبەری ساڵی ١٨٦١ گەورەترین کارەساتی ناخۆشی ژیانی مەلیکە ڤیکتۆریا بوو. مردنی پرەنس ئالبێرت لەتەمەنی ٤٢ ساڵیدا جگە لەوەی کارەساتێکی دڵتەزێن بوو بۆ مەلیکە ڤیکتۆریا، بەڵکوو کاریگەرییەکی قووڵیشی لەسەر شێوەی دەسەڵاتدارێتیو رەوشتی ئەو بەدرێژایی چل ساڵی پاشماوی ژیانی دانا. خەمی مردنی ئالبێرت کە مەلیکە ڤیکتۆریا ئەشقو خۆشەویستییەکی زۆری پێی هەبوو شاژنی تا کۆتایی ژیانی بەر نەدا. ئەو تا دە ساڵ دوای مردنی هاوسەری جگە لەهەندێك رێوڕەسمو بۆنە کە ناچار بوو ئامادە بێت، بەشداریی لە هیچ رێورەسمێك نەکردو کەمتر بزەی دەهاتە سەر لێوی. یەکێك لە ئاواتەکانی پرەنس ئالبێرت پێش مردنی ئەوە بوو کە کوڕە گەورەکەیان (ئالبێرت ئێدوارد) هەرچی زووتر زەماوەند بکات، لەبەرئەوەی ئالبێرت ئێدوارد کە دوای مردنی مەلیکە ڤیکتۆریا بەناوی ئێدواردی حەوتەم لەسەر تەختی پاشایەتی بریتانیا دانیشت، لەتەمەنی گەنجێتیدا لە رادەبەدەر عەیاشو خۆشگوزەرانو بزێو بوو. هەلاتنی ئەو لەگەڵ کچێکی فەڕانسەوی کە لەکاتی سەفەر بۆ باشووری فەڕانسەو کەمێك دوای مردنی باوکی روویدا ئابڕوو چوونێکی گەورەی لێکەوتەوە. مەلیکە ڤیکتۆریا لەگەڵ ئەوەش کە هێشتا هەر تاسەباری هاوسەری بوو، بڕیاریدا هەرچی زووتر ئەو ئاواتەی هاوسەری جێبەجێ بکات، بەڵام دۆزینەوەی کچێکی شیاوو لەبار بۆ هاوسەرێتی ئێدوارد ماوەیەکی خایاند. لە ئاکامدا پرەنسێس ئەلێکساندێری کچی نۆزدەساڵەی پاشای دانیمارکی بۆ هاوسەری کوڕەکەی هەڵبژاردو لەساڵی ١٨٦٣دا رێوڕەسمی زەماوەندی ئەوان لە لەندەن بەڕێوە چوو. جێنشینی ئیمپراتۆری بریتانیا لەو کاتەدا ٢٢ ساڵ تەمەنی بوو.







**مەلیکە ڤیکتۆریا لەگەڵ نەوەکەی ویلهۆڵم کە دواتر بەناوی ویلهۆڵمی دووهەم لەسەر تەختی دەسەڵاتی ئەڵمان دانیشت و لە شەڕی یەکەمی جیهانی دژ بە بریتانیا راوەستا.**

دوای مردنی لۆرد پاڵمێرستۆن لەساڵی ١٨٦٥، پۆستی سەرۆك وەزیری بە نۆبە بە لۆرد رۆسێل‌و دێربی‌و دیزرائیلی[٢٤] گەیشت و لە ئاکامدا "ویلیام گلادستۆن"[٢٥]، رێبەری پڕ جموجۆڵی لیبراڵەکان دوای سەرکەوتن لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٨٦٧ پۆستی سەرۆك وەزیرانیی بەدەست هێناو خولی یەکەمی حکوومەتەکەی شەش ساڵ درێژەی کێشا. لەنێوان ئەوو مەلیکە ڤیکتۆریا هەندێك جیاوازی بۆچوون لەکاروباری تایبەت بە سیاسەتی دەرەوەو شێوازی گلادستۆن لە بەڕێوەبردنی کاروباری حکوومەتدا هەبوو، بەلاّم مەلیکە ڤیکتۆریا کە پێ‌بەندی بنەماکانی دێمۆکراسی بوو هیچ کات بۆچوونی خۆی بە سەر دەوڵەتدا دانەدەسەپاندو تەنیا بەراسپاردن‌و دەربڕینی روانگەی خۆی لەکاروباری دەرەوەو ناوخۆ رازی دەبوو. بەرهەڵستکاری

24-Disraeli
25-William Egladstone



توندو تیژی گلادستۆن لەپەرلمان، بێنجامین دیزرائیلی (رێبەری حیزبی پارێزگاران) بوو کە پێش گلادستۆن ماوەی دەمانگ پۆستی سەرۆك وەزیرانی لە ئەستۆ بوو. روانگەکانی مەلیکە ڤیکتۆریا لە کاروباری سیاسەتی ناوخۆدا لە بیرو بۆچوونەکانی دیزرائیلی نێزکتر بووو هەر بەو هۆیەشەوە دوای سەرکەوتنی دیزرائیلی لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٨٧٤ی بریتانیاو بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك وەزیرانی، لەنێوان مەلیکە ڤیکتۆریاو حکوومەت (پەرلمان) لەیەك گەیشتنێکی پوخت درووست بوو. بریتانیا لە دووهەمین خولی حکوومەتی دیزرائیلی‌دا کەماوەی شەش ساڵی خایاند، هێزە ئیستعمارییەکانی (داگیرکاری) خۆی بەرفراوانتر کردو هەرێمی ئێمپراتۆریەتی بریتانیا لە ئاسیاو ئەفریقیا بەرینتر بوو. دیزرائیلی لەسیاسەتی ئەورووپاشدا رۆڵێکی گرینگی گێڕاو یەکێك لەئەکتەرە سەرەکییەکانی کۆنگرەی بەرلین لەساڵی ١٨٧٨ بوو کە دەسەڵاتی رووسەکان‌و توورکەکانی لە بەڵکان بەرتەسك کردەوەو سەربەخۆیی رۆمانیاو بۆلگاریاو سێربستانی مسۆگەر کرد. دووڕگەی قێبرێس دەسکەوتی بریتانیا لەو کۆنگرەیە بوو کە زیاتر لە حەفتا ساڵ وەك مووستەعمەرەو پێگەی سەرەکی بریتانیا لە رۆژهەڵاتی مەدیتەرانە مایەوەو دوای سەربەخۆیش کەم‌وزۆر بەبریتانیا بەستراوە. مەلیکە ڤیکتۆریا بە پێشنیاری دیزرائیلی لەساڵی١٨٧٧ کە هاوکات بوو لەگەڵ چلەمین ساڵڤەگەڕی ئێمپراتۆریەتی ئەو نازناوی ئێمپراتۆریسی هێندی وەرگرت. لەو رێکەوتەدا هەموو منداڵەکانی مەلیکە ڤیکتۆریا لەگەڵ بنەماڵە پاشایەتییەکانی ئەورووپا خزمایەتییان پێکهێنابوو و بریتانیاش لەو رێگایەوە دەسەڵاتی سیاسی خۆی لەئەورووپا بەرفراوانتر کردبوو. سەرەڕای سەرکەوتنەکانی دیزرائیلی لەسیاسەتی دەرەوە، رەکەبەری سەرەکی ئەو کە بەردەوام لە ئەنجوومەنی عەوام (پەرلمان) رەخنەی لە سیاسەتەکانی دەوڵەت دەگرت، لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٨٨٠ سەرکەوت‌و بۆ جاری دووهەم پۆستی سەرۆك وەزیرانی بریتانیای بەدەست هێنا. پێوەندییەکانی مەلیکە ڤیکتۆریا لەگەڵ گلادستۆن وەك خولی یەکەمی سەرۆکایەتی وەزیرانی خۆش نەبووو بەتایبەت ئەو ناکۆکییانە لەرووداوی راپەڕینی مەهدی لە سوودان گەیشتە ئەو پەڕی خۆی. رێبەری مەزهەبی سوودان (محەمەد ئەحمەد) کە لەساڵی ١٨٨٣بەناوی مەهدی شۆڕشی کردو دەیهەویست سوودان لەژێر دەسەڵاتی بریتانیاو میسر ئازاد بکات، لە شەڕو پێکدادانێك لەگەڵ هێزەکانی میسر کە بەسەرکردایەتی ئەفسەرە بەریتانیاییەکان رێك دەخرا، توانی دەهەزارکەسیان لێ‌بکووژێ. مەلیکە ڤیکتۆریا خوازیاری بەرەنگار بوونەوەی توندوتیژو





داواكاری خوێنی ئەفسەرە كوژراوەكانی بریتانیا بوو، بەڵام گلادستۆن دەیهەویست ئەو گرفتە لە ڕێگای دیپلۆماسییەوە چارەسەر بكات. لە ئاكامدا بۆ سەركوتی ئەو ڕاپەڕینەو لەژێر گوشاری مەلیكە ڤیكتۆریا كە لەم بابەتەدا ڕای گشتی خەڵكیشی لەگەڵ بوو، یەكێك لە تووڕەترینو بەسامترین ئەفسەرەكانی بریتانیا بەناوی "چارلز گۆردۆن"[26] ڕەوانەی سوودان كرا. گۆردۆن لەسەرەتای ئەركەكەیدا هەندێك سەركەوتنی بەدەست هێنا، بەڵام لە ئەنجامدا هێزەكانی مەهدی شاری خارتوومیان گەمارۆدا. پەلە نەكردنی گلادستۆن لە ناردنی هێزی یارمەتیدەر بۆ سوودان كە تا ڕادەیەك لە بێ فەرمانی گۆردۆن لە دەوڵەتو نارازی بوونی گلادستۆن لە شێوازی ئەو سەرچاوەی دەگرت، بووە هۆی ئەوەكە لە كۆتاییەكانی ساڵ ١٨٨٥ واتە پێش گەیشتنی هێزە یارمەتیدەرەكانی بریتانیا، شاری خارتووم لەلایەن هێزەكانی مەهدی داگیر بكرێتو هەموو سەربازانو ئەفسەرانی بریتانیا بۆ وێنە خودی گۆردۆنیش بكوژرێن. مەلیكە ڤیكتۆریا كە لەو ڕووداوە بە توندی تووڕەببوو لە پەیامێكی توندوتیژدا گلادستۆنی بە بەرپرسیاری ئەو كارەساتە دانا. گلادستۆن لەساڵی ١٨٨٥ لەسەر پۆستی سەرۆك وەزیران لاچوو، بەڵام شەش مانگ دواتر بەهۆی سەركەوتنی دووبارەی لیبراڵەكان بۆ جاری سێهەم پۆستی سەرۆك وەزیرانیی بەدەست هێنا. بەڵام ئەمجارەیان گلادستۆن لەسەر گرفتو بابەتی ئیرلەندا لەگەڵ پەرلمان وەكێشە هاتو لەسەر گەڵاڵەی پێشنیاری ئەو سەبارەت بە پێدانی سەربەخۆیی نیوخۆیی بە ئیرلەندا ناكۆكی كەوتە نێو ئەندامانی حیزبەكەی. سەدكەس لە نوێنەرانی لیبراڵی پەرلمان لەگەڵ نوێنەرانی حیزبی پارێزگار هاودەنگ بوونو دژی ئەو گەڵاڵەیە دەنگیان دا. گلادستۆن بە جیابوونەوەی ئەو ژمارە لە ئەندامانی حیزبی لیبرال زۆرینەی دەنگەكانی پەرلمانی لەدەست داو ناچار بوو دەست لەكار بكێشێتەوە. مەلیكە ڤیكتۆریاش بەخۆشحاڵییەوە داواكارییەكەی ئەوی سەبارەت بە لەسەر كار لاچوونی پەسند كرد. مەلیكە ڤیكتۆریا هیچ كێشەیەكی لەسەردەمی حكوومەتی شەش ساڵەی "لۆرد سالیسبۆری"[27] لەگەڵ حكوومەت نەبوو. ڕێوڕەسمە بەشكۆیەكانی پەنجایەمین ساڵی ئیمپراتۆریەتی مەلیكە ڤیكتۆریاش لەساڵی ١٨٨٧ هەر لەسەردەمی حكوومەتی سالیسبۆری بەڕێوە چوو كە پاشاو زۆربەی شازادەكانی وڵاتانی جیهان بەشدارییان تێدا كرد. كارتێكەری دەسەڵاتی ئیستعماری بەریتاینا لەسەر ئێرانیش هەر لەو سەردەمەدا گەیشتە بەرزترین ئاستی

26-Charles Gordon
27-Lord salisbury



خۆی. ناسرەدین شا لەساڵی١٨٨٩و لەدووهەمین سەفەری خۆیدا بۆ بریتانیا، ئیمتیازگەلێكی بانكیو كانزایی گرینگی دا بە "بارۆن جۆلیۆس ڕۆیتێر"[28] كە دامەزراندنی بانكی شایی لەئێران گرینگترین دەرەنجامی ئەو ئیمتیازانە بووو ساڵێك دواتر ئیمتیازی سەرپەرشتی تووتنو تەنباكۆی ئێرانی دا بە بریتانیاییەكان كە بەهۆی ڕاپەڕینی زانایانی ئایینیو نارەزایەتی گشتیی گەلی ئێران هەڵوەشاوە. بەریتانیاییەكان لەبەرامبەر هەڵوەشانەوەی ئەو ئیمتیازە ٥٠٠٠٠٠ لیرەیان وەك سزای جەنگی لە ئێران وەرگرت كە بە شێوەی قەرز لەلایەن بانكی شاییەوە دابین كراو دراوە. ئەوە یەكەمین قەرزی دەرەكی ئێران بوو كە دەوڵەت ناچار بوو بۆ دانەوەی ئەو قەرزە ئیمتیاز گەلێكیتر بە بەریتانیاییەكان بدات. گلادستۆن لەساڵی ١٨٩٢ و دوای سەركەتنی حیزبی لیبراڵ لە هەڵبژاردنەكاندا بۆ جاری چوارەم وەك سەرۆك وەزیران هەڵبژێردراو ئەمجارەشیان بەلاساری گەڵاڵەكەی لەمەڕ پێدانی سەربەخۆیی ناوخۆیی بە ئیرلەندا وەپێش گرتەوەو بەهۆی ئەوە كە لیبراڵەكان زۆرینەی كورسییەكانی پەرلمانیان گرتبۆوە، ئەو گەڵاڵەیە بە زۆرینەی دەنگ لەلایەن ئەنجوومەنی عەوام (نوێنەران) پەسند كرا. بەڵام ئەنجوومەنی ئەعیان یان لۆردەكان ئەو گەڵاڵەیەیان ڕەد كردەوە.

لەو ڕێكەوتەدا دەبوایە هەموو یاساكان لەلایەن ئەنجوومەنی نوێنەرانو ئەنجوومەنی لۆردەكان پەسند بكرایەو هەوڵی گلادستۆن بۆ گۆڕینی دەنگی ئەنجوومەنی لۆردەكان لەپاشماوەی دەسەڵاتیدا بێئاكام مایەوە. گلادستۆن ڕۆژی یەكەمی مارسی ساڵی ١٨٩٤ لەسەر پۆستی سەرۆك وەزیرانی لاچوو. ئەو ئیتر پیرە پیاوێكی ٨٥ ساڵە بوو و مەلیكە ڤیكتۆریاش كە لەهەر چوار خولی سەرۆكایەتی وەزیرانی ئەودا جیاوازی بۆچوونی لەگەڵیدا هەبوو، داواكارییەكەی ئەوی بۆ دەست لەكاركێشانەوە بەرێزێكی تایبەتەوە قەبوڵ كردو شاژن "لۆرد ڕۆزبێری"[29]ی كردە جێنشینی ئەو. بەڵام حكوومەتی ڕۆزبێری زۆری نەخایاند بە سەركەتنی حیزبی پارێزگاران لە هەڵبژاردنەكانی ساڵی١٨٩٥دا دووبارە سالیسبۆری وەك سەرۆك وەزیران هەڵبژێردراو تا تەواو بوونی تەمەنی مەلیكە ڤیكتۆریا درێژەی بە حكوومەت دا. لەساڵی ١٨٩٧ كە ڕێوڕەسمی شەستەمین ساڵوەگەڕی ئیمپراتۆریەتی مەلیكە ڤیكتۆریا بەڕێوە چوو نازناوی "دایكی گەورەی ئەورووپا"یان بە شاژنی ٧٨ساڵەی بریتانیا دا. لەبەرئەوەی زۆربەی پاشاو شاژنەكانی دواتری ئەورووپا نەوەی مەلیكە

28-Baron julius Reuter
29-Rosebery





ڤیکتۆریا بوون: ویلهۆڵم، یەکەمین نەوەی ئەو لەو سەردەمەدا ئێمپراتۆری ئەڵمانیا بووو ئەلێکساندرا شاژنی رووسیاو ڤیکتۆریا، شاژنی ئیسپانیاو سۆفیا، شاژنی یۆنان هەموویان نەوەی مەلیکە ڤیکتۆریا لە کچەکانی بوونو مارگارێت، شاژنی سویدیش نەوەی ڤیکتۆریا لە کورێکی بوو. مەلیکە ڤیکتۆریا لە رۆژی ٢٢ی ژانڤیەی ساڵی ١٩٠١ لەتەمەنی ٨٢ ساڵیدا مردو کوڕەکەی (ئێدوارد) لەتەمەنی شەست ساڵیدا بەناوی ئێدواردی حەوتەم لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت. بریتانیا لەدەورانی دەسەڵاتی درێژخایەنی مەلیکە ڤیکتۆریا بە بەرزترین ئاستی دەسەڵاتی خۆی گەیشتو نازناوی "ئیمپراتۆریەك کە هیچ کات لەودا خۆر ئاوا نابێت " هەر لەسەردەمە بە بریتانیا درا.

هەروەها ئەو دوایین پاشا یان شاژنی بریتانیا بوو کە راستەوخۆ دەستی لە کاروباری حکوومەتو بەتایبەت دیاریکردنی رێبازی گشتی دەوڵەت لە سیاسەتی دەرەوە وەردەدا. بەلاّم جێنشینەکانی ئەو بە نۆبە، ئێدواردی حەوتەم، جۆرجی پێنجەم، ئێدواردی هەشتەم، جۆرجی شەشەمو ئێلیزابێتی دووهەم هەرگیز ئیزنیان بە خۆیان نەدا کە دەست لەکاروباری حکوومەت وەردەنو رۆڵی پاشا لە بریتانیا بەتایبەت لەسەردەمی مەلیکەی ئێستای بریتانیا(ئێلیزابێتی دووهەم) لە هەمووکات کەم رەنگتر بۆتەوە. مەلیکە ڤیکتۆریا رێی بە سەرۆك وەزیرەکانی نەدەدا دەست لە کاروباری دەرباری بریتانیا وەردەنو نەریتی باوو کۆنی لابردنی کاربەدەستانو خزمەتکارانی کۆشك هاوکات لە گۆڕانی حکوومەت یان لەسەر کارمانەوەیان بەرازی بوونی سەرۆك وەزیرانی نوێی تێك دا. یەکێك لە کارە هەرە سەیرو سەمەرەکانی مەلیکە ڤیکتۆریا لە کۆتایی ژیانیدا بریتی بوو لە سووربوونی ئەو سەبارەت بەراگرتنی سکرتێرێکی (مونشی) هێندی لەکۆشکی دەسەڵاتی بریتانیا.

ئەو کەسە کە هەر بەناوی "مۆنشی"[٣٠] ناو بانگی دەر کردووە، موسوڵمانێکی بە رەچەڵك هێندیی خەڵکی "ئاگرا"[٣١]یە کە ناوی عەبدلکەریم بووو لەتەمەنی ٢٤ساڵیدا وەك خزمەتکاری تایبەتی مەلیکە هەڵبژێردرا بووو پێشخزمەتکاریی ئەو زیاتر لە ساڵێکی نەخایاندو مەلیکە ئەوی کردە سکرتێری تایبەتی خۆی. شاژن وەردە وەردە لەگەڵ ئەو سکرتێرە بەرادەیەکی زۆر تێکەڵاو بوو و ژمارەیەکی زۆر لە وشەو زاراوە هێندیەکان لەو فێر بووو زۆربەی کات بە هێندی قسەی لەگەڵ دەکرد.

30-The Munshi
31-Agra





**چوار نەوە(جیل) لە تەنیشت یەکتر-مەلیکە ڤیکتۆریا لەگەڵ یەکێك لە کچانی بەناوی پرەنسێسی وێڵزو نەوەکەی بەناوی دووشیزی بۆرکو نەتیجەکەی بەناوی پرەنس ئێدواردی بۆرك.**

ئەو سکرتێرە بەرە بەرە بوو بە نهێنی پارێزی رازەکانی شاژنو دەست پێراگەیشتنی ئەو بە بەڵگەنامە نهێنی‌یەکانی بریتانیا بووە هۆی زویریو بێزاری کاربەدەستانی دەوڵەتی بریتانیا بە جۆرێك کە لۆرد سالیسبۆری، سەرۆك وەزیرانی بریتانیا چەند جارێك ئەو بابەتەی لە شاژن دووپات کردەوە بەلاّم مەلیکە ڤیکتۆریا گوێی بە هیچ کام لەو راسپاردانە نەداو جارێکیشیان کاتێك کە ناوی ئەو سکرتێرەیان لەناوی هاورێکانی ڤیکتۆریا بۆ سەفەری فەڕانسە سڕیبۆوە، زۆر تووڕە بووو

بەهۆی ئەو تووڕەبییەوە هەموو ئەو نامەو بەڵگانەی فرێدا کە لەسەر مێزەکەی بوو. دوای مردنی مەلیکە ڤیکتۆریا لەساڵی ١٩٠١ روون بۆوە کە سکرتێرە هێندییەکە تەواوی ئەو نامەو یاداشتانەی کە شاژن بۆ ئەوی نووسیبوو وەك بیرەوەری لای خۆی راگرتووە کە هەموویان بە فەرمانی ئێدواردی حەوتەم، پاشای بریتانیا سووتێندران. مەلیکە ڤیکتۆریا ژنێکی هونەرمەندو هونەر دۆست بوو. ئەو بەباشی پیانۆی دەژەنی‌و گۆرانی دەوەت‌و سەمای دەکرد. هەڵبەت دوای مردنی هاوسەرەکەی، گۆرانی‌و سەمای وەلانا بەلاّم تا تەمەنی حەفتا ساڵی پیانۆی دەژەنی‌و لەوەی کە کچەکان‌و بووکەکان‌و نەوەکانی بە مۆسیقای ئەو گۆرانیان دەگوت چێژی وەردەگرت. ئەو هۆگری هونەری شانۆش بووو هەتا هاوسەری زیندوو بوو پێکەوە سەردانی هۆڵەکانی شانۆی لەندەنیان دەکرد. بەلاّم دوای مردنی هاوسەری ئیتر سەردانی هیچ شانۆیەکی نەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە دراما بە ناوبانگەکانیان بە شێوەیەکی تایبەت بۆ شاژن‌و ئەندامانی بنەماڵەکەی‌و میوانە رەسمییەکانی دەرباری بریتانیا لە یەکێك لە کۆشکەکانی پاشایەتی نەمایش دەدا.

مەلیکە ڤیکتۆریا لە یاداشتەکانی رۆژانەیدا کە چەند بەشێکی لە چاپ دراوە دەڵێت کە بەشداری لە میوانی‌وبۆنە رەسمییەکان‌و رێوڕەسمی پێشوازی‌و میوانداریەتی لە میوانانی بیانی، ناخۆشترین‌و سەخترین کاری ئەو لەسەر دەمی ئێمپراتۆریەت بووە. ئەو سەبارەت بە هەریەك لەو رێوڕەسم‌و میوانیانەش یاداشتی نووسیوەو لێرەدا باس لە چەند بەشێك لەسەفەری ناسرەدین شا بۆ بریتانیا دەکەین کە لە یاداشتەکانی مەلیکە ڤیکتۆریادا نووسراوە. لەپێشدا دەبێ وەبیرتان بێنمەوە کە بەر لە یەکەمین سەفەری ناسرەدین شا بۆ بریتانیا لەساڵی ١٨٧٣ کە یەکەمین سەفەری فەرمی پاشای ئێران بۆ بریتانیا بوو، دەنگۆگەلێکی زۆر سەبارەت بە رەوشت‌و عادەتی ئەوو هەروەها ئەوەی کە ژمارەیەك لەژنانی حەرەمسەراو قەرەواشەکانی لەگەڵ خۆی دەهێنێ بۆ لەندەن بلاّو ببۆوە. ئەو دەنگۆیانە هات‌وهاوارێکی زۆری لە کۆڕە سیاسی‌و کۆمەلاّیەتییەکاندا دروست کردبووو هەر بۆیەش گلادستۆن، سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتی بریتانیا بە مەلیکە ڤیکتۆریای گوت ئەگەر ئەو پڕۆپاگەندانە راست بێت‌و ناسرەدین شا لەگەڵ ژنان‌و قەرەواشەکانی بێتە لەندەن، دەوڵەت لەرێوڕەسمی پێشوازی‌و میوانداریەتی ئەودا بەشداری ناکات. یاداشتەکانی مەلیکە ڤیکتۆریا لە رێکەوتی٢٠ی ژووەنی ساڵی ١٨٧٣ باسی دیمانەی ئەو لەگەڵ ناسرەدین شا دەکات. لەو سەفەرەدا بە پێچەوانەی ئەو دەنگۆیانەی کە بلاّو ببۆوە هیچ ژنێك لەگەڵ ناسرەدین شا نەبوو. شاژن دیمانەکەی لەگەڵ پاشای ئێرانی بەرووداوێکی سەرنج راکێش‌و لە بیر نەچوو نرخاندوە. شاژنی پەنجاو چوارساڵەی بریتانیا



سەرەڕای سالأنێك پاشایەتی‌و ئەو ئەزموونە زۆرەی کە لەو جۆرە میوانیانەدا هەی بوو، لە ئاست ئەو" رووداوە مەزنەی رۆژ" واتە چاوپێکەوتنی ناسرەدین شا هەستی بە ئالۆزی‌و پەرێشانحاڵی دەکرد. شاژن دەنووسی: "بەم بۆنەیەوە جلێکی جوان‌و رێکوپێکم کە تایبەت بە بەیانیان بوو، لەبەر کردو مرواریيە درشتەکانم لەمل کرد. ئەستێرەو سەرشانەکانی نیشانەی بەندی گۆرەوی‌و ڤیکتۆریا‌و ئالبێرت و... م لەسەرشانم دانا". دەنگی زەنگی کەنێسە بەبۆنەی سالڕۆژی لەسەر تەخت دانیشتنی ئەوو هەروەها سەفەری رەسمی شای ئێران بۆ بریتانیا دەهات. کاتێك گاردی پاشایەتی‌و هەروەها پاسەوانانی تاوەری لەندەن بە ئۆنیفۆرمە (جل‌وبەرگی تایبەتی سەربازی) سوورەکانیان راوەستان، "هەمووشتێك لە جموجۆڵ‌و خرۆشانێکی مەزن دابوو". کاتێك کە کالیسکەکەی شا لەگەڵ یازدە کالیسکەی‌تر لە دوورەوە بەدەر کەوتن، شاژن بۆ پێشوازی لە میوانەکانی لە پلیکانەکانی (قالّدرمە) کۆشکی پاشایەتی رۆیشتە خواری‌و پێوەندیی بە وەزیری دەرەوەو کاربەدەستانی‌تری حکوومەتەوە گرت کە چاوەڕێی ئەو بوون. مەلیکە دەستی بۆلای ناسرەدین شاوە درێژ کردو بن قۆڵی ئەوی گرت‌و بەئەسپایی لەپلیکانەکانەوە سەرکەوتن. "سێردێنیز رایت"[32]ی بالۆێزی پێشوی بریتانیا لە ئێران کە دەستی بە بیرەوەرییەکانی مەلیکە ڤیکتۆریا لە مۆزەخانەی کۆشکی ئێمپراتۆری راگەیشتبوو، لە پەرتووکەکەی خۆیدا لەژێرناوی " ئێرانییەکان لەنێوان بەریتانییەکان"[33] روونکردنەوەیەکی سەرنج راکێشی سەبارەت بە چۆنیەتی میوانداری لە ناسرەدین شاو پێدانی "بەندی گۆرەوی"[34] نووسیوەو بۆ وێنە دەڵێت: "رێوڕەسمی پێدانی بەندی گۆرەوی پێش

32-Denis Wright

33-The persians Amongst The English

٣٤- هێمای بەندی گۆرەوی order of the Garter کۆنترین‌و بەرزترین هێمای پاشایەتی بریتانیایە کە لەساڵی ١٣٤٩ لەسەردەمی ئێدواردی سێهەم داندرا. ناودێرکردنی ئەم هێمایە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە ئێدواردی سێهەم لەگەڵ خۆشەویستەکەی ( کۆنتیس سالیسبۆری ) سەمایان دەکرد بەندە گۆرەوییەکەی سالیسبۆری دێتە دەری‌و دەکەوێتە سەر زەوی. ئامادەبوانی کۆڕەکە پێدەکەنن، بەلاّم ئێدواردی سێهەم بۆ سەرکۆنەی ئەوان دەچەمێتەوەو بەدەستی خۆی بەندی گۆرەوییەکە لە لاقی کۆنتیس سالیسبۆری دەکاتەوە و ئەو رستەیە دەڵێت honi soit qui maly pense کە واتاکەی ئەوەیە: سەری شۆڕبێت ئەو کەسەی خەیاڵی خراپ دەکات. ئێدواردی سێهەم دوای وتنی ئەو رستەیە دەڵێت: "ئەو بەندە گۆرەوییە ئەوەندە پیرۆز دەکەم کە هەمووکەس بۆ بەدەستهێنانی منەت بکێشێ". بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکەی، هێمای بەندنی گۆرەوی دەکاتە بەرزترین هێمای فەرمی لە بریتانیا. هێمای بەندی گۆرەوی بە ژمارەیەکی کەم دەدرێت‌و ژمارەی ئەو کەسانەی کە ئەو هێمایەیان بەدەست هێناوە نابێت





شێوی نیوەڕۆ لە ژووری سپی ئەنجامدرا. مەلیکە ڤیکتۆریا لە نێوەراستی ژوورێکی گەورە کە هاورێکانی خۆیو ناسرەدین شا دەوروبەریان پڕ کردبوو، زۆر بەژیری هەڵسوکەوتی دەکرد. هەر چەند خۆی لە بیرەوەرییەکانیدا نووسیویەتی: "رەنگە پێکەنینی بێت بەلاّم من زۆر هەستم بە شەرم دەکرد". دوو کچی مەلیکە لەگەڵ براکانیان، ئارتوورو لیۆپۆڵدا کە پێشتر ناسرەدین شایان لە وێزگەی شەمەندەفەر بینی بوو لەوێ ئامادە بوون. لەگەڵ ئەوەشدا هەم پرەنس وێڵز (جێنشین)و هەم دووکی ئێدینبۆرۆو کوڕەکەیتری شاژن ئامادەیی خۆیان بۆ بەشداری لەو ڕێوڕەسمەو هەروەها ئەو میوانی‌یەی کە دواتر دەدرا نیشان دابوو، بەلاّم شاژن کە بنەماڵەی پاشایەتیی بە رێکوپێکییەکی زۆر قوورسەوە بەڕێوە دەبرد، بڕیاریدا ئاڵ وگۆر لە بەرنامەکانی پێشتر نەدرێت... "لۆرد گرانڤیڵ"[35] هێمای بەندی گۆرەویی بەدەستی شاژن دا بۆ ئەوەی بیدات بە شای ئێران. دووشازادەی گەنج مەلیکە ڤیکتۆریایان لە دانانی شانەبەندی شین  لەسەر شانی چەپی ناسرەدین شا یارمەتی داو سەرۆك وەزیرانی ئێرانیش ئەستێرەی گەوهەر نیشانی رازاوە بە ئەڵماسی ئەوی بە سینگی ناسرەدین شاوە بەست. ناسرەدین شا دوایی دەستی شاژنی گرتو لە لێوەکانی خۆی نێزیك کردەوەو مەلیکەش رێزی پێویستی لێگرت. هەمووی ئەو ڕێوڕەسمانە لەچەند خولەکێك ئەنجام دراو دوایش پاشای ئێران هێمای تایبەتی پاشایەتی ئێرانی کە تا ئەوکاتە بە هیچ ژنێك نەدرا بوو پێشکەش بە مەلیکە ڤیکتۆریا کردو جگە لەمەش هێمای نوێی هەتاوی کە تازە لە ئێران درووست کرابوو، پێشکەش بە شاژن کرد. هێمای هەتاو زۆر کەم بە ژنان دەدراو تا ئەو رێکەوتە تەنیا دایکی ناسرەدین شاو ئێمپراتۆریسی رووسیاو پرەنسێس ڤیکتۆریای هاوسەری جێنشینی ئەڵمانیاو شاژنی بێلجیکا ئەو هێمایەیان وەرگرتبوو. ناسرەدین شا کاتێك کە ویستی شانەبەندی ئەو نیشانەیە بخاتە سەر شانی مەلیکە ڤیکتۆریا زۆر ناشیانە جوولاّوە، بەجۆرێك کە مەلیکە ڤیکتۆریا لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا نووسیویەتی: "کلاّوەکەم لەمەترسی کەوتندا بوو، بەلاّم سەرۆك وەزیرانو هەروەها پرەنسێس هێلیناو لوییز بە هانامەوە هاتن..."مەلیکە ڤیکتۆریا لە ڕێوڕەسمی بەڕێکردنی شای ئێران بۆ وڵاتەکەی کە لە رۆژی دووهەمی ژووئییە ئەنجام درا، هەردوو نیشانەکانی بەستبوو. مەلیکە ڤیکتۆریا ئەمجارەیان خۆی چاوەدێری ئەوکارەی کردبوو کە ئەفرادی گاردی پاشایەتی لە

---

لە ژمارەیەکی دیاری کراو تێپەرێت. هەر بەو هۆیەوە بە مردنی ئەو کەسانەی کە ئەو هێمایەی وەرگرتووە هێمایەکی نوییێ دەدرێت بەکەسێکیتر.

35-Lord Granville



وێزگەی شەمەندەفەروە تا دەروازەی کۆشکی وێندستۆر بۆ رێز لێنان لە پاشای ئێران بەریز راوەستن. جارێکی تریش شاژن بۆ پێشوازی لە میوانەکانی لە پلیکانەکان هاتە خوارێو قۆڵی ئەوی گرت. دواییش مەلیکە میوانەکانی بۆ ژوورە جیاجیاکانی کۆشك رێنوێنی کردو خەزێنە بەنرخەکانی کۆشکی بۆ وێنە کۆمەڵێك پەرتووکی دەستنووسی فارسیی پیشانی ئەو دا. شاژن هەروەها سەرنجی ناسرەدین شای بۆلای ئەڵماسی درشتی چیای تیشك راکێشا کە بە بەرۆکییەوە هەڵیواسیبوو. (ئەم بابەتە دیار نی‌یە ئایا شاژن دەیزانی کە هاوتا ئەو ئەڵماسە بەناوی دەریا تیشك تایبەتە بە شای ئێران یان نا؟) کاتێك کە شای شاکان رۆیشتە ناو ژووری نان خواردنی کۆشك بە زمانی فەرانسەیی گوتی: "ژوور رازاوەیەو دیمەنێکی جوانی هەیە." مەلیکە پێش ئەوەی شای ئێران کۆشکەکە بە جێ بهێڵێ وێنەیەکی واژۆکراوی خۆی پێشکەش بە ناسرەدین شا کرد. شاژن لە یاداشتەکانی رۆژانەی خۆیدا سەبارەت بە چۆنیەتی مالاّوایی شای ئێران دەنووسێ: "ئەو لەکاتی ماڵئاواییدا خەمبار بووو دەستی منی ماچ کرد". ناسرەدین شا لە سەفەری دووهەمی خۆی بۆ بریتانیا کە لە هاوینی ساڵی ١٨٨٩ ئەنجام درا، تەنیا دووجار توانی مەلیکە ڤیکتۆریا ببینێ. مەلیکە ڤیکتۆریا کە لەو کاتەدا ٧٠ساڵی تەمەن بوو، ئەرکی میوانداری لە شای ئێرانی بە کووڕەکەی بەناوی ئێدوارد ئەسپارد کە بە نازناوی "پرەنس وێڵز" ناوبانگی هەبوو. دێنیس رایت بە پاڵپشتی ئەو بەڵگانەی کە لە ئارشیڤە رەسمییەکانی بریتانیادا هەیە، دەنووسێ کە مەلیکە ڤیکتۆریا لە بنەڕەتدا بە بانگهێشتی ناسرەدین شا بۆ بریتانیا لەو رێکەوتەدا رازی نەبووو لە یاداشتێکی خۆیدا بۆ سەرۆك وەزیرانی ئەو کات کە بەدەستنووسی خۆی نووسیبووی، دەنووسێ: "رازی نیم کە شای ئێران بێتە ئێرە". بەلاّم لۆرد سالیسبۆری کە لەو کاتەدا وەزیری دەرەوەی بریتانیا بوو، بەهۆی بەرژەوەندی سیاسی پێی لەسەر ئەم بابەتە داگرتو لە ئەنجامدا شاژن رازی بوو وەك میوانی ئەو پێشوازی لە شا بکرێت، بەلاّم لەو بارەیەوە سوور بوو کە "ئەگەر ئەو سەردانە لە بواری سیاسیدا پیویستە، نابێت خەرجییەکەی لە ئەستۆی من بێت". دێنیس رایت هەروەها درێژەی پێدەدات کە خەزێنەداری بریتانیا سەرەڕای ئەوە کە شاژنو سالیسبۆری زویر ببوون، ئامادە نەبوو لە خەزێنەی دەوڵەت خەرجییەکانی سەفەری ناسرەدین شا بداتو تەواوی خەرجییەکانی ئەو سەفەرە پڕمەسرەفەی ناسرەدین شا بۆ بریتانیا بە سەر مەلیکە ڤیکتۆریا داسەپێندرا.





# ژنێك كه پەنجا ساڵ له وڵاتی چین حوكمڕانی كرد

له ژیاننامەو به سەرهاتی ئەو ژنانەی که به درێژایی مێژوو به دەسەڵات گەیشتوون نابێت ناوی ژنێکی چینی له بیر بکرێت. ئەو ژنه (تزۆهسی)[1] شاژنو سەرکردەی چین له نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستەمه که نیزیك به ٥٠ساڵ له چین حوکمڕانی کرد. ئەو یەکێك له تووڕەترینو بێبەزەییترین ژنانی جیهانه که بەدرێژایی مێژوو دەسەڵاتی گرتۆته دەستو بۆ پاراستنی دەسەڵاتو بەردەوام بوونی حوکمڕانیەکەی، خۆی لەکوشتنی نزیکترین کەسانی نەپاراستووە. تزۆهسی له چاو ئەو ژنانەی که حوکمڕانیان کردووە، کەمو زۆر هاوشێوەی کاترین دۆمێدیسییه بەڵام قەبارەی ئەو تاوانو دڕندەییانه که دەیخەنه ئەستۆی تزۆهسی زۆر بەربڵاوتر بووە. لەگەڵ ئەوەشدا تزۆهسی له ساڵانی کۆتایی تەمەنیدا لای گەلی چین پیرۆز بووە ونازناوەکانی وەك "دایکی پیرۆز" و " بودای پیر"ی وەرگرتووە. تزۆهسی که ناوی ئەسڵی ئەو "ییهۆنۆلا"[2]یه لەساڵی ١٨٣٥ له پەکین له دایك بوو. ئەو یەکێك له خزمەکانی بنەماڵەی کۆنی "مانچۆ"[3] بوو که له سەدەی حەڤدەهەمدا لەناوچەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی چین ( کۆریاو مەنجووری ئێستا) بەرەو باشوور هاتنه خواریو بەشێکی هەرە زۆری ئەو ناوچەیەیان داگیر کرد. باوکی تزۆهسی ئەفسەری گاردی ئێمپراتۆری بوو که ساڵێك دوای لەدایکبوونی ئەو مردو ییهۆنۆلا لەگەڵ دایكو براو خوشکەکانی جێگەیان بۆ ماڵی یەکێك لەخزمەکانی خۆی گواستەوە که ئەندامی گاردی پاراستنی ئێمپراتۆری بوو. کچه گەورەی ئەو بنەماڵەیه له حەرەمسەرای ئێمپراتۆر بووو کچه بچووکەکەی ئەو بنەماڵەیەش که ناوی ساکۆتا[4] بوو، رفیقو هاواڵی ییهۆنۆلا بوو که ڕۆڵێکی بەر چاوی له ڕەوتی ژیانی ئەودا نواند. ییهۆنۆلا لەکاتی گەنجێتیدا بەهۆی جوانییەوە سەرنجی هەمووانی بۆ لای خۆی راکێشا. ئەو

1-Tzu His

2-Yehonola

3-Manchu

4-sakota



لەتەمەنی پازدە ساڵیدا به پێچەوانەی کچانی هاوتەمەنی، باڵابەرزو لەش ناسك بوو. چاوە قەوییەکانی لەنێوان کچەکانیتری چینیو بنەماڵەی مانچۆ که چاویان ورد بوو، زیاتر له هەموو تایبەتمەندییەکانیتری خۆی دەنواند. کچانی مانچۆ به پێچەوانەی کچەکانی تری چینی له هەڵسوکەوتو تێکەڵاوییان لەگەڵ کوڕانی هاوتەمەنیان ئازاد بوونو ییهۆنۆلاش که له ژینگەیەکی ئازاد هاتووچۆی دەکرد لەتەمەنی شازده ساڵیدا ئاشقی کوڕه خاڵەکەی بەناوی "یۆنگ لۆ"[5] بوو. یۆنگ لۆ ئەندامی گاردی پاراستنی ئێمپراتۆر بووو جارجاره ییهۆنۆلای لەگەڵ خۆی بۆ نێو شاری قۆرخکراو دەبرد. کاتێك که یۆنگ لۆ بینی ییهۆنۆلا به تەمەنی حەڤدەساڵی گەیشتووە بەفەرمی خوازبێنی لێکرد، بەڵام هەر لەوکاتەو لەکۆتاییەکانی بەهاری ساڵی ١٨٥٢دا ئێمپراتۆری چین (سێن فێنگ)[6] که تازە ڕێوڕەسمی ماتەمینی باوکی تەواو ببوو بڕیاریدا حەرەمسەراکەی گەورەتر بکاتو شاژنێکی نوێ بۆ خۆی هەڵبژێرێ. شەست کەس له جوانترین کچانی مانچۆ بۆ بینینی ئێمپراتۆرو دایکی هەڵبژێردران بۆ ئەوەی لەنێوانیاندا ژمارەیەك بۆ حەرەمسەرا هەڵبژێردرێن که ییهۆنۆلاو ساکۆتاشیان لەگەڵ بوو. ڕۆژی چواردەهەمی ژووەنی ساڵی ١٨٥٢ شەست کچی جوانی مانچۆ لەبەر چاوی حیزو چنۆکی ئێمپراتۆر به ریز دەرۆیشتنو ئێمپراتۆریش به راوێژی دایکی، کچەکانی هەڵ دەبژارد. ٢٨ کچ لەو شەست کچەی له پێشبڕکێیەکەدا بەشدارییان کردبوو هەڵبژێردران که ییهۆنۆلاو ساکۆتاشیان لەگەڵ بوو. ژنانی حەرەمسەرا به چوار گرووپ یان دەسته دابەش دەکران و لەو بارەیەوە پتر پێگەی بنەماڵەیی کچەکان لەبەرچاو دەگیرا. ساکۆتا که بەراوەرد لەگەڵ کچەکانیتر پێگەیەکی بەرزتری بوو له گرووپی یەکەم داندراو ییهۆنۆلاش که له هەموویان جوانتر بوو له گرووپی سێهەم جێی گرت. ساکۆتا لەنێوان کچەکانی گرووپی یەکەمیشدا پلەی یەکەمی بەدەست هێناو هەر بەم هۆیەشەوە پێش هەموویان شانازی خەوتن لەگەڵ ئێمپراتۆری بەدەست هێنا. ئەگەر ساکۆتا کوڕێکی له ئێمپراتۆر بوایه دەیتوانی پۆستی شاژنی چینیش بەدەست بێنێو کچەکانیتریش جارجارەیەك بۆ تێر کردنی هەوەسی ئێمپراتۆر بانگهێشت دەکران. ییهۆنۆلا که خۆی بۆ هاوسەری ئێمپراتۆر لەساکۆتا به شایانتر دەزانیو

5-Jung Lu

6-Hsien Feng





بەلام دیاریکردنی نۆبەی ئەو کچانەی کە دەبوایە لەگەڵ ئیمپراتۆر هاوسەرین بن لەئەستۆی ئان تێهای بووو هەڵبژاردنی یێهۆنۆلا بە لەبەرچاوگرتنی پێوەندییەکانی رابردووی ئەو دووانە سرووشتی بوو. ئان تێهای کە بە تەواوەتی شارەزای هەڵسوکەوتو خاڵە لاوازەکانی ئیمپراتۆر بوو، پێش ئەوەی یێهۆنۆلا بنێرێتە پاڵ ئیپراتۆر هەندێك شتی فێر کرد. یێهۆنۆلاش توانایی تەواوی بۆ وەرگرتنو بە کارهێنانی ئەو ئەزموونانە هەبووو هەر بەو هۆیەشەوە کاتێك چووە ژووری خەوی ئیمپراتۆر، سێ شەوو رۆژ لەوێ مایەوەو ئیمپراتۆری هۆگرو سەوداسەری خۆی کرد. لەگەڵ ئەوەشدا یێهۆنۆلا بە لەبەرچاوگرتنی نوقسانیو لاوازی ئیمپراتۆر دڵنیا نەبوو بتوانێ لێی دووگیان بێتو بە ئامانجی خۆی بگات. بۆیەش یێهۆنۆلا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی بڕیاریدا کە دڵدارەکەی پێشووی (یۆنگ لۆ) ببینێتەوەو پێوەندی پێوە بگرێت. یۆنگ لۆ یەکێك لە ئەفسەرەکانی گاردی پاراستنی ئیمپراتۆ بووو دۆزینەوەی بۆ یێهۆنۆلا ئاسان بوو. ئان تێهای بۆ گەیشتن بەو ئامانجە یارمەتی ئەوی داو یێهۆنۆلاش چەند مانگ دواتر بە خۆشحاڵییەوە بە ئیمپراتۆری گوت کە منداڵێکی ئەوی لە سك دایە.

یەکەمین منداڵی ئیمپراتۆر کچ بوو (لە ساکۆتا بوو) و ماوەیەکی کورت دوای لەدایکبوون مرد. بەخت یاوەری یێهۆنۆلا بوو کە لەساڵی ١٨٥٦ یەکەمین منداڵی کە کوڕ بوو چاوی بە دونیا پشکووت. ئیمپراتۆر بەهۆی خۆشحاڵیی لەدایکبوونی ئەو کوڕە شایی لە دڵدا دەگەڕاو پێی وەزەوی نەدەکەوتو بە لەدایکبوونی ئەو منداڵە پێگەی یێهۆنۆلاش لە دەربار پتەوتر بووو بەناوی دایکی جێنشینی ئیمپراتۆر بوو بە سەرتۆپی حەرەمسەرای ئیمپراتۆر. هەڵبەت تا ئەو رێکەوتە هیچکەس جگە لەخودی یێهۆنۆلاو ئان تێهایو باوکی راستەقینەی منداڵەکە، واتە یۆنگ لۆ نەیدەزانی ئەو منداڵە کوڕی ئیمپراتۆر نییە. لەو بەڕوارەوە بەملاوە دەسەلاتی یێهۆنۆلا رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبووو بە لە بەرچاو گرتنی خۆشەویستیو هۆگری ئیمپراتۆر سەبارەت بە ئەو، دەنگی یێهۆنۆلا لە دانانو لابردنی کاربەدەستانو پەسند کردنی بڕیارەکان کاریگەر بوو. یێهۆنۆلا بەر لە هەموو شتێك توانی سەرنجی ئیمپراتۆر بۆ لێهاتوویيو شایستەیی کوڕە پوورەکەی کە هەمان دڵدارەکەی خۆی بوو، راکێشێو ئەو بۆ پۆستی گرینگی سەرکردایەتی گاردی ئیمپراتۆری هەڵبژێرێت. یۆنگ لۆ لەو پۆستەدا زیاترو ئاسانتر دەستی بە



خۆشەویستییەکەشی بە هیوای ئەو رۆژە کە ببێتە شاژنی چین  فیدا کردبوو، نەیدەتوانی ئەو سووکایەتییە قەبووڵ بکاتو بۆیەش پێویست بوو رێگایەك بۆ نووستن لەگەڵ ئیمپراتۆر پەیدا بکاتو پێش ساکۆتا کوڕێك بۆ ئیمپراتۆر بەدونیا بێنێ. کلیلی ئەو رێگایە لە دەست دووکەسدا بوو کە دەبوایە هەردووکیان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی رازی بکات. بەر لە هەمووشتێك رازی کردنی دایکی ئیمپراتۆر پێویست بوو، لەبەرئەوەی لەراستیدا کچانی حەرەمسەرا پێش ئەوە کە بچنە سەر جێگەو بانی ئیمپراتۆر، بە خزمەتکاری دایکی ئیمپراتۆر دەژمێردرانو ئەو بوو کە دەیتوانی سەرنجی ئیمپراتۆر بۆ لای ئەو کچانەی کە پێی جوانو هۆگریان بوو رابکێشێ. دوای دایکی ئیمپراتۆر پیاوێك بەناوی "ئان تێهای"[7] کە نێرەمووکی حەرەمسەرا بووو ئیمپراتۆر متمانەی تەواوی پێی هەبوو دەیتوانی هاریکاری یێهۆنۆلا بکات بۆ گەیشتن بە ئیمپراتۆر. ئان تێهای پێشتر هونەرمەندی شانۆ بوو کە لە هەوەسبازییەکانی سەرەتای گەنجێتی ئیمپراتۆر رێنماو هاوبەشی بوو. ئان تێهای بە پێچەوانەی ئەو شتەی کە دەینواند نێرەمووك نەبووو دەگوترا ئیمپراتۆر ئەوی بۆ تێر کردنی هەوەسەکانی بەو ناوە لای خۆی راگرتووە. لەدەرباری چین باو بوو کە ئیمپراتۆر تا ماوەیەك تەنیا لەگەڵ ژنی ژمارە یەکی حەرەمسەرا هاوسەرین بێت تا شانازی یەکەمین منداڵی ئیمپراتۆر وەبەر ئەو بکەوێت. دووگیانی ساکۆتا ماوەیەکی خایاندو یێهۆنۆلا دەرفەتی لە باری بۆ بەدەستهێنانی سەرنجی دایکی ئیمپراتۆرو نزیکی لەگەڵ ئان تێهای بەدەست هێنا. بەدەستهێنانی سەرنجو هۆگری دایکی ئیمپراتۆر لەرێگای خۆشخزمەتی بەو ئاسان بوو، بەلام چۆنیەتی نزیکایەتیو دۆستایەتی لەگەڵ ئان تێهای دیارنییە. لەسەر بنەمای دەنگۆگەلێك کە راستو درۆبوونی روون نییە، ماوەیەك یێهۆنۆلا لەشی تەسلیمی ئان تێهای کرد بووو پێوەندییەکەیان ساڵانێك درێژەی کێشا. راست بوونی ئەو دەنگۆیە لەم روانگەوە جێگەی گومانە کە ئان تێهای نەیدەتوانی بەر لە ئیمپراتۆر پێوەندی سێکسیی لەگەڵ بگرێت. کاتێك کە ساکۆتا دووگیان بوو بەر تەسکییەکانی ئیمپراتۆریش سەبارەت بە جووت بوون لەگەڵ کچەکانیتری حەرەمسەرا کۆتایی پێهات. دایکی ئیمپراتۆر میوانییەکی بۆ کوڕەکەی ئامادە کرد بۆ ئەوەی دووبارە کچەکانی حەرەمسەرا لە نزیکەوە ببینێتو بەو گرینگییەی کە بە یێهۆنۆلای دەدا سەرنجی ئەوی بۆ لای ئەو کچە جوانە راکێشا.

7-An Te Hai





یێهۆنۆلا رادەگەیشت. یێهۆنۆلا لەسەر کوتی ئەو شۆڕشانەی کە لە ئەیالەتەکانی "هۆنان"[8]و "کیانگ سۆ"[9] دەستی پێکردبوو، لێهاتوویی‌و توانایی خۆی دەرخست. ئێمپراتۆر لە پەسندکردنی بڕیار بۆ سەرکوتی ئەو شۆڕشانە سەری لێ‌شێوا بوو، بەلاّم یێهۆنۆلا داوای لێکرد کە بەرپرسایەتی ئەو کارە بخاتە ئەستۆی ئەو. یێهۆنۆلا بە یارمەتی یۆنگ لۆ توانی هێزێك بۆ سەرکوتی ئەو شۆڕشانە کۆبکاتەوەو پێش ئەوەی کە ئەو دوو شۆڕشە بچێتە نێو ئەیالەتەکانی‌تری چین سەرکووت کرا. لەو سەرکوتەدا کە بە توندوتیژییەکی زۆرەوە ئەنجام درا دەیان هەزار کەس لە یاخی‌بووانی تێدا کوژرا. ئێمپراتۆر لەو ڕێکەوتەوە لە هەموو کاروباری پەیوەست بە سیاسەتی دەرەکی‌و ناوخۆیی چین راوێژی بە یێهۆنۆلا دەکردو یێهۆنۆلا لەرێوڕەسمی میوانداری‌و وتووێژ لەگەڵ نوێنەرانی ولاّتانی‌تر لە تەنیشت ئێمپراتۆر دادەنیشت. دەسەلاّتی بێگانەکان بەتایبەت بریتانیا دوابەدوای "شەڕی تریاك "[10] لەچین زۆر ببوو. نوێنەری سیاسی بریتانیا لە چین، "لۆردئیلگین"[11] کە سەرکردایەتی هێزەکانی بریتانیای لەم ولاّتەدا لەئەستۆ بوو بە دەسکەوتەکانی بەدەستهاتوو لەشەڕی تریاك رازی نەبووو هەربەم هۆیەشەوە سەربازگەکانی بەندەری "تێنتسێن"[12]ی لە نێزیکی پێتەخت داگیر کرد. ئێمپراتۆر کە پیاوێکی نەفس نزم‌و بێ‌ئیرادە بوو، لەبەرامبەر گوشاری بەریتانیاییەکان ناچاربوو چەند پەیماننامەیەکی نوێیان لەگەڵ واژۆ بکات‌و ئیمتیازگەلێکی نوێیان پێی بداو هاتووچۆی پاپۆڕە بیانی‌یەکان لە یازدە بەندەری ئەو ولاّتە ئازاد بکات. بەپێی ئەو پەیماننامانە کە بە پەیماننامەی تێنتسین بە ناوبانگن، ئیمتازگەلێکی نوێی بازرگانی بە بێگانەکان دراو ئێمپراتۆر لەگەڵ دامەزراندنی

8-Hunan

9-kiangsu

-١٠ .شەڕی تریاك (opium war) لەساڵی ١٨٣٩دا و دوابەدوای دەستبەسەرداگیرانی تریاکی بازرگانە بریتانیاییەکان لە بەندەری کانتۆن هەڵگیرسا. پاپۆڕە سەربازییەکانی بریتانیا بەندەری کانتۆنیان بۆردوومان کردو هۆنگ کۆنگیان داگیر کرد. شەڕی تریاك لەساڵی ١٨٤٢ دوای واژۆ کردنی پەیماننامەیەك لەنێوان چین‌و بریتانیا کۆتایی پێهات‌و چینی‌یەکان ناچار بوون جگە لە غەرامەی دەستبەسەر داگیرانی تریاکەکان، مافی "کاپیتۆلاسیۆن"ی بریتانیاییەکانیش قەبووڵ بکەن‌و بەندەری هۆنگ کۆنگیش بە بریتانیاییەکان بدەن.

11-Lord Elgin

12-Tientsin



بالۆیزخانەکانی ولاّتانی بێگانە لەشاری پەکین رەزامەندی دەربڕی. بەلاّم بەهاتنە ژوورێی یێهۆنۆلا بۆ گۆڕەپانی ئەو بارودۆخە جێبەجێکرانی ئەو پەیماننامانە راگیران. لەساڵی ١٨٥٩ پێش بە هاتنی یەکەمین وەفدەکانی نوێنەرانی ولاّتانی بیانی بۆ پەکین گیرا. لەبەرئەوەی یێهۆنۆلا لە مێشکی ئێمپراتۆری رۆکردبوو کە بالۆێزخانە بیانی‌یەکان لە پەکین دەبنە سەکۆی پیلانگێڕی دژی ئێمپراتۆرو هەر بەم هۆیەشەوە دەست تێوەردانی بێگانەکان لە کاروباری ناخۆیی چین پتر دەبێت. یێهۆنۆلا لەو کاتەدا ژنێکی لاوی ٢٤ ساڵاّن بوو کە بەرادەی پێویست شارەزای بێگانەکان لە بەڕێوبردنی سیاسەتەکانیان نەبوو. و هەروەها برای بچووکی ئێمپراتۆر (گۆنگ)[13] و سەرکردەی گاردی ئێمپراتۆری (یۆنگ لۆ) ئەویان رازی کردبوو کە چین دەتوانێت لەبەرامبەر گوشاری بێگانەکان خۆڕاگری‌ۆ نەهێڵێت بێگانەکان دەست لە کاروباری ناوخۆیی چین وەردەن. بەلاّم بریتانیاییەکان بە پێچەوانەی پێشبینی یێهۆنۆلاو راوێژکارەکانی، لەسیاسەتی هەڕەشەو گوشار دەستیان هەڵنەگرت‌و بەهۆی ئەوەکە ئەو هەڕەشانە هیچ دەرەنجامێکی نەبوو، لە هاوینی ساڵی ١٨٦٠ دووبارە هێرشیان کردە سەر بەندەری تێنتسین. ئەمجارەیان جگە لە بریتانیاییەکان، فەڕانسەییەکانیش لەو هێرەشانەدا بەشدارییان کردو هێزەکانی هاوبەشی فەڕانسەو بریتانیا تەنیا بە داگیرکردنی تێنتسین رازی نەبوون‌و هێرشیان کردە سەر پێتەخت. ئیمپراتۆر کە زراوی چوو بوو داوای دەکرد شاندێك بۆ وتووێژ لەگەڵ ئیلگین بۆ بەندەری تێنتسین رەوانە بکەن. بەلاّم یێهۆنۆلا کە خوازیاری بەرەنگار بوونەوەی ئەو هێرشانە بوو، پێش ئەوەی ئێمپراتۆر بتوانێ بڕیارێك پەسند بکات، یەکەیەکی لەسەربازانی مەغۆلی بۆ شەڕ لەگەڵ هێرشبەرانی بریتانی‌و فەڕانسەیی رەوانە کرد. سەربازانی مەغۆلی پێش قەراوڵەکانی دوژمنیان خستە داوەوەو هەموویان کوشتن‌و بەو هۆیەشەوە پێشڕەوی هێزە هێرشبەرەکان راگیرا، بەلاّم ئەو راوەستانە کاتی بووو لۆرد ئێلگین بە گەیشتنی هێزی یارمەتیدەر هێرشی نوێی دەست پێکردەوە. سەربازەکانی مەغۆلی ئەمجارە نەیانتوانی لەبەرامبەر تۆپخانەی قوورسی بریتانیا خۆڕاگرن‌و پەڕش‌و بلاّو بوونەوەو یەکەکانی سەربازی چینیش کە بۆ بەرنگاری ئەو هێزانە نێردرا بوون پاش لێکەتنی زەرەدێکی گیانی زۆر پاشەکشەیان کرد.

13-Kung





ئێمپراتۆر بڕیاریدا لەپێتەخت بچێتەدەرێ‌و یێهۆنۆلاش کە دەیزانی ئەمجارەیان ناتوانن بەرگری بکەن لەگەڵ ئێمپراتۆر پەکینی بەجێهێشت. سەربازە ئەوروپییەکان دوو ڕۆژ دواتر چوونە ناو پەکین‌و دوای تالانی کۆشکەکانی ئێمپراتۆری، ئەو بینا مەزنە مێژووییانەیان سووتاند. ئێمپراتۆرو هاوڕێکانی لەشاری "جی‌هۆل"[14] کە دەکەوێتە ئەیالەتی مەنچووری گیرسانەوە. ئیمپراتۆر نەخۆش‌و لەجێدا کەوت‌و یێهۆنۆلاش کە بە بەرپرسیاری ئەو چەرمەسەریە دادەندرا کەوتە بەر رقو کینە. ساکۆتا جارێکی‌تر بوو بە سەرتۆپی ژنانی حەرەمسەرای ئێمپراتۆر، بەڵام لە بەشداری لە پیلانێك خۆی پاراست کە دووشازادە بەناوی "یی"[15]و "چێنگ"[16] بۆ دەرکردنی یێهۆنۆلا لەدەرباری چین دایان ڕشتبوو. یێهۆنۆلا جارێکی‌تر بە هاریکاری ساکۆتا توانی بچێتە سەر جێگەوبانی ئێمپراتۆر (کە لەوکاتەدا بێهۆش بوو)و مۆرە تایبەتەکەی لێ بدزێ. ئێمپراتۆر هێسن فێنگ لەسەرەتای ساڵی ١٨٦١ مردو یێهۆنۆلا دەستبەجێ ڕایگەیاند کە وەسیتنامەکەی ئێمپراتۆر لە دەستی ئەو دایە. بەپێی ئەو وەسیەتنامەیەی کە یێهۆنۆلا بە کەڵك وەرگرتن لە مۆری تایبەتی ئێمپراتۆر دروستی کردبوو، ئێمپراتۆر کوڕە پێنج ساڵەکەی (تۆنگ چی)[17] کە لە ڕاستیدا کوڕی ئەو نەبوو بۆ جێنشینی خۆی دیاری کردبووو بڕیاری دابوو کە یێهۆنۆلا بە نازناوی "تزۆهسی" یان شاژنی قەسری ڕۆژئاوایی پۆستی جێگری پاشایەتی بە ئەستۆوە بگرێت تا ئەوکاتەی تۆنگ چی بە تەمەنی یاسایی دەگات. ساکۆتاش بە پاداشی ئەو خزمەتانەی کە بە یێهۆنۆلای کردبوو، بە نازناوی "تزۆ-ئان"[18] یان شاژنی قەسری ڕۆژهەڵات ناودێر کراو پلەی سێهەمی دەرباری چینی بەدەست هێنا. یێهۆنۆلا کە ئیتر بە نازناوی تزۆهسی باسی دەکەین، دەستبەجێ دوای مردنی ئێمپراتۆر ئەرکی وتووێژ لەگەڵ بێگانەکانی بە برای بچووکی ئێمپراتۆر (کۆنگ) کە پیاوێکی کارامەبوو ئەسپارد. بێگانەکان کە خۆشیان لەدرێژە پێدانی ئەو داگیرکارییەی پەکین‌و خەرجییەکانی ڕاگرتن‌ودابینکردنی ئەو هێزانە نارازی ببوون،

14-Jehol

15-yi

16-cheng

17-Tung chih

18-Tzu An



به وەرگرتنی بەڵێنیی جێبەجێکرانی بەڵێنەکانی دەوڵەتی پێشوو لەلایەن حکوومەتی نوێی چینەوە پەکینیان چۆڵ کردو تزۆهسی بە ڕێوڕەسمێکی بە شکۆوە هاتەوە نێو پێتەخت.



**تزۆهسی لەسەرەتاکانی سەرۆکایەتی چین لەنێوان خزمەتکارەکانیدا**

پیلانێك بۆ کوشتنی تزۆهسی لە یەکەمین ڕۆژەکانی دەسەڵاتی ئەو ئەنجام درا. لەو پیلانە جگە لە "یی"و "چێنگ" کە پێشتر ئاماژەیان پێکرا، پیاوێکی دەوڵەمەندی چینیش بەناوی "سۆشۆن"[19] بەشدار بوو. پیلانگێڕەکان پێش ئەوەی بە ئامانجەکەیان بگەن، لەلایەن هێزەکانی ئێمپراتۆری دەستبەسەر کران. تزۆهسی فەرمانی بە دووشازادەکە دا کە بە گۆریسێکی ئاورێشمی خۆیان لە سێدارە بدەن، بەڵام سەبارەت بە سۆشۆن ئەوپەڕی بێ ڕەحمی‌و دڵڕەقی بەکار هێنا: تزۆهسی فەرمانیدا کە "سۆشۆن بەزیندوویی پارچەپارچە بکەن‌و دەبێ گۆشتی لەشی بە هەزار لەت دابەش بکرێت !". هەروەها داراییەکەشی بە قازانجی ئێمپراتۆری دەستی بەسەردا گیرا و لە ڕاستیدا ئەوە تزۆهسی بوو کە تەواوی سەرمایەو گەوهەرو زەوییەکانی ئەوی داگیر کرد. چوار ساڵی سەرەتای حکوومەتی تزۆهسی کەم‌و زۆر بێ ڕووداوێکی گرینگ تێپەڕی. پرەنس کۆنگ، برای ئیمپراتۆری پێشوو بەکردەوە ڕۆڵی وەزیری دەرەوەی دەگێڕاو بەو شارەزایی‌و لێهاتووییەی کە لە وتووێژو مامەڵە لەگەڵ بێگانەکان بەدەستی هێنابوو ئەوانی بۆ هاوکاری لەگەڵ حکوومەتی نوێ هان داو لەبەرامبەریشدا ئیمتیازگەلێکی پێدان کە بووە هۆی

19-Su Shun





زیاتربوونی دەسەڵاتی بێگانەکان. ئەرکی ڕێکخستنی سوپای چین درا بە یۆنگ لۆ کە هەر وەك جاران  لەلایەن تزۆهسییەوە خۆشەویست بووو گرینگی تایبەتی پێدەدرا. تزۆهسی جگەلە پرەنس کۆنگو یۆنگ لۆ، گرینگییەکی تایبەتیشی دەدا بە ئان تێهای کە رۆڵێکی گرینگی لەسەر کەوتنەکانی ئەودا گێڕا بوو. ئان تێهای ئەو رۆڵەی کە بۆ ئێمپراتۆری پێشووی دەگێرا، بۆ تزۆهسی‌یشی لەئەستۆ گرتبوو. لەو کۆڕە بەزمو خواردنەوانەی کە ئان تێهای بۆ شاژنی دەرزاندەوە، جوانترین پیاوەکانی چینیی کە بەزۆرینە شانۆکارو مۆسیقاژەنو گۆرانی‌بێژ بوون، بەشدارییان دەکردو تزۆهسی کە لەتەمەنی سی ساڵی بۆ سەرەوە بەراورد لەگەڵ تەمەنی لاوێتی سەبارەت بە بابەتی سێکس چاو برسیتر بوو رۆژ بە رۆژ لە گەندەڵیدا نوقمتر دەبوو. لەئاکامدا، زێدەرۆییەکانی ئان تێهای‌و دەستێوەردانە رۆژ لە دوای رۆژ زیاترەکانی ئەو لە کاروباری دەوڵەتدا پرەنس کۆنگی توورە کردو لە دەرەئەنجامی پیلانێك کە  لەلایەن ئەوو بە بەشداری‌و هاوکاری تزۆئان (مەلیکە ژمارە٢) ئەنجام درا، ئان تێهای کوژرا. تزۆهسی زۆر بە توندی لەم رووداوە توورە بووو هەر بەم هۆیەشەوە پرەنس کۆنگی  لەسەر کار لابردو رقی لە تزۆئان هەڵگرت. تزۆهسی دوای ئەو رووداوە زۆرتر بە یۆنگ لۆ پشت ئەستور بووو لەنێوان ئەندامانی بنەماڵەی هاوسەری تەنیا پشتیوانیی لە برای بچووکی هاوسەری بەناوی "چۆن"[20] کردو خوشکەکەشی کردە هاوسەری. لەساڵی ١٨٧٢ تەمەنی کوڕەکەی تزۆهسی (تۆنگ چی) گەیشتە شازدە ساڵ کە لەچین بە تەمەنی یاسایی دەژمێردرا. تزۆهسی بە رواڵەت دەسەڵاتەکانی حکوومەت‌و ئیمپراتۆریەتی بە کوڕەکەی ئەسپارد بوو، بەڵام بەکردەوە لە پشتی پەردەدا سەرکردەو دەسەڵاتداری راستەقینەی چین بوو. ئێمپراتۆری گەنج بە بێ ئیزن‌و رازی بوونی دایکی هیچ کارێکی نەدەکرد. یۆنگ لۆش کە باوکی راستەقینەی ئێمپراتۆری نوێ بوو دەسەڵاتێکی بەرفراوانی لە ئێمپراتۆریەتی تۆنگ چی‌دا بەدەست هێنا. بەڵام ئەویش ناچار بە ملکەچی لە ئاست دایکی ئێمپراتۆرو دابینکردنی ئامانجەکانی ئەو بوو. هەڵەی تزۆهسی لێرەدا ئەوەبوو کە کچێکی جوان‌و ژیری بەناوی "ئالۆتیێ"[21] بۆ هاوسەری کوڕەکەی هەڵبژارد. ئالۆتیێ لەساڵی یەکەمی زەماوەندی لەگەڵ ئێمپراتۆردا مەلکەچی فەرمانەکانی دایکی ئیمپراتۆر بوو، بەڵام دوای ئەوە کە جێگە پێی خۆی پتەو کردو ئێمپراتۆری لاوی خستە ژێر کارتێکەری

20-Chun
21-Alute



خۆیەوە، ئیتردەستی بە ململانی لەگەڵ تزۆهسی کرد. ئێمپراتۆری لاویش لەژێر کاریگەری هاوسەریدا بەرەبەرە دەستی بە خۆڕاگری لەبەرامبەر فەرمانەکانی دایکی کردو لە زۆربەی کارەکانیدا بەجێگەی دایکی لەگەڵ هاوسەری راوێژی دەکرد. تزۆهسی کە هەستی دەکرد بە زوویی تەواوی هێزو دەسەڵاتەکەی لە دەست دەدا، بۆ لابردنی کوڕەکەی‌و بووکەکەی دەستبەکار بوو. تزۆهسی لەوە دەترسا کە ئەگەر ئالۆتیێ کوڕی بێ دەتوانێ بەناوی دایکی جێنشینی ئێمپراتۆری پێگەی خۆی پتەوتر بکات‌و ئەگەریش ئێمپراتۆر مرد (کە بەهۆی لاوازی‌و نەخۆشی ئەگەری مردنی نێزیك بوو) دەتوانێ وەك جێگری ئێمپراتۆرو دایکی ئێمپراتۆری داهاتوو دەسەڵات بگرێتە دەستی خۆی. ئێمپراتۆر تونگ چی لەساڵی ١٨٧٥ لەتەمەنی نۆزدە ساڵیدا مرد. تۆنگ چی بەر لە مردن ماوەیەك نەخۆش‌و لە جێدا کەوتبووو هەر لەبەرئەوەش مردنی ئەو سرووشتی دەهاتە بەرچاو. بەڵام زۆربەی مێژوونووسان هۆی سەرەکی مردنی لەنەکاوو پێشوەختی ئێمپراتۆری لاو دەخەنە ئەستۆی دایکی‌و لەو باوەڕە دان کە نەخۆشی درێژخایەنی ئەو بەهۆی ژەهرێکەوە بووە کە وردە وردە چۆتە ناو لەشی ئێمپراتۆروە. بەڵام ئالۆتیێ، هاوسەری ئێمپراتۆری گەنجیش دوو گیان بووو لەناوبردنی ئەو بۆ تزۆهسی ئاسان نەبوو. شێوەی ئاسایی کار ئەوە بوو کە دەبوایە بۆ هەڵبژاردنی ئێمپراتۆری داهاتوو تا کاتی زایینی ئالۆتیێ چاوەڕوانی بکرێ، بەڵام تزۆهسی پێشتر جێنشینی ئێمپراتۆری کۆچکردووی دیاری کرد بوو: ئەو جێنشینەی کە تزۆهسی لەبەرچاوی گرتبوو، کوڕی کەم تەمەنی پرەنس چۆن واتە برابچووکی ئێمپراتۆری پێشوو بوو کە بە خۆشکەزای خۆشی دەژمێردرا. تزۆهسی بەرلە وەی کە ئالۆتیێ بتوانێ دژکردەوەیەك لە خۆی پیشان بدات، ریورەسمی هەڵبژاردنی ئێمپراتۆری نوێی بەناوی "کوانگ سۆ"[22] ئەنجامداو لەگەڵ ئەوەش کە دەبوایە جێگری ئێمپراتۆری بەدایك یان باوکی ئێمپراتۆری نوێ ئەسپێردرابوایە، بەرواڵەت‌و لەسەر داواکاری ئەوان جارێکی‌تر پۆستی جێگری ئێمپراتۆری پاشای چین بە تزۆهسی ئەسپێردرا. لەوکاتەدا ئالۆتیێ چاوەڕێی لەدایکبوونی منداڵەکەی دەکرد. بەڵام تزۆهسی دەرفەتی پێ نەدا بۆ ئەوەی دوای لەدایکبوونی منداڵەکەی کە ئەگەر کوڕ بوایە، داوای تاج‌و تەختی چین بکات. کەمترلە مانگێك دوای دیاری کردنی ئێمپراتۆری نوێ هەواڵی خۆکوشتنی ئالۆتیێ هەموو کەسی وەسەرسووڕمان خست. بەڵام هیچ هۆکارێك پێشکەش نەکرا بۆ خۆکوشتنی ئەو ژنە گەنج‌و جوانە بەو منداڵەی کە لە زگی دابووو

22-Kuang Hsu





کەمتر کەسێك لەو خاڵەدا گومانی هەبوو کە تزۆهسی بۆ پتەوتر کردنی پێگەی دەسەڵاتی خۆی ئەوی کوشتوە. تزۆهسی لەم رێکەوتەوە تا ساڵی ١٨٨٧ کە ئێمپراتۆری نوێ بە تەمەنی یاسایی ئێمپراتۆریەت گەیشت بە تەواوی هێزو دەسەڵاتەوە لە چین حوکمڕانی کرد. لەو ماوەیەدا تزۆئان شاژنی ژمارە دووش بە مەرگی نادیار مرد. مێژوونووسان ئەو رووداوەش دەخەنە ئەستۆی تزۆهسی، لەبەرئەوەی ئێمپراتۆری نوێ لە رەوشتی دەسەڵاتخوازانەی تزۆهسی زویر ببوو بەردەوام هات وچۆی قەسری ئەوی دەکردو تزۆهسیش لەوە دەترسا کە کۆانگ سۆ دوای گەیشتن بەدەسەڵات، ئەو لەسەر دەسەڵات لابەرێتو هێزو دەسەڵاتەکانی بە تزۆئان بسپێرێت.



**تزۆهسی لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی**



تزۆهسی تەنانەت دوای گەیشتنی کوانگ سۆ بەتەمەنی یاسایش لە پێ ئەسپاردنی دەسەلاتەکانی حکوومەت بە خوشکەزاکەی خۆی دەپاراست. تا ئەوەکە لەئاکامدا لەساڵی ١٨٨٩ ناچار بوو دەسەلاتەکانی ئێمپراتۆریەت بەو بسپێرێت. تزۆهسی کە لەو کاتەدا ژنێکی ٥٥ ساڵە بوو بە رواڵەت دەستی لە کاری حکوومەت هەڵگرتبوو، بەڵام بەکردەوە دەستی لە تەواوی کارەکانی حکوومەت وەردەداو هیچ بڕیارێکی گرینگ بەتایبەت سەبارەت بە هەڵبژاردنی پۆستە گرینگەکانی دەسەلات بەبێ راوێژو رازی بوونی ئەو ئەنجام نەدەدرا. لەدوایین دەیەی سەدەی نۆزدەیەمدا دەسەلاتی بێگانەکان لە چین گەیشتبووە ئەوپەڕی خۆیو جگە لە بازرگانەکانو شاندەکانی نوێنەرایەتی سیاسی بێگانە، میسیۆنێرەامیشی مەزهەبیە جۆراوجۆرەکانی ولاتانی جیهان لەسەرانسەری چیندا هات وچۆیان دەکردو پاپۆرە بازرگانییەکان ئازادانەو بێ هیچ سنورێك لەبەندەرەکانی چین رادەوەستان. هاتنە ژوورەوەی شتو مەك بۆ چینو رۆیشتنەدەرێی کەرستەی خاوو بەرهەمەکانی چینی بۆ دەرەوە بەپێی هیچ یاساو رێسایێك نەبوو. دەوڵەمەندانو بازگانە بیانییەکان بە دامەزراندنی رێگەی شەمەندەفەر لەنێوان بەندەرە گرینگەکانی چینو ناوەندەکانی بەرهەمهێنانی ناوخۆییو دامەزراندنی بەندەرگەو هەندێك ناوەندی بەرهەمهێنان کە هەموویان راستەوخۆ لەژێر چاوەدێری ئەواندا بەرێوە دەچوون، کرێکارانی چینییان دەچەوساندەوەو بە کەڵك وەرگرتن لە هێزی کاری زۆرو هەرزانی چینییەکان، بەربۆمی جووتیاریو بەرهەمە دەستکردە ناوخۆییەکانی چینییەکانیان بە نرخێکی کەم لێدەکرین. دەوڵەتە بیانییەکانو بەتایبەت بریتانیاو رووسیاو ئەڵمانیاو فەڕانسەو ژاپۆن بەکردەوە چینیان بە هەرێمەکانی ژێر دەسەلاتی خۆیان دابەش کردبووو هەرکامێکیان لە بەشێك لەو ولاتە بەرینە سیاسەتی خۆیان بەرێوە دەبرد.

بریتانیاییەکان هەرێمی دەسەلاتی خۆیان لە باشووری چین بەرفراوان کردبووو رووسەکانیش بە درێژایی رێگە ئاسنی سەرانسەری سیبیری بۆ مەنچووریو داگیر کردنی بەندەری "پێرت ئارتوور" بەشێکی گرینگی باکووری چینیان داگیر کردبوو. لەساڵی ١٨٩٧ ئەڵمانییەکان ناوچەی "کیائۆچۆ"[٢٣]یان داگیر کردو هاوکات لەگەڵ ئەوان، ژاپۆنییەکانیش دەستدرێژییان کردە سەر کۆریاو فەڕانسەوییەکانیش لە باشووری رۆژئاوای چینو لەسەر هەرێمێك کە دواتر

23-kiaochow

ناوی "هێندوچینی" لەسەر داندرا سەقامگیر بوون. ئەمریکاییەکانو ولاّتانیتری ئەورووپاش هەرچەند دەستدرێژییان نەکردە سەر خاکی چین بەلاّم ئیمتازگەلێکی بازرگانی هاوشێوەی ولاّتانیتری داگیرکەریان بەدەست هێنا.

لەساڵی ١٨٩٨دا ئێمپراتۆر کوانگ سۆ کە هێدی هێدی دەسەلاّتەکانی حکوومەتی بەدەستەوە گرتو دەیهەویست خۆی لەژێر فەرمانی پووری (تزۆهسی) رزگار بکات، بەبێ راوێژو رازی بوونی ئەو فەرمانێکی دەرکرد کە بەهۆی ئەو فەرمانەوە هەندێك چاکسازی بۆ مۆدێرنیزەکردنی چین ئەنجام درا. ئەم چاکسازییانە بریتی بوون لە نویٚ کردنەوەی رێکخراوی سوپای چین بە شێوەی ولاّتانی ئەورووپیوچاوپێداخشاندنەوەی بنەماکانی بەڕێوبەرایەتی ولاّتوگۆڕینی سیستەمی دادپەروەری بە شێوەی ولاّتانی رۆژئاواییو بەرفراوان کردنی دامەزراوەکانی پەروەردەو فێر کردنو وەرگێڕانو بلاّو کردنەوەی پەرتووکە بیانییەکان لەچین. کوانگ سۆ پێشتر لەپەکین ئەم پرۆگرامەی لەگەڵ باڵوێزخانەکانی ولاّتانی ئەورووپی باس کردبووو هاودەنگی ئەوانی بۆ ئەنجامدانی ئەو چاکسازییانە وەرگرتبوو. ولاّتانی ئەورووپی لەم لایەنەوە رازی بوون کە بە ئەنجامدانی ئەو چاکسازییانە بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی ئەوان ناکەوێتە ژێر مەترسییەوەو بە بەشداری ئەوان لەو چاکسازییانە بەر ژەوەندییەکانیان سەقامگیرتر دەبوو. باڵوێزەکانی ولاّتانی دەرەوە لە پەکین کە سەبارەت بەو چاکسازییانە پشتیوانیان لە ئێمپراتۆر دەکرد، لەو باوەڕە دابوون کە تزۆهسیی ٦٣ساڵە ئیتر ئەو دەسەلاّتو هێزەی پێشوی نەماوەو ئیمپراتۆر دەتوانیٚ بە سەربەخۆیی پرۆگرامەکانی جێبەجێبکات. بەلاّم تزۆهسی بە پێچەوانەی رای ئەوان هێشتاش دەستی لە دەسەلاّت بەرنەدابووو نەیدەتوانی ئەو سەرەڕۆییانەی ئێمپراتۆر قەبوولْ بکات. تزۆهسی کە دژی ئالْو گۆڕیو چاکسازییەکانی ئێمپراتۆر بوو، سەرەتا داوای لێکرد جێبەجێکردنی فەرمانەکانی بە بیانووی ئامادە نەبوونی پێشەکییەکانی ئەو کارە تا دواین ئاگاداری وەدوابخاتو بەواتایەکیتر لەو بەڵێنانەی کە بە خەڵکی دابوو پاشەگەز بێتەوە. بەلاّم ئێمپراتۆر نەچووە ژێرباری ئەو داواکارییەی تزۆهسیو تەنانەت بۆ رێگرتن لەو کردەوانەی کە لەوانە بوو یۆنگ لۆی ئەڤیندارو راوێژکاری باوەڕ پێکراوی تزۆهسیو سەرکردەی گاردی ئێمپراتۆری ئەنجامی بدات، فەرمانی دەستبەسەر کردنی ئەوی دەر کرد. بەلاّم سیخوڕەکانی تزۆهسی پێش جێبەجێ بوونی ئەو فەرمانە شاژنیان ئاگادار کردەوە ووتیان ئێمپراتۆر دەیهەوێت یۆنگ لۆ دەستبەسەرو رەنگە فەرمانی کوشتنی پەسند بکات. تزۆهسی داوای لە یۆنگ لۆ کرد دەستبەجێ هەڵوێست بگرێو بەهێزە دەهەزار کەسییەکەی شاری قەتەغە کراو (ناوچەی



کۆشکەکانی پاشایەتیو جێگەی نیشتەجێ بوونی ئێمپراتۆر) گەمارۆ بدات. ئێمپراتۆری سەرەڕۆیان لە دوورگەیەکی نێو گۆڵی (دەریاچە) ناوەندی شاری قەدەغەکراو بەند کردو سەری چەند کەس لە راوێژکارانو هەوا دارەکانیان کە هاندەری بوون لە جەستە جیا کردەوە. باڵوێزە بیانییەکانی نیشتەجێ لە پەکین لەو بارودۆخەی کە هاتبووە ئاراوە ناڕازی بوونو نەیاندەتوانی حکوومەتی تزۆهسی کە بە جۆرێك کودتای سەربازیو بەپێچەوانەی دابو نەریتی کۆنی چین بە دەسەلاّت گەیشتبوو، بەرەسمیەت بناسن. تزۆهسی بانگەشەی ئەوەی کرد کە ئێمپراتۆر کوانگ سۆ هەر لەسەر دەسەلاّتەو تەنیا هەندێك لەکەسانو لایەنگرەکانی لەسەرکار لابراون. تزۆهسی بۆ سەلماندنی بانگەشەکەی ژنە دیپلۆماتکارە بیانییەکانی نیشتەجیٚ لەپەکینی بۆ شاری قەتەغەکراو بانگهێشتن کردو فەرمانیدا کە هاوکات لەگەڵ میوانداری لەو خانمە دیپلۆماتکارە بیانییانە، ئێمپراتۆر بە سەرو وەزعێکی رێکوپێکەوە بۆلای ئەو بهێنن. تزۆهسی لەو ماوە کورتەی کە ئێمپراتۆر لەو کۆڕەدا ئامادە بوو، زۆر بە دڵسۆزیو هێمنی هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردو بە خانمە دیپلۆماتکارەکانی وا پیشاندا کە پێوەندی ئەو لەگەڵ ئێمپراتۆر زۆر باشو ئاساییە. هەڵبەت ئێمپراتۆریان دوای ئامادە بوون لەو کۆڕە بردەوە بەندیخانەو کوانگ سۆش هیچکات لەهۆکاری ئەو دڵسۆزییە کورتەی پووری تێنەگەیشت. لەساڵی ١٨٩٨داو دوابەدوا کودتای تزۆهسی بزاڤێك بەدژی ئەو دەست تێوەردانە رۆژ لە دوای رۆژ زیاترەی بیانییەکان سەری هەڵدا. کۆمەڵە کەسانێك سەرۆکایەتی ئەو بزاڤەیان دەکرد کە وەرگێڕانی وشەبەوشەی دەقە چینییەکەی دەبێتە "ئەنجوومەنی مستە هەماهەنگەکان"[٢٤] کە واتای یەکگرتوییو یەکپارچەیی ئەندامانی کۆمەڵەکە دەگەیێنیٚ. بەلاّم بیانییەکان ناوی "کۆمەڵەی مست لێدەران" یان لەسەرداناو ناوی کۆمەڵەکە دوای راپەڕینی ئەوان کە هێدی هێدی بەربلاّوتر دەبوو، بە "راپەڕینی بۆکسۆرەکان"[٢٥] ناوبانگی دەرکرد کە بە پێچەوانەی نازناوەکەی هیچ پێوەندییەکی بە مستو مستەکۆڵەوە نەبوو. راپەڕینی دژی دەسەلاّتو دەست تێوەردانی بیانییەکان بە هێرشی پەڕشو بلاّو بۆ سەر نووسینگەکانی نوێنەرایەتیی بازرگانیو ناوچەکانی نیشتەجێ بوونی بیانییەکانو میسیۆنە مەزهەبییەکان دەستی پێکردو هێدی هێدی بەرفراوانتر بوو، بە جۆرێك کە بەهۆی تێکدانی هێڵەکانی شەمەندەفەر کە لەلایەن بیانییەکانەوە بەڕێوە دەچوو، بەشی هەرە

24-The society of Harmonious Fists

25-Boxer Rising





گەورەی گواستنەوە لەڕێگای شەمەندەفەرەوە لە کار کەوتو زەرەدو زیانێکی زۆر لە بازرگانە بیانییەکان کەوت. بالۆێزە بیانییەکانی نیشتەجێ لە پەکین بۆ پاراستنی هێمنیو پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانیان چوونە لای تزۆهسی، بەلام تزۆهسی هیچ کارێکی بۆ ڕێگرتن لە درێژەکێشانی ئەو توندوتیژییانە ئەنجام نەدا. تزۆهسی کە هیچ هێزێکی ڕێکوپێکی جگە لە هێزێکی دە هەزرا کەسیی گاردی ئێمپراتۆریو چەند یەکەیەکی بچووکی سەربازی لە ئەیالەتەکان لە دەستدا نەبوو، بەروالەت نەیدەتوانی بۆ سەرکوتی ئەو شۆڕشەی کە سەرانسەری چینی گرتبۆوە هیچ هەڵوێستێکی کاریگەر بگرێت، بەلام لە زۆربەی سەرچاوەکانی ولاتانی ڕۆژئاواییو ئەنسکلۆپیدیا بەناوبانگەکانی ئەمریکاو بریتانیادا وا باس کراوە کە تزۆهسی بە شێوەیەکی شاراوە بزاڤی بۆکسۆرەکانی بەهێزتر دەکرد بۆ ئەوەی بتوانێ کۆتایی بە دەسەلاتی بیانییەکان لە چین بهێنێ.

بزووتنەوەکانی دژی بێگانە لە چین لەساڵی ١٩٠٠ گەیشتە بەرزترین رادەی خۆیو زیاتر لە ١٠٠ میسیۆنێری مەزهەبی لەچوار مانگی یەکەمی هەمان ساڵدا کوژران. هێرش بۆ سەر هێڵەکانی شەمەندەفەرو هێڵەکانی پێوەندی تێلگراف بەرفراوان بووو لە ئاکامدا بریتانیاییەکان بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان، لە چین هێزیان دابەزاند. ئەم کارەی بریتانیاییەکان بووە هۆی بەربلاوتر بوونی بزاڤی دژی بێگانەو لەمانگی ژووەنی ساڵی ١٩٠٠ بۆ یەکەمین جار ناوەندەکانی شاندی نوێنەرایەتیی بیانی لە پەکین کەوتە بەر پەلاماری جەماوەریو لە ڕۆژی ١٩ ژووەن بالۆێزی یەکەمی ئەڵمانیا لە پەکین کوژراو دوابەدوای ئەم ڕووداوە، ناوچەکانی نیشتەجێ بوونی بیانییەکان کە بالۆێزخانە بیانییەکانیشی تێدا بوو لە لایەن هێرشبەرانەوە گەمارۆدران. بیانییەکان، تزۆهسیان بەوە تۆمەتبار کرد کە دەستی لەو ڕاپەڕینەدا هەبووەو هێزکانی گاردی ئێمپراتۆریش لە گەمارۆدانی ناوچەکانی نیشتەجێبوونی بیانییەکان بەشدارییان کردووە. لەسەرەتاکانی ساڵی١٩٠٠دا هێزێکی تێکەلاوی نێونەتەوەیی کە پێکهاتبوو لەسەربازانی ئەڵمانیا، بریتانیا، ژاپۆن، ڕووسیا ، نەمسا ، فەرانسە، ئیتالیاو ئەمریکاو سەربازانی هێندی کە لەژێر سەرکردایەتی ئەفسەرانی بریتانیادا بوون، بۆ پاراستنی گیانو بەرژەوەندییەکانیان لەچین دامەزرا. ئەو هێزە کەبە یەکەمین هێزی نێونەتەوەیی لە جۆری خۆی دەژمێردرا، لە چواردەیەمی ئووتی ساڵی ١٩٠٠ گەیشتە پەکین. دیسان بەپێی سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان، تزۆهسی بەر لە گەیشتنی ئەو هێزە بۆ پەکین فەرمانی بە یۆنگ لۆ دا کە ناوچەی نیشتەجێ بوونی بیانییەکان تۆپباران بکاو بەرلە چۆڵکردنی پەکین هەموویان پەرشو بلاو بکات، بەلام یۆنگ لۆ کە پتر بە سەر ئەقڵیدا زاڵ بوو نە چووە ژێر باری ئەو فەرمانەو جێبەجێی



نەکرد. تزۆهسیو کەسانی دەوروبەری بەر لە گەیشتنی ئەو هێزانە شاری پەکینیان چۆڵ کرد. تزۆهسی بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا جلوبەرگی ژنانی دێهاتیی چینی لە بەر کردو نینۆکە درێژەکانی قوڵەکردەوە بۆ ئەوەی لەکاتی ئەگەری تووشبوونی هێزە هاوپەیمانەکان نەناسرێتەوە. تزۆهسی لەو سەفەرە دوورو درێژەدا کوانگ سۆشی کە لەجێدا کەوتبوو بەو وەزعە ناخۆشەوە لەگەڵ خۆی برد تا بیانییەکان نەتوانن لەکاتی نەبوونی ئەو کوانگ سۆ لەسەر تەختی دەسەلات دابنێنو بۆ هەمیشە ڕێگە لە گەڕانەوەی تزۆهسی بۆ سەر تەختی دەسەلات بگرن.

تزۆهسیو هاوڕێیانی بۆ گەیشتن بە شاری "سیان"[٢٦]ی پێتەختی ئەیالەتی "شێن سی"[٢٧] کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای چین زیاتر لە هەزار کیلۆمەتریان بڕی. تزۆهسی لەو سەفەرەدا کە دوومانگی خایاند، سەرەڕای ئەوە کە ٦٥ ساڵی تەمەن بوو، خۆڕاگریو گورجو گۆڵییەکی زۆری لە خۆی پیشان دا. ئەو بە درێژایی ئەو دوو مانگە سەفەرە هەر بەو جلکە دێهاتییانە دەخەوتو تەنیا جارجارەیەك کە لە بەر باران تەڕ دەبوو، دایدەکەندو لەسەر ئاگر وشکی دەکردەوە. خواردنی ئەوان لەو ماوەیەدا تەنیا نانو هێلکە بوو، بەلام ڕەنجو ناخۆشیو برسێتی کاریگەری خۆی داناو تزۆهسی تا کۆتایی ژیانی ئیتر ساغ نەبۆوە. سەربازانی هێزی نێونەتەوەیی دوای چوونە ژوورەوە بۆ شاری پەکین تەنیا بە ئازاد کردنی بیانییەکانی ئەو شارە قایل نەبوون. ئەو پێشمارانەی (مدعی) شارستانییەت، کوشتو کوشتارو تاوانو تالانێکی ئەوەندە ناحەزو نامرۆڤانەیان ئەنجامدا کە بە باس کردنیان مووی لەشی هەربیسەرێك ڕاست دەبێتەوە. زۆرترین تاوانەکان بەدەستی سەربازانی ژێر فەرمانی ژێنراڵ "ڤۆن والدێر سی"[٢٨]ی ئەڵمانیایی ئەنجام دراو ئەفرادی ژێر دەسەلاتی ئەو بۆ قەرەبوو کردنەوەی خوێنی بالۆێزی یەکەمی ئەڵمانیا لە پەکین سەری سەدان لاوی چینیان لە جەستە جیا کردەوە. لەنەبوونی تزۆهسیو ئێمپراتۆر، تەنیا کاربەدەستێکی چینی کە بیانییەکان دەیانتوانی وتووێژی لەگەڵ بکەن یۆنگ لۆی سەرکردەی سوپا بوو. یۆنگ لۆ لەسەرەتای پاشایەتیی تزۆهسیدا سەرکردەی گاردی ئێمپراتۆری بوو کە بە وەرگرتنی ئامێرە نوێیەکانی شەڕ بۆ وێنە تۆپی کرۆپ ئەو هێزەی وەك سوپایەکی ڕێکوپێكو مۆدێرنیزە لێکردبوو. بەرگریی یۆنگ لۆ لەئاست دوایین

26-Sian

27-Shensi

28-Von Waldersee





فەرمانەکانی تزۆهسیو خۆپاراستنی ئەو لە چۆڵ کردنی پەکین بووە هۆی درووست بوونی تێگەیشتنی دوو لایەنە لەنێوان یۆنگ لۆو بیانییەکان، بەلاّم یۆنگ لۆ کە هێشتاش هەر بە تزۆهسی وەفادار مابوو هەرگیز ئامادە نەبوو لەو هەلّکەوتە بە قازانجی خۆی کەلّك وەرگرێ. یۆنگ لۆ وەردە وەردە دەرفەتی بۆ گەڕانەوەی تزۆهسی بۆ پەکین رخساندو بیانییەکانیش بەمەرجی وەرگرتنی غەرامەو سزادانی تاوانبارانی شەڕو بەدەستهێنانی ئیمتیازگەلێکی سیاسیو ئابووری نوێ لە چین رازی بوون کە تزۆهسی بۆ پەکین بگەڕێتەوە. لە رۆژی حەوتەمی سێپتەمبەری سالّی ١٩٠١ پەیماننامەیەك لەنێوان چینو ولاّتانی داگیرکەری بیانی واژۆ کرا کە بە هۆیەوە چین سێسەدو سی میلیۆن دۆلاری وەك قەرەبوو کردنەوەی زەرەدەکان تەرخان کرد بۆ دەولّەتانی داگیرکەرو بیانییەکانی نیشتەجێ لە چینو هەروەها بەلّێنی نوێی بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەوان گرتە ئەستۆ. هەروەها دەولّەتانی داگیرکەر ناوی سەد کەس لە کاربەدەستانی چینییان کە بە بڕوای ئەوان دەستیان لە کوشتاری بیانییەکانو میسیۆنێرە مەزهەبییەکان هەبوو، پێشکەش بە نوێنەرانی حکوومەتی چین کردو داوای کوشتنی ئەوانیان کرد. تزۆهسی بۆ درێژەپێدانی دەسەلاّتی ناچار بوو ئەو مەرجە قەبووڵ بکاتو بەر لە گەڕانەوە بۆ پەکین فەرمانی کوشتنی هەموویانی دەرکرد. تزۆهسی لەسەرەتاکانی سالّی ١٩٠٢داو دوای هەژدەمانگ دووری لە پەکین گەڕایەوە ئەو شارەو ئیمپراتۆری نەخۆشو بێدەسەلاّتی لەگەڵ خۆی گەڕاندەوە. تزۆهسی ئەمجارەیان بەشی هەرە زۆری دەسەلاّتەکانی خۆی بە یۆنگ لۆ ئەسپاردو خۆشی تەنیا چاوەدێری بەرزی لەسەر کاروباری حکوومەت دەکرد. لەسەرەتاکانی نۆڤەمبەری سالّی ١٩٠٧ ئیمپراتۆر کوانگ سۆ کە بەکردەوە هیچ رۆڵێکی لە بەڕێوەبردنیکاروباری حکوومەت لە دەستدا نەمابوو، مردو تزۆهسی کە خۆشی نەخۆشو لە جێدا کەوتبوو، کوڕی یەك سالّەی پرەنس "چۆن"ی (برا بچووکی کوانگ سۆی کە لە کچی یۆنگ لۆ بوو) بە جێنشینی ئیمپراتۆر هەلّبژارد. تزۆهسی رۆژی چواردەی نۆڤەمبەری سالّی ١٩٠٧ لەتەمەنی ٧٣سالّیدا مردو ئیمپراتۆری کەم تەمەنیش (پۆ-یی)[٢٩] پێنج ساڵ دواتر بەهۆی شۆڕشی کۆماریخوازان لە چین لەسەر تەختی دەسەلات لابردرا.

---

29- Pu yi.







# ژنێك كە ئیمپراتۆریەتی تێزارەكانی بەبا دا

ئەلێكساندرا یەكێك لە ژنە دەسەلاتدارەكانی مێژووی جیهان لەسەدەی بیستەمە كە لەساڵی ١٨٩٤ لەتەمەنی بیستودوو ساڵیدا تاجی شاژنی رووسیای لەسەرناو ٢٤ساڵ دواتریش لەگەڵ هاوسەرو منداڵەكانی لەشارێكی دوور كەوتووی نێزیك سیبیری گوللە باران كران. ئەو بەو كارتێكەرییە لە رادەبەدەرەی كە لەسەر هاوسەری، نێكۆلای دووهەم دوایین تێزاری (قەیسەر) رووسیا هەی بوو بەكردەوە لەسەردەمی دەسەلاتی بیستو سێ ساڵەی ئەو لە رووسیا حوكمی گێڕا. بە باوەڕی ژمارەیەك لە مێژوونووسان ئەگەر لە جێی ئەو ژنێكیتر هاوسەری نیكۆلای دووهەم بوایە، رەنگە رووسیا هیچكات تووشی شۆڕش نەبوایەو پاشماوەی تێزارەكان هێشتاش هەر لە رووسیا حوكمڕانیان دەكرد. مەلیكە ئەلێكساندرا كە ناوی ئەسڵی ئەو "ئالێكس ڤیكتۆریا هێلێنا لوییز بیاتریس"[1] بوو لە رۆژی شەشەمی ژووەنی ساڵی ١٨٧٢ لە "دارمشتات"[2]ی ئەڵمانیا لە دایك بوو. ئەو كچی یەكیك لەكچەكانی مەلیكە ڤیكتۆریا بەناوی گراندوشێس "ئالیس"و گراندووك لوئی چوارەم، یەكێك لە شازادەكانی ئەڵمانیاو فەرماندەری "هێس-دارمشتات"[3] بوو. ئالێكس لەتەمەنی شەش ساڵیدا دایكی لەدەست داو مەلیكە ڤیكتۆریا ئەركی پەروەردە كردنی ئەوی گرتە ئەستۆ. مەلیكە ڤیكتۆریا سەبارەت بە ئالێكس كە دایكی لەمنداڵییەوە لەدەست دابوو، لەهەموو نەوەكانیتری خۆشتر دەویستو خۆی پەروەردەو فێركردنی ئەوی لەژێر چاوەدێری خستبوو. هەر بەو هۆیەشەوە ئالێكس وەك نەوەو كچەكانیتری ڤیكتۆریا بە شێوەی بریتانیاییەك پەروەردە كرابووو كاتێك خۆی ناسی، زمانو ئەدەبیاتی ئینگلیزیی باشتر لە زمانو ئەدەبیاتی ئەڵمانی دەزانیو پتر وەك شازادە خانمێكی بریتانی بە ئەژمار دەهات. مەلیكە ڤیكتۆریا هەروەك منداڵو نەوەكانیتری، بەدوای مێردێكی ناسراوو شیاو بۆ ئالیكس دەگەڕاو لەو گەڕانەشدا جێنشینی رووسیای (نیكۆلا) بۆ بینییەوە. كاتێك كە ئالیكس بە تەمەنی ٢١ ساڵی گەیشت، مەلیكە ڤیكتۆریا جێنشینی

1-Alix Victoria Helena Louise Beatrice

2-Darmstadt

3-Hesse-Darmstadt



رووسیای كە لەو رێكەوتەدا ٢٥سالان بوو بانگهێشتن كردو پێشەكییەكانی ئاشنایی ئەوی لەگەڵ ئالێكس ئامادە كرد. مەلیكە ڤیكتۆریاو ئەلێكساندێری سێهەم (تێزاری رووسیا) لەو زەماوەندە ئامانجی سیاسیان هەبوو، بەلام نیكۆلاو ئالێكس كە بە نازناوی ئەلێكساندرا ناودێركرا لە رۆژانی یەكەمی چاوپێكەوتنیاندا ئاشقی یەكتر بوونو زەماوەندە سیاسییەكەیان گۆڕا بۆ زەماوەندێكی ئاشقانە. نیكۆلاو ئالێكس لە بەهاری ساڵی ١٨٩٤ لە رێوڕەسمێكدا كە بە ئامادە بوونی مەلیكە ڤیكتۆریا لە لەندەن ئەنجامدرا، بوونە دەزگیرانو نیكۆلا دوای ئەو رێوڕەسمە بۆ ماوەی مانگێك لە لەندەن مایەوەو لەو ماوەیەدا زۆر بە گەرمو گوڕی هۆگری هاوسەری داهاتووی بوو. بەلام لەو كاتانەدا باوكی نیكۆلای بە سەختی نەخۆش كەوتو لەسەر راسپاردەی پزیشكەكان بۆ كۆشكی هاوینی "لیڤادیا"[4] لەسەر كەناری نیمچە دوورگەی كەریمە گواسترایەوە كە بەڵكوو هەوای گەرمو شێدارو خۆری كەناری دەریا نەخۆشییەكەی چارەسەر بكات. بەلام كاتێك نیكۆلا لە كۆتاییەكانی ساڵی ١٨٩٤ گەڕایەوە لای باوكی، پزیشكەكان لەچاك بوونەوەی تێزار هیوا بڕاو ببوون. تێزار ئەلێكساندێری سیهەم كە دەیزانی بەو زووانە دەمرێ، داوای لە نیكۆلا كرد كە دەزگیرانو شاژنی داهاتووی رووسیا بۆلای ئەو بانگهێشتن بكات. پرەنسێس ئالێكس رۆژی بیستەمی ئۆكتۆبەری ساڵی١٨٩٤لە رێگای "سێمفرۆپۆل"[5]ەوە چووە ناو لیڤادیاو لە دە رۆژی كۆتایی تەمەنی ئەلێكساندێری سێهەم لەگەڵ دەزگیرانی چەند جار سەردانی باوكی لەسەرەمەرگی هاوسەری داهاتووی كرد. تێزار ئەلێكساندێری سێهەم لە رۆژی یەكەمی نۆڤەمبەری ساڵی١٨٩٤دا مالاوایی كردو مردنی ئەو بۆ كوڕەكەی كارەساتێكی دڵتەزێنو جەرگبڕ بوو. سەرەڕای ئەو هەولانەی كە تێزار بۆ پەروەردە كردنی كوڕەكەی لە بواری سەربازیو چاوەدێری بەردەوامی ئەو لە بواری پەروەردەو فێركردن ئەنجامی دابوو، نیكۆلا هیچ شتێكی لە هێزو شكۆی باوكی بە میرات وەرنەگرتبووو جلوبەرگی سەربازی بەتەنیا قەرەبووی ناشارەزاییو ناشیاوییەكانی ئەوی نەدەكردەوە. گراندووك ئەلێكساندێری زاوای نیكۆلا كە زۆر جێگەی متمانەی ئەو بوو، لە بیرەوەرییەكانیدا سەبارەت بە مردنی تێزارو كارێگەری ئەو مردنە لەسەر تێزاری داهاتوو دەنووسێ: "كاتێك كە تێزار مرد، نیكۆلا وەكوو منداڵ دەگریاو دڵۆپە فرمێسكەكانی بێ بڕانەوە لەچاوە شینەكانی دەهاتە خوارێ... ئەو بە گریانەوە قۆڵی

4-Livadia

5-Simferopol





منی گرتو منی بردە ژوورکەی خۆیو لەوێشدا ماوەیەك یەکترمان لە باوەش گرتبووو ئەسرینمان دەباراند. ئەو نەیدەتوانی بیری کۆبکاتەوەو لە ترسی ئەو بەرپرسایەتییە گەورەی کە وەك ئیمپراتۆری داهاتووی رووسیا کەوتبووە سەر شانی دەلەرزی...  دوای ئەوە کە کەمێك هێدیتر بۆوە بە حاڵەتی پاڕانەوەو لالانەوە گوتی ساندرۆ (بەو نێوە بانگی دەکردم ) چی بکەم! چی بەسەر منو تۆو ئالێکسو دایکمو رووسیا دادێت؟ من بۆ پۆستی تێزاری ئامادە نیم. من هەرگیز نەمدەویست ببم بە تێزار. من هیچ شتێك لە کاروباری حکوومەت نازانم، چۆن لەگەڵ وەزیرەکانم قسە بکەم"[6]. یەکەمین بڕیاری گرینگی نیکۆلای دووهەم لە پۆستی تێزاریدا ئەوە بوو کە رێکەوتی زەماوەندەکەی بهێنێتە پێشێ، لەبەرئەوەی وای بیر دەکردەوە کە ناتوانێ باری قورسی ئەو ئەرکە نوێیە بە بێ دەزگیرانی کە زۆر بە توندی گیرۆدەی ببوو بە شان بکێشێ. تەنانەت نیکۆلا پێی داگرتبوو کە رێورەسمی زەماوەندەکەی دەبێ هەر لە هەمان حەوتووی دوای مردنی باوکیو تا "کاتێك کە باوکی لەژێر ئەو میچە دایە" بەشێوەیەکی تایبەت لە لیڤادیا بەڕێوە بچێت. بەڵام براکانی تێزاری کۆچکردوو واتە مامەکانی نیکۆلا بەتوندی دژی ئەو بڕیارەو ئەنجامدانی رێورەسمی زەماوەندەکە بەرلە بەخاك سپاردنی تەرمی براکەیان راوەستانو لەئاکامدا بڕیار درا کە زەماوەندەکە دوای بە خاك سپاردنی تێزار لە رۆژی بیستو شەشەمی نۆڤەمبەر لە ساینت پیتەرزبۆرگ بەڕێوە بچێت. ئەو پاشاو شازادەو کاربەدەستە بیانییانەی کە بۆ رێورەسمی بەخاك سپاردنی تێزار چوو بوونە روسیە لەرێورەسمی زەماوەندیشدا بەشدارییان کردو ئەو نزیکی کاتە بۆ گەلی رووسیا ناپیرۆز بوو. بە جۆرێك کە زۆر کەس لەو رۆژانەدا دەیانگوت "ئەم بووکە لەپشت سەری تابووتێك هاتۆتە رووسیا". نیکۆلای دووهەم لەتەنیشت هاوسەری کە ئاشقانە خۆشی دەویست هەستی بە هێمنیو بەختەوەری دەکرد. بەڵام ئەو زەماوەندە دەرەنجامێکی خۆشی بۆ ئەوو گەلی رووسیا لێنەکەوتەوەو فاکتەری جۆراوجۆر لە کارتێکەری زۆری شاژنەوە بگرە تا هەڵسوکەوتی ئەو لەگەڵ ئەفرادی دەربارو نزیکانی هاوسەریو لە کۆتاییشدا گوازرانەوەی نەخۆشی نەمەینی خوێن (هیمۆفیلیا)[7] لەوەوە بۆ تەنیا کوڕەکەی کە بووە هۆی رووکردن سێحرو جادووو تێخزینی کەسێکی نەناسراو بەناوی

6-Robert Massi-Nicholas and Alexandra.p.57.
7-Hemophilia



"راسپوتین"[8] بۆ دەرباری رووسیا، یارمەتیدەری سست بوونی پێگەی نیکۆلای دووهەمو بەهێزبوونی ورەی شۆڕشگێڕانو داڕمانی ئیمپراتۆریەتی تێزاری لە رووسیا بوو. شاژنی نوێی رووسیا کە دوای زەماوەند ناوی "ئەلێکساندرا فیۆ دۆرۆڤنا"[9]یان لەسەر داناو تا کۆتایی تەمەنیشی بەتەواوی فێری زمانی رووسی نەبوو، زۆرتر لەگەڵ هاوسەریو کەسانی دەوروبەری بە زمانی ئەڵمانیو ئینگلیزیو فەڕانسەیی قسەی دەکرد. پێوەندی ئەو لەسەرەتادا لەگەڵ مەلیکە ماری، دایکی نیکۆلای دووهەم سارد بووو هەڵسوکەوتی ساردی ئەو لەگەڵ ژنانی دەرباری بەتایبەت هاوسەرانی چوار مامەکەی تێزار کە کارتێکەرییەکی زۆریان لەسەری هەبوو، نیکۆلای تووشی گیرو گرفت دەکرد. گەورەترین گرفتی مەلیکە ئەلێکساندرا ئەوە بوو کە نەیدەتوانی کوڕی بێتو لەحەوت ساڵی یەکەمی زەماوەندیدا چوار جار دووگیان بوو، بەڵام هەر چوارجار کچی بەدونیا هێنا. دوای ئەوە شاژن بۆ زایینی کوڕ رووی کردە سێحرو جادووو پاڕانەوە بە لەدایکبوونی کوڕێك کە ناویان نا "ئالێکسیس"[10] بیرو باوەڕە پڕپووچەکانی بەهێزتر بوو. بەڵام جێژنەکانی لەدایکبوونی ئەو کوڕە لەمانگی ئوتی ساڵی ١٩٠٤ بەهۆی تێکشکانی هێزەکانی رووسیا لە شەڕ لەگەڵ ژاپۆن شێواوو گیرۆدە بوونی ئالێکسیس بە نەخۆشی هیمۆفیلیا کە رێگەی بۆ تێخزانی راسپوتین بۆدەرباری رووسیا ئاواڵە کرد، سەرەتای دسپێکی بەلاگەلێکیتر بوو.

***

ساڵی ١٩٠٥ خاڵێکی وەرچەرخانی گرینگ لە مێژووی رووسیا بوو. لەمانگی ژانڤیەی هەمان ساڵدا هەواڵی تێکشکانی سەرشۆڕانەی هێزەکانی تێزار لە شەڕی ژاپۆنو گیرانی بەندەری "پێرت ئارتوور" ئاگری ناڕەزایەتیی لەناو خۆی رووسیا خۆشتر کردو یەکەمین شەپۆلی مانگرتنی کرێکاران لە پێتەخت دەستی پێکرد. رێبەری مانەکە قەشەیەکی لاو بەناوی "گاپۆن"[11] بوو کە رێکخراوێکی کرێکاریی بەناوی "کۆمەڵەی کرێکارانی رووس" پێکهێنا بووو هەوڵی دەدا رێگە لە زۆر بوونی دەسەلاتی کەسانی چەپو رێکخراوە لادەرەکانی

8-Gregory Rasputin
9-Alexandra Feodorovna
10-Alexis.
11-Gapon.





بزووتنەوەی کرێکاری رووسیا بگرێ. لە رۆژی یەك شەممە ٢٢ی ژانڤیەی هەمان ساڵدا سەد هەزار کرێکاری مانگرتوو لەحاڵێکدا کە گاپۆن لە پێشیانەوە بوو، بەرەو کۆشکی زستانی تێزار رێپێوانیان کردو خوازیاری ئەوە بوون کە تێزار نوێنەرەکانیان بۆ وتووێژ وەر بگرێت. بەدرێژایی رێگەی خۆپیشاندانەکە هیچ شەڕو پێکدادانێك لەنێوان خۆپیشاندەرانو هێزەکانی ئاسایش رووی نەدا، بەڵام قەزاقەکانو هێزەکانی سوارەی گاردی کۆماری لە نزیکی کۆشکی زستانی رێگەیان پێگرتن. جەماوەر بێگوێدان بە بوونی ئەو هێزانە درێژەیان بە رێپێوانەکەیان داو لەم کاتەدا بووکە سەربازەکان تەقەیان لێکردن. لەو کارەساتە کە بە یەك شەممەی خوێناوی بەناوبانگە، بەپێی سەرژمێریی رەسمی ٩٢ کەس لە خۆپیشاندەران کوژرانو سەدان کەسیشیان لێ بریندار بوو، بەڵام بەپێی ئەو سەرژمێرییەی کە لەلایەن رێکخراوە کرێکارییەکانو گرووپە بەرهەڵستکارەکانی رژێیم بڵاو بۆوە، ژمارەی کوژراوەکان بە چەندین هەزار کەس مەزندە کرا. کارەساتەکانی یەك شەممەی خوێناوی لە کاتێکدا روویدا کە رووسیا بە پێشکەوتنە خێراییەکانی بۆ گەشەسەندنی پیشەیی لەماوەی یازدە ساڵ دەسەڵاتدارێتی نیکۆلای دووهەم وەك یەکێك لە وڵاتە پێشکەوتووە پیشەییەکانی جیهانی لێهاتبوو و بەرهەمە پیشەییەکانی لە ماوەی ئەو ١٠ ساڵە دوو بەرامبەر ببوو. رووسیا کە تاکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بە وڵاتێکی جووتیاری دەژمێردراو بەشی هەرە زۆری پێداویستییەکانی لە بواری شتومەکی پیشەیی لە دەرەوە دەکڕی، ئێستا بە قۆناغی خۆبژێوی گەیشتووەو تەنانەت هەندێك لە کەل و پەلە پیشەییەکانیشی بۆ دەرەوە دەنێرێ. ژمارەی کرێکارانی یەکە پیشەییەکان لە چوار ملیۆن کەس تێدەپەڕیو گەشەسەندنی هێڵەکانی شەمەندەفەر کە لەساڵی ١٩٠٥ دەگەیشتە ٧٠هەزار کیلۆمەتر، بەشە دوور کەوتووەکانی ئەو دەوڵەتە بەرینەی پێکەوە دەلکاند. هەر بەو هۆیەشەوە بوو کە بەخێرایی هەواڵەکانی تایبەت بە کارەساتی یەك شەممەی خوێناویو دەنگۆی کوژرانی هەزاران کرێکاری مانگرتوو بەدەست سەربازەکانی تێزار لەسەرانسەری رووسیا بڵاو بۆوەو حیزبو گرووپە چەپو شۆڕشگێڕەکان کە بەهۆی گەشەسەندنی دەوڵەت لە بواری پیشەیی، داوێنی تێکۆشانیان بەرفراوانتر ببوو، توانیان شەپۆلەکانی نارەزایەتی لەسەرانسەری رووسیا بەربڵاوتر بکەن. بە جۆرێك کە لەفێوریەی ساڵی ١٩٠٥تا نۆڤەمبەری هەمان ساڵ نێزیکەی ٣ملیۆن کرێکار لە پێتەختو شارە گەورەکانی‌تر مانیان گرتو پیشە تازە بنیاتنراوەکانیان بە تەواوی نقوستان کرد. لەمانگی فێوریە یەکێك لە مامەکانی تێزار بەناوی گراندۆك سێرگەی



بەدەستی یەکێك لە تێرۆریستەکانی حیزبی سۆسیالیست تێرۆرکراو سێ‌مانگ دواتر بەهۆی تێکۆشانی گرووپە شۆڕشگێڕەکان لەناو سوپا، هەندێك بزوتنەوە لەناو هێزە چەکدارەکان دەستی پێکرد کە گرینگترینیان بریتی بوو لەراپەڕینی مەلەوانەکانی پاپۆری شەڕ کەری "پوتێمکین" لە دەریای رەش. لە ئەنجامدا تێزار نیکۆلای دووهەم کە لە ئاست ئەو رووداوانە گێژو داماو ببوو، بە پێشنیاری ژمارەیەك لە راوێژکارەکانی لەرۆژی نۆزدەهەمی ئووتی ساڵی ١٩٠٥ لە فەرمانێکدا دامەزراندنی ئەنجوومەنێکی راوێژکاریی بەناوی "دووما"[12] راگەیاند. ئەو ئەنجوومەنە کە دەسەڵاتی یاسادانانی نەبووو لە هەمان کاتدا بە پاشەکشەیەکی ئاشکرای تێزار لەبەرامبەر تەوەژمی رای گشتی دەژمێردرا، توانای دابینکردنی ویستو داخوازییەکانی جەماوەرو گرووپە سیاسییەکانی نەبوو. هەر بەو هۆیەشەوە نەتەنیا گرفتێکی چارەسەر نەکرد بەڵکوو بوێریو گوڕوتینێکی دیکەی بە خەڵك بەخشی کە بۆ دابینکردنی داخوازییەکانیان شۆڕشێکی نوێتر وەڕێ بخەن. لەنێوان لایەنگرانی تێزار، ژمارەیەکیان لایەنگری زەبرو زەنگو سەرکووتی بەرهەڵستکاران و گرووپێکیشیان لایەنگری هێمنیو پێدانی ئازادی زۆرتر بە خەڵك بوون. نیکۆلای دووهەم خۆی لایەنگری هێمنی بووو هەربەم هۆیەشەوە لە رۆژی سیهەمی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٠٥ بە هەڵبژاردنی سەرۆك وەزیرانێکی لیبڕاڵ بەناوی "کۆنت ویتێ"[13] هەنگاوێکی بەرزتری بۆ دابینکردنی داخوازییەکانی خەڵك هەڵێنا. تێزار لە راگەیاندراوێکدا کە بەبۆنەی هەڵبژاردنی سەرۆك وەزیرانی نوێ بڵاو بۆوە، بەڵێنی بە خەڵکدا کە ئەنجوومەنێکی نوێ بە دەنگی گشتی خەڵك هەڵدەبژێردرێت، ئازادی قەڵەمو رادەربڕین دابین دەکرێت، بارودۆخی کار چاك دەکرێتو مافی کرێکارەکان بۆ دامەزراندنی سەندیکا جۆراوجۆرەکان بەرەسمیەت دەناسرێت. بەڵام ئەو ئیمتیازە بەرفراوانانەش شۆڕشگێڕەکانی رازی نەکردو بە گەڕانەوەی چەند کەس لە شۆڕشگێڕانی دوورە وڵاتی وەك ترۆتسکیو لێنین بۆ گۆڕەپانی شۆڕش، شەپۆلی مانگرتنو ئاڵۆزی تەواوی وڵاتی گرتەوە. لەم قۆناغەدا بوو کە نیکۆلای دووهەم بڕیاریدا دەست لە سیاسەتی هێمنیو سازش هەڵگرێو لەبەرامبەر مانگرتوان توندوتیژی بەکار بهێنی. لە رۆژی شازدەهەمی دێسەمبەری ساڵی ١٩٠٥، هەموو ئەندامانی کۆمیتەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی کرێکاران لەشاری ساینت پیتەرزبۆرگ دەستبەسەر کرانو فەرمانی مانگرتنو

---

12 Douma

13-Sergius Witte





راپەڕینە گشتیەکانیش کە لەلایەن ئەوانەوە دەرکرا بوو جێبەجێ‌نەکرا. مانگرتنەکە لە مۆسکۆ کە لەژێر دەسەڵاتی لێنین‌و بێلشویکەکاندا بوو گۆڕا بۆ شۆڕش‌و ئاژاوەیەکی گەورە، بەڵام بەناردنی هێزێکی یارمەتیدەرو یەکەیەکی تۆپخانە لە پێتەختەوە بڵاوە بە بێلشویکەکان کرا و لێنینیش هەڵات بۆ فینلەندا. نیکۆلای دووهەم لە ساڵی ١٩٠٦ بە متمانە بەخۆو پێگەیەکی پتەوترەوە دەستی بەکار کردەوەو بە دانانی سەرۆك وەزیرانێکی شایستەو کارامە، هەڵەکانی رابردووی قەرەبوو کردەوە. سەرۆك وەزیرانی نوێ (پیتەر ئێستۆلیپین)[١٤]، دوومای دووهەومی کە ژمارەیەك لەنوێنەرانی چەپو شۆڕشگێڕی تێدا بوو، هەڵوەشاندەوەو بە سەرکوتی هێزە بەر هەڵستکارەکان هەڵبژاردنەکانی خولی سێهەمی دوومای لە بارودۆخێکدا ئەنجام دا کە هیچکام لە بەرهەڵستکارانی دەوڵەت نەیانتوانی بچنە ناو دووما. دەورانی سەرۆك وەزیرانی ئێستۆلیپین کە لەساڵی ١٩٠٦ تا ساڵی ١٩١١ درێژەی کێشا بە باشترین سەردەمی ئێمپراتۆریەتی ٢٣ ساڵەی تێزار نیکۆلای دووهەم دەژمێردرا، لەبەرئەوەی کە لەو سەردەمەدا رووسیا هێمنی خۆی بەدەست هێناوەو هاوکات لەگەڵ سەرکوتی بەرهەڵستکاران، هەندێك چاکسازی بۆ رازی کردنی خەڵك ئەنجام درا. گرینگترین کاری ئێستۆلیپین بریتی بوو لە چاکسازی زەوی‌و دابەشکردنی زەویە کشتوکاڵییەکان لەنێوان جووتیارەکانی رووسیا، بە جۆرێك کە لە کۆتایی حکوومەتی پێنج ساڵەی ئەودا ٩ملیۆن بنەماڵەی جووتیاری رووس زەوی کشتوکاڵییان بەدەستهێنا بوو. لەو ماوەیەشدا سرووشت یارمەتی دەری بوو، لەبەرئەوەی کە ئاوو هەوای لەبارو بارانی زۆروبەجێ ئاستی بەربۆمی جووتیاریی گەیاندبووە رادەیەك کە رووسیا بۆ یەکەمین جار توانی بەربۆمی جووتیاری بنێرێتە دەرێو بواری گەشەپێدانی پیشەییش بە کەڵك وەرگرتن لەداهاتەکەی بەرەو پێش بەرێت. رێگای شەمەندەفەری سەرانسەری رووسیا تا رۆژهەڵاتی سیبری تەواو کراو هەزاران کیلۆمەتر هێڵی نوێی ئاسن دامەزرا. بە بەرزبوونەوەی ئاستی داهاتی دەوڵەت، حەقدەستی فەرمانبەرانو کادیرەکانی هێزە چەکدارەکان پتر کراو کرێکارەکانیش کەبەشی هەرە زۆری هێزە بەرهەڵستکارەکانیان پێك دەهێنا، بواری ژیانیان باشتر بوو. بەمجۆرە بوو کە هێزو ژمارەی بەرهەڵستکاران کەمتر بوّوەو بەدرێژایی دەسەڵاتی ئێستۆلیپین مان یان ئاڵۆزییەکی گەورەو ئەوتۆ رووی نەدا. ئێستۆلیپین لەبەرامبەر

14-P.Stolypin



کۆنەپەرستانی دەربارو بەرهەڵستکارانی چاکسازی پتر پشت بە دووما ئەستوور بووو هەر بەم هۆیەشەوە ئەو کەسانە هەندێك پیلانو چالاکییان بە دژی دووما ئەنجامدا. بەڵام ئێستۆلیپین بە پشتیوانیو متمانەی تێزار توانی لەبەرامبەر ئەو چالاکیو پیلانانە خۆڕابگرێت تا ئەوەکە رووداوی راسپوتین ناکۆکی خستە بەینی ئەو ومەلیکە ئێلکساندراو هەر بەم هۆیەشەوە مەلیکە ئەلێکساندرا پێوەندی بە بەرهەڵستکارەکانی ئەوەوە گرت.

**مەلیکە ئەلێکساندرا دوای لەدایکبوونی یەکەم منداڵی لەگەڵ مەلیکە ڤیکتۆریا –تێزار نیکۆلای دووهەمو پرەنس ئێدڤارد، جێنشینی بریتانیاش لە وێنەکەدا دەبیندرێن**

***

ئێستا کەمێك بۆ دواوە دەگەڕێینەوەو رۆڵی راسپوتین لە ژیانی مەلیکە ئەلێکساندرا لە ساڵەکانی ١٩٠٥ تا١٩١١ روون دەکەینەوە. بەڵام دەبێ لە پێشدا ئەو قەشە نەناسراوە کە دوای نیکۆلای دووهەم گرینگترین رۆڵی لە ژیانی مەلیکە ئەلێکساندرا نواند، باشتربناسین راسپوتین نازناوێکە کە گەلی رووسیا لەسەر قەشەیەکی گۆندی بەناوی "گریگۆری ئێفیمۆڤیچ نۆڤیخ"[١٥]یان دانابووو ئەو نازناوە کە لەهەموو جێگەیەك لەجیاتی ناوە ئەسڵییەکەی بەکار

15-Grigori Efimovich novikh

هاتووە، ناسێنەری ئەو بە ڕواڵەت پیاوە ئایینی‌یە خراپکاریە: ڕاسپوتین لە وشەی رووسی "ڕاسپوتنی"[16] گیراوە کە واتای پیاوێکی چەپەڵو هەوەسبازو بەد ڕەوشت دەگەێنێ. گرێگۆری نۆڤیخ کە ئێمەش بەناوی ڕاسپوتین باسی دەکەین لەساڵی ١٨٧١ لە یەکێك لە گوندەکانی دەوروبەری "تۆبۆلسك"[17] کە دەکەوێتە ناوچەی سیبری لە دایك بووو لەتەمەنی لاویدا پێوەندیی بەیەکێك لە گرووپە مەزهەبییەکان بەناوی "خلیستی"[18] گرت. پێڕەوانی ئەو ڕێبازە مەزهەبییە ڕێوڕەسمە مەزهەبییەکانیان بە گۆرانیو سەماو خۆبادانی توند بەڕێوە دەبرد و بەکردەوە ئەو ڕێورەسمانەیان بۆ کۆڕی عەیشو خواردنەوەو هەوەسبازی گۆڕی بوو. پیاوو ژن لە ڕێوڕەسمی مەزهەبی ئەو ڕێبازە بەشدارییان دەکردو دوای ماوەیەك سەماو خۆبادانی توند، ئاگایان لەخۆیان نەدەماو لەحاڵەتی مەستیو بێهۆشی یان نواندنی ئەم حاڵەتانە جووت دەبوونو ئاگری هەوەسیان دادەمرکاند. ڕاسپوتین لەتەمەنی ٢٥ساڵیدا لە زێدی خۆیو لە نێزیکی ١٠٠ گوندی دەوروبەری پیاوێکی ناسراو بوو. ناوبانگی ئەو قەشە گەنجە جگە لەچاوە تیژو کارتێکەرەکانی، پتر بەهۆی هەندێك دەسەوەسان "مۆعجزە"و کەرامەت بوو کە بۆیان هەڵبەستبوو. لە تەواوی گووندەکانی دەوروبەری تۆبۆلسك دەنگۆی ئەوە لە ئارادابوو کە ڕاسپوتین نەخۆشە چارەسەر نەکراوەکان دەرمان دەکاتو داهاتووی هەرکەسێك بەجارێك چاولێکردن لەروخساری پێشبینی دەکات. خەڵکی تۆبۆلسكو دەوروبەری لەو بڕوایە دابوون کە قەشە ڕاسپوتین ئاگاداری سڕەکانی گەردوونەو لەگەڵ زاتی خودا پێوەندی هەیەو هەربەو هۆیەشەوە پێش ئەوەی نازناوی ڕاسپوتین وەربگرێت، ئەویان بەناوی "بووژی چێلۆڤێك"[19] دەناسی کە واتاکەی لەزمانی رووسی پیاوی خودایە! لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا ناوبانگی ڕاسپوتین گەیشتبووە شارە گەورەکانی وەکوو مۆسکۆو کییەفو کازان. لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم لە کەنیسەکانو کۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی ساینت پیتەرز بۆرگیش ناوی ئەم قەشە مۆعجزەگەرەیان بیستبوو، بەڵام لەو ساڵانەدا لە تەنیشت مۆعجزەو کەرامەتەکانی قەشە ڕاسپوتین داستانگەلێك سەبارەت بەد ڕەوشتی هەوەسبازییەکانی ئەو لەسەر زمانان بوو. دەگوترا قەشە ڕاسپوتین زۆربەی ئەو ژنو کچە گەنجانەی کە بۆ دان پێدانان یان ئاگادار

16-Rasputny

17-Tobolsk

18-Khlisty

19-Bojy Tchelloviek



بوون لەداهاتوویان دەچوونەلای، فریودەداودەستدرێژی پێدەکردن. دەنگۆی ئەوە هەبوو کە هیچکەس نەیدەتوانی لەبەرامبەر چاوەکانی خۆڕابگرێو قەشە گریگوری تەنانەت بەهێزی هیپنۆتیزم زۆر ژنی نەجیب زادەو ناسراوی ناچار بە ملکەچی لە ئاست مەیلو هەوەسبازییەکانی دەکرد. ڕاسپوتین نەخۆشی "سادیسم"یشی هەبووو بۆ وێنە یەکێك لەو داستانانەی کە لەبارەی ئەوی دەگێڕنەوە ئەوەیە کە جارێکیان کچێکی گەنج لە شاری کازان بە رووتو قووتی لەدەست ئازارو ئەشکەنجەکانی ئەو هەڵدێتو ڕاسپوتینیش قامچی بەدەست لە شەقامەکانی کازان بەدوای دەکەوێ. ڕاسپوتین دوای ئەو ڕووداوە ناچار دەبێت شاری کازان بەجێ بهێڵێ، بەڵام لە ژمارەی تامەزرۆو هۆگرانی لە شارەکانی‌تری رووسیا کەم نەبۆوە. یەکەم جار ڕاسپوتین لەساڵی ١٩٠٤دا ڕۆیشتە ناو شاری ساینت پیتەرز بۆرگو بەهۆی ئەو ناوبانگەی کە لەو ڕێکەوتەدا بەدەستی هێنا بوو، توانی ڕێگەیەك بۆ ڕۆیشتنە ناو کۆڕی دەوڵەمەندانی پێتەختی رووسیا بدۆزێتەوە. ڕاسپوتین لە یەکەمین ساڵەکانی نیشتەجێ بوونی لە ساینت پیتەرز بۆرگ لەگەڵ ژمارەیەك لە ژنانی دەرباری رووسیاش پێوەندی گرتو ئەوانی خستە ژێرکاریگەری خۆی. لەگەڵ ئەوەشدا ڕاسپوتین تا ساڵی ١٩٠٦ کە لە ڕێگای یەکێك لە ژنەکانی دەرباری بە تێزار نیکۆلای دووهەمو مەلیکە ئەلێکساندرا ناسێندرا، نەیتوانی بوو ڕێگایەك بۆ چوونە ناو کۆشکی ئێمپراتۆریەت بدۆزێتەوە. تێزار بەر لە وەرگرتنی ڕاسپوتین لەگەڵ ئۆسقۆفی گەورەی کەنیسەی ئۆرتۆدۆکسی رووسیا (تیێئۆفان)[20] ڕاوێژی کردو خراپی ناوبانگی ئەوەی سەبارەت بە بەدرەوشتی وەبیر تیێئۆفان هێناوە، بەڵام تیێئۆفان کە پێشتر چەند جارێك لەگەڵ ڕاسپوتین چاوپێکەوتنی ئەنجام دابووو کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەو، ڕوون کردنەوەیەکی سادەی بۆ دان پێدانانی کەسایەتی ڕاسپوتین خستە ڕوو. تیێئۆفان هاوکات لەگەڵ ئاماژە بە خراپی ناوبانگی ئەو گوتی: (من لە تاوانەکانی ئەو ئاگادارم... ئەو زۆر تاوانی کردووە کە هەندێکیان زۆر گەورەن. ئەو لەگەڵ ئەوەشدا دوای ئەنجامدانی هەر تاوانێك لە دەرگای خوای مەزن تۆبەو داوای لێبۆردن دەکاتو بە پشتگەرمی بە بەخششی خودا وەك منداڵێك کە تازە لە دایك دەبێت پاكو بێگەرد دەبێتەوە!)[21]

20-Theophane

٢١- وتنی ئەو وتانە لە زمانی پیاوێکی ئایینی، ئەویش لە پۆستی ئۆسقۆفی کەنیسەی گەورەی ئۆرتۆدۆکسەوە سەیرو سەمەرە دەهاتە بەرچاو. بەڵام ئەو کەسەی کە ئەو قسانە لە زمانی ئۆسقۆفی گەورەی کەنیسەی ئۆرتۆدۆکس دەگێڕێتەوە مووریس پاڵئۆلۆگی Maurice paleologue نووسەرو مێژوونووسی بەناوبانگی فەڕانسەیە کە لە لە ساڵەکانی کۆتایی حکوومەتی تێزار باڵوێزی فەڕانسە بووە.





راسپوتین لە یەکەمین چاوپێکەوتنی لەگەڵ تێزارو ئەلێکساندرا، ئەوان دەخاتە ژێرکاریگەری خۆیو لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بابەتی نەخۆشی جێنشینی کەم تەمەنی تێزارو رۆڵی راسپوتین لە چارەسەر کردنو کۆنترۆڵی ئەو نەخۆشییە لە ئارادا نەبوایە، نەیدەتوانی لە دەرباری رووسیا ئەوەندە گرینگیو دەسەلاٌت بەدەست بهێنێ و بەکردەوە تێزارو شاژن بخاتە ژێر دەسەلاٌتی خۆی. نیشانەکانی نەخۆشی هیمۆفیلیا هەر لەسەرەتاکانی منداڵی ئالێکسیسەوە خۆی وەدەرخستو بەهۆی ئەوە کە پزیشکەکان نەیانتوانی چارەسەری بکەن، بە پێداگری شاژن داوایان لە راسپوتین کرد کە سەردانی ئەو منداڵە بکات. راسپوتین یەکەم جار لە بارودۆخێکی قەیرانی کەهەوڵی پزیشکەکان بۆ بەرزکردنی خوێبەربوونی ئالێکسیس هیچ دەرەنجامێکی لێ نەکەوتبۆوە، لەسەر جێگەی ئەو ئامادە ببوو لە حاڵەتێکدا کە داوای لە شاژن کرد چاو لە چاوی برێت، دەستی بەخۆێندنی هەندێك دووعا کرد کە کەس ماناکەی نەدەزانی. بەلاٌم تێزارنیکۆلای دووهەمو شاژن کە لەسەر جێگەی منداڵەکەیان ئامادە بوون، بە سەرسوورمانەوە بینیان خوێنرێژی کورەکەیان هاوکات لەگەڵ خوێندنی ئەو پارانەوانە هێدی هێدی راوەستاو ئالێکسیس لە مردن رزگاری بوو. هاتوو چۆی راسپوتین دوای ئەم رووداوە زیاتر بووو مەلیکە ئالێکساندرا کە باوەری بەهێزی لە رادەبەدەرو بان مرۆڤیی (مافوق بشری) راسپوتین هێنا بوو، داوای لێکرد بەردەوام لە دەوروبەری کۆشكو لە بەردەستیدا بێت بۆ ئەوەی لەکاتی سەرهەڵدانی هەر جۆرە مەترسییەك بۆ جێنشینی رووسیا بەبێ فیرۆدانی کات بگاتە سەری. بەلاٌم ئیتر کەڵك وەرگرتن لە موعجزەو کەرامەتی راسپوتین تایبەت بە ئالێکسیس نەبووو ژنانی دەرباریو دەوڵەمەندانی رووسیاش بۆ کەڵك وەرگرتن لە راسپوتینو گوێگرتن لە پێشگۆییەکانی ئەو نۆبەیان دەگرت. راسپوتین هەموو شەوێك لەو کۆرە بەزمانەی کە بە خاتری ئەو ئامادە دەکرا، بەشداری دەکردو دەنگۆی ئەوە لە ئارادا بوو کە شەوانە دوای خواردنەوەو خۆشرابواردن، لەگەڵ ژنێکی دەرباری یان دەولەمەند دەخەوێ. راسپوتین لەساڵی ١٩١٠دا بە کەڵك وەرگرتن لە کارتێکەریو دەسەلاٌتی خۆی لەسەر شاژنو کەسانی دەربار دەستی بەدەست تێوەردان لە کاروباری دەوڵەتی کردو ئێستۆلیپین، سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتی رووسیا کە لەو دەست تێوەردانانەی ئەو توورە ببوو، لەسەرەتاکانی ساڵی ١٩١١ فەرمانیدا تا هەندێك لێکۆلینەوە سەبارەت بە کارەکانی ئەو ئەنجام بدرێت.

راپۆرتی پۆلیس کە پێشینەی تاریكو کردەوە خراپو ناحەزەکانی راسپوتین تێدابوو بە تێزار ئەسپێردرا. بەلاٌم تێزار کە ئاگاداری هۆگریو پشت ئەستووری مەلیکە ئالێکساندرا بەو قەشە



نەناسراوە بوو هیچ هەڵویستێکی بۆ سنووردار کردنی کارەکانی ئەو نەگرت. ئێستۆلیپین خۆی دەستبەکار بووو بەبێ ئیزنی پێشوو لە تێزار، فەرمانی دوورخستنەوەی ئەوی لە پێتەخت دەرکرد. شاژن زۆر بەتوندی دژی ئەو بریارەی سەرۆك وەزیران راوەستا، بەلاٌم تێزار کە لە راپۆرتی پۆلیس سەبارەت بە رابردووی راسپوتینو کردەوەکانی لە دەربار بەپەرۆش هاتبوو هیچ هەڵویستێکی ئەوتۆی بۆ هەڵوەشاندنەوەی فەرمانی سەرۆك وەزیران ئەنجام نەداو راسپوتینیش بۆ نارەزایەتی دەربرین لەبەرامبەر فەرمانی ئێستۆلیپین، لەساینت پیتەرز بۆرگەوە یەکسەرە بەرەو "بیت المقدس" وەرێکەوت.



**راسپوتین لەسەرەتای تێخزان بۆ دەرباری رووسیا**





راسپوتین لە "بيت المقدس"یشەوە پێوەندی خۆی لەگەڵ مەلیکە ئالێکساندرا نەپچڕاندو لە نامەکانیدا بۆ شاژن، بەردەوام ئێستۆلیپینی بە پیلانگێڕی دژی بنەماڵەی پاشایەتی تۆمەتبار دەکرد. شاژن رقو کینەو شکی خۆی بۆ تیزارنیکۆلای دووهەم گواستەوەو هەر بەو هۆیەشەوە هێدی هێدی پێوەندییەکانی تێزارو سەرۆك وەزیرانە کارامەکەی بەرەو سارد بوونەوە دەرۆیشت. تا ئەوەکە لەسێپتەمبەری ساڵی١٩١١و لە کاتێکدا کە تێزار لەگەڵ سەرۆك وەزیرانەکەی بۆ پەردە لەسەرلابردنی پەیکەری ئالێکساندێری سێهەم رۆیشتبوونە کییەف، ئێستۆلیپین بەدەستی پیاوێك کوژرا کە دواتر زانرا یەکێك لە ئەندامانی پۆلیسی نهێنی رووسیا بووە. خاڵی سەیروسەمەرە ئەوە بووکە لەکاتی روودانی تێرۆرەکە راسپوتینیش کە تازە لە بيت المقدس گەڕابۆوە لە کییەف ئامادە بوو. راسپوتین دوای کوژرانی ئێستۆلیپین لەسەر داواکاری مەلیکە ئالێکساندرا گەڕایەوە پێتەختو دووبارە سەردانی جێنشینی ٧ساڵەی رووسیا کردەوە کە دووچاری نەخۆشییەکە هاتبۆوەو لەمەترسی مردن دابوو. جارێکیتر هەڵکەوتی رۆژگار یان موعجزە کاری خۆی کردو جێنشینی رووسیا لە مەترسی مردن رزگاری بوو. پزیشکانو پسپۆڕانی ناسراوی رووسیا کە توانای چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی جێنشینی رووسیایان نەبوو، ناتواننن پاساوێکی گونجاو سەبارەت بە رۆڵی راسپوتین لە چارەسەر کردنی ئەو نەخۆشیە بهێننەوە. تەنیا روونکردنەوەیەکی کە لەم بابەتە داروە ئەوەیە کە راسپوتین بەهێزی هیپنۆتیزم ئەو نەخۆشییەی کۆنترۆڵ دەکرد. لە پەرتۆکی " نیکۆلاو ئالێکساندرا"دا کە بەرهەمی "رۆبێرت ماسی"ەو خۆشی بە نەخۆشی هیمۆفیلی دەیناڵاند، ئاماژە بە هەندێك بابەتی جۆراوجۆر لە کۆنترۆڵی ئەو نەخۆشییە بە هیپنۆتیزم کراوە. رۆبێرت ماسی لە زمانی ژمارەیەك لە ئەندامانی دەربارو پیاوانی رووسیا لەسەردەمی دەسەڵاتی تێزار نیکۆلای دووهەمو تەنانەت نەیارانی راسپوتینیش ئاماژە بە کاریگەری نائاساییو لە رادەبەدەری چاوە کارتێکەرەکانی لە بینەران دەکات. بەم چەشنە پێگەی راسپوتین دوای کوژرانی ئێستۆلیپین لە جاران پتەوتر بووو هەوڵەکانی جێنشینی ئێستۆلیپینیش (ڤیلادێمیر کۆکۆڤسیتسۆڤ)[22] بۆ پچڕاندنی دەسەڵاتی راسپوتین لەدەرباری رووسیا بێ ئاکام مایەوە. لەو کاتەدا رۆژنامەو چاپەمەنییەکانی رووسیاش کە تا رادەیەك ئازادییان بەدست هێنا بوو، هەندێك هەواڵو دەنگۆگەلیان سەبارەت بە

22-Vladimir Kokovtsitsov.



راسپوتینو دەسەڵاتی ئەو لە دەرباری رووسیا بڵاو دەکردەوەو بە راشکاوی یان لە پەردەدا (شاراوە) باسی گەندەڵیو پێوەندییە سێکسییەکانی ئەویان لەگەڵ ژنانی دەربار دەکرد. لەنێو خەڵکدا دەنگۆی ئەوەش هەبوو کە راسپوتین تەنانەت لەگەڵ خودی شاژنیش پێوەندی هەیەو ئەم چیرۆکە دم بە دم دەگەڕا کە راسپوتین بەهێزی هیپنۆتیزم تێزار ناچار دەکات پێڵاوەکانی بۆ داکەنێتو لاقەکانی بۆ بشواتو دواییش لەبەر چاوی ئەو لەگەڵ شاژن جووت دەبێت!.



**ئێستۆلیپین سەرۆك وەزیرانی لێهاتووو بەهێزی رووسیا**

**کە بەدەست ئەفرادی راسپوتین کوژرا**

وردە وردە قسەو باسی راسپوتین بوو بە گرینگترین بابەتی رۆژی رووسیاو قسەو باسی ئەو رووداوە بۆ ئەنجوومەنی دووماش کێشرا. "میخائیل روودزیانکۆ"[23]ی سەرۆکی دووما کە یەکێك لە ئەفسەرانی سوارەی تێزار بوو، داوای لە نوێنەرانی دووما کرد کە لە قسەو باس سەبارەت بەو بابەتەو دووپات کردنەوەی ئەو داستانە زیندووانەی کە لەناو خەڵکدا بڵاو بۆتەوە خۆیان بپارێزن تا خۆی ئەم بابەتە لەگەڵ تێزار باس دەکات. تێزار لەکاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرۆکی دووما گووتی کە خۆشی لەو بابەتەو ئەو دەنگۆیانەی کە لەبارەی ژیانی شاژن دەیبیستێ بە پەرۆشەو داوای لە روودزیانکۆ کرد کە هەندێك لێکۆلینەوەی نهێنی سەبارەت بە کارەکانی راسپوتین ئەنجام بداو دواییش دەرەنجامەکەی پێرابگەیێنێت. راپۆرتی روودزیانکۆ

23-Michael Rodezianko





زۆربەی ئەو دەنگۆیانەی سەلماند کە پەیوەست بوو بە گەندەڵی‌و دەستێوەردانە نابەجێیەکانی راسپوتین لە کاروباری دەوڵەت. بەڵام ئەم راپۆرتەش هەروەك راپۆرتەکەی ئێستۆلیپین دەرەنجامێکی لێنەکەوتەوەو تەنانەت تێزار بەهۆی پشتیوانی توندو بەردەوامی شاژن لە راسپوتین، داواکارییەکەی روودزیانکۆی سەبارەت بە ئامادەبوونی لە روونکردنەوەیەکی بەرەوروو قەبووڵ نەکرد. تێزار نیکۆلای دووهەم بڕیاریدا لەفێوریەی ساڵی ١٩١٣جێژنی سێسەدەمین ساڵی پاشایەتی رۆمانۆفەکان لەسەر رووسیا بەڕێوە بەرێت، بەڵام رێوڕەسمی ئەو جێژنە کە لە کەنێسەی گەورەی ساینت پیتەرز بۆرگ بەڕێوەچوو، بەهۆی بەگژداچوونی توندو ناحەزی راسپوتین‌و روودزیانکۆ (سەرۆکی دووما) بەریسوایی کێشرا. راسپوتین لەو جێگەیە دانیشتبوو کە بۆ روودزیانکۆ تەرخان کرابوو و گوێی لە ئاگادار کردنەوەی یاساوڵەکان بۆ هەستان لەسەر کورسی روودزیانکۆ رانەدەگرت. روودزیانکۆ کە خۆی پیاوێکی بە خۆوەو چوار شانە بوو خۆی ئەو کارەی گرتە ئەستۆو راسپوتینی لەسەر جێگاکەی بەزر کردەوەو بەزەوی دادا. ئەو رووداوە سەرۆکی دوومای لە بەر چاوی تێزار خست‌و ئەوی بۆ رێوڕەسمەکانی دواتری مۆسکۆو پێتەخت بانگهێشتن نەکرد. شکۆی جێژنەکانی سێسەدەمین ساڵی پاشایەتی بنەماڵەی رۆمانۆف‌و ئەو حەشیمەتەی کە لە مۆسکۆ بۆ پێشوازی تێزار کۆببوونەوە ئەو باوەڕە هەڵەیەی لە دەروونی تێزارو شاژندا بەهێزکرد کە گەلی رووسیا بەراستی‌و لەقوڵایی دڵ‌و گیانەوە لایەنگری ئەوانن. راسپوتین کە لەدژایەتی سەرۆك وەزیران‌و سەرۆکی دووما سەبارەت بە خۆی تێگەیشتبوو بەتایبەت دوای ئەکێشەیەی کە لە رێوڕەسمی دەسپێکردنی جێژنەکان لەگەڵ سەرۆکی دووما تووشی ببوو، رێژەی هەوڵەکانی بە دژی ئەوان چڕتر کردو شاژنیش کە لەژێر کارتێکەری‌و لەمێشکرۆکردنی ئەودا بوو، بەراشکاوی سەرۆك وەزیران‌و سەرۆکی دووماو وەزیرەکان‌و نوێنەرانی دوومای بە مرۆڤ گەلێکی ترسەنۆك‌و نەفام کە "تێزاری خۆشەویست" لەخەڵك جیا دەکەنەوە ناودێر دەکردو ئەو لەمەترسی شۆڕش دەترسێنن. مەلیکە ئالێکساندرا لەو رۆژانەدا لەگەڵ لایەنگرانی خۆی باسی حکوومەتی تێزاری لە نێو دڵی خەڵکی دەکردو دەوڵەت‌و دوومای وەك لەمپەرو جیاکەرەوەی سەرەکی پتەو کردنی ئەو پێوەندییە دەزانی!. بەڵام رێك لەو رۆژانەدا کەمەلیکە ئالێکساندرا باسی لە حکوومەتی تێزار لە نێو دڵی خەڵك‌و ئەو "پێوەندییە لێکدانەبڕاوە"ی ئەوی دەکرد، شەپۆلی ناڕەزایەتی لەسەرانسەری رووسیا بەرزتر دەبۆوەو ٧٠٠ هەزارکەس لە کرێکارانی رووسیا خەریکی مانگرتن بوون. ژمارەی مانگرتوان لە



ژانڤیەی ساڵی ١٩١٤دا گەیشتە یەك میلیۆن کەس‌و لەناوچەی باکۆ بەهۆی تەقەی سەربازانی قەزاق لەکرێکارانی مانگرتووی نەوت، سەدان کەس کوژران‌و بریندار بوون. لەژووئیەی ساڵی ١٩١٤دا ژمارەی کرێکارانی مانگرتوو بۆ یەك میلیۆن‌و پێنسەد هەزار کەس پەرەی سەندو کرێکاران لە شەقامەکانی پێتەخت خەریکی دامەزراندنی سەنگەرو شەڕو پێکدادان لەگەڵ هێزە چەکدارەکان بوون. لەو کاتەدا تێزار لەژێر کاریگەری لەمێشك رۆکردنەکانی شاژن‌و راسپوتین، سەرۆك وەزیرانی لەسەرکار لابردو دیسان بە پێشنیاری ئەوان پیرە مێردێکی ٧٦ ساڵەی بەناوی "ئیڤان گۆرمیکین"[٢٤] بەجێنشینی ئەو هەڵبژارد. گۆرمیکین لەساڵی ١٩٠٦یش هەر پۆستی سەرۆکایەتی وەزیرانی لەئەستۆ بوو، بەڵام بەهۆی ناشیاوی لە چارەسەرکردنی گرفتەکانی رووسیا دوای رووداوەکانی ساڵی ١٩٠٥ لەسەرکار لابردرا بوو. بە دانانی گۆرمیکین بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی بەکردەوە هەوساری کاروباری وڵات کەوتە دەستی راسپوتین. لەبەرئەوەی کە راسپوتین لەو رێکەوتەوە بە شێوەیەکی راستەوخۆو بە راشکاوی بەشداری لە دانان‌و لەسەرکار لابردنی وەزیران‌و پۆستەگرینگەکانی دەوڵەتی‌و سەربازی دەکردو مەلیکە ئالێکساندراش کە لە بارەی هەر کام لە کاربەدەستانی حکوومەت رای دەردەبڕی، بەراشکاوی‌دەیگوت: " بەهۆی ئەوە کە دۆستی ئێمە (راسپوتین) سەبارەت بە فلاٚن کەس خۆشبینە، پێشنیاری هەڵبژاردنی ئەو بۆ ئەم پۆستە دەکەم" یان لەبەر ئەوەی کە فلاٚن کەس دوژمنی دۆستی ئێمەیە، هەڵبژاردنی ئەو بۆ ئەم پۆستە لە بەرژەوەندیدا نی‌یە! لە ئەنجامی ئەو دەستێوەردانانە، کەسانی شیاوو خاوەن کەسایەتی کە ئامادە نەبوون سووکایەتی دەستماچکردنی راسپوتین قەبووڵ بکەن، دەستیان لەکار کێشاوەو ژمارەیەك ئەفرادی ناشارەزاو نەفام‌و ناکەس جێگەی ئەوانیان گرتەوە. مۆریس پالئۆلۆگی باڵوێزی ئەوکاتەی فەڕانسە لە دەرباری تێزار کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، لەبارەی چەپەڵی‌و سووکی‌و گەندەڵکاری ئەو کەسانەی کە لەو سەردەمە هەستیارەی مێژووی رووسیادا لەسەر پۆستە گرینگەکان دادەمەزران دەنووسێ: "ژمارەیەك لەو ئەفرادە هاوسەریان دەخستە باوەش‌و پاڵ راسپوتین بۆ ئەوەی بە کەڵك وەر گرتن لە دەسەلاٚتی ئەو، پایەو پلەیەك بەدەست بێنن". شەڕی یەکەمی جیهانی پێنج مانگ دوای لەسەرکار دانانی گۆرمیکین بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی رووسیا دەستی پێکرد.

24-Ivan Goremykim .





رووسیا لەسەرەتای ئەو شەڕە بۆ پشتیوانی لە سێربستان بە دژی نەمسا راوەستاو ئەڵمانیاش بۆ پاڵپشتی کردنی نەمسا بەدژی رووسیا شەڕی راگەیاند. هێزەکانی رووسیا لەقۆناغە سەرەتاییەکانی شەڕدا هەندێك سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. بەڵام بە هاتنە ژوورەوەی ئەڵمانیا بۆ شەڕ، هێزەکانی رووسیا بە لێکەوتنی زەرەدو زیانێکی زۆر قورس ناچار بە پاشەکشە بوون. ئەو تێکشکانە هەستی دژایەتی کردنی ئەڵمانیای لە رووسیادا هارووژاندو تێزاریش بۆ دژەکردەوە لەبەرامبەر ئەڵمانی‌یەکان، ناوی ئەڵمانیی پێتەختی لەساینت پیتەرز بۆرگەوە بۆ ناوی رووسیی پێترۆگراد گۆڕی. بەڵام هەستی دژە ئەڵمانیایی خەڵك پتر رووبەرووی شاژنی بە رەچەڵەك ئەڵمانیایی دەبۆوە کە پێشتر بەهۆی پشتیوانی لە راسپوتین پێگەو متمانەی خۆی لە دەستدا بوو.

***

شەڕی یەکەمی جیهانی‌خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە مێژووی رووسیاو جیهان دا. دەوڵەتی تێزاری رووسیا کە ئامادەیی تەواوی بۆ بەشداری لەم شەڕەدا نەبوو، بە ماوەی سێ ساڵ ١٥ ملیۆن سەربازی بۆ بەرەکانی شەڕ نارد کە زیاتر لە ٩ ملیۆن کەسیان کوژران‌و بریندار یان بە دیل گیران. ژمارەی سەربازانی رووس کە لەو شەڕەدا کوژران زیاتر لە ملیۆنێك‌و ٧٠٠ هەزار کەس بووو ژمارەی برینداربوان لە ٤ ملیۆن ونۆسەد هەزار کەس تێدەپەڕی. گەورەترین گرفتی رووسیا لەو شەڕەدا دوای ناشیاوی سەرکردەکان‌و دەستێوەردانی ئەفرادی ناشارەزا لە هونەری سەربازی لە شەڕەکاندا بریتی بوو لە ئامادە کردنی کەل‌و پەل‌و خواردەمەنی یان بە واتا سەربازییەکەی گرفتی لۆژێستیکی بوو، لەبەرئەوەی‌کە بەرەکانی شەڕ هەزاران کیلۆمەتر لەسەرچاوەکانی دابینکردنی هێزەکانی رووسیا دوور بووو رێگەی ئاسنی رووسیاش توانایی‌و کێشی تەواوی بۆ گەیاندنی پێداویستییەکانی شەڕو خواردەمەنیی ملیۆنەها سەربازی رووسیا لە بەرەکانی شەڕدا نەبوو. لەو بارودۆخە هەستیارەدا دەسەڵات‌و کارتێکەری راسپوتین لەدەرباری رووسیا گەیشتبووە بەرزترین رادەی خۆی. بە جۆرێك کە موریس پاڵئۆلۆگی باڵوێزی ئەوکاتەی فەڕانسە لە رووسیا بەم شێوەیە لەسەر تێزار دەنووسێ کە تێزار نیکۆلای دووهەم لەژێر کاریگەری لەمێشك رۆکردنەکانی ئەو بڕیاریدا خۆی سەرکردایەتیی چالاکییەکانی بەرەکانی شەڕ لە ئەستۆ بگرێت. تێزار رۆژی پێنجەمی سێپتەمبەری ساڵی ١٩١٥ بەرەو ناوەندی گشتیی سەرکردایەتی هێزەکانی رووسیا لە هەشت سەد کیلۆمەتری باشووری پێترۆگراد وەڕێکەوت‌و بە رۆیشتنی ئەو لە پێتەخت بەکردەوە



هەوساری کاروباری رووسیا کەوتە دەست مەلیکە ئالێکساندرا کە ئەویش بە نۆبەی خۆی بەڕێوەبەری فەرمانەکانی راسپوتین بوو. لەسەرەتادا ئامادە بوونی تێزار لە بەرەکانی شەڕ کەمێك بووە هۆی بەرز بوونەوەی ورەی ئەفسەران‌و سەربازانی رووسی‌و هەر بەم هۆیەشەوە هێزەکانی رووسیا لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩١٥و سەرەتاکانی ١٩١٦ هەندێك سەرکەوتنیان لە بەرەکانی شەڕی ئەڵمانیا بەدەست هێنا، بەڵام تەمەنی ئەو سەرکەوتنانە کە زەرەدو زیانێکی زۆری لێکەوتەوە لەناوەراستەکانی ساڵی ١٩١٦ کۆتایی پێهات‌و هێرشە بەرپرچدەرەوەکانی ئەڵمانیاو پاشەکشەی هێزەکانی رووسیا دەستی پێکرد. بە نەبوونی تێزار لە پێتەخت شیرازەی کاروباری حکوومەت لێك هەڵوەشاوەو تێزار لەسەرەتاکانی فیوریەی ساڵی ١٩١٦ کە بە تەواوی کۆنترۆڵی کارەکان لەدەستی گۆرمیکینی پیر دەرچوو بوو، بەپەلە گەڕایەوە بۆ پێتەخت تا سەرۆك وەزیرانێکی نوێ بۆ رووسیا هەڵبژێرێت. راسپوتین ئەمجارەشیان ئەو کەسەی کە مەبەستی بوو لەسەر دەستی شاژن بە سەر تێزاری داسەپاند. سەرۆك وەزیرانی نوێ پیاوێك بوو بەناوی "بوریس ئیستۆرمێر"[٢٥] کە پێشتر بەرپرسی بۆنەگێڕانی دەربار بووو تەنیا هونەری ئەو بریتی‌بوو لە دووروویی‌و زمان چەوری. هەڵبژرادنی پیاوێکی بەدناوو سووکی وەك ئێستۆرمێر بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی رووسیا لەنێوان ئەندامانی ئەنجوومەنی دووما تۆفانێکی لەرق‌و بێزاری سازکرد، بەڵام تێزار لە رۆژی ٢٢ی فیۆریەی‌ساڵی ١٩١٦ بە پێشنیاری شاژن بۆ جێگیرکردنی پێگەی سەرۆك وەزیرانەکەی، لە کۆبوونەوەی دووما بەشداری کردو دوای وتارێك سەبارەت بە شەڕ، ئێستۆرمێری وەك سەرۆك وەزیرانی نوێ بە دووما ناساند. نوێنەرانی دووما لەو کۆبوونەوەیەداو لە رووی تێزار نەیانتوانی هیچ دژە کردەوەیەك لە خۆیان وەدەرخەن، بەڵام رق‌و کینەی ئێستۆرمێریان هەر لە دڵدا مایەوە. لە لایەکی‌ترەوە دوابەدوای هەڵبژاردنی ئێستۆرمێر بۆ پۆستی سەرۆکایەتی وەزیران، شیاوترین وەزیرەکانی حکوومەتەکانی پێشوو وەکوو "سازۆنۆف"[٢٦] وەزیری دەرەوە کە لەساڵی ١٩١٠ بەرپرسایەتی ئەو پۆستەی لە ئەستۆ بووو "پۆلیڤانۆف"[٢٧] وەزیری شەڕ کە بەڕای چاوەدێرە بیانی‌یەکان لێهاتووترین کەسایەتی سەربازی رووسیا بوو، دەستیان لە کار

---

25-Boris Stummer

26-Sazonov

27-Polivanov





کێشاوە. تێزار دوای ئەم گۆڕانکارییانە گەڕایەوە بۆ بنکەی سەرکردایەتی لەبەرەی شەڕ و جارێکیتر بەڕێوەبەرایەتی کاروباری دەوڵەت کەوتەوە دەستی مەلیکە ئالێکساندراو راسپوتین. بەلاّم شاژنو راسپوتین نەتەنیا لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت لە پشت بەرەی شەڕ، بەڵکو دەستیان لە دیاریکردنی ڕێبازی سەربازیو سیاسەتی شەڕیش وەردەداو نامە گۆڕینەوەکانی مەلیکە ئالێکساندرا لەگەڵ تێزار لەو کاتەی کە سەرۆکی گشتیی هێزەکانی رووسیا بوو، نیشان دەدات کە شاژن لەتەواوی ئەو ماوەیەدا ئاگادارو بەشداری وردەکارییەکانی پلانەکانی شەڕ بووەو لەهەرکام لەو نامەو تێلگرافانەدا بۆچوونەکانی راسپوتینی سەبارەت بەکاروباری سەربازی بەو چەمکانە کە "دۆستی ئێمە پێشنیار دەکات "یان "برادەری ئێمە دوێنێ شەو بینیویەتی" واتە "لە خەودا بینیویەتی"و "دۆستی ئێمە داوات لێدەکات" لە مێشکی تێزاری رۆدەکرد.

بەپێی ئەو نامانەی کە لەبەردەست دایە، راسپوتین لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩١٥و سەرەتاکانی ساڵی ١٩١٦ پتر پێشنیاری هێرش بردن لەبەرە جۆراوجۆرەکانی شەڕ دەکات، بەلاّم لەناوەراست مانگەکانی ساڵی ١٩١٦و دوابەدوای سەرکەوتنی هێزەکانی ژنێراڵ "برۆسیلۆف"[28] لە بەرەی "گالیسیا"[29] کە زەرەدو زیانێکی قورسی لێکەوتەوە، پێشنیاری راگرتنی شەڕی ئەو بەرەیە دەکات. ژنێراڵ "ئالێکسیڤ"[30]ی سەرۆکی ناوەندی سووپای رووسیا تێزار رازی دەکات کە هێرشەکان درێژەی هەبێت، بەلاّم شاژن جارێکیتر تێلگرافێك دەنێرێتو داوا دەکات کە "دۆستی ئێمە لەوە کە برۆسیلۆڤ پێشنیاری ئەوی جێبەجێنەکردووە زویر بووەو جەختی لەسەر دەکاتەوە کە ئەو بڕیارە لەسەرەوە واتە لای خوداوە هاتووە! لە رۆژی ٢٥ی سێپتەمبەری ساڵی ١٩١٦ تێلێگرافێکیتر بەم واتایە لەلایەن شاژنەوە بەدەستی تێزار دەگات: "ئاە ئازیزم. دووبارە فەرمان بە برۆسیلۆڤ بدە کە ئەم کوشتو کوشتارە رابگرێت... ئێوە دەبێ زۆرتر گرینگی بە پێشنیارەکانی برادەرەکەمان بدەن. ژێنراڵەکانی ئێمە گرینگی بە ژیانی مرۆڤەکان نادەن. ئەمەش تاوانێکی مەزنە". لەئەنجامدا تێزار لە رۆژی ٢٥ی سێپتەمبەردا ملکەچی روانگەکانی راسپوتین بووو لە ولاّمی تێلێگرافەکەی شاژن دا دەنووسێ: "ئازیزم فەرمانم بە برۆسیلۆڤ دا کە هێرشەکان

28-Brusilov

29-Galicia

30-Alexiev



رابگرێت". برۆسیلۆف کە لەو فەرمانە لەنەکاوەی تێزار سەری سووڕدەمێنی، بەناچاری هێرشەکان رادەگرێتو ئەمەش دەبێتە هۆی دەستپێکردنی پاشەکشەو تێکشکانە گەورەکانی رووسیا لە کۆتاییەکانیساڵی ١٩١٦و سەرەتاکانی ساڵی ١٩١٧. ژێنراڵ ئالێکسیڤ دواتر گوتی کە دەستێوەردانەکانی شاژن لە کاروباری نیزامیو لەمێشك رۆکردنەکانی راسپوتین کە نەتەنیا لەسەر شاژن بەڵکوو لەسەر تێزاریش کاریگەر بوو، فاکتەری هەرە گرینگی شکستەکانی رووسیا لەشەڕی یەکەمی جیهانی بووە. لەزمانی ئالێکسیڤەوە دەگێڕنەوە کە "دوای لەسەرکار لاچوونی تێزار، لەنێوان بەڵگەنامەکانی شاژندا نەخشەیەکی تەواوی بەرەکانی شەڕ بیندرایەوە، لە کاتێکدا لەو نەخشەیە تەنیا دوو نووسخە لەبەردەست دابوو کە یەکیان لە ژووری کاری منو ئەوەی تریان لە ژووری کاری تێزار دابووو خوا دەزانی بە چ مەبەستێك ئەو نەخشەیەیان لەبەردەستی شاژنو لە راستیدا لەبەردەستی راسپوتین داناوە". لە پاییزی ساڵی ١٩١٦دا ئاڵۆزیو نارەزایەتی لە رووسیا گەیشتە بەرزترین رادەی خۆی. دەوڵەتی لاوازو بێدەسەلاّتی ئێستۆرمێر بە هیچ جۆرێك توانایی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی رۆژانەی خەڵکی بەتایبەت لەبواری کەمی خواردەمەنی نەبوو. هەواڵەکانی شکستو پاشەکشەو زەرەدو زیانی قورسی نوێ لە بەرەکانی شەڕ، هەموو خەڵکی تووڕە کردبووو مانگرتنو کەمکاری لە کارگەو دامو دەزگا دەوڵەتییەکان رووسیای بەرەو مەرگەجارێکی تەواو کێشا بوو. لەم میانەدا دەنگۆی تایبەت بە دزێوی دەربارو گەندەڵکارییەکانی راسپوتینو پێوەندی ئەو لەگەڵ شاژن لە پێتەختو شارە گەورەکانی رووسیا رۆیشتبووە دەرێو خزیبووە ناو ریزەکانی سوپاو لەوێشەوە لە رێگای سەربازە بریندارەکان کە دەگەڕانەوە زێدی خۆیان، بە گوندەکانیش گەیشتبوو. جگە لەوەو هاوکات لەگەڵ دەسپێکردنی پاشەکشەی هێزەکانی رووسیا لەبەرەکانی شەڕ، بە بەربلاّوی دەنگۆی ئەوە بلاّو ببۆوە کەراسپوتین شۆفاری ئەڵمانییەکانەو بە هاریکاری شاژنو ئێستۆرمێر کە هەردووکیان بە رەچەڵەك ئەڵمانی بوون، زانیارییە نهێنییەکانی تایبەت بە گواستنەوەی هێزەکانی رووسیاو پلانە جەنگیەکانی تێزاریان بە ئەڵمانییەکان راگەیاندووە. نوێنەرانی دووماش بە توندی لە دەستێوەردانەکانی راسپوتین لە کاروباری سەربازیو دەوڵەتی نارازی ببوونو لە کۆبوونەوەی مانگەکانی سێپتەمبەرو ئۆکتۆبەری دووما، نوێنەرانی دووما لەچەپو راستو لیبێراڵو تەنانەت ژمارەیك لە نوێنەرە دەمارگرژەکانی لایەنگری تێزاریش لەپشتی تریبوونەوە ئێستۆرمێرو راسپوتینیان خستە بەر پەلاماری رخنەو بە شێوەیەکی ناراستەوخۆش رەخنەیان لە شاژن دەگرت. تێزار لە ئاکامدا لە

کۆتاییەکانی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٦ بڕیاریدا، ئیستۆرمێر کە لەماوەی هەشت مانگ حکوومەتدا ناشارەزایی‌و لاوازی‌و ناشیاوی خۆی سەلماندبوو لەسەرکار لابەرێت. شاژن هەوڵیدا بە ناردنی نامەگەلێك بۆ تێزار کە لەواندا جەخت لەسەر باوەڕو متمانەی راسپوتین بەئیستۆرمێر کرابوو، هاوسەری لەم بڕیارە پەشیمان کاتەوە بەلاّم تێزار ئەمجارەیان راسپاردەکانی راسپوتین‌و شاژنی قەبووڵ نەکردو لە رۆژی نۆیەمی نۆڤەمبەر لە نامەیەکدا بۆ شاژنی نووسی کە "بە داخم ئەمجارەیان نەمتوانی پێشنیارەکانی دۆستەکەمان (راسپوتین) جێبەجێ‌بکەم. من کاتژمێرێکی‌تر ئیستۆرمێر ئاگادار دەکەمەوە کە دەست لە کار بکێشێتەوە. هیچکەس باوەڕی پێی نی‌یەو باڵوێزی بریتانیا پێی گوتم کە ئەگەر ئەم دەوڵەتە ماوەیەکی زیاتر لەسەرکار بمێنێتەوە تووشی شڵەژاوییەکی گشتی دەبینەوە". بەلاّم جێنشینی ئیستۆرمێر (ئالێکساندێر ترێپۆڤ)[31] یش نەیتوانی خۆی لەشەڕی راسپوتین دوورخاتەوەو هەر بەو هۆیەشەوە بە پێداگری شاژن، چەند کەس لە وەزیرانی لەسەرکار لابردراوەی حکوومەتی پێشووی کە راسپوتین پشتیوانی لێدەکردن وەك ئەندامی حکوومەتی نوێ هەڵبژارد. ترێپۆڤ هەوڵیدا بە پێدانی ٩٥٠٠٠ دۆلار بەرتیل‌و پێدانی ئیمتیاز گەلێکی وەك خانوویەکی بەشکۆ لە پێترۆگرادو خزمەتکارو پاسەوان، راسپوتین رازی بکات واز لە دەست تێوەردان لە کاروباری دەوڵەتی بهێنێت، بەلاّم راسپوتین ئەو پێشنیارەی قەبووڵ نەکرد.



**تێزار نیکۆلای دووهەم‌و مەلیکەئالێکساندرا لە جلوبەرگی رەسەنی خانەدانی پاشایەتی رووسیا**

31-Alexander Trepov



ترێپۆڤ دواتر بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتە پەنای بۆ "گراندووك پاوڵ"[32] دوایین مامی زیندووی تێزار برد. پاوڵ لە دیمانەیەکدا کە رۆژی شازدەیەمی دیسەمبەری ساڵی ١٩١٦ لەگەڵ تێزارو شاژن ئەنجامی دا، بەرەوڕووی مەلیکە ئالێکساندرا ئاماژەی بەو زیان‌و زەرەرانە کرد کە دەسەلاّت و بوونی راسپوتین لە دەرباری رووسیا لە شەرەف‌و کەسایەتی شاژن‌و تێزاری داوەو گوتی لە بەرژەوەندی تێزارو رووسیا دایە کۆتایی بەم بارودۆخە بهێندرێت. تێزار بە هێمنی گوێی لە قسەکانی مامی گرت‌و داوای لەهاوسەری کرد کە رای خۆی لەو بابەتەدا دەربڕێ. مەلیکە ئالێکساندرا بە توندی قسەکانی مامی تێزاری رەد کردەوەو هاوکات لەگەڵ پشتگیری لە راسپوتین، گوتی: "هەموو پێغەمبەران لەسەردەمی خۆیان نەفرەت‌و سووکایەتیان پێکراوەو هەموویان لە دەورانی ژیانیاندا بووختانی ناحەزیان خراوەتە پاڵ!". هەر لەو رۆژانەدا بووکە لە کۆبوونەوەیەکی دووماداا یەکێك لە بەناوبانگترین نوێنەرەکانی لایەنگری تێزار بەناوی "پۆریشکۆڤیچ"[33] کە نووسەرو شاعیری بەناوبانگی سەردەمی خۆی بوو، لە وتارێکی توندوتیژ کە نێزیك بە دوو کاتژمێری خایاندو بە چەپڵەرێزانی نوێنەرەکانی‌تر پێشوازی لێکرا، هێرشی کردە سەر راسپوتین‌و بە ترێپۆڤ‌و وەزیرەکانی گوت: "بەڕێزان ئەگەر کەمترین هەستی نیشتمان پەرەستی لە دەروونتان دایە. ئەگەر ناوو شانازییەکانی رووسیاو کەرامەت‌و کەسایەتی تێزارتان خۆش دەوێت، بچنەلای تێزار. بکەونە ژێر پێی‌و پێی بڵێن رووسیا لەمەترسی دایە. ئێمە لەسەرەتای شۆڕش داین‌و نابێت "موژیك"[34]ێکی نەناسراو خراپی‌تر لەسەر وڵاتی ئێمە حکوومەت بکات". لەو کۆبوونەوە پڕجۆش‌و خرۆشەی دووما کە ئەو قسانە بە راسپوتین دەگوترا، کەسایەتییەکی بەناو بانگ لەنێوان بینەران ئامادە بوو. ئەو کەسایەتییە ناودارە شازادە "فلێکس یۆسۆپۆڤ "[35] بووکە تەمەنی بیست‌و نۆساڵ‌و لەو کاتەدا دەوڵەمەندترین پیاوی رووسیا بوو. ئەو زەوییانەی کە لە باوکی بە میرات بۆی مابۆوە بریتی بوون لە ٣٧پارچە زەوی گەورەو حەوت کۆشکی بە شکۆ لە مۆسکۆو پێترۆگرادو قەسرگەلێکی جۆراوجۆر لە نیمچە دوورگەی کەریمە. یۆسۆپۆڤ لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ تەنیا یەکێك لە زەوییەکانی ئەو نزیکەی دووسەد کیلۆمەتر بە درێژایی کەناری رۆژئاوای دەریای خەزەر درێژەی هەبوو کە سەرچاوەکانی نەوت‌و گازو کانزای ئاسنی تێدا بوو. نرخی زەوی‌و زارو سەرمایەو کارگەکانی بە ٣٥٠ تا ٥٠٠ ملیۆن دۆلاری ئەو کات مەزندە کراوە

32-Grand Dake paul

33.Purishkevich

٣٤. Moujik دەستەواژەیەکی رووسی‌یە کە بە گوندییەکی نەخوێندەوار یان مرۆڤێکی نەزان دەوترێ

35-Felix Yousoupov





که تەنانەت لەسەرمایەی تێزارەکانیش زۆرتر بوو. یۆسۆپۆڤ رۆژی دواتری کۆبوونەوەکەی دووما که قسەکانی پۆریشکۆڤیچی بیستبوو، سەردانی کردو گوتی بۆ رزگاری رووسیا هیچ رێگەیەك جگە لە کوشتنی راسپوتین لە بەر دەستدا نییەو ئەو ئامادەیە ئەم کارە بکات، بەلاّم بەتەنیایی ناتوانێ سەرکەوێت. پۆریشکۆڤیچ بە خۆشحالّییەوە ئامادەیی خۆی بۆ هاوکاری لەگەلّ ئەو دەربڕیو ئەو دووانە بۆ ئەنجامدانی پلانەکەیان چەند کەسێکی‌تریشیان بۆ هاوکاری کردنی خۆیان دیاری کرد کە بریتی بوون لە "گراندوك دیمیتری پاولۆڤیچ"[٣٦]، کوڕی ٢٦ساڵەی مامی تێزارو پزیشکێك‌و ئەفسەرێکی سوپا کە هەر دووکیان برادەری پۆریشکۆڤیچ بوون. یۆسۆپۆڤ و هاودەستانی دوایین رۆژەکانی مانگی دێسەمبەریان بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکەیان تەرخان کرد. یەکێك لە رووداوە سەیرو سەمەرەکانی ژیانی راسپوتین کە ئەفسانەگەلێکی سەبارەت بە ژیانی ئەو دروست کردووە، نامەیەکە کە لەدوایین حەوتووی مانگی دێسەمبەری ساڵی ١٩١٧دا نووسیویەتی‌و لەو نامەیەدا مردنی خۆی لەسەرەتای مانگی ژانڤیەی ساڵی ١٩١٧ پێشبینی دەکات.



**راسپوتین لە رۆژەکانی کۆتایی تەمەنی**

36-Dimitry Pavlovich



لەو نامەیەدا کە دوای مردنی راسپوتین بەدەست کەوتووەو نامەکەی بەناوی بچووکی خۆی (گریگۆری) واژۆ کردووە، هاتووە کە ئەگەر بەدەستی کەسێکی ئاسایی بکوژرێت، رووسیا تووشی هیچ مەترسییەك نابێتەوە بەلاّم ئەگەر دەستی شازادەیەك یان کەسێکی نەجیب زادەی دەربار بە خوێنی ئەو سووربێت ئەوە رووسیا بۆماوەی ٢٥ ساڵ هێمنی بەخۆیەوە نابینێ‌و هیچ شازادەو نەجیب زادەیەك لەو ولاّتەدا نامێنێتەوە. راسپووتین لە کۆتایی ئەو نامەیەدا بۆ تێزاری نووسیوە: "تێزاری ولاّتی رووسیا، ئەگەر رۆژێك زەنگوڵەکانی کەنێسە هەواڵی مردنی گریگۆری بە تۆ رابگەیێنن، ئەوە بزانە ئەگەر دەستی شازادە یان خزمێکی تۆ بەخوێنی من سووربێت، هیچکەس لە ئەندامانی بنەماڵەی تۆ تەنانەت منداڵەکانیشت زیاتر لە دووساڵ دوای مردنی من زیندوو نامێننەوەو هەموویان بەدەستی گەلی رووسیا دەکوژرێن. "یۆسۆپۆڤ بۆ جێبەجێکردنی پیلانی کوشتنی راسپوتین لە خا لەسەرەکییە لاوازەکەی ئەو، واتە هۆگری بە ژنانی ناسراو جوانی دەربار کەڵکی وەرگرت‌و بەبیانووی ئەوەی کە هاوسەرەکەی، پرەنسێس "ئیرینا" دەیهەوێت بە شێوەیەکی تایبەت‌و نهێنی چاوی بەراسپوتین بکەوێت، ئەوی بۆ کۆشکی خۆی لەشاری پێترۆگراد بانگهێشتن کرد. راسپوتین کە پرەنسێس ئیرینای لەهەندێك لەمیوانی‌یەکانی دەرباربینی بووو هەڵخەڵەتاوی جوانی ئەو ببوو، بە بێ بیرکردنەوە ئەو بانگهێشتنەی قەبووڵ کردو بەڵێنی دا ئەو میوانی‌یە بە نهێنی بپارێزێت. بەلاّم پرەنسێس ئیرینا لەو کاتەدا لە یەکێك لە کۆشکەکانی هاوسەری لە نیمچە دوورگەی کەریمە (کە دواتر کۆنفرانسی یاڵتا لەوێ بەسترا) دەژیاو لە کۆشکی نیشتەجێ بوونی یۆسۆپۆڤ لە پێترۆگراد تەنیا ئەو پێنج کەسەی کە پلانی کوشتنی راسپوتینیان دارشتبوو، چاوەرێی ئەویان دەکرد. بکوژەکانی راسپوتین دوای کوشتنی ئەو بۆ شاردنەوەی تەرمەکەی، رووباری بەستەلەکی"نوا"یان کە لە تەنیشت کۆشکەکەی یوسۆپۆڤەوە تێدەپەڕی، کون کردو لاشەکەیان خستە ناوی. بەلاّم راسپوتین لەدوایین هەوڵەکانیدا بۆ دەرباز کردنی گیانی، دەستی بە کونەکەوە گرتبووو هەر لەوێشدا لەسەرما رەق هەلاّتبوو. ئەندامانی پۆلیسی نهێنیی تێزار دوای دوو رۆژ گەڕان بە دوای راسپوتین تەرمەکەیان دۆزییەوەو لەرەوتی ئەم گەڕانەو هاوکات لەگەڵ گەڕانی ماڵی راسپوتین نامەکەی ئەویان دۆزیەوە کە چەند رۆژ بەر لەکوژرانی نووسیبووی‌و لەسەر





مێزی کارەکەی دانا بوو. هەواڵی کوژرانی ڕاسپوتین مەلیکە ئالێکساندراو تێزاری بە توندی هەژاندو لە ئاکامدا تەرمەکەیان لە باخچەی پاشایەتیی "تسارکۆیێ- سێلۆ"[37] بە خاك ئەسپاردو تێزارو شاژنو چەند کەس لە ئەندامانی خانەدانی ڕووسیا لەڕێوڕەسمی بە خاك ئەسپاردنی ئەو ئامادە بوون. تێزار کە پیاوێکی خۆرافی بووو بێ ئەوەی ئاگادار بوایە دەکەوتە ژێر کاریگەری ڕاسپوتین، دوای ئاگادار بوونەوە لەناوەڕۆکی دوایین نامەکەی ئەو بەتوندی ترساو خۆی دۆڕاند. موریس پالێئۆلۆگی باڵوێزی فەڕانسە لەدەرباری ڕووسیا کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، ڕۆژی حەوتەمی ژانڤیە، واتە هەشت ڕۆژ دوای کوژرانی ڕاسپوتین سەردانی تێزاری کردو ئاسەواری ترسو سەر لێشێواوی ئەوی بەڕوونی بینی. ئەو لەبارەی ئەو دیمانەیە دەنووسێ: "تێزار نزیەکەی دووکاتژمێر منی لای خۆی ڕاگرتو لەو ماوەیەدا ئاسەواری پەرێشانیو خەمێکی قووڵم لەروخساریدا بینی. قسە پەرتوبلاوەکانیو بێدەنگی درێژ خایەنو ڕوخساری شێواوو چاوتێبڕینە بێمەبەستەکانیو درێژەکێشانی قسەو بڕینە لەنەکاوەکانی، بەڕوونی نیشانی دەدا کە خۆی دۆڕاندووەو وای هەست دەکرد کە کارەساتەکان وەپێشی کەوتوون. لە کۆی قسەکانی تێزار واتێگەیشتم کە تێزار خۆی بەچارەنووس ئەسپاردووەو پێش ئەوەی کە ناچاربێت دەست لەپۆستی پاشایەتی هەڵگرێ، پێیوابوو کۆتایی بەئەرکەکانی هێناوە"[38]. باڵوێزی فەڕانسە لەم چاوپێکەوتنەدا هەوڵیدا تێزار ڕازی بکات تا بە هاوکاری دووما دەوڵەتێکی بەهێز پێك بهێنێ کە لەبەرامبەر دوومادا هەست بە بەرپرسایەتی بکات. بەڵام تێزار لە وەڵامی پێشنیارەکانی ئەو پتر بێدەنگ دەبووو یان وڵام گەلێکی پەرتو بلاوی دەداوە کە بۆ باڵوێزی فەڕانسە بێماناو لێڵ بوو. پالێئۆلۆگ دوای ئەو چاوپێکەوتنە چووە لای هاوکارە بەریتانیاییەکەی بەناوی سێرجۆرج بوکانان[39] و هاوکات لەگەڵ دەربڕینی پەرۆشی خۆی سەبارەت بە باری دەروونی تێزار داوای لە باڵوێزی بریتانیا کرد کە بەبێ فیرۆدانی کات سەردانی تێزار بکاتو بارودۆخی شلەژاوو مەترسییەکانی داهاتووی بەگوێدا بخوێنێ. بەڵام سەردانی باڵوێزی بەریتانیاش هیچ دەرەنجامێکی لـێنەکەوتەوەو تێزار وڵام گەلێکی سەبارەت بە بۆچوونەکانی

37-Tsarkoi-selo

38-M. Paleologue-La Tsarine mysterieuse p.139.

29-Sir George Buchanan



ئەو داوەکە لەلاوازی ئەو لە بڕیاردان سەرچاوەی گرتبوو. دوای باڵوێزەکانی فەڕانسەو بریتانیا، ڕوودزیانکۆی سەرۆکی دووماش لە ڕۆژی بیستەمی ژانڤیەی ساڵی ١٩١٧ چووە لای تێزارو لەچەند قسەیەکی ڕووتو بێپەردەدا وتی: "خاوەن شکۆ، بارودوخی وڵات لەهەمووکات مەترسیدارترە... تووڕەییو نارەزایەتیخەڵك گەیشتۆتە ڕادەیەك کە بەڕوونی ڕوودانی هەرجۆرە ئاژاوەو شۆڕشێك چاوەڕوان دەکرێ...هەموو گەلی ڕووسیا خوازیاری گۆڕانی دەوڵەتو دانانی سەرۆك وەزیرانێکن کەدەنگ ومتمانەی گشتیی هەبێتو سەبارەت بەگیرو گرفتەکانی خەڵك هەست بە بەرپرسیارێتی بکات... خاوەن شکۆ بێشەرمانە دەبێ بڵێم، هیچکەسێکی داوێن پاك لەدەوروبەرت نەماوە کە بتوانی پشتی پێببەستیو کەسانی شیاوو داوێن پاك دەوروبەریان چۆڵ کردووی... ئیتر ئەمە نهێنییەك نییە کە خاوەن شکۆ شاژن دەست لەهەموو کاروباری وڵات وەردەداتو وەزیرانی حکوومەت ڕاپۆرتەکانیان بەشاژن دەدەنو فەرمان لەو وەردەگرن... بێپەردە بڵێم کە کردەوەکانی ئەو بۆتە هۆی ڕقو بێزاری گشتیو گەلی ڕووسیا شاژن بەسیخوری ئەڵمانیا دەزانن..." تێزار بە توڕەییەوە وتی: "چ بەڵگەیەکتان بۆسەلماندنی قسەکانتان هەیە؟"ڕوودزیانکۆ لە وەڵامدا وتی: "خاوەن شکۆ ئەمانە بەڵگەیان ناوێت... ئەو شێوازەی کە شاژن گرتوویەتە بەرو دەرەنجامی دەستێوەردانەکانی لە کاروباری حکوومەتدا ئەم گومانەی دروست کردووە... خاوەن شکۆ لە بەر ڕووسیاو بۆ پاراستنی دەسەلاتی خۆتان



**تێزار نیکۆلای دووهەم و کوڕەکەی**





مەهێڵە شاژن درێژە بەو دەستێوەردانانە بدات... کارێك مەکە خەڵك ناچار بن لەنێوان تۆو بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت یەکیان هەڵبژێرن". ژینراڵ ئالێکسیڤی سەرۆکی ناوەندی سوپای رووسیا هاوشێوەی ئەو قسەیەی گوتبوو کە ئەگەر بڕیار بێت لەنێوان رووسیاو تێزار یەکیان هەڵبژێرم، بەدڵنیاییەوە رووسیا هەڵدەبژێرم. لە ئەنجامدا تێزار لە کۆتاییەکانی ژانڤییە سەرۆك وەزیرانێکی نوێی هەڵبژاردو ئەویش خراپترین هەڵبژاردن بوو بۆ چارەسەری گرفتە گەورەکانی دەوڵەت لە یەکێك لەسەردەمە پڕ لە قەیرانەکانی رووسیا. سەرۆك وەزیرانی نوێ، پرەنس "نیکۆلای گۆلیستین"[40]ی پیرەمێرد بوو کە هیچ ئەزموونێکی لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت نەبووو پێش وەئەستۆ گرتنی ئەوپۆستە، جێگری سەرۆکی یەکێك لەدامەزراوە خێرخوازییەکانی رووسیا بوو. گۆڕینی سەرۆك وەزیران بارودۆخی خراپتر کرد. لەبەرئەوەی کە گۆلیستین لە پێشینیانی خۆی ناشیاوتر بووو دەسەڵاتی مەلیکە ئالێکساندراش بە مانەوەو جێگیر بوونی چەند کەس لە وەزیرانی حکوومەتی پێشوو لە دەوڵەتدا بەردەوام مایەوە.

***

بەدرێژای مانگی فیۆریەی ساڵی ١٩١٧ زیاتر لە پێشوو بارودۆخی رووسیا شڵەژا. ژمارەیەکی زۆر لەکارخانەکانی رووسیا بەهۆی نەگەیشتنی سووتەمەنیو کەرستەی خاو لە کار وەستان. سەرمای زۆری ٣٠ تا ٣٥ پلەی ژێر سفرو بارینی بەفری قورس لە رووسیا بووە هۆی بەسترانی رێگاکانو سەرهەڵدانی قاتو قڕیو کەم بوونی خواردەمەنی لە شارەکان. حیزبو گرووپە چەپەکانی وەکوو بێلشویکەکانو مێنشویکەکانو سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکان تێکۆشانی خۆیان لەنێوان کرێکارانو لاوانو تەنانەت هێزە چەکدارەکانیش چڕتر کرد. لەسەر داواکاری وەزیری دەوڵەت کە هەستی بە خراپیو شڵەژاوی بارودۆخی ولاَت دەکرد، یەکەکانی سوپا لە شەقامو ناوەندە گرینگەکان جێگیر بوون تا لەبەرامبەر بزوتنەوە شۆڕشگێڕییەکان رابوەستن، بەلاَم ئەو کارە بووە هۆی لاوازتر بوونی سوپا و تەشەنەکردنی بیری شۆڕشگێڕی لەنێوان ئەفرادادی سوپا.

لە رۆژی بیستو حەوتەمی فێوریەدا بۆ یەکەمین جار لەپشت تریبوونی دووما وتارێکی توندوتیژ بە دژی تێزارو بنەماڵەی پاشایەتی خوێندرایەوە. وتاربێژەکە (ئالێساندێر

40-Nicholas Golistyn



کرێنسکی)[41] یەکێك لە رێبەرانی لیبراڵو میانەرەوی دووما بووو وتنی ئەو وتانە لەلایەن ئەوەوە نیشانەی ئەوە بوو کە ئیتر کەس سەبرو تاقەتی نەماوە.

کاتێك شاژن لەو وتارە کە بۆ یەکەمین جار داوای لەسەرکار لابرانی تێزار نیکۆلای دووهەمی تێدا بەیان کرابوو ئاگاداربوّوە، بە رقەوە هاواری کرد کە دەبێ ئەو پیاوە بە تاوانی خەیانەت لەدار بدرێ. تەنانەت شاژن بەبێ ئاگادار کردنەوەی تێزار فەرمانی بە سەرۆك وەزیران دا کە پێشەکییەکانی تۆمەتبارکردنو دواییش دەستبەسەر کردنی کرێنسکی ئامادە بکات. بەلاَم روودزیانکۆی سەرۆکی دووما بەلایەنگری لەو گوتی کە هەرگیز ئیزنی دەستبەسەر کردنی کرێنسکی نادات. لەحەوتەی یەکەمی مانگی مارسی ساڵی ١٩١٧دا خۆپێشاندانو شەڕو پێکدادان لە شەقامەکانی پێترۆگراد دەستی پێکرد، بەلاَم تێزار لەو کاتە پڕ قەیرانەدا، واتە رۆژی حەوتەمی مارس بڕیاریدا کە دووبارە پێتەخت چۆڵ بکاتو بگەڕێتەوە بنکەی سەرکردایەتی هێزەکانی رووسیا. تێزار پێی وابوو بە گەیشتنی چەکی نوێ لە بریتانیاو فەڕانسەوە دەتوانێ خۆی بۆ هێرشی گەورەی بەهار ئامادەبکاتو بە سەرکەوتن لەو شەڕەدا هەموو گرفتە ناوخۆییەکان چارەسەر بکات. ئەمەش لە حالێکدا کە ئاگری شۆڕش لە پێتەخت زۆر بەتین بووو هیچ دەرفەتێکی بۆ جێبەجێکردنی ئەو پیلانە دوورو درێژانە نەدەهێشتەوە. لەرۆژی هەشتەمی مارس واتە رۆژێك دوای بە جێهێشتنی پێتەخت لەلایەن تێزارەوە، کرێکارانی پێترۆگراد مانیان گرت. کرێکارە مانگرتووەکان بە شەقامەکانی شاردا دەرژێشتنو لەچەند جێگەیەکی شار تووشی شەڕو پێکدادان لەگەڵ هێزە چەکدارەکان بوون. لەرۆژی نۆهەمی مارس شێواوی شار بەرفراوانتر بووو ژێنراڵ "خابالۆڤ "[42]، سەرکردەی بنکەی سەربازی پێترۆگراد لە رۆژی دەیەمی مارس دوای رازی کردنی شاژنو ئیزن وەرگرتن لە تێزار لە رێگای تێلێگرافەوە، تەقەی لە کرێکارانی مانگرتوو کردو بەو کارە ئاگری شۆڕشی خۆشتر کرد. شاژن کە لەو رۆژە ئالۆزانەدا لە تسارکۆیێ سلۆ لە نێزیکی پێتەخت بوو، هەموو رۆژێك بارودۆخەکەی بە تێزار رادەگەیاندو بەهۆی ئەو ئاگادارییە نادرووستو درۆیانەی کە لایەنگرانو ئەفرادی ریاکاری دەربار بە شاژنیان رادەگەیاند، شڵەژاویو ئالۆزی باروودۆخی لەوەی کە هەبوو

41-Alexander Kerensky

42-Khabalov





کەمتر دەنواند. لە پەیامی رۆژی نۆیەمی دێسەمبەری شاژن بۆ تێزار هاتووە: "سەرەڕای هەندێك شێواویو ئالۆزی کە لەچەند بەشێکی شار رووی داوە، خابالۆڤ توانیویەتی بارودۆخەکە کۆنترۆڵ بکات" لە پەیامی رۆژی دەیەمی مارسی ئەو هاتووە کە "مانگرتوانو ئاژاوەگێران ئەمرۆ روودارترو نەترستر لە دوێنێ بوون. شلەژاوییەکە زۆرتر لەلایەن کەسانی بێکارو گێرەشێوێنو ئاژاوەگێر دروست بووە. لاوانو خوێندکارانێك کە تا ئەمرۆ تەنانەت رۆژێك برسێتیان نەچێژاوە بەردەوام هانی هەژارانو کرێکاران دەدەن کە هاواری برسێتی بەرزکەنەوەو شۆڕش بکەن. من دڵنیام ئەگەر هەوا ساردتر بوایە ئەوانە لەماڵێ وەدەر نەدەکەوتنو ئاوری ئاژاوەیان خۆش نەدەکرد !".



**مەلیکە ئالێکساندرا و چوار کچەکەی، ئۆڵگا، تاتیانا، ماریا و ئاناستازیا**

مەلیکە ئالێکساندرا هەر لەو پەیامەدا هاوسەری دڵنیا دەکاتەوە کە ئەگەر دەسەلاتی پێویست بە خابالۆڤ بدرێت، ئەوە ئاژاوەکە بە تەواوی سەرکوت دەکرێ. تێزار بە رواڵەت لەژێر کاریگەری هاوسەری، بۆ سەرکوتی ئاژاوەکە دەسەلاتی تەواو بە خابالۆڤ دەدات. خاڵێکی گرینگتری دیکە کە لە پەیامی رۆژی دەی مارسی شاژن بۆ تێزار دەبیندرێت، ئەوەیە کە شاژن لەو پەیامەدا بە توندی هێرش دەکاتە سەر دووماو دەنووسێ: " لە دووما هێرشی توندو بوێرانە لەسەر



حکوومەتو دەسەلات دەکرێت. هەڵبەت ئەم وتارانە لە رۆژنامەکاندا بلاو ناکەنەوە. بەلام بۆ پێش گرتن لە درێژە کێشانی ئەو بارودۆخە پێویستە سزای نویو قورس بۆ ئەو کەسانەی کە بە دژی رێژیمو بنەماڵەی پاشایەتی قسەدەکەن پەسند بکرێت". لە پەیامی رۆژی یازدەهەمی مارسی مەلیکە ئالێکساندرا هاتووە "زۆربەی ئاژاوەکان لەلایەن کەسانی بێکارەو کچانو کوڕانی خوێندکارو ژمارەیەك تەرپۆشو تێرو حەساوە کە هیچ خاڵێکی هاوبەشیان لەگەڵ کرێکارانی مانگرتوودا نییە پەرەی پێدەدرێت. لەو رۆژانە ژمارەیەك سەربازی برینداریش لەنێوان خۆپیشاندەران دەبیندرێن کە ئەوانیان بۆ هاندانی کەسانیتر بەتایبەت ئەفسەرانو سەربازانی سوپا هێناوەتە نێو گۆڕەپانی خۆپیشاندانەکە..." مەلیکە ئالێکساندرا لەسەرەتای چوونە ناو شۆڕشدا پەیامێك بۆ تێزار دەنووسێ کە شیاوی خوێندنەوەیەو لەم پەیامەدا دەنووسێ: "وابزانم بە زوویی هەموو شتێك چاك دەبێتەوەو جێگەی پەشۆکاوی نییە. ئەمرۆ خۆر دەدرەوشێتەوەو من هەست دەکەم کە خۆشەویستە کۆچکردووەکەمان لە گۆڕدا هێدی نووستووە. ئەو بەخاتری ئێمە گیانی بەخت کرد!". مەبەستی شاژن لە "خۆشەویستە کۆچکردووەکەی" راسپوتینە کە رووحە شەیتانییەکەی چەند مانگ دوای مردنیش هەر رووحو دڵی شاژنی داگیر کرد بوو. بەلام دروست لەو رۆژانەدا کە شاژن ئەو پەیامە هیواو سوکنا بەخشەی بۆ هاوسەری نارد، رووودزیانکۆی سەرۆکی دووماش تێلێگرافێکی ئاگادارکەرەوەی بۆ تێزار رەوانە کرد. لە تێلێگرافی رۆژی یازدەیەمی مارسی ئەو بۆ تێزار دەخوێنینەوە کە "بارودۆخ زۆر ناسكو مەترسیدارە. بێ سەرەو بەرەییەکی تەواو پێتەختی گرتۆتەوە. دەوڵەت فەلەج بووەو سووتەمەنیو خۆراك زۆر کەمو دەگمەن بووە. ئامرازی گواستنەوەی گشتی لە کار کەوتووە... ناڕەزایەتی رۆژبەرۆژ زیاتر پەرەدەستێنێ. هێزەکانی ئاسایش لەبەرامبەر مانگرتوانو خۆپیشاندەران سەریان لێ شێواوەو هەندێکیان تەقە لە هاوڕێیانی خۆیان دەکەن.. ئەگەر تێزار بەخێرایی بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەرپرسیارو بەهێزو شیاو نەدات کارەساتو نەهامەتی دێتە ئاراوە..." رووودزیانکۆ رۆژی دواتر (دوازدەیەمی مارس) پەیامێکی تاڵتری بۆ تێزار ناردو تێزاری لە رقو ناڕەزایەتی توندی نوێنەرانی دووما ئاگادار کردەوە. تێزار کە پێشتر پەیامەکەی شاژنی سەبارەت بە هەندێك جووڵانەوەی دووما دژی دەربارو پۆستی پاشایەتی پێگەیشتبوو، هەر ئەو رۆژە لە وەلامێکی کورتدا بۆ رووودزیانکۆ فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی دوومای دەرکرد. رووودزیانکۆ لە وەلامی تێزار تێلێگرافێکی خێرای

بەم نێوەرۆکە نارد کە "بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خاوەن شکۆ کۆبوونەوەکانی دووما بە شێوەیەکی کاتی رادەگرین تا رەنگە ئێوە لە بڕیاری خۆتان سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوەی دووما پاشگەز بنەوە.. بە داخرانی دووما دوایین سەنگەری پاراستنی رێکوپێکیو یاسای وڵات دادەڕمێو دەوڵەتیش توانای سەقامگیر کردنی رێکوپێکیو ئاسایشی نامێنێتەوە... من داواتان لێدەکەم هاوکات لەگەڵ فەرمانی سەر لەنوێ دەستپێکردنەوەی کارەکانی دووما، بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێی بەرپرسیار دەر بکەن ئەگەر لەم کارە پەلە نەکەن سوپاش لێك بلاو دەبێتەوەو بە پێشڕەویو سەرکەوتنی سوپای ئەڵمانیاش، لەناو چوونی دەوڵەتی رووسیاو حکوومەتی بنەماڵەی ئێوە مسۆگەر دەبێت... کاتی پەسند کردنی بڕیاری دیاریکردنی چارەنوسی خۆتانو رووسیا گەیشتوە... سبەینێ زۆر درەنگ دەبێت..." سەرەڕای فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی دووما لەلایەن تێزارو داخستنی کاتی دووما لەلایەن روودزیانکۆوە، نوێنەرانی دووما بڕیاریان دا لە باڵەخانەی دووما نەچنە دەرێو کۆبوونەوەیەکی نائاسایی پێك بهێنن. لەرۆژی چارەنوس سازی دوازدەیەمی مارس رووداو گەلێکیتریش رووی دا: ئەندامانی کەتیبەیەکی هێزی ئاسایش راپەڕینو سەرکردەکەی خۆیان کوشتو گرووپێك لە قەزاقەکان پێوەندییان بە خەڵکەوە گرتو حەشیمەتێکی زیاتر لە سی هەزارکەسی لە چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگا وەکوو کرێکارانو خوێندکارانو سەربازانو ژنان بەرەو دووما وەڕێکەوتن. لەکاتێکدا کە حەشیمەتەکە بەرەو دووما لە رۆیشتن دابوون، نوێنەرانی دووماش لە تەلاری کۆبوونەوەکاندا لەدەوری یەك کۆ ببونەوە. پێکهێنانی کۆبوونەوەی دووما دوای دەرچوونی فەرمانی هەڵوەشانەوەی دووما لەلایەن تێزارەوە مانای شۆڕشو بەرنگار بوونەوەی بە دژی تێزار دەدا. لەو کۆبوونەوەیەدا وتاری توندوتیژ بە دژی شاژنو تێزار خوێندرایەوەو ژمارەیەك لە نوێنەرانی دووما پێشنیاریان کرد کە دووما گوێ نەدا بە فەرمانی تێزارو خۆی وەك جێنشینی دەوڵەت یان ئەنجوومەنی دامەزرێنەران بناسێنێت. رۆژی سێزدەهەم گراندووك میخائیلی برای تێزار جارێکیتر بۆ رزگاری رێژیم دەستبەکار بووو داوای لەسەرۆکی ناوەندی سوپای رووسیا (ژێنراڵ ئالێکسیڤ) کرد بڕواتە لای تێزارو داوای لێ بکات کە بە دانانی سەرۆك وەزیرانێکی هەڵبژێردراوی خەڵكو هەروەها بە پاشگەز بوونەوە لە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی دووما، لە رێگایەکی شیاوەوە بەرنگاری ئەو قەیرانە بێتەوە. بەلاّم تێزار کە لەناوەندی سەرکردایەتی هێزەکانو لە شەمەندەفەرە تایبەتییەکەی خۆی دانیشتبوو، بە تەواوی ئاگاداری بارودۆخەکە



نەبووو هەر بۆیەش گرینگی بە پەیامی براکەی نەدا. ئەو هێشتاش لەژێرکاریگەریی لەمێشك رۆکردنەکانی شاژندا پێی وابوو کە دەتوانێ بە کەڵك وەرگرتن لە هێزەکانی ئاسایشو پۆلیس بارودۆخەکە کۆنترۆڵ بکاتو هەر بۆیەش بێ ئەوەی بیر لە رێگا چارەیەکیتر بکاتەوە ئەرکی سەرکوتی شۆڕشی پێترۆگرادی بە ژێنراڵ "ئیڤانۆڤ "[43] ئەسپارد. ئیڤانۆڤ و سەربازەکانی بەرەو شاری پێترۆگراد وەرێکەوتنو تێزاریش بۆ ئەوەی کە دوای سەرکوتی شۆڕشەکە سەرکەوتوانە بچێتەوە نێو شاری پێترۆگراد، فەرمانیدا کە شەمەندەفەری پاشایەتی بەرەو "تسارکۆییێ-سلۆ" لە نێزیکی پێتەخت وەڕێکەوێت. لە یەکێك لە ئێزگاکانی نێوان رێگادا هەواڵی شێواویو نالەباری بارودۆخی شارو زاڵ بوونی شۆڕشگێڕان بە سەر شاری پێترۆگرادو دەوروبەریان بە تێزار راگەیاند. شەمەندەفەری پاشایەتی بۆ "پێسکۆڤ "[44] کە یەکێك لە بنکە سەربازییەکان بوو، گەڕایەوە تا دوای رۆیشتنە ژوورەوەی هێزەکانی ئیڤانۆڤ دووبارە بەرەو پێتەخت وەڕێکەوێت. تێزار هێشتاش هیوادار بوو کە ئیڤانۆڤ بتوانێ بەبێ بەرەوڕوو بوونەوەی بەرگرییەکی ئەوتۆ شۆڕشەکە تێك بشکێنێ. مەلیکە ئالێکساندرا کە هێشتاش لە "تسارکۆییێ- سلۆ" (لە نزیکی پێتەخت) مابۆوە، ئەو بیرەی لەمێشکی تێزار رۆ دەکرد کە تەنیا ژمارەیەکی کەم لەسەربازەکان پشتیان لێکردووەو زۆربەی هێزەکانی ئاسایشیش پێی وەفادار ماون. شاژن لە رێکەوتی سێزدەیەمی مارس لە پەیامێکدا بۆ تێزار دەنووسێ: "ئەمڕۆ نەمتوانی پێوەندیتان پێوە بگرم... وادیارە کەسانێك هەوڵ دەدن پێوەندی ئێمە بپچڕێننو ئێوە ناچار بکەن کە یاسایەکی بنەڕەتی یان شتێکی مەترسیدارتری لەو بابەتە واژۆ بکەن. من لێتان دووپات دەکەمەوە کە نەچنە ژێر باری واژۆی ئەو جۆرە لاپەڕانە. بەو جۆرەی کە دەڵێن بارو دۆخەکە ئەوەندە ئالۆزو مەترسیدار نییە. ئەفسەرانو سەربازانی سوپا جگە لە ژمارەیەك خۆفرۆش هێشتاش پێتان وەفادار ماون. تەنیا ئەوەندە بەسە کە لە پێسکۆڤو ناوەندەکانیتری جێگیربوونی هێزەکانی ئاسایش خۆت وەدەرخەی، دەبینی کە چۆن لە تەنیشتت رادەوەستنو بۆ هەر گیانبەخت کردنێك ئامادە دەبن". بەلاّم شاژن بەتەواوی لە هەڵە دابوو. رێکخراوی سوپا پەڕشو بلاو ببووو بەشێکی گەورە لە هێزەکانی ئاسایشی پێتەخت بەجێگەی تێزارو

43- Ivanov

44- Peskov





سەرکردەکانی خۆیان، پێڕەوییان لە فەرمانی ئەنجوومەنە شۆڕشگێڕییەکانی سەربازانو کرێکاران دەکرد کە بەکردەوە ببوونە جێنشینی دەوڵەت. لەنێوان سەرکردە پایە بەرزەکانی سوپاشدا نارەزایەتییەکی توند دەبیندرا، بە شێوەیەك کە ژێنراڵ "رۆزسکی"[45]، سەرکردەی ناوەندی هێزەکانی ئاسایشی پێسکۆڤیش دوای چوونە ژوورێی تێزار بۆ ئەو بنکەیە، خراپیو شلەژاوی بارودۆخی بە گوێدا هەڵکوتاندو گوتی کە سوپا ناتوانیٚ لە هەر دوو بەرەی ناوخۆییو دەرەکی شەڕ بکات. ژێنراڵ رۆزسکی کە یەکێك لە ئەفسەرە شایانو باوەڕپێکراوەکانی تێزار بوو، دوای وتووێژێکی زۆر توانی تێزار رازی بکات کە رێگا چارە پێشنیارییەکەی گراندۆك میخائیل قەبووڵ بکاتو هاوکات لەگەڵ دیاریکردنی سەرۆك وەزیرانێکی کارامەو جێگەی متمانەی خەڵك، هێزی دووما بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەنجوومەنی نوێنەرانی سەربازانو کرێکاران، نوێیو زیندوو کاتەوە. تێزار بڕیاریدا کە روودزیانکۆی سەرۆکی دووما بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی هەڵبژێریٚو ئەرکی ئاگادار کردنەوەی روودزیانکۆی لەئەستۆی ژێنراڵ رۆزسکی خست. رۆزسکی هەروەها داوای لە تێزار کرد کە فەرمانی ئیڤانۆڤیش سەبارەت بە هێرش بردنە سەر پێتەخت هەڵوەشێنێتەوە. تێزار ئەو داواکارییەشی قەبووڵ کرد. تێزار ئەو بڕیارانەی لە کاتژمێر سیٚونیوی نیوە شەوی چواردەی مارس پەسندکرد. ژێنراڵ رۆزسکی دەستبەجیٚ ئەو بڕیارانەی بە روودزیانکۆ راگەیاند. روودزیانکۆ لە وڵامدا گوتی ئەگەر تێزار ئەو بڕیارانەی چەند حەوتوویەك لەمەوبەر دەربکردایە رێگایەکی رزگاری دەماوە بەڵام ئێستا ئیتر خەڵك داوای دەست لەکارکێشانەوەی تێزار دەکەن. کاتێك کە ژێنراڵ رۆزسکی ئاکامی وتووێژەکانی لەگەڵ روودزیانکۆ بۆ تێزار باس دەکرد، تێلێگرافێکی ژێنراڵ ئالێکسیڤ (سەرۆکی ناوەندی هێزەکانی رووسیا) بەدەستی تێزار گەیشت. ئالێکسیڤ لەو تێلێگرافەدا نووسیبووی کە ورەی سوپا زۆر لاواز بووەو تەنیا دەست لەکار کێشانەوەی تێزار بە قازانجی کوڕەکەی (جێنشین) و جێگری گراندووك میخائیل دەتوانێت ورەی سەربازەکان بۆ درێژە پێدانی شەڕ بەرز کاتەوە. ژێنراڵ جەختی لەسەر ئەوەش کردبۆوە کە تێزار هەرچی درەنگتر بڕیار بدات ئەوە مەترسیش زیاتر دەبێتو رەنگە ئیتر شۆڕشگێڕان بە مانەوەو بەردەوام بوونی سیستەمی پاشایەتیش رازی نەبن. تێزار کە لەقەبووڵ نەکردنی پێشنیاری سەرۆك وەزیران لەلایەن روودزیانکۆو تێلێگرافی

---

45-Ruzsky



سەرۆکی ناوەندی هێزەکان بەتەواوی غافلگیرو حەپەسا بوو، تێلێگرافی ژێنراڵ ئالێکسیڤی دا بەدەست رۆزسکیو گوتی ژێنراڵ روانگەی ئێوە چیە؟ رۆزسکی وڵامی داوەو گوتی: "ئەو بابەتە ئەوەندە گرینگە کە ناتوانم بە خێرایی وڵامی خاوەن شکۆ بدەمەوە. کەمێکم دەرفەت بدەیە تا بۆچوونی سەرکردەکانیتریش بپرسم". رۆزسکی لە دوانیوەڕۆی چواردەیەمی مارسدا دیسان رۆیشتەوە بۆ لای تێزارو ئەمجارەیان دوو ژێنراڵیتری لەگەڵ خۆی برد. رۆزسکی دوایین هەواڵەکانی بە تێزار راگەیاندو گوتی: ئەندامانی گاردی ئێمپراتۆری کۆشکەکانیان بەجیٚ هێشتووەو لە دەرەوەی دووما کۆبوونەتەوەو ئامادەیی خۆیان بۆ خزمەت بە دەوڵەتێکی نوێی هەڵبژێردراوی دووما راگەیاندوە. دووماو ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکارانو سەربازانیش کومیتەیەکی هابەشی دەوڵەتییان دامەزراندووەو فەرماندەری سەربازی مۆسکۆش وەفاداری خۆی بۆئەو کومیتەیە دەربڕیوە. ژمارەیەك لەوەزیرەکانی تێزار دەستبەسەر کراونو لە کۆتاییشدا شاژن ئامادەیی خۆی بۆ وتووێژ لەگەڵ روودزیانکۆ راگەیاندوە. دوابەدوای ئەوهەواڵە راچڵەکێنەرانەش تێلێگرافێکی نویٚ لەلایەن ژێنراڵ ئالێکسیڤەوە رەوانەکرا. ژێنراڵ ئالێکسیڤ لەوڵامی داواکارییەکەی رۆزسکی، روانگەی سەرکردەکانی سوپای رووسیای سەبارەت بەدەست لەکار کێشانەوەی تێزار پرسیبووو هەموو ژێنراڵەکان بە یەکدەنگی پێشوازییان لەو داواکارییە کرد بوو. کاتژمێر دووو نیوی دوانیوەڕۆ ئەو تێلێگرافە بەدەستی تێزار گەیشتو تێزار دوای چەند چرکەیەك بێدەنگی رایگەیاند: "من بڕیاری خۆم داو دەست لەدەسەلاٚت دەکێشمەوە!" کاتژمێرێك دواتر دوو تێلێگراف ئامادە کرا کە یەکیان بۆ روودزیانکۆی سەرۆکی دووماو ئەوەی تریشیان بۆ ژێنراڵ ئالێکسیڤی سەرۆکی ناوەندی هێزەکانی رووسیا بوو. دەقی ئەو تێلێگرافەی کە بۆ روودزیانکۆ نێردرا بریتی بوو لە "بۆ رزگارییو بەرژەوەندی رووسیا من لە هیچ جۆرە خۆبەخت کردنێك قسووری ناکەم. هەر بەم هۆیەشەوە ئامادەم بە قازانجی کوڕەکەمو دانانی براکەم، میخائیل ئالێکساندرۆڤیچ وەك جێگری پاشا واز لە دەسەلاٚت بهێنم، بە مەرجێك کە کوڕەکەم تا گەیشتن بە تەمەنی یاسایی لەگەڵ خۆم دا بمێنێتەوە". لە تێلێگرافی تێزار نیکۆلای دووهەم بۆ ژێنراڵ ئالێکسیڤی سەرۆکی ناوەندی سوپای رووسیاش هاتوەکە "لەبەر بەختەوەرییو رزگاری رووسیای ئازیزم بڕیارم داوە دەست لە پۆستی پاشایەتی بکێشمەوە. کوڕەکەم دەبێتە جێنشینی منو داوا لە هەموو ئەفسەرانو ئەندامانی سوپا دەکەم کە پێی وەفاداربن". بەیانیی رۆژی پازدەیەمی مارس شاندێکی نوێنەرانی دووما





بەلەدەستدابوونی دەقی ئامادەکراوی داواکارییەکەی تێزار سەبارەت بەدەست لەدەسەڵات کێشانەوەی تێزار بەقازانجی کوڕەکەی بەرەو پێسکۆڤ وەرێکەوتن بۆ ئەوەی تێزار ئەو بەڵگەیە واژۆ بکات. تێزار کاتژمێر نۆی شەو نوێنەرانی دووما وەرگرتو پێی ڕاگەیاندن کە دوای ناردنی تێلێگرافەکە بڕیاری خۆی گۆڕیوەو لە ئەسپاردنی دەسەڵات بە کوڕەکەی پاشەگەز بۆتەوە... تێزار درێژەی بە وتەکانی خۆی داو گوتی بڕیاری داوە دەسەڵات بە براکەی (میخائیل) بسپێرێتو داواکاری نامەکەی سەبارەت بەدەست کێشانەوە لە دەسەڵات بەو دەقە ئامادەو بە نوێنەرانی ئەسپارد. کاتێك کە نوێنەرانی دووما بەیانیی ڕۆژی ١٥ی مارس بەلەدەستدابوونی داواکاری نامە نوێیەکەی تێزارسەبارەت بەدەست لەدەسەڵات کێشانەوە ڕۆیشتنە ناو شاری پێترۆگراد، کومیتەی دووماو کومیتەی بەڕێوەبەرایەتی ئەنجوومەنی سەربازانو کرێکاران ئەندامانی دەوڵەتی کاتییان هەڵبژارد بوو. ئیتر دەست لەدەسەڵات کێشانەوەکەی تێزار دەرەنگ ببوو ئەنجوومەنی سەربازانو کرێکاران ئامادە نەبوون ئەو داواکارییە قەبووڵ بکەنو دەسەڵاتی بنەماڵەی ڕۆمانۆف درێژە بکێشێ. بەیانیی ڕۆژی شازدەیەمی مارس شاندێکی نوێنەرانی دووماو ئەندامانی حکوومەتی کاتی بە سەرۆکایەتی رووەدزیانکۆ چاوپێکەتنێکیان لەگەڵ گراندووك میخائیلیبراو جێنشینی تێزار ئەنجامداو داوایان لێکرد واز لەدەسەڵات بهێنێت. بەڵام مەلیکە ئالێکساندرا هێشتناش هەر هیوادار بوو کە ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٠٥ دووپات بێتەوەو هاوسەرەکەی بە دەسەڵات بگاتەوە. ئەو لە نامەیکدا کە لە بەڕواری شازدەهەمی مارس بۆ هاوسەرەکەی دەنێرێت، دەنووسێ :" هاوسەری ئازیزو قارەمانی من... من بە تەواوی لە هۆکاری بڕیاری ئێوە لەم بارودۆخەدا تێدەگەم.. ئێوە بەو لەخۆبردووییەتان ئێمپراتۆریەتی ڕووسیاو تاجو تەختی خۆتان پاراست. من سوێنتان بۆ دەخۆم کە جارێکیتر ئێوە بە شانازییەکی بەرزتر لەسەر تاجو تەختی ڕووسیا دەبینم. ئەمجارەیان نەتەنیا سوپاو گەل بەڵکو هێزو بەخششی خوداش تاجی دەسەڵاتی ئەو نیشتیمانە لەسەر ئێوە دەکات".

***

بەڵام پاشەرۆژبینیی مەلیکە ئالێکساندرا وەڕاست نەگەڕا وئەندامانی ماڵباتی پاشایەتی ١٥مانگ دوای دەست کێشانەوەی تێزار تووشی چارەنووسێکی نەگبەت بوون. تێزار نیکۆلای



دووهەمو ئەندامانی بنەماڵەکەی دوای شۆڕشی یەکەمی ڕووسیا لەمانگی مارسی ١٩١٧دا لە کۆشکی ئێمپراتۆریی "تسارکۆییێ- سلۆ" لە نزیکی شاری پێترۆ گراد لەژێر چاوەدێری دابوون.

لە ژوئییەی هەمان ساڵدا دەوڵەتی کاتی بڕیاریدا کە بنەماڵەی پاشایەتی بۆ "تۆبۆلسك" لە سیبری بگوازرێتەوە. لەبەرئەوەی کە بە لە بەر چاوگرتنی لاوازی حکوومەتی کاتی سەبارەت بە چارەسەر کردنی گرفتەکانی ڕووسیاو زۆربوونی دەسەڵاتی بێلشویکەکان، مەترسی ئەوە لەئارادا بوو کە ئەفسەرە ناڕازییەکان شۆڕش بکەنو تێزار بگەڕێننەوە سەر دەسەڵات. دوای سەرکەوتنی شۆڕشی بێلشویکیی ڕووسیا لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩١٧ (شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧)و هاتنە سەرکاری "لێنین" یش بنەماڵەی پاشایەتی ماوەیەك لە تۆبۆلسك لە بەندیخانەدا بوون، تا ئەوەکە لەمانگی مارسی ١٩١٨ دەسەڵاتدارانی بێلشویکیی ناوچەی ئۆراڵ پێشنیاریان کرد کە بنەماڵەی پاشایەتی بۆ "ئێکاترینبۆرگ"[٤٦] لە ڕۆژهەڵاتی کێوەکانی ئۆراڵ بگوازرێنەوە بۆ ئەوەی لە مەترسی دەرباز کردنی ئەوان لەلایەن یاخی بوانو هێزە نەیارەکانی شۆڕش پێشگیری بکردرێت. دوای گواستنەوەی بنەماڵەی پاشایەتی بۆ ئێکاترینبۆرگ، ئەنجوومەنی ئەو ناوچەیەی کە لەوێدا بێلشویکەکان زۆرینەی خەڵکیان پێك دەهێنا، پێشنیاری کوشتنی تێزاریان کە لەلایەن چەند کەس لە ئەندامانی ئەنجوومەنەکە گەڵاڵە کرابوو، خستە بەرباسو لێکۆڵینەوە، بەڵام زۆرینەی ئەندامانی ئەنجوومەن دژی پێشنیاری کوشتنیتێزار بەر لە وەرگرتنی ڕەزامەندی مۆسکۆ بوون. لەئاکامدا ئەنجوومەنی ئێکاترینبۆرگ بڕیاریدا کە ڕێبەری بێلشویکی ئەو ناوچەیە بۆ دیاریکردنی چارەنووسی تێزارو بنەماڵەکەی بۆ مۆسکۆ بنێرێت. کومیتەی ناوەندی حیزبی بێلشویك لەسەرەتادا دادگایی کردنی ئاشکرای تێزارو بنەماڵەکەیان خستە بەر باسو لێکۆڵینەوەو زۆرینەی ئەندامانی کومیتە لەگەڵ ئەو بۆچوونەش کۆك بوون، بەڵام لێنین پێیوا بوو پێکهێنانی کۆبوونەوەی دادگاییی کردنی تێزار کارێکی زیادیو تەنانەت مەترسیداریشە. لێنین دەیگوت کە بە پێکهێنانی ئەو دادگایە جارێکیتر سەرنجی خەڵك بۆلای تێزار ڕادەکێشینو گرفتێکی نوێ بۆ خۆمان دروست دەکەین. پەرەسەندنی چالاکییەکانی نەیارانی حکوومەتی بێلشویکیو نزیك بوونەوەیان لە ئێکاترێنبۆرگ هیچ گومانێکی سەبارەت بە دیاریکردنی چارەنووسی تێزارو بنەماڵەکە نەهێشتەوەو لێنین هاوکات لەگەڵ دەرکردنی

46-Ekaterinburg





فەرمانی کوشتنی تێزارو بنەماڵەکەی، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە تێزارو بنەماڵەکەی بە شێوەیەك لەناوبەرن کە "بەرهەڵستکارانی شۆڕش تەنانەت ئێسقانەکانی ئەوانیان دەست نەکەوێت بۆ کەڵك وەرگرتن لە هەڵخەڵەتانی ئەو نەفامانەی کە خەونی گەڕانەوەی ئیمپراتۆریەت دەبینن !".



**تێزار نیکۆلای دووهەم کەمێك دوایدەست لە دەسەڵات کێشانەوەی کە لە "تسارکۆیێ-سلۆ" لەژێرچاوەدێری دابوو**

ئەو وەفدەی کە ئەرکی جێبەجێکردنی ئەو فەرمانەیان پێ ئەسپێردرا بوو لە شەوی ١٦ ژووئییەی ساڵی ١٩١٨ رۆیشتنە ئێکاترینبۆرگو بەبێ فێرۆدانی کات لەگەڵ کاربەدەستانی ئەو ناوچەیە چوونە جێگەی نیشتەجێی بوونی تێزارو هاورێکانی. بە جۆرێك کە "بایکۆڤ "[47]، کە یەکێك لە نوێنەرە پایەبەرزەکانی ناوچەی ئۆراڵ بوو دەگێڕێتەوە "ئەو کەسانەی کە یاساوڵی جێبەجێکردنی بڕیاری کوشتنی بنەماڵەی پاشایەتی بوون، نیوە شەو چوونە نێو جێگەی نیشتەجێ بوونی ئەوانو فەرمانیان دا کە ئەندامانی بنەماڵەی تێزارو هاورێکانی کە لە ژوورەکانی نهۆمی سەرەوە نووستبوون، ببەنە ژێرخانی ماڵێ. پێش هەموویان تێزارو مەلیکە ئالێکساندرایان کە نەخۆش بوو لە خەو هەستاندو دواییش نۆبەی ئالێکسیسو چوار کچەکەی

47-Bykov



گەیشت. جگە لە ئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتی، دوکتور بوتکین ( پزیشکی بنەماڵە)و سێ خزمەتکارەکەشیان کە لەگەڵیان بوون لە خەو هەستاندو بۆ ژێرخانی ماڵەکەیان بردن. "تێزارو ئەندامانی بنەماڵەکەیو هاورێیانی تا ئەوکاتەی کە چوونە ژێرخانی ماڵەکە ئاگاداری چارەنووسی خۆیان نەبوون. لەبەر ئەوەی پێیان گوترا بوو کە هێزە نەیارەکانی شۆڕش دەیانهەوێ هێرش بکەنە سەر ئێکاترینبۆرگو بۆیەش پێویستە بە شەو ئەوان لەو جێگایە بگوازنەوە، بەڵام هێشتا چەند خولەکێك لە کۆبوونەوەکەی ئەوان لەژێرخان تێنەپەڕی بوو کە لە پلیکانەکانەوە دەنگی رمبەی پێ بیستراو ماوەیەك دواتر چەند کەس لەگەڵ ژمارەیەك چەکدار چوونە نێو ژێرخانەکە. بڕیاری کوشتنی ئەوان کە چەند رستەیەك بوو خوێندرایەوەو دەستبەجێ دوای ئاماژەی نوێنەری بەرێوەبردنی بڕیارەکە رێژنەیەك لە فیشەك بەسەری تێزارو بنەماڵەکەیو هاورێیانی باری. تەواوی ئەم رێورەسمە زیاتر لە دووخولەکی نەخایاندو هەر یازدە کەسیان دەستبەجێ کوژران".

بە فەرمانی یۆرۆسکی[48](نوێنەری تایبەت بە جێبەجێکردنی ئەو بڕیار) تەرمی کوژراوەکانیان کە هێشتاش خوێنی لێدەتکا، لە چەند پەتویەك پێچاندو لە ترۆمبیلێکی بارکێشیان خست. تەرمەکان لە شەودا بۆ کانزایەکی چۆڵو هۆڵ لە چەند کیلۆمەتری شار گوازرانەوەو کارەکانیتر بۆ سبەینێی رۆژی دواتر راگیرا. یۆرۆسکی دەیهەویست کە فەرمانەکەی لێنین بەبێ کەم و کورتی جێبەجێ بکات و پاشماوەی بنەماڵەی پاشایەتی وا لەناو بەرێت کە "تەنانەت ئێسقانێك لەوان بۆ کەڵك وەرگرتن بە دژی شۆڕش نەمێنێتەوە!".

48-Yurousky







**دوایین وێنەی بنەماڵەی تێزار نیکۆلای دووهەم کە لەسەربانی جێگەی دەستبەسەرکرانی ئەوان گیراوە**

بۆ جێبەجێکردنی ئەو فەرمانە تەرمەکانیان پارچە پارچە کردو لە تێزاوی سۆلفۆریکیان رشتەو دوای دڵنیا بوون لە تێکەلاّو بوونی ئێسقانەکان لەگەڵ تێزاوەکە، تێکەلاّوەکەیان رشتە ناو چاڵێك کە پێشتر بۆ ئەم کارە ئامادەکرابووو چاڵەکەیان پڕکردەوە. فەرمانی لێنین سەبارەت بە کوشتنو لەناوبردنی ئاسەواری تەرمەکانی رۆمانۆفەکان تەنیا تایبەت بە بنەماڵەی تێزار بوو بەلاّم یاساوڵەکانی جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە پزیشكو خزمەتکارەکانی ئەو بنەماڵەیەشیان خستە ناو ئەم بڕیارەوەو تەرمەکانی ئەوانیش تووشی چارەنووسی تەرمەکانی بنەماڵەی پاشایەتی بۆوە. هەواڵی کوژرانی دواین تێزاری رووسیا لە چاپەمەنیو بلاّوکراوەکانی رووسیا بەم چەشنە راگەیاندرا: "بەهۆی ئەوەکە تێزار ویستوویەتی رابکاتو پێوەندی بەهێزەکانی دژ بە شۆڕشەوە بگرێت، فیشەك باران کراوە". هەواڵی کوژرانی مەلیکە ئالێکساندراو منداڵەکانی هەرگیز بە شێوەیەکی فەرمی بلاّو نەکراوە، تا ئەوەکە سالاّنی دواتر وەردەکارییەکانی ئەو رووداوە لە رۆژنامەکانی رۆژئاوادا بلاّو بۆوەو کاربەدەستانی یەکیەتی سۆڤیەتیش بەبێدەنگی خۆیان دانیان بەو کارە دانا.

# کچێکی هەژار و بیژوو کە فریشتەی رزگاری هەژاران و بێ بەشان بوو

ئێڤیتا پیرۆن[1] یەکێك لەناودارترین ژنەکانی سەدەی بیستەمو یەکەم ژنە کە لە نیوگۆی رۆژئاوای زەوی بە دەسەلآت گەیشتووەو هێشتاش دوای تێپەڕ بوونی نێزیکەی چل ساڵ لەسەردەمی سەرۆکایەتی ئەو لەسەر ئەرژەنتین، ناوی لەسەر زمانی گەلی ئەرژەنتین ماوە. ئەوو هاوسەری (خوان پیرۆن)[2] هەردووکیان بیژوو بوون کە لە چاوەدێری باوك بیٚبەش بوون، بەلآم چارەنووس ئەوانی  لەسەر رێگەی یەك داناو رەوتی ژیانی هەردووکیان دوای ئەو ئاشنا بوونە گۆڕا. ئێڤیتا پیرۆن کە ناوی راستەقینەی ئەو "ماریا-ئیڤا-دۆراتیٚ"[3]یە، لەرۆژی ٢٦ ئاپریلی ساڵی ١٩١٩ لە شارۆچکەی "لۆس تۆڵدۆس"[4] لە نێزیکی شاری "بۆینێس ئایرێس"[5]ی پێتەختی ئەرژەنتین لە دایك بوو. ئەو مندالّی بیژووی پیاوێکی دەوڵەمەند بە نای خوان دۆراتیٚ[6] بوو کە لەدایکی ماریا (خوانا-ئیبارگۆرن)[7] چەند مندالّێکی بیژووی تریشی هەبوو. باوکی ماریا ئیڤا کە لە مالیٚ بەناوی ئێڤیتا بانگیان دەکردو دواتریش بەم ناوە ناوبانگی دەرکرد، لە بۆینێس ئایرێس دەژیاو هاوسەری یاسایی‌و مندالّی‌تریشی هەبووو جارجارەیەك سەردانی دلّداری پێشووو مندالّە بیژووەکانی لە شاری لۆس تۆڵدۆس دەکردو یارمەتی بژێوی دەدان. ئێڤیتا کە بچووکترین مندالّی بنەماڵەکەی بوو، هەمیشە لەوەکە بابی وەك بابی مندالّەکانی‌تر لەگەلّیان نەدەژیان، مەینەتی دەچێشت‌و دایکشی تا سەردەمی مردنی باوکی لەساڵی ١٩٢٦ ئەو رازەی کە کچەکەی مندالّی بیژووی ئەو باوکەیە ئاشکرا نەکرد. ئێڤیتا لەکاتی مردنی باوکی ٧ ساڵی تەمەن بووو یەکەمین ئەزموونی تاڵی ژیانی کە لە پەرتووکی بیرەوەرییەکانیدا یادی دەکاتەوە، هەڵسوکەوتی توندو ناحەزی ژن‌و مندالّە شەرعیەکانی باوکی

1-Evita peron

3- Maria Eva durate

2-Juan peron

4-Los Toldos

5-Buenos Aires

6- juan Duarte

7-juana Ibarguren



بوو کە لەگەڵ ئەوو دایکی لە رێورەسمی بەخاك سپاردنی باوکی ئەنجامیاندا. ئێڤیتا لەسەرەتادا لە پەرتووکی بیرەوەرییەکانی کە دوای بلآو بوونەوە لەساڵی ١٩٥١ پتر لە سەد جاری‌تر چاپ کرایەوە، باسی مەینەتی‌و نەهامەتییەکانی کاتی مندالّی‌و ئەو سووکایەتییە دەکات کە لە لایەکەوە بەهۆی هەژاری‌و نەداری‌و لە لایەکی‌ترەوە بەهۆی نەبوونی باوك‌و سەرپەرشتی بنەماڵە پێی‌کراوەو ئەو شەوەی کە دایکی هەواڵی مردنی باوکی‌و سڕی بیژوو بوونی ئەوی بۆ ئاشکرا دەکات بە تاڵترین شەوی ژیانی نێو دەبات. ئێڤیتا دەنووسیٚ: ئەو شەوە تا بەیانی گریام‌و بەیانیی رۆژی دواتر کە بۆ بەشداری لەرێورەسمی بەخاك ئەسپاردنی بابم دەرۆیشتین بۆ بۆینێس ئایرێس، لە پاسەکەداخەوتم. ئێڤیتا تا تەمەنی ٧ ساڵی لە شارۆچکەکەیان نەچوو بووە دەری‌و چاو لێکردنی شەقامە گەورەکان‌و بینایە چەند نهۆمییەکانی پێتەخت بەرادەیەك وەجۆش وخرۆشی خستبوو کە بۆ ماوەیەکی کورت خەمی بیٚ باوکی لەبیر چۆوە. ماڵە بەشکۆکەی بابی لەگەڵ ماڵە بچووکەکەی خۆیان بەراورد نەدەکراو هەر لەو ماڵە بوو کە ئێڤیتای بچووك دووهەمین پێکانی دەروونی پێکەوت: هاوسەرو مندالّە شەرعیەکانی باوکی، ئێڤیتاو دایکیان بە جنێوو دمشڕی وەدەرناو مۆڵەتی ئەویان پیٚ‌نەدان کە لەرێورەسمی بە خاکسپاردنی باوکی بەشداری بکەن. ئێڤیتا لە پەرتووکی بیرەوەرییەکانیدا ئەم رووداوە بە خاڵێکی وەرچەرخانی ژیانی نێو دەباو دەنووسیٚ کە من دوای ئەو رووداوە بڕیارم دا تۆڵە لە دەوڵەمەندان بستێنمەوەو دوای گەڕانەوە بۆ ماڵە کۆن‌و ناخۆشەکەمان هیچ ئاواتێکم جگە لە گەڕانەوە بۆ بۆینێس ئایرێس‌و هەوڵ‌و تێکۆشانی کۆمەلآیەتی نەبوو. ئێڤیتا دواتر درێژە بە قسەکانی دەداو دەڵێت: "دوای مردنی باوکم کە ئیتر هەستم بە خۆشەویستی‌و هۆگری ئەو نەدەکرد باری ژیانمان خراپتر بوو، لەبەرئەوەی باپیرم (باوکی دایکم) کە شۆفێری پاس بووو یارمەتی بژێوی ئێمەی‌دەدا، دوای ماوەیەکی کورت مردو دایکم بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانمان ناچار بوو لەمالآن خەریکی خزمەتکاری‌و جلك شوشتن (قەراوەشی) بێت". ئێڤیتا لەو بارودۆخەدا بەناچاری قۆناغی ناوەندیی بەنیوچڵی بەجێهێشت‌و لەتەمەنی شازدە ساڵیدا بۆ پەیداکردنی کار بەرەو بۆینس ئایرێس وەڕێکەوت. ئەو کچێکی جوان‌و سەرنج راکێش‌و دەنگێکی خۆشی هەبووو پێی وابوو کاری شانۆ یەکەمین کارێکە کە تێدا سەرکەوتوو دەبێت. ئێڤیتا توانایی هونەریی بۆ نواندنی رۆڵ لەسەر تەختەی شانۆ هەبوو، بەلآم جوانی لە رادەبەدەری ئەو فاکتەری سەرەکی بوو بۆ ئەوەی بتوانیٚ لە شانۆیەکی پلە دوو کار ببینێتەوەو بەڕێوەبەری ئەو شانۆیەی کە ئێڤیتای  لەسەر کار دامەزراند بوو چاوی تیٚ‌بڕیبوو. لە هەندێك لەو بلآوکراوانەی کە ژیاننامەی ئێڤیتا پیرۆنی تێدا بلآو کراوەتەوە، نووسراوە کە ئێڤیتا لەکاتی





نەدیبوو، بۆ یەکەمین جار لەگەڵ نیگایەکی مێهرەبانو پاك رووبەروو بۆوە کە بەدرێژایی تەمەنی لێی دەگەڕا. ئێستا پێویستە پێش روونکردنەوەی دەرەنجامەکانی ئەو ناسیاوییە کە رەوتی ژیانی ئێڤیتاو خوان پێرۆنو هەروەها رەوتی مێژووی ئەرژەنتینی گۆڕی، خوان پێرۆنی هاوسەری داهاتووی ئێڤیتاو رێبەری ناوداری ئەرژەنتین باشتر بناسین. خوان پێرۆن کە لەکاتی ئاشنابوون لەگەڵ ئێڤیتا ٤٩ ساڵی تەمەن بووو نێزیەکەی ٢٥ ساڵ لە ئێڤیتا بەتەمەن تر بوو، لە رۆژی هەشتەمی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٨٩٥ لە شارۆچکەی "لۆبۆس" لەدایك بوو. ئەویش وەکوو ئێڤیتا منداڵی بیژووی پیاوێکی دەوڵەمەند بەناوی "ماریۆ توماس پێرۆن" بوو کە تا کاتی گەورەبوونی کوڕەکەی، خەرجی خوێندنی ئەوی دابین کردو ئەوی بۆ خوێندنگایەکی سەربازی نارد. خوان پێرۆن دوای گەیشتن بە پلەی ئەفسەری، توانی بەخێرایی پلەکانیتری سەربازیش ببڕێتو لەساڵی ١٩٣٠ لە کودتایەکی سەربازیدا بەشداری کرد کە بووە هۆی رووخانی رژێمی یاسایی لە ئەرژەنتین. خوان پێرۆن دوای کودتای ساڵی ١٩٣٠ وەك پاشکۆیەکی سەربازی ئەرژەنتین رەوانەی باڵوێزخانەی شیلی کراو دوو ساڵ دواتر بەهۆی ژنبازیو رووداوێکی جاسوسی کە دەستی یەکێك لە دڵدارەکانی ئەوی تێدا بوو بۆ ئەرژەنتین بانگهێشتن کرا، بەلاّم زۆر زوو پێگەی خۆی بەدەست هێناوەو ئەمجارەیان وەك پاشکۆیەکی سەربازیی باڵوێزخانە بۆ رۆمو بێرلین نێردراو لەم دوو دەوڵەتەدا سەرهەڵدانو پێگەیشتنی فاشیسمی بەچاوی خۆی بینیو خۆشی یەکێك لەو کەسانەبوو کە هیتلێرو موسولینیی ستایش دەکرد. پێرۆن لەساڵی ١٩٣٩و پێش دەستپێکردنی شەڕی دووهەمی جیهانی گەڕایەوە ئەرژەنتینو لەگەڵ گروپێك لە ئەفسەرە گەنجەکانی ئەرژەنتین حیزبێکیان پێك هێنا کە تا رادەیەك لەرێکخراوی نازی دەچوو. پێرۆن بەکردەوە لە وەتارەکانیدا لایەنگری لە هیتلێر دەکردو دەیگوت کە بیرۆکەی هیتلێر لە شەڕو ئاشتیدا باشترین رێنمای خەباتی ئێمەیە. ئامانجو دروشمەکانی حیزبی پێرۆن تارادەیەك هاوشێوەی دروشمەکانی حیزبی ناسیۆنال سۆسیالیستی ئەڵمانیا بووو هاوکات لەگەڵ جۆلاّندنی هەستی نەتەوایەتی، زۆرتر گرینگیی بە چینی کرێکار دەدا. پێرۆن لەساڵی ١٩٤٣ لەکودتایەکی دژی حکوومەتی مەدەنی ئەرژەنتین بەشداری کرد کە تازە جێنشینی حکوومەتی سەربازی ئەو ولاّتە ببووو لە حکوومەتی کودتادا، سەرەتا پۆستی جێگری وەزارەتی بەرگری پێدراو دوایش بوو بە وەزیری کارو لەو پۆستەدا بوو کە لەساڵی ١٩٤٤ لەگەڵ ئێڤیتای دڵداری هاورێکەی (ئیمبێرت)و بیژەری بەناوبانگی رادیۆ ئاشنا بوو. پێرۆن لەسەرەتای چوونە ناو تەمەنی ٥٠ساڵیدا پیاوێکی تەنیاو سەڵت بوو. دوای سی ساڵ ژنبازی ئیتر بە دوای ئەشقێکی راستەقینەو خاوێنو بەردەوامدا



رۆیشتن بۆ بۆینێس ئایرێس تا تەمەنی بیست ساڵی لەشفرۆشی کردووەو هونەرمەندی شانۆش کاری دووهەمی بووە. ئەو بابەتانە پتر لەلایەن رۆژنامەڤانانی نەیاری ئێڤیتا پێرۆنەوە بلاّو کراوەتەوەو لەراستی بە دوورە. هەڵبەت گومانێك لەوەدا نییە کە ئێڤیتا دوای چوونە نێو جیهانی شانۆ، پێوەندیی لەگەڵ پیاوی جۆراوجۆر هەبووە بەلاّم وەك خۆی لە بیرەوەرییەکانیدا باسی کردووە، بەردەوام لەگەڕان بەدوای سۆزو خۆشەویستییەك بووە کە لەتەمەنی منداڵیدا لێی بێبەش بووەو هەرگیز بۆ پارەو پووڵ چاوی لە پیاوان نەبڕیوە. یەکێك لەدۆستەکانی ئێڤیتا لەسەردەمی شانۆ کاریدا ئەفسەرێکی لاو بەناوی "ئانیباڵ فرانسیسکۆ ئیمبێرت"[8] بوو کە لەساڵی ١٩٤٣ لەگەڵ گرووپێك لەو ئەفسەرانەی کە کودتایان کرد بوو، هاوکاری کردو لەحکوومەتی کودتادا بۆ پۆستی وەزیری پۆستەو تێلێگراف هەڵبژێردرا. ئیمبێرت لەو پۆستەدا سەرپەرشتی بەشی رادیۆشی لە ئەستۆبوو. ئێڤیتا کە لە کارەکەی ماندوو ببووو سەرکەوتنێکی ئەوتۆشی بەدەست نەهێنا بوو، داوای لە ئیمبێرت کرد کە لەسەر کاری بێژەری رادیۆ دای بمەزرێنێ. ئێڤیتا لەسەر رادیۆ دامەزراو بەهۆی دەنگە خۆشو زولاڵەکەی توانی لەماوەیەکی کەمدا نێو بانگ دەرکات. یەکێك لەسەرنج راکێشترین پرۆگرامە رادیۆییەکانی ئەو کە لایەنگری زۆری هەبوو، خوێندنەوەی ژیاننامەی ژنە ناودارەکانی جیهان بوو. ئێڤیتا لەو پرۆگرامە رادیۆییەدا زۆرتر گرینگی بەو ژنانەدەدا کە بەهۆی هەوڵو تێکۆشانی خۆیان ئەو نێوبانگو سەرکەوتنانەیان بەدەست هێناوەو وەکوو خۆی لەسەردەمی منداڵیو مێرمنداڵی تامی هەژاریو پەرێشانیو دەستکورتیان چێشتووە. لەراستیدا مەبەستی ئێڤیتا لە خوێندنەوەی ژیاننامەی ئەو ژنانەی کە خۆیان پێگەیاندووە، ئەوە بوو کە ئاواتەکانی خۆی بۆ گەیشتن بە ناوبانگ وەدەرخست. لە ژانڤییەی ساڵی ١٩٤٤ دا بوومەلەرزەیەکی بەهێز لە "سان خوان"[9] روویدا کە زەرەدو زیانێکی زۆری لێکەوتەوە. ئێڤیتا ئەرکی سەرپەرشتی بەرنامە پڕوپاگەندەییەکانی بە مەبەستی کۆکردنەوەی یارمەتی بە بوومەلەرزە لێدراوەکان وەئەستۆ گرتو لە رەوتی ئەو پرۆگرامانەدا لەگەڵ سەرکردەی کەتیبەیەکی سەربازی بەناوی خوان پێرۆن ئاشنا بوو. خوان پێرۆن کە یەکێك لە ئەفسەرە کودتاچیەکان بووو لەگەڵ ئیمبێرتیش دۆستایەتی هەبوو، هەر بە نێگای یەکەم ئاشقی ئەو ژنە جوانو لاوە بووو ئێڤیتاش کە تا ئەوکاتە جگە لە هەوەس هیچیتری لەچاوی پیاوان

---

8-Anibal Francisco Imbert

9-San Juan





دەگەڕاو ئەو خالانەی کە ئەو خوازیاری بوو لە ئێڤیتا بەدیدەکرا. ئێڤیتا لەسەرەتادا وەك باوکێك چاوی لەو پیاوە هێدیو ساکارە دەکرد، بەڵام وردە وردە پێوەندییەکانیان وەك ئەڤینداریيەکی راستەقینەی لێهاتو ئێڤیتا لە قووڵایی دڵەوە ئاشقی ئەو "باوکە ئەڤیندار"ە بوو. ئێڤیتا بۆ بەرەو پێش بردنی کارەکانی پێرۆن، هەموو کاتو توانایی خۆی بۆ هەوڵو تێکۆشان لە رێکخراوە کرێکارییەکانی ئەرژەنتین تەرخان کردو لەنێو کرێکارانی ئەرژەنتین متمانەو خۆشەویستییەکی زۆری بۆ پێرۆن بەدەست هێنا. پێرۆن لەساڵی ١٩٤٥ بوو بە جێگری سەرۆك کۆماری ئەرژەنتین، بەڵام لە ئۆکتۆبەری هەمان ساڵ بە فەرمانی سەرۆك کۆماری ئەرژەنتین (فارێڵ)[10] دەستبەسەرو بەند کرا. تۆمەتی پێرۆن کارشکێنیو پیلانگێڕی بوو بۆ لەسەرکار لابردنی سەرۆك کۆمار کە ئەگەر بسەلمێندرابوایە لە مەترسی کوژران دادەبوو. لەم کاتەدا بوو کە ئێڤیتا دەستبەکار بووو رەوتی مێژووی ئەرژەنتینی گۆڕی. ئەو بە کەڵك وەرگرتن لەخۆشەویستی وکارتێکەری خۆی لە نێو کرێکارانی ئەرژەنتین، توانی رازییان بکات کە لە پێتەخت خۆپیشاندانێك بە دژی گیرانی پێرۆن وەرێ بخەن. لەرۆژی ١٧ئۆکتۆبەری ساڵی١٩٤٥و دوابەدوای مانگرتنی گشتیو خۆپیشاندانی کرێکاران لە شەقامەکانی بۆینێس ئایرێس، سەرۆك کۆمار ناچار بوو کە لە فەرمانەکەی پێشووی پاشەگەز بێتەوەو پێرۆن لە بەندیخانە بێنێتە دەرێ. خۆپیشاندانی کرێکاران تا رزگاری پێرۆن لە بەندیخانەو ئامادەبوونی لەکۆشکی سەرۆك کۆماری بەردەوام بووو کرێکارانی ئەرژەنتینی دوای ئەوە کە سەرۆك کۆماریان لەگەڵ پێرۆن لەسەر باڵکۆنی کۆشکی سەرۆك کۆماری بینی گەڕانەوە سەر کارەکانیانو کۆتاییان بە خۆپیشاندانەکە هێنا. پێرۆن بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو ماوە کورتەی کە لەبەندیخانەدا بوو پلەی ژنێراڵی وەرگرتو دوای ئەم رووداوە بوو کە بەفەرمی پێشنیاری زەماوەندی بە ئێڤیتا کرد. رێوڕەسمی زەماوەندی ئەوان لەمانگی دیسەمبەری ساڵی ١٩٤٥ لە بۆینێس ئایرێس بەڕێوە چوو. ژێنراڵ خوان پێرۆن لە ژانڤییەی ساڵی ١٩٤٦دا خۆی بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری پاڵاوت. خوان پێرۆن بۆ دەستەبەر کردنی ئەو پۆستە لە کاتی پێشبڕکێیەکانی هەڵبژاردن، لە هەموو شتێك زیاتر پشتی بە توانایی ئێڤیتا لە هونەری پڕۆپاگەندەو وتاربێژیو خۆشەویستی ئەو لەنێوان گەلی ئەرژەنتین بەستبوو. ئێڤیتا لەماوەی چوارمانگ پێشبڕکێی هەڵبژارنو بۆ پاڵپشتی هاوسەری سەردانی هەموو شارە گەورەکانو ناوەندە پڕحەشیمەتەکانی ئەرژەنتینی کردو دەرەنجامی ئەو هەولانە بریتیبوولە سەرکەوتنی بەرچاوی

---

10-Farrel



پێرۆن لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی١٩٤٦. پێرۆن بۆ ماوەی ٥ساڵ بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری هەڵبژێردراو ئێڤیتاش هاوکات لەگەڵ هاوسەری سەرقاڵی رێکخستنی حیزبێك بەناوی "حیزبی پێرۆنیست" بوو. ئێڤیتا ناوی حیزبەکەی نا حیزبی بێ جل وبەرگەکان کە کەم تا کورت هاومانای زاراوەی فارسیی "پێخواسەکانە". ئامانجو پرۆگرامی ئەم حیزبە هەر لەناوەکەیەوە دەردەکەوێ. ئێڤیتا بە لەبیر هێنانەوەی رۆژگاری تاڵی منداڵیو مێرمنداڵی دەیهەویست لەدەوڵەمەندان تۆڵە بستێنێتەوەو تا دەتوانێ یارمەتی چینی هەژارو زەحمەتکێشی کۆمەڵگا بدات .



**خۆپیشاندانی کرێکارانی ئەرژەنتین بە لایەنگری لە ئێڤیتا پێرۆن**

لەراستیدا حیزبەکەی ئێڤیتا بیروباوەڕی سۆسیالیستی هەبوو و بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی چینی هەژارو سەقامگیرکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی هەوڵی دەدا. ئێڤیتا پێرۆن لە تەنیشت ئەنجامدانی کاروباری سیاسی، ڕێکخراوێکی مەزنی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتیی دامەزراندو تەواوی هەوڵو تێکۆشانی خۆی بۆ کاروباری خێرخوازی لەو ڕێکخراوەدا وەگەڕ خستو هەروەها چەند پرۆگرامێکی سەفەری بۆ ناوچە کاولو هەژارنشینەکانی سەرانسەری وڵات داناو هەر بەو هۆیانەشەوە نازناوی "فریشتەی رزگاری هەژارانو داماوان"ی وەرگرت.



**ئێڤیتا پێرۆن لە یارییەکی تۆپانەدا شەقی یەکەمی لە تۆپ هەڵدا**

ئێڤیتا پێرۆن لەساڵی ١٩٤٧دا بەشێوەی فەرمی وەك هاوسەری سەرۆك کۆماری ئەرژەنتین، سەردانی چەند وڵاتێکی ئەورووپای رۆژئاوای کرد. مەبەستیئێڤیتا لەو سەفەرانە بریتی بوو لە دامرکاندنی کاریگەریی خراپی مەیلەوچوونە فاشیستییەکانی هاوسەری لەنێوان وڵاتانی ئەورووپی کە بریندارى بیری فاشیستی بوون. ئێڤیتا لەو ئەرکەدا سەرکەوتوو بوو، بەڵام چاپەمەنیو رۆژنامەکانی ئەورووپاو بەتایبەت ئەو رۆژنامانەی کە بیری چەپییان هەبوو، ئەویان



بەوە تۆمەتبار کرد کە بە پێچەوانەی درووشمەکانی سەبارەت بە لایەنگری لە کرێکارانو داماوان، زۆربەی کاتەکانی لەسەفەری فەرانسەدا بە کڕینی جلوبەرگو گەوهەرو ئاڵتونی بەنرخ لە بوتیك فرۆشانو زێڕینگەرانی پاریس تەرخان کردووە. کارتێکەری ئێڤیتا پێرۆن لەسیاسەتی ئەرژەنتینو رۆڵی ئەو لە دەسەڵاتدا رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبوو، ئەمەش بە شێوەیەك بوو کە لەساڵی١٩٥٠و ١٩٥١ هەموو کەس ئەویان بە سەرۆكو دەسەڵاتداری راستەقینەی ئەرژەنتین دەزانی. ژێنرال پێرۆن کە هاوسەرەکەی لەقووڵایی دڵو ئاشقانە خۆشی دەویست لەساڵی١٩٥١ بڕیاریدا کە هاوسەری بکاتە پاڵێوراوی پۆستی جێگری سەرۆك کۆماری ئەرژەنتین. بەڵام ژێنراڵەکانی ئەرژەنتین کە لە دەست تێوەردانە رۆژ لە دوای رۆژ زیاترەکانی ئێڤیتا لە کاروباری حکوومەت نارازی ببوون، بە دژی پاڵێوراوی ئەو بۆ پۆستی جێگری سەرۆك کۆماری هەڵوێستیان گرت. ئێڤیتا کە هەستی بە روودانی کودتایەك لە پشت ئەو دژایەتی کردنانە دەکرد، خۆی پاشەکشەی کردو هەر وەك ساڵی ١٩٤٦ سەرپەرشتی پرۆگرامەکانی هەڵبژاردنی هاوسەری گرتە ئەستۆ.



**ئێڤیتا پێرۆن لەکاتی خوێندنەوەی وتارێك لەسەر رادیۆ**

ژێنراڵ پیرۆن لە هەڵبژاردنەکانی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٥١ بە زۆرینەی دەنگ بۆ دووهەمین جار بۆ پۆستی سەرۆك كۆماری ئەرژەنتین هەڵبژێردراو دوای سەرکەوتن لەو هەڵبژاردنانەدا رایگەیاند کە ئەمجارەش وەك ساڵی ١٩٤٦بەهۆی هەوڵەکانی هاوسەری توانیویەنی سەرکەوێ. ئێڤیتا پیرۆن دوای دووپات بوونەوەی هەڵبژاردنی هاوسەری بۆ پۆستی سەرۆك كۆماری نەخۆش‌و لەجێگەدا کەوت. لەسەرەتادا واگومان دەکرا کە ئەو نەخۆشییە بەهۆی ماندوو بوون‌و پەشۆکاوی سەری هەڵداوە، بەڵام دوایی بەهۆی تاقی کارییە پزیشکییەکان دەرکەوت توشی نەخۆشی شێرپەنجە بووەو پتر لە چەند مانگی‌تر ژیان ناکات. ئێڤیتا پیرۆن دوای چەند مانگ نەخۆشی‌و ژان لە رۆژی ٢٦ی ژووئیەی ساڵی ١٩٥٢ماڵئاوایی لەژیان کرد. ئەو لەکاتی مردنیدا تەنیا سی‌و سێ ساڵی تەمەن بووو ژمارەی بەشدار بوان لە رێورەسمی بەخاك سپاردنی ئەو نیشان دەدات کە تا چ رادەیەك لای خەڵك خۆشەویست بووە. ئەرژەنتین لەرۆژی بە خاك سپاردنی ئەودا وەك حاڵەتی وەستانی لێهات‌و کۆڕی یادکردنەوە وماتەمینی ئەو تا حەوتوویەك درێژەی هەبوو.



**وێنەیەکی گەورە لە ئێڤیتاپیرۆن کە تا مانگێك دوای مردنی لە گۆڕەپانی گەورەی ناوەندی شاری بۆینێس ئایرێس رۆشن بووو لایەنگرانی شەوانە بە یادی ئەو لەم گۆڕەپانەدا کۆدەبوونەوە.**



مردنی ئێڤیتا پیرۆن لەتەمەنی لاوێتیدا بۆشاییەکی گەورەی لەژیانی خۆان پیرۆن دروست کردو هەڵەکانی خۆان پیرۆن لە پاشماوەی خولی سەرۆك كۆماریدا وەدەرکەوت کە هاوسەری تا چ رادەیەك لە کۆنترۆڵ‌و رێنمایی ئەو لەکاروباری دەسەڵاتدا کاریگەری بووە. یەکەمین هەڵەی پیرۆن دوای مردنی خێزانی ئەوە بووکە ئیمتیازی دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوتی بە کۆمپانیایەکی ئەمریکاییدا و ئەمەش نارەزایەتی‌و دژەکردەوەی ژمارەیەك لەرێبەرانی حیزبەکەی لێکەوتەوە. دووهەمین هەڵەی گەورەی پیرۆن دانانی هەندێك یاسا سەبارەت بە ئازادی ژنان‌و مافی تەڵاق بوو کە بووە هۆی دژایەتی کردنی کەنیسەی ئەرژەنتین. قەیرانی ئابووری‌و پەنەمان‌و بێکاریش فاکتەری‌تر بوون کە پێگەی پیرۆنیان لە نێوخەڵکدا لەرزۆك کردو هەل ومەرجی بۆ کودتایەکی سەربازی دژی ئەو ئامادە کرد. لەساڵی ١٩٥٥ هێزی دەریایی ئەرژەنتین بە دژی پیرۆن راپەڕی، بەڵام پیرۆن توانی ئەو بزوتنەوەیە سەرکوت بکات. لە سێپتەمبەری هەمان ساڵدا سەرکردەکانی سوپای ئەرژەنتین لەچەند بەشی دەوڵەتدا شۆڕشیان کردو پیرۆنیش دوای سێ رۆژ بەرگری ناچار بەدەست کێشانەوەو چوونە دەرێ لە ئەرژەنتین کرا. پیرۆن لەسەرەتادا چووە وڵاتی دراوسێ (پاراگوای)و دواییش نیکاراگوای‌و لە ئاکامدا لە ئیسپانیا نیشتەجێ بوو. پیرۆن نێزیکەی ١٧ساڵ بە پشتیوانی ژێنراڵ فرانکۆی دیکتاتۆری ئیسپانیا لەو وڵاتەدا ژیانی کرد. حیزبی پیرۆنیست لەسەرەتای ساڵەکانی دەیەیی ١٩٧٠ کە هەل ومەرجێکی نوێ لە ئەرژەنتین هاتبووە ئاراوەو حیزبە سیاسییەکان ئازادی تێکۆشانیان بەدەست هێنا، هەوڵەکانی خۆی دەست پێکردەوەو توانی لەهەڵبژاردنە گشتییەکانی ساڵی ١٩٧٣ی ئەرژەنتین سەرکەوتن دەستەبەر بکات. ژێنراڵ پیرۆن دوای ١٨ ساڵ دووری لە نیشتمان گەڕاوە بۆ ئەرژەنتین‌و لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٣لەتەمەنی ٧٨ ساڵیدا جارێکی‌تر بۆ پۆستی سەرۆك كۆماری ئەرژەنتین هەڵبژێردرا. پیرۆن لە تاراوگەدا هاوسەرێکی‌تری هێنابووو دەیهەویست رۆڵی ئێڤیتا پیرۆنی لەژیانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی ئەرژەنتین پی بدا. پیرۆن بۆ ئەم مەبەستە هاوسەری دووهەمی(ماریائێستیلا)[11] کە بەناوی "ئێزابێللا پیرۆن"[12] بەناوبانگ بوو وەك جێگری خۆی هەڵبژارد. خوان پیرۆن لەژووئیەی ساڵی١٩٧١دا، واتە کەمتر لەیەك ساڵ دوای هەڵبژاردنی بۆ پۆستی سەروك كۆماری مردو هاوسەری بوو بە جێنشینی. بەڵام ئاواتی

---

11-Maryia Estela
12-Lsabella Peron





پیرۆن سەبارەت بەوە کە هاوسەری دووهەمی ببێتە ئێڤیتای دووهەم وەدی نەهاتو ئیزابێللا کە لێهاتوویی‌و شارەزایی‌و توانایی پێویستی بۆ بەڕێوەبەری کاروباری حکوومەت نەبوو، لەمانگی مارسی ساڵی **١٩٧٦** بە کودتایەکی هێمنانەو بێ خوێنرێژی لەسەر کار لابردرا. ئەم رۆژانە لە ئەرژەنتین کەس یادی ئیزابێللا ناکاتەوە کە ٢٠ مانگ سەرۆك کۆماری ئەو وڵاتە بوو، بەڵام یادو بیرەوەری ئێڤیتا هێشتاش لە دڵەکاندا زیندووەو پەرتووکەکەی ئێڤیتا پیرۆن لەژێر ناوی **"ئامانجی ژیانی من"**[13] کە جگەلە ژیان نامەو بیرەوەرییەکان، روانگە کۆمەڵایەتییەکانی خۆی تێدا روون کردۆتەوە هەموو ساڵێك بە رێژەیەکی زۆر لەچاپ دەدرێتەوە. ئەو پەرتووکە لەراستیدا پەرتووکی پیرۆزی حیزبی پیرۆنیست یان پێخواسەکانی ئەرژەنتینە کە هێشتاش یەکێك لە بەهێزترین حیزبەکانی ئەرژەنتینەو لەنێوان چینی کرێکار لایەنگرو خۆشەویستییەکی زۆری هەیە.

13-La Razzon de mi vida





# سێ ژنی سەرۆك کۆمار کە رۆڵی گرینگ و کاریگەریان لە سیاسەت و حکوومەتی ئەمریکادا نواند

لە کۆمەڵگای ئەمرۆی ئەمریکادا پلەو پایەی ژنو پیاو پێکەوە یەکسانە، بەڵام ژنانی ئەمریکا لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم توانیویانە ئەو مافانە بەدەست بهێننو گەشەی سیاسی ئەوان لەو ماوەیەدا بەراورد لەگەڵ ژنانی ئەورووپیو تەنانەت ئاسیایش هێدیتر بووە. لەیاسای بنەڕەتی ئەمریکادا کە زیاتر لە دوو سەدە بە سەرکۆکردنەوەو نووسینەوەیدا تێدەپەڕێت، مافی دەنگدان بە ژنان نەدراوەو تەنانەت دوای شەڕە ناوخۆییەکانی ئەمریکاو راگەیاندنی بڕیاری ئازادی کۆیلەکان لەدەیەی ١٨٦٠ یش تەنیا مافی دەنگدان بە پیاوانی رەش پێست دراو ژنانی ئەمریکا بە رەش پێستو سپی پێستەوە تا ساڵی١٩٢٠ لە مافی سیاسی بێبەش بوون. لەگەڵ ئەوانەشدا ژنێکی ئەمریکایی تەنانەت بەرلەوە کە ژنانی ئەم وڵاتە مافی سیاسی وەرگرن، لە سیاسەتو حکوومەتی ئەمریکادا رۆڵی یەکەمی نواندو وەك "یەکەمین سەرۆك کۆماری ژنی ئەمریکا" ناوبانگی دەر کرد. لەمێژووی ئەمریکا هیچ ژنێك بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری یاخود جێگری سەرۆك کۆماری هەڵنەبژێردراوە، بەڵام ژمارەیەك لەهاوسەرانی سەرۆك کۆمارەکانی ئەمریکا توانیویانە بە کارتێکەری لە مێردەکانیان رۆڵێکی گرینگو بەرچاو لەحکوومەتی ئەمریکادا بگێڕن. لە کۆی ئەو ژنانە سێ ژن توانیویانە زیاتر لە ژنەکانیتر لە ژیانی سیاسی هاوسەریانو لەو رێگەیەشەوە لە سیاسەتو شێوازی حکوومەتی ئەواندا کاریگەر بن. ئەو سێ ژنە بریتین لە خاتوو ئێدیت بولینگ ویلسۆن[1] هاوسەری "وودرۆ _ویلسۆن"[2]ی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە شەڕی یەکەمی جیهانی، ئێلیانۆر رۆزڤێلت[3]، هاوسەری "فرانکلین دیلانۆ رۆزڤێلت"[4]ی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە ساڵەکانی ١٩٣٣تا ١٩٤٥و لە کۆتاییشدا نانسی

1-Edith Bolling wilson
2-Woodrow Wilson
3-Eleanor Roosevelt
4-Franklin Delano Roosevelt



رەیگان[5]، هاوسەری "رۆناڵدرەیگان"[6]ی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لەساڵەکانی ١٩٨١ تا ١٩٨٩ کە هەر سێکیان لەسەردەمی سەرۆك کۆماری هاوسەرانیان رۆڵی بەرچاوو جارجارەش دیاری کەریان لەسیاسەتی ئەمریکادا نواندووە. ئێدیت ویلسۆن هاوسەری دووهەمی بیستو هەشتەمین سەرۆك کۆماری ئەمریکا (ویلسۆن) بوو کە لەساڵی ١٩١٥ واتە ساڵێك دوای مردنی هاوسەری یەکەمی لەگەڵ ئەو زەماوەندی کرد. ویلسۆن لەساڵی ١٩١٢ وەك سەرۆك کۆماری ئەمریکا هەڵبژێردراو لەمانگی ئووتی ساڵی ١٩١٤ هاوسەری یەکەمی لەدەست دا. تەنیاییو پەرێشانیو پەشۆکاوی ئەو دوای مردنی هاوسەری، پزیشکە تایبەتو باوەڕپێکراوەکەی (کاری گریسۆن)[7] وەبیری ئەوەخست کە هاوسەرێکی نوێی بۆ ببینێتەوە. یەکێك لەدۆستە نێزیکەکانی هاوسەری کاری گریسۆن، ژنێکی ٤٢ساڵان بەناوی"ئێدێت بۆلینگ گاڵت"[8] بوو کە لەساڵی ١٩٠٨ هاوسەرەکەی لەدەست دابووو زێڕینگەرییەکی گەورەی لە واشنگتۆن بە میرات بۆ بەجێ مابوو. گریستۆن بەپێکهێنانی چەند کۆڕێکی میوانی پێشەکییەکانی ئاشنا بوونی ویلسۆنو ئێدێتی ئامادە کردو ویلسۆنیشس کە لەو کاتەدا پیاوێکی ٥٨ ساڵان بوو، بەرادەیەك ئاشقی ئەم ژنە بوو کە بە ناردنی پێشکەشییەك ئەوی بۆ ئێوارە خوانێکی تایبەتی لە کۆشکی سپی بانگهێشتن کردو لەگەڵ ئەوە کە هێشتا ساڵێك لەمردنی هاوسەری تێپەڕ نەببوو، هاوکات لەگەڵ وتنی ئەو بابەتە کە لەیەکەمین چاوپێکەتنیدا ئاشقی بووە، پێشنیاری زەماوەندی پێکرد. ئێدیت ویلسۆن لە پەرتووکی بیرەوەرییەکانیدا کە لەساڵی ١٩٣٩ بڵاو بۆوە، بەم شێوەیە داستانی ئەو میوانییە تایبەتە لەکۆشکی سپیو پێشنیاری زەماوەندی سەرۆك کۆماری ٥٨ ساڵەی ئەمریکا دەگێڕێتەوە:

*... پێشنیاری زەماوەندی سەرۆك کۆمار کە زیاتر لە چەند جارێك ئەوم نەبینی بوو چاوەڕوان نەکراوو راچڵەکێنەر بوو بۆ من. من کە چاوەڕوانی ئەو پێشنیارە نەبووم، خۆم ئامادە نەکرد بوو کە وەڵامێکی باشو شیاوی پێ بدەمەوە. یەکەمین شت کە هاتە زەینمەوە، هەڵبەت بێ لە بەرچاو گرتنی ئەوە کە رەنگە قسەکانم ببێتە هۆی زویر بوونی ئەو، خستەسەر زارمو گوتم*

5-Nancy Reagan
6-Ronald Reagan
7-cary Garyson
8-Editbollihg Galt





*"بەلاّم بەرێز سەرۆك كۆمار ئێوە ناتوانن منتان خۆش بوێت... لەبەرئەوەی كە ئێوە هێشتا من ناناسن.. جگە لەوەش هێشتا سالێك بە سەر مەرگی هاوسەرتان تیّ نەپەڕیوە"*. سەرۆك كۆمار لە ولاّمدا وتی: *"بەڵی من لەهەستی ئێوە تێدەگەم. بەلاّم كچە بچكۆڵە (ئەو لەگەڵ ئەوەش كەمن زیاتر لە چل ساڵم تەمەن بوو، بەم ناوە دەیدواندم) لێرەدا پێوانە كاتو حەوتووو مانگو ساڵ نییە.. لەو ڕۆژەی كە هاوسەرم مردووە من ساتێك هێمنیو ئارامیم نەبینیوە. تەنیایی ئازارم دەداتو لەو ڕۆژەی كە ئێوەم بینیوە ئەو هەستە لە دەروونمدا درووست بووە كە تەنیا ئێوە دەتوانن جێگەی چۆڵی ئەو لەم ماڵەدا پڕ كەنەوە. من ئەم بابەتەم بە كچەكانمو هێلێن (كچە مامی ویلسۆن كە دوای مردنی هاوسەری ویلسۆن، بەرێوبردنی كاروباری ناوخۆی كۆشكی سپیی لە ئەستۆدا بوو) وتووەو هەموویان رازین كە منو تۆ زەماوەند بكەین...*

ئێدیت درێژە بە قسەكانی دەداتو دەڵێ كە وتووێژی ئێمە سەبارەت بە زەماوەند كاتژمێرو نیوێكی خایاند. لە ئاكامدا وتم ئەگەر بڕیار بێت ئەم شەو جوابی بەڵێ یا خود نا بدەمەوە، جوابی من نێگەتیڤ دەبێت مەگەر ئەوە كە دەرفەتی بیركردنەوەم لەبارەی ئەو پێشنیارە پیّبدەی. ویلسۆن دەرفەتی بیر كردنەوەی پێدا، بەلاّم ئێدیت كە نەیدەتوانی بڕیار بدات، دوو ڕۆژ دواتر لە واشینگتۆن چووە دەرێو دوور كەوتنەوەی لە پێتەخت دوومانگی خایاند. ئێدیت ویلسۆن لە بیرەوەرییەكانیدا دەنووسێ: "كاتێك واشینگتۆنم بەجێهێشت دلّم بۆ پیاوێك لێی دەدا كە لەم پلە بەرزە سیاسیو زانستییەدا[9]، بەپاكیو راستگۆیی سەبارەت بە من ئەشقو خۆشەویستی دركاند، بەلاّم دەمهەویست بە ماوەیەك دووری لە واشینگتۆن بە جۆرێك هەستی قووڵی ئەو تاقی بكەمەوە...". چەند ڕۆژ دوای رۆیشتنی ئێدیت لە واشینگتۆن، هاوسەری گریسۆن (پزیشكی تایبەتی ویلسۆن) ئەو ئاگاداری كردەوە كە سەرۆك كۆمار دوای رۆیشتنی ئەو بەهۆی خەمو پەژارەیەكی زۆرەوە نەخۆشەو لە جێگەدا كەوتووە. ئێدیت نامەیەكی پڕ لە سۆزو خۆشەویستیی بۆ ویلسۆن نووسیو بەڵێنی پێدا كە دوای گەڕانەوە ئەگەر سەرۆك كۆمار لە پێشنیارەكەی پاشەگەز نەبووبێتەوە ولاّمەكەی بە دلّخوازی ئەو دەبێت. ئەو نامەیە ویلسۆنی

9- ویلسۆن بەر لەوەكە ببێتە سەرۆك كۆمار، پسپۆرێكی ناسراوو نووسەرێكی بەتوانا بوو. پەرتووكەكانی سەبارەت بە بابەتە سیاسیو كۆمەلاّیەتییەكان لە زانكۆكانی ئەمریكا دەگوتراوە. هەروەها ویلسۆن ماوەی دەسالیش سەرۆكایەتی زانكۆی بە ناو بانگی "پرینستۆن"ی ئەمریكای لە ئەستۆدا بوو.



هێنایەوە سەرخۆشی و شادیو خۆشحالّی ئەو لە كۆبوونەوەكانی حكوومەت بۆ ئەو وەزیرانەی كە ئاگادرای بابەتەكە نەبوون، سەرسووڕ هێنەر بوو. ڕۆژی سێهەمی سێپتەمبەر ئێدیت گەڕایەوە بۆ واشینگتۆنو لەكاتی گەیشتنی بۆ ماڵەوە سەبەتەیەكی گەورەی گوڵو بانگهێشتن نامەیەكی سەرۆك كۆماری سەبارەت بەبانگێشت كرانی بۆ خواردنی شەو لەكۆشكی سپی بەدەست گەیشت. ئەو شەوە ویلسۆن بە گەرمو گوڕی پێشنیاری زەماوەندەكەی باس كردەوەو جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كە دەبیّ رێورەسمی زەماوەندەكەش بەیانی بێت. بەلاّم ئێدیت داوای مولّەتی زۆرتری بۆ ئامادەكردنی خۆی كرد. لەئاكامدا لەسەر ئەوە رێككەوتن كە بڕیاری ویلسۆن بۆ زەماوەند لەگەڵ ئێدیت بوولینگ لەهەمان ڕۆژی چواردەهەمی سێپتەمبەری ساڵی ١٩١٥ رابگەیێندریێو رێورەسمی زەماوەندی ئەوان لەمانگی ئۆكتۆبەر بەڕێوە بچێت. دوای راگەیاندنی بڕیاری ویلسۆن بۆ زەماوەند لەگەڵ ئێدیت بوولینگ رووداوێكی سەیرو سەمەرە روویدا كە نەتەنیا دەیتوانی پڕۆگرامەكانی ویلسۆنو ئێدیت لەمەترسی باوێ، بەلّكوو دەیتوانی ئابروو كەسایەتی یەكیك لە ناودارترین سەرۆك كۆمارەكانی ئەمریكاش ببات. ژنێك بەناوی ماری ئالێن پیك[10] رایگەیاند كە ویلسۆن سالاّنێكی زۆر ئەویندارى ئەو بووەو نێزیكەی ٢٠٠ نامەی ئاشقانەی بۆ نووسیوە. ماری ئالێن پیك پەیامی بە ویلسۆن دابوو كە ئەگەر دەیهەوێ زەماوەند بكات، دەبیّ لە پێشدا زەماوەند لەگەڵ ئەو بكات. پەیامەكەی ماری ئەو هەڕەشەیەشی تێدا بوو كە ئەگەر زەماوەندەكەی ئەو لەگەڵ ئێدیت بۆلینگ سەربگرێت نامەكانی بلاّو دەكاتەوەو ئابرووی دەبات.

هەڕەشەی ماری مەترسیدار بووو ئەگەر ئەو بابەتە بسەلمێندرابوایە كە ویلسۆن لەكاتی زیندوو بوونی هاوسەری لەگەڵ ژنێكیتر پێوەندی یا خود نامە گۆڕینەوەی بووە، ئابروی كەسایەتییە سیاسیو كۆمەلاّیەتییەكەی دەكەوتە مەترسییەو. رووداوی ماری ئالێن پیك كە هێشتاش بۆ كەس روون نییە، كۆتایی پێهاتو نامە ئاشقانەكانی ویلسۆن هیچكات بلاّو نەبۆوە. بەلاّم ئەوە روونو ئاشكرایە كە ئێدیت بوولینگ لە بێدەنگ كردنی ماری پیك رۆلێكی گرینگی گێڕاو بە پێدانی پارەیەكی زۆر نامەكانی ویلسۆنی لەو ژنە كڕیوەتەوە. تەنانەت دەنگۆی ئەوە لە ئارادا بوو كە ماری بەخەرجی ئێدیت سەفەری دوورو درێژی بۆ ولاّتانی ئەورووپی كردووەو دوای

10-Mary Allen Peck





گەڕانەوەش بۆ ئەمریکا تا کۆتایی دەورانی سەرۆك کۆماری ویلسۆن پارەو پوولێکی بەرچاوی لە سامانی خودی ئێدیت وەرگرتووە. ویلسۆن بەهۆی ئەو رۆڵەی کە ئێدیت لەرووداوی ماری ئالێن پیکدا نواندی زیاتر لەجاران هۆگری بوو. رێوڕەسمی زەماوەندی ئەوان بەهۆی تووش بوون بە رووداوی ماری ئالێن پیك‌و پێویستیی بێدەنگ کردنی ئەو پێش ئەم رێوڕەسمە، تا مانگی دێسەمبەر وەدوا خرا. جێژنی بووکێنی لە رۆژی ١٨ی دێسەمبەر لەماڵی ئێدیت بەڕێوە چوو. تازە  بووکی ٤٢ ساڵە لە ژانڤییەی ساڵی ١٩١٦و دوای تەواو بوونی مانگی هەنگوین بۆ کۆشکی سپی گواسترایەوە. ویلسۆن کە لەساڵی ١٩١٦ بۆ جاری دووهەم بوو بە پاڵێوراوی بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك کۆماری‌و بە نازناوی "پیاوی ئاشتی"و کەسێك کە توانی ئەمریکا لەئاوری شەڕی یەکەمی جیهانی بپارێزێت، بەزۆرینەی دەنگ دووبارە بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری ئەمریکا هەڵبژێردرا. بەڵام چەندمانگ دواتر ئەو پیاوەی کە بە دروشمی ئاشتی لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتبوو، ئەمریکای تووشی شەڕ کرد. ویلسۆن لەرۆژی یەکەمی ئاپریلی ١٩١٧ لە وتارێکدا کە لەکۆنگرەی ئەمریکا پێشکەشی کرد، دوای روونکردنەوەی هۆکارەکانی بەشداری ئەمریکا لە شەڕ، وتی: "خستنە ناوی ئەم دەوڵەتە ئاشتی خوازە بۆ یەکێك لە مەترسیدارو پڕکارەساتو مەینەتبارترین شەڕەکانی مێژوویی جیهان بڕیارێکی ترسناکە... بەڵام ئێمە رێگایەکی ترمان نییە... ژیاری مرۆڤ لە مەترسی دایەو لە هەموو کاتێکدا حەق‌و راستی (حەقیقەت) لە ئاشتی باشترو بەنرخترە". بەشداری کردنی ئەمریکا لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا فاکتەرێکی گرینگ بوو بۆ سەرکەوتنی هاپەیمانان لەبەرامبەر هێزەکانی ئەڵمان‌و ئیتالیاو عوسمانی (متحدین). سەرۆك کۆمار ویلسۆن وەك قارەمانێکی سەرکەوتووی ئەو شەڕە لەرۆژی چواردەیەمی دێسەمبەری ساڵی ١٩١٨ بەرەو ئەورووپا وەڕێکەوت. ویلسۆن چ لەکاتی شەڕو چ لەکاتی وتووێژەکانی تایبەت بە کۆتایی پێهێنانی شەڕو ئاشتی، لەگەڵ هاوسەری راوێژی دەکرد. ئێدیت لەوە کە هاوسەری لە وتووێژەکانی ئاشتی‌و دیاریکردنی داهاتووی جیهان رۆڵی یەکەمی هەیە شانازی بە خۆی دەکردو بەتایبەت لەپێوەندی لەگەڵ گەلاڵەی پێشنیاری ویلسۆن بۆ دامەزراندنی رێکخراوێکی جیهانی کە ئاشتی‌و دادپەروەری لەجیهاندا سەقام گیر بکات، بە شانازی‌و لەخۆباییەوە باسی لێوە دەکرد. بەڵام حیزبی بەرهەڵستکاری ویلسۆن (کۆماریخواز) لە ماوەی سەفەری درێژخایەنی ئەو بۆ ئەورووپا لە هەڵبژاردنەکانی کۆنگرەی ئەمریکا سەرکەت‌و بەم هۆیەشەوە زۆربەی نوێنەرانی کۆنگرەو



بەتایبەت زۆرینەی بەرچاوی سێناتۆرەکان دژ بە سیاسەتەکانی ئەو هەڵوێستیان گرت. ویلسۆن دوای گەڕانەوەی بۆ ئەمریکا بینی رەنگە گەلاڵەکەی بۆ دامەزراندنی "کۆمەڵەی نەتەوەکان" کە وڵاتەکانی ئەورووپا بە گەرمی پێشوازیان لێکرد، لەلایەن زۆرینەی سێناتۆرە بەرهەڵستکارەکانەوە رەد کرێتەوە. ئێدیت ویلسۆن کە ئاگاداری هۆگری‌و خۆشەویستی هاوسەری بەو گەلاڵەیەو ئەو کاریگەرییە خراپە بوو کە پەسند نەکرانی گەلاڵەکە لەسەر ورەو دەروونی ئەوی دادەنێت، پێشنیاری بە ویلسۆن کرد بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی خەڵك لەسیاسەتەکانی دەرەوەی ئەمریکاو لەم رێگایەشەوە ناچارکردنی سێنا بۆ پێڕەوی لەرای گشتی خەڵك، خەباتێکی پڕوپاگەندەی بەرفراوان لەئەمریکا وەرێخەن. ویلسۆن ئەو پێشنیارەی پەسند کردو رۆژی سیهەمی‌سێپتەمبەری ساڵی ١٩١٩ بۆ سەفەرێکی یەك مانگە بۆ ویلایەتە جۆراوجۆرەکانی ئەمریکا سواری شەمەندەفەر بوو. بۆ ئەو سەفەرە ١٦٠٠٠ کیلۆمەترییە پرۆگرامی وتار بێژی بۆ ٢٦ جێگا ئامادە کرابوو. خانمی ویلسۆن‌و گریسۆن، پزیشکی تایبەتی سەرۆك کۆمارو ٢٥ هەواڵنێر لەو سەفەرەدا هاورێیەتی ویلسۆنیان دەکرد. هەروەك خاتوو ویلسۆن پێشبینی کردبوو، ئەو سەفەرەی ویلسۆن بەسەرکەوتنێکی بەرچاو دەستی پێکردو وتارەکانی ویلسۆن کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر بیسەرانی دادەنا.



**خانمی ویلسۆن لەگەڵ هاوسەرەکەی، وودرو-ویلسۆن**





رەنگدانەوەی بەرفراوانی ئەو وتارانە لە رۆژنامەو بلاّوکراوەکانی ئەمریکاو پێشوازی رای گشتی لەو وتارانە، ویلسۆنی هان دا کە وتاری پترو بە گوڕوتینتر بداو بۆیەش لە هەر شارێك چەند جارو لە کۆڕو کۆمەڵە جۆراوجۆرەکان وتاری دەخوێندەوە. گریسۆن لە هەژانی توندی ویسلۆن لەکاتی وتاربێژی و ئەو گوشارەی کە لە رەوتی سەفەرەکە دەکەوتە سەر ویلسۆن بە پەرۆش بووو ئێدیت ویلسۆنیش بەراسپاردنی گریسۆن داوای لە هاوسەری دەکرد کە ژمارەی وتارەکانی کەمتر بکاتەوە، بەلاّم ویلسۆن کە لە پێشوازیو گوێگرتنی خەڵك لە وتارەکانی سەرخۆش دەبوو، گوێیێ نەدەدا راسپاردەکانی پزیشكو هاوسەری، بۆیەش لەنێوان رێگادا بەهۆی گوشارو ماندووبوونو جۆشو خرۆشی زۆرەوە تۆشی شەپلّە بووو هەر بەو هۆیەشەوە ئەو شەمەندەفەرەی کە ویلسۆنو هاورێیانی پێ بوو بەرەو واشینگتۆن گەڕاوە. رۆڵی سەرەکی خاتوو ویلسۆن لە سیاسەتو حکوومەتی ئەمریکادا لەم رێکەوتەوە دەست پێدەکات. لەبەرئەوەی کە ئێدیت ویلسۆن دەستبەجێ دوای گەڕانەوەی سەرۆك کۆمار بۆ واشینگتۆن، هاوسەرەکەی لە ژووری خەوتنی لە کۆشکی سپیدا بەند کردو بە بیانووی ئەوەکە دەبێ سەرۆك کۆمار بە راسپاردنی پزیشك پشووی تەواو بدات، چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەو قەدەغە کرد. ویلسۆن تا تەواو بوونی دەورانی سەرۆك کۆماری کە ١٧مانگ درێژەی کێشا نەخۆشو لەجێدا کەوت. پێوەندی ئەو بەدنیای دەرەوەو کاربەدەستانی حکوومەتو سیناتۆرەکانو نوێنەرانی کۆنگرە لەرێگای ئێدیت ویلسۆنەوە بوو. خانمی ویلسۆن لە ژوورێك کە لە تەنیشت دیوی خەوتنی هاوسەرەکەی بوو، چاوپێکەوتنی لەگەڵ وەزیرەکانو کاربەدەستانی دەوڵەتو سەرکردە سەربازییەکانو سێناتۆرو نوێنەرانی کۆنگرە دەکردو بۆچونو پێشنیارەکانیانی دەنووسیو دوایش ئەو راپۆرتو هەواڵو پێشنیارانەی لەژوورێکی داخراودا لەگەڵ هاوسەری باس دەکردو ولاّم یان بڕیارەکانی سەرۆك کۆماری لە بارەی هەرکام لەو راپۆرتو پێشنیارانە بە کاربەدەستانی دەوڵەتیو سەرکردە سەربازییەکانو سێناتۆرو نوینەرانی کۆنگرە رادەگەیاند. لە هەندێك جێگەدا کە پێویست بوو فەرمانی سەرۆك کۆمار لەژێر راپۆرتەکان بە نووسراوە بێت، ئێدیت فەرمان یا خود روانگەی هاوسەرەکەی بەدەستنووسی خۆی دەنووسیو ویلسۆنیش ژێری ئەو نووسراوانەی واژوو دەکرد. درێژەکێشانی نەخۆشی ویلسۆن بە لە بەرچاو گرتنی ئەو راگەیاندراوە لێڵو هیوابەخشە پزیشکییانەی کە سەبارەت بە یاسایی بوونی باری تەندروستی سەرۆك کۆمار بلاّو دەکرایە، ئەو گومانەی لەزەینی خەڵکدا درووست دەکرد کە سەرۆك کۆمار لەش ساغیو توانای بڕیاردانی لە



دەست داوەو ئەوە خانمی ویلسۆنە کە لە گرینگترین بابەتەکانی پەیوەست بە کاروباری سیاسەتی دەرەکیو ناوخۆیی ئەمریکا لەجیاتی ئەو بڕیاردەداتو واژۆی سەرۆك کۆمار لەژێر بڕیارەکانی خۆی دەدات. تەنانەت ژمارەیەك لە سێناتۆرە بەرهەڵستکارەکانی ویلسۆن شکیان لە واژۆکانی سەرۆك کۆمار دەکرد، لەبەرئەوەکە واژۆکانی بە خەتێکی شکاوو لەرزۆك لەسەر لاپەڕەکان دەدراو وادەهاتە بەرچاو کە خاتو ویلسۆن پێنووسەکەی داوەتە دەستی هاوسەرییو ئەوی لە واژۆکردنی بەڵگەکان یارمەتی داوە. لەساڵی ١٩٢٠ کە خەباتی ژنانی ئەمریکا بۆ وەدەست هێنانی مافە رامیارییەکانیان گەیشتبووە بەرزترین رادەی خۆی، سێناتۆرێکی ئەمریکایی گوتی کە ژنانی ئەمریکایی پێش ئەوەی مافە رامیارییەکانیان بەدەست بهێنن، حکوومەتمان بە سەردا دەکەن. ئەو بەراشکاوی ناوی خانمی ویلسۆنی وەك ژنێك هێنا کە بەکردەوە ئەرکەکانی سەرۆك کۆماری ئەمریکا ئەنجام دەداتو پێشنیاری کرد کە شاندێك لە پزیشکە پسپۆڕەکان سەرۆك ویلسۆن بخەنە ژێر تاقیکاریو ئەگەر بەراستی ناتوانێ ئەرکەکانی سەرۆك کۆماری ئەنجام بدات، ئەوە دەبێ بەپێی یاسای بنەڕەتی ئەمریکا دەسەلاّتەکانی سەرۆك کۆماری بەجێگرەکەی بسپێردرێت. بەلاّم سێناتۆرەکانو نوێنەرانی کۆنگرە پێشوازییان لەو پێشنیارە نەکردو زۆرینەی ئەندامانی کۆنگرە ئەگەرچی دەیانزانی ویلسۆن توانای ئەنجامدانی ئەرکەکانی نییەو خاتوو ویلسۆن لەلایەن ئەوەوە لەسەر کاروباری ناوخۆییو دەرەکیو دانانو لەسەرکار لابردنی کاربەدەستانی دەوڵەتی بڕیار دەدات، رازی بوون کە ئەم بارودۆخە تا تەواوبوونی دەورانی سەرۆك کۆماری ویلسۆن درێژەی هەبێت. هۆی ئەم هەڵویستەی سێناتۆرەکانو ئەندامانی کۆنگرە ئەوە بوو کە ئەگەر ویلسۆن لەسەرکار لابردرابوایە، جێگرەکەی (تۆماس رەیلی مارشاڵ)[11] دەبووە جێنشینی ئەوو تۆماس رەیلی مارشاڵیش نەتەنیا لەلای کۆماریخوازەکان قێزەون بوو بەڵکوو لەنێوان سێناتۆرەکانو نوێنەرانی دیمۆکراتخوازی کۆنگرەش نەیاری زۆر بووو هەر بۆیەش درێژەکێشانی ئەو بارودۆخە لە بەدەستەوە گرتنی پۆستی سەرۆك کۆماری لەلایەن تۆماس مارشاڵەوە لەلایەن ئەوانەوە زیاتر قەبووڵ دەکرا. بەم شێوەیە خانمی ویلسۆن توانی بە کەڵك وەرگرتن لەو هەڵکەوتە تایبەتییەی کە لە دەورانی نەخۆشی هاوسەرەکەی هاتبووە ئاراوە، تا کۆتایی دەورانی سەرۆك کۆماری

11-Thomas Rileg Marshal





هاوسەری لەساڵی ١٩٢١ لە ئەمریکا حوکمڕانی بکات. هەڵبەت سەنگی حکوومەتی حەڤدە مانگەی ئەو لە بواری سیاسەتی دەرەکی‌و نێوخۆیی قورس‌وسەرکەوتوو نەبووو کۆمەڵەی نەتەوەکان کە بە پێشنیاری ویلسۆن لە کۆنفرانسی پاریس دامەزرا بوو، بەبێ ئامادەبوونی نوێنەرانی ئەمریکا دەستی بەکارەکانی کرد. ویلسۆن تا چوار ساڵ دوای تەواوبوونی دەورانی سەرۆك کۆماری زیندو مایەوەو خانمی ویلسۆن لە رووی خۆشەویستی‌و ئەڤینەوە ئەرکی چاوەدێری‌و ئاگاداری مێردە پەککەوتووو نەخۆشەکەی تا کۆتایی هاتنی ژیانی لەرۆژی سێهەمی فێبریەی ساڵی ١٩٢٤ بەئەستۆ گرت. خاتوو ویلسۆن کە پەرتووکی بیرەوەرییەکانی پێشکەش بە رووحی هاوسەری کردبوو، لەساڵی ١٩٣٩ چاپ‌و بڵاو کردەوەو تاساڵی ١٩٦١کە لەتەمەنی ٨٨ ساڵیدا مرد، لەگەڵ ئەوەش کە پیرو نەخۆش بوو لە تەواوی ئەو رێوڕەسمانە بەشداری دەکرد کە بەیادی هاوسەری یاخود لەبەر ناو لەسەرنانی رێکخراوێك یان قوتابخانەیەك یان پردو شەقامێك بەناوی ویلسۆن بەڕێوە دەچوو.

***

دوای ئێدیت ویلسۆن کە ماوەیەك بە تەنیاو بەناوی هاوسەری لە ئەمریکا حوکمڕانی کرد، لە نیوان هاسەری سەرۆك کۆمارەکانی ئەمریکادا ئێلیانۆر رۆزڤێڵت، هاوسەری فرانکلین دیلانۆ رۆزڤێڵت (سی‌و دووهەمین سەرۆك کۆماری ئەمریکا) رۆڵی بەر چاوی لە سیاسەت‌و حکوومەتی ئەمریکادا نواندو دوای مردنی هاوسەری ساڵانێکی زۆر پۆستی نوێنەری ئەمریکای لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەئەستۆ بوو. ئێلیانۆر رۆزڤێڵت لەساڵی١٨٨٤لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی نیۆیورك لەدایك بووو لەتەمەنی منداڵیدا دایك‌و باوکی لەدەست داو لەژێر سەرپەرشتی خزمە نزیکەکانی دەژیاو لە قوتابخانە تایبەتی‌و شەوورۆژەیی (پانسیۆن) نیۆیورك خەریکی خوێندن بوو. یاساو رێساکانی ئەو قوتابخانانەی کە ئێلیانۆر دەرسی لێدەخوێند، زۆر تووندو جیدی بووو هەر بۆیەش ئێلیانۆر جگە لەوە کە بەباشی وانەکانی دەخوێند، زۆر رێکوپێك‌و قورس راهات‌و هەر ئەم هەڵسوکەوتە مەتین‌و قورسەی ئەو بوو کە سارای دایکی فرانکلین رۆزڤێڵتی خستە بیری ئەوەی کە خوازبێنی لێ بکات بۆ کوڕەکەی. فرانکلینیش لە بنەماڵەیەکی زۆر دەوڵەمەندو تێروتەسەلی نیۆیورك لەدایك ببووو لە بەناوبانگترین خوێندنگەکان‌و زانکۆکانی ئەمریکادا خوێندنی تەواو کرد بوو.





**فرانکلین رۆزڤێڵت‌و ئێلیانۆر لەساڵی ١٩٠٦، ساڵێک دوای زەماوەند**

ئێلیانۆر رۆزڤێڵت لەکاتی زەماوەند لەگەڵ فرانکلین لەساڵی ١٩٠٥ دا بیست‌و یەك ساڵی تەمەن بووو هاوسەریشی تەنیا دوو ساڵ لەو گەورەتر بوو. لەساڵی ١٩٠٦ یەکەمین منداڵیان کە کچ بوو، چاوی بە دونیا پشکوت‌و لەماوەی دەساڵی دواتر چوار منداڵی تریشیان بوو کە هەموویان کوڕ بوون. لەو ماوەیەدا فرانکلین رۆزڤێڵت چووە نێو کارو تێکۆشانی سیاسی‌و لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری لەساڵی ١٩١٢ بە توندی لایەنگری لە ویلسۆن دەکرد. رۆزڤێڵت دوای سەرکەوتنی ویلسۆن لەهەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری، پۆستی جێگری وەزیری دارایی وەرگرت‌و لە رێکخستنی هێزی دەریایی ئەمریکا بۆ شەڕ لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا رۆڵی گرینگی گێڕا. هاوکات لەگەڵ هەوڵە سیاسییەکانی فرانکلین رۆزڤێڵت، ئێلیانۆریش پێوەندیی بە بزاڤی ژنانی ئەمریکا بۆ بەدەستهێنانی مافە رامیارییەکانەوە گرت‌و لە کۆبوونەوەکانی ژنان لە نێیۆرك‌و واشینگتۆندا وتارگەلێکی پڕجۆش‌وخرۆشی خوێندەوە. هەروەها ئێلیانۆر رۆزڤێڵت لە رۆژنامەکانی ئەمریکا دەستی بە نووسینی وتار بە لایەنگری لەمافی ژنان کرد. لەو کاتەدا ناوبانگی ئەو لەهاوسەری کەمتر نەبوو. لەساڵی ١٩١٨دا کاتێك کە فرانکلین رۆزڤێڵت لەگەڵ ویلسۆن بۆ بەشداری لە کۆنفرانسی ئاشتی چوو بووە پاریس،

ئێلیانۆر لەکاتی ڕێکوپێك کردنی ژووری کاری هاوسەری نامەگەلێکی ئاشقانەی دۆزییەوە کە بەدەستنووس‌و واژۆی سکرتێرە گەنج‌و جوانەکەی (لۆسی مێرسێر)[12] بۆ ڕۆزڤێلت نووسرا بوو. نامەکان کە پتر لەوڵامی نامەکانی ڕۆزڤێلت نووسرا بوون، تایبەت بوو بە پێوەندی ئەوان لە دوو ساڵی رابردوودا. ئێلیانۆر تا گەڕانەوەی ڕۆزڤێلت بێدەنگی راگرت، بەڵام کاتێك کە ڕۆزڤێلت لە سەفەر گەڕایەوە پێی گوت کە دەبێ لەنێوان ئەشقی ئەو کچە ٢٢ ساڵەیەو ژیانی بنەماڵەی خۆی یەکیان هەڵبژێرێت. ڕۆزڤێلت ئامادە نەبوو کە ئەشق‌و پێوەندییەکانی لەگەڵ لۆسی بپچڕێنێ‌و هەر بەو هۆیەشەوە ئێلیانۆر بۆ وەرگرتنی رەزامەندی دایکی ڕۆزڤێلت سەبارەت بە جیابوونەوەیان سەردانی ئەوی کرد. دایکی فرانکلین کە دوای مردنی هاوسەری بەتەنیا میراتگری سەروەت‌و سامانی ئەو بە ئەژمار دەهات، ڕۆزڤێڵتی بانگهێشتن کردو پێی راگەیاند کە ئەگەر واز لە ئەڤینی لۆسی نەهێنی لەسەروەت وسامانی خۆی بێ‌بەشی دەکات. فرانکلین ئامادە بوو لەبەر ئەڤینی لۆسی هەمووشتێکی خۆی فیدا بکات، بەڵام پێش ئەوەکە هاوسەری تەڵاق بدات چووە لای لۆسی تا بەڵێنی زەماوەندی لێ‌بستێنێ‌و لۆسی کە کاتۆلیك بوو، گوتی ناتوانێ لەگەڵ پیاوێك کە هاوسەری تەڵاق داوە زەماوەند بکات.

زەماوەندی لۆسی لەگەڵ پیاوێکی بەساڵاچووی دەوڵەمەند خاڵی کۆتایی ئەم ئەڤینە بوو. پێوەندییەکانی ئێلیانۆرو فرانکلین دوای ئەو رووداوە تا ماوەیەك سارد وسڕ بوو، بەڵام ئێلیانۆر لەساڵی ١٩٢١ کە فرانکلین تووشی پەککەوتوویی هات، بە لەخۆبردووییەکی بێ وێنەوە ئەرکی چاوەردێری‌و پەرستاری فرانکلینی بەئەستۆ گرت‌و ڕۆزڤێڵتی خستە ژێر کاریگەری دڵسۆزییەکانی خۆی. پەککەوتوویی ڕۆزڤێلت بەهۆی چاوەدێری هاوسەری‌و بەهەندێك وەرزش کە بەیارمەتی ئەو ئەنجامی دەدا، بڕێك باشتر بووو توانی بە گۆچان بڕوات، بەڵام پەککەوتوویی هەردوو لاقی چاك نەدەبۆوەو ناچار بوو زۆرتر بە ویلچێر (عارەبانەی پەککەوتووان) هات وچۆ بکات. ڕۆزڤێلت بە لەمێشك ڕۆکردن‌و هاندانی هاوسەری هەوڵە سیاسییەکانی خۆی چڕتر کردەوەو هەر بەم هۆیەشەوە بوو کە توانی بەسەر ئەو پەرێشانی‌و کەسەریەدا زاڵ بێت کە بەهۆی پەککەوتوویی‌و نەجووڵانەوەی لەشی تووشی ببوو. ئێلیانۆریش پێ‌بەپێی هاوسەری چووە نێو گۆڕەپانی سیاسەت‌و توانی ڕێبەرایەتی کۆمەڵەی ژنانی لایەنگری حیزبی دێمۆکرات

---

12-Lucy Mercer



بەدەستەوە بگرێت. ڕۆزڤێلت لەساڵی ١٩٢٨دا پۆستی گرینگی حاکمی ویلایەتی نیۆیۆرکی بەدەستەوە گرت و لەم دەنگدانەدا دەنگی ژنانی نیۆیۆرك لەسەرکەوتنی ئەودا ڕۆلێکی گرینگی نواند.



**ئێلیانۆر ڕۆزڤێلت ڕێبەریی خۆپیشاندانی لایەنگرانی مافی سیاسیی ژنانی ئەمریکا لەساڵی ١٩٢٠دەکات**

لەسەرەتای دەیەی ساڵی ١٩٣٠دا ئەمریکا تووشی گەورەترین قەیرانی ئابووری دەورانی سەربەخۆیی خۆی بۆوەو ڕۆزڤێلت بە پێدانی بەڵێنیی جێبەجێکردنی چەند گەلاڵەیەکی کاریگەرو بەجێ بۆ نەهێشتن‌و لەناوبردنی ئەو قەیرانە خۆی بۆ بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك کۆماری پاڵاوت. هاندەری سەرەکی ئەو لەم پێشبڕکێیەدا هاوسەری بووو هەر بۆیەش ڕۆزڤێلت دوای سەرکەوتن بەسەر رکەبەرەکانی لە کۆنڤانسیۆنی حیزبی دێمۆکرات، لەگەڵ هاوسەری سەردانی ویلایەتەکانی ئەمریکای کردو بە گوتنی زیاتر لە دووسەد وتار لە ویلایەتەکانی ئەمریکا، سەلماندی کە سەرەڕای پەککەوتویی لاق هێشتاش هەر توانایی‌و لێهاتوویی بێ‌وێنەی بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لەم بارودۆخە دژوارو نالەبارەدا هەیە. ڕۆزڤێلت بە وەدەستهێنانی زیاتر لەحەوت ملیۆن دەنگ توانی





بەسەر ڕکەبەرە کۆماریخوازەکەی خۆی (هێربێرت هۆڤێر)[13] سەرکەوێ کە لەو ڕێکەوتەدا سەرۆك کۆماری ئەمریکا بووو دەورانی سەرۆك کۆماری ئەو لەرۆژی چوارەمی مارسی ساڵی **١٩٣٣** دەستی پێکرد. ڕۆزڤێڵت بە هەڵبژاردنی دۆستو هاوکاری دروستکارو شایستەو بە بوێرییەکی بیٚوێنەوە کە بۆ ئاڵۆ گۆڕی بنەڕەتی لە ئابووری ئەمریکادا بەکاری هێنا، توانی ئەمریکا لەو قەیرانە گەورە ڕزگار بکات. ڕۆزڤێڵت لەساڵی **١٩٣٦** بۆ جاری دووهەم بە زۆرینەی دەنگ کە لە جاری یەکەم زیاتر بوو، بە سەرۆك کۆماری ئەمریکا هەڵبژێردرا. لەساڵی **١٩٤٠** کە تازە بڵێسەی شەڕی دووهەمی جیهانی هەڵگیرسابوو، گەلی ئەمریکا نەیاندەویست لەو بارودۆخە نالەبارە کەسێکی نەناسراو بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری هەڵبژێرن، هەربۆیەش ڕۆزڤێڵت بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئەمریکاو بۆ جاری سێهەم وەك سەرۆك کۆماری ئەمریکا هەڵبژێردراو لەکۆتاییشدا لەساڵی **١٩٤٤** لەسەرەتای نێزیك بوونەوەی سەرکەوتن لە شەڕ جارێکیتریش هیچ ڕکەبەرێکی لە حیزبی دێمۆکرات بۆ بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك کۆماری نەبوو. هەرچەند ئەمجارەیان تووشی ڕکەبەرێکی بەهێز لە حیزبی کۆماریخواز بۆوە، بەلاٚم توانی بە جیاوازییەکی کەمو بۆ جاری چوارەم پۆستی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بەدەست بهێنیٚ. ئێلیانۆر لەتەواوی ماوەی سەرۆك کۆماری ڕۆزڤێڵت کە زیاتر لە دوازدەساڵی خایاند، نێزیکترین ڕاوێژکارو هاوکاری ئەو لە کاروباری پەیوەست بەسیاسەتی دەرەوەو ناوخۆیی ئەمریکا بوو. گرینگترین کێشە تایبەتییەکانی سیاسەتی ناوخۆییو نێونەتەوەیی ئەمریکا نەتەنیا لە کۆبوونەوەکانی حکوومەتدا، بەڵکو لە کۆبوونەوە تایبەتییەکانی سەرمێزی نان خواردن کە لەچێشتخانەی کۆشکی سپی پێك دەهات،دەکەوتە بەر باسو لێکۆڵینەوە. لەم کۆبوونەوانەدا کە پتر لەکاتی خواردنی نانی بەیانیو نیوەڕۆ لەچێشتخانەی کۆشکی سپی ئەنجام دەدراو ناویان نابوو"کابینەی چێشتخانە"[14]، وەزیرانی پایەبەرزو ڕاوێژکارانی نێزیکی سەرۆك کۆمار ئامادە دەبوونو ئێلیانۆریش کە ئەندامی هەمیشەیی‌ئەم کابینەیە بوو لە زۆربەی بابەتە گرینگەکان ڕاوێژی پێدەکرا.

ئەرکێکی گرینگیتر کە ئێلیانۆر لەو ماوەیەدا بە ئەستۆی گرتبوو، ئەوە بوو کە بە جێگای هاوسەری لە ڕێوڕەسمە جۆراجۆرەکان بەشداری دەکردو هەروەها لەلایەن ڕۆزڤێڵتەوە بۆ چارەسەر کردنی بابەتو گرفتەکانی ناوخۆییو ئاگاداربوون لە بیروبۆچوونی ڕێبەرانی ولاٚتانی دەرەوە سەفەری جۆراوجۆری بۆ دەرەوەو ناخۆی ولاٚت دەکرد.

13-Herbert Hoover

14-Kitchen Cabinet





**ئەم وێنەیەی ئێلیانۆر ڕۆزڤێڵت لە دوایین ساڵی مانەوەی لە کۆشکی سپی بۆ گۆڤاری لایف گیراوە**

ئێلیانۆر بە نووسینی وتارگەلێك لەژێرناوی "ڕۆژی من"[15] کە هەمموو ڕۆژێك پتر لەسەد ڕۆژنامە هاوکات لەسەرانسەری ئەمریکا چاپیان دەکرد، ڕوانگەکانی خۆی سەبارەت بە بابەتەکانی ڕۆژ لەگەڵ خەڵك باس دەکردو مانگانە بە شێوەیەکی مام ناوەندی نزیکەی سێ هەزارنامەی لە خەڵك وەردەگرت کە نووسینگەیەکی بۆ لێکۆڵینەوەو ولاٚمدانەوەی ئەونامانە دروست کردبووو هەر حەوتوویەك کورتەیەك لە بیرو بۆچوونی خەڵکی سەبارەت بە باسە جیاوازەکان کە لەم نامانەدا ڕەنگی دەداوە، پێشکەش بە هاوسەری دەکرد. ئێلیانۆر ڕۆزڤێڵت بەکردەوە لە ڕەوتی شەڕی

15-My day





دووهەمی جیهانیدا کە رۆزڤێڵت بۆ بەشداری لە کۆنفراسە نێونەتەوەییەکان لە ئەمریکا دەرۆیشتەدەرێ، ئەرکەکانی سەرۆك کۆماری بەڕێوە دەبردو هەموو رۆژێك لەرێگای تێلێگرافو بێسیمەوە پێوەندی بە هاوسەرییەوە دەگرت. دوایین کۆنفراسێکی نێونەتەوەیی کە رۆزڤێڵت بەشداری تێدا کرد، کۆنفراسی یاڵتا بوو کە لەنیوەی یەکەمی فێوریەی ساڵی ١٩٤٥ لە کۆشکی دوایین تێزاری رووسیا لە کەناری دەریای رەش گیراو چارەنووسی داهاتووی جیهانو دابەش کردنی ئەورووپا بە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی تێدا تاوتوێ کرا. یەکێك لە بڕیارەکانی یاڵتا کە رۆزڤێڵت زۆر هۆگری بوو، دامەزراندنی رێکخراوێکی نێونەتەوەیی بەناوی "رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان" بەجێگەی کۆمەڵەی نەتەوەکان بوو. بەلاَم کەمتر لە دوو حەوتوو دوای دەستپێکردنی یەکەمین کۆبوونەوەکانی ئەم رێکخراوە لە سانفراسیسکۆو لەشەوی دوازدەهەمی ئاپریلی ساڵی ١٩٤٥ چرای تەمەنی رۆزڤێڵت کوژاوە. ئێلیانۆر دوای مردنی هاوسەری بوو بە نوێنەری ئەمریکا لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانو لەحەوت خولی دانیشتنە سەرەتاییەکانی رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتوەکاندا کە دەورانی کێشەو ناکۆکی ئەمریکاو یەکیەتی سۆڤیەت بوو، سەرۆکایەتی شاندی نوێنەرانی ئەمریکای لەو رێکخراوە لەئەستۆ بوو. ئێلیانۆر رۆزڤێڵت لەساڵی١٩٥٣ کە سەردەمی سەرۆك کۆماری "ئایزۆن هاوێر"[16] و حکوومەتی کۆماریخوازان دەستی پێکرد، دەستی لە کاروباری سیاسی هەڵگرتو تاکۆتایی تەمەنی خەریکی سەیرو سەفەرو نووسین بوو. ئێلیانۆر لەساڵی ١٩٦٢و لەتەمەنی ٧٨ ساڵیدا مالاَوایی لە ژیان کرد. ئێلیانۆر لەساڵی ١٩٣٢ تا ١٩٦٢ زیاتر لە دە پەرتووکی نووسیوە کە بەناوبانگترینیان پەرتووکی ژیاننامەی خۆیەتی لەژێر ناوی "ئەوە بەسەرهاتی منە"و بیرەوەرییەکانی لە کۆشکی سپی.

***

لەنێوان هاوسەرانی سەرۆك کۆمارەکانی ئەم دواییانەی ئەمریکا، تەنیا نانسی رەیگان هاوسەری سەرۆك کۆماری ئەمریکا لەساڵەکانی ١٩٨١ تا ١٩٨٩ لە سیاسەتو حکوومەتی ئەمریکادا رۆڵی بەرچاوی نواندوە، بەلاَم رۆڵی ئەوەنە بەراورد لەگەڵ رۆڵی خانمی ویلسۆنو ئێلیانۆر رۆزڤێڵت زۆر بەرچاو نی‌یە. رۆڵی نانسی رەیگان لەحکوومەتی ئەمریکادا بە بلاَوبوونەوەی پەرتووکی پڕهاتو هاواری سەرۆکی ستاڤی پێشووی کۆشکی سپی (دۆناڵدرەیگان )[17] لەساڵی ١٩٨٨ ئاشکرا بوو .

16-Eisenhower
17-Donald Regan





**لەم وێنەیەدا وینەی نانسی رەیگان، هاوسەری رۆناڵد رەیگان (سەرۆك کۆماری پێشووی ئەمریکا) لەگەڵ دۆناڵدرەیگانی سەرۆکی ستاڤی کۆشکی سپی دەبینرێت. ئەم وێنەیە پێش سەرهەڵدانی ناکۆکی لەنێوانیان کە بووە هۆی لەسەر کارلابردنی دۆناڵدرەیگان گیراوە**

دۆناڵد رەیگان کە نزیکترین هاوکاری رۆناڵد رەیگان بوو، لەم پەرتووکەدا کە ناوی "بۆ تۆمار لە مێژوو"[18]یە روونی کردوّتەوە کە نانسی رەیگان بە چ شێوەیەك دەست لە سیاسەتی دەرەوەو ناوخۆی ئەمریکا وەردەداتو دوایین دەست تێوەردانی نانسی کە بووە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی لەنێوان ئەوو سەرۆکی پێشووی ستاڤی کۆشکی سپیو لەسەرکار لابردنی دۆناڵدرەیگان، بریتی‌بوو لە رووداوی فرۆشتنی چەكو چوڵی ئەمریکا بە ئێرانو گواستنەوەی قازانجی بەدەستهاتوو لەو مامەڵەیە بۆ یارمەتیدانی شۆڕشگێڕانی نیکارگوای کە دەستی نانسی تێدابوو.

یەکێك لەخاڵە سەرەنج راکێشەکانی پەرتووکی دۆنالدرەیگان ئەوەیە کە ئاماژە بە سەردانی بەردەوامی نانسی بۆ لای ئەستێرە ناسێکی دانیشتووی سانفرانسیسکۆ دەکات و دەبێت کە نانسی بۆ دیاریکردنی کاتژمێرەکانی بەختو شوّمی هەوڵەکانی هاوسەرەکەی سەردانی ئەو ئەستێرە ناسەی کردووە. بەو شێوەیەی کە دۆناڵدرەیگان لە پەرتووکەکەیدا دەنووسێ، پڕۆگرامی کاری رۆنالد رەیگانو رێکەوتی چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ رێبەرانی ولاتانی‌تریش هەر لە رووی خشتەیەکی زەمانی دیاری دەکرا کە بەبۆچونی ئەستێرە ناسی باوەڕ پێکراوی خانمی رەیگان رێك خسترابووو خانمی رەیگان لەکاتژمێرە شوّمەکان، پێشی بەدیمانەی هاوسەری لەگەڵ کاربەدەستانی جۆراوجور یان وتار خوێندنەوەو وتووێژو واژۆ بەڵگەو پەیماننامەکان دەگرت!

18-For the Record





# چوار ژنی ئاسیایی کە ناوبانگ و دەسەڵاتیان لە باوك یان مێردەوە بە میرات وەرگرت

لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا چوار ژنی ئاسیایی بە دەسەلأت گەیشتن کە خاڵی هاوبەشی هەموویان بریتی بوو لە بە میرات وەرگرتنی دەسەلأت لە باوكو هاوسەریان. هەڵبەت هەر چواریان توانایی‌و لێهاتوویی تەواویان بۆ بەدەستهێنانی دەسەلأتو بەڕێوبردنی کاروباری نیشتمانەکەیان هەبوو، بەلأم هەرگیز بەبێ ناوبانگو سەرکەوتنی هاسەر یاخود باوکیان شانسی گەیشتن بە تەختی دەسەلأتیان نەبوو. یەکەمین ژن کە لەجیهاندا پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرت، خاتوو"سیریماڤۆ باندارانایکی"[1] بوو کە لەساڵی ١٩٥٩و دوای کوژرانی هاوسەری (سولەیمان باندارانایکی) بەجێگای ئەو وەك ڕێبەری حیزبی ئازادی سەیلان هەڵبژێردراو دوای سەرکەوتنی ئەم حیزبە لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٦٠ ی سەیلان (سریلانکا)[2] بە پۆستی سەرۆك وەزیرانی گەیشت. خاتوو باندارانایکێ بەهۆی ناوبانگی هاوسەری بووکە ئەم سەرکەوتنەو گەشەسەندنەکانی دواتری خۆی بەدەست هێناو هەربەم هۆیەشەوە پێویستە بەر لە ڕوونکردنەوەی ژیانی سیاسی ئەو، کورتەیەك لەژیانی هاوسەری (سولەیمان باندارانایکێ) باس بکەین. سولەیمان باندارانایکی لەساڵی ١٨٩٩ لە "کۆلۆمبۆ"[3]ی پێتەختی سەیلان لە دایك بوو. دوای تەواوکردنی قۆناغەکانی سەرەتایی‌و ناوەندی چووە بریتانیاو خوێندنی باڵای لە زانکۆی ئاکسفۆرت تەواو کرد. سولەیمان دوای گەڕانەوە بۆ سەیلان لەساڵی ١٩٢٥دا خەریکی کاری پارێزەری دادگا بوو، بەلأم هاوکات لەگەڵ ئەم کارە خەباتی سیاسیشی دەکردو لەسەرەتای ساڵەکانی دەیەی ١٩٣٠ وەك ڕێبەی حیزبی کۆنگرەی نەتەوەیی سەیلان هەڵبژێردرا. سولەیمان باندارانایکێ لە ڕەوتی ئەو تێکۆشانە سیاسی‌یانە لەگەڵ قۆڵی هێندیی حیزب کە دەیانهەویست لەحیزبی کۆنگرەی هێند

1-Sirimavo Bandaranaike

2-Sri Lanka

3-Colombo



پێڕەوی بکەن دژایەتی دەکردو لەخەباتی ڕزگاریخوازانەی سەیلان ڕۆڵی بەرچاوی نواند. سولەیمان باندارانایکێ لە یەکەمین دەوڵەتی یەکگرتووی نەتەوەیی سەیلان کە دوای سەربەخۆیی ئەم وڵاتە لەساڵی ١٩٤٨ دامەزرا، پلەی وەزیری تەندروستی سەیلانی وەدەست هێناو لەم پۆستەدا توانی نەخۆشی مالاریا کە زەرەدو زیانێکی مرۆڤی زۆری لێکەوتەوە بنەبڕ بکات. سولەیمان باندارانایکێ لەساڵی ١٩٥١ دەستی لەم پۆستە کێشاوەو دواییش حیزبی ئازادی سەیلانی دامەزراند. ئەم حیزبە توانی بە دروشمە سۆسیالیستییەکانی لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٦ سەرکەوێتو سولەیمان باندارانایکێ دوای بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك وەزیری، بنکە سەربازی‌و دەریاییەکانی بریتانیای لە سەیلان داخست. بەهۆی سیاسەتە ناسیۆنالیستییەکانی باندارانایکێو بەرتەسك کردنی ژیانی کەمایەتییەکانی هێندی‌و بوودایی لەوڵات، هەندێك شڵەژاوی لە سەیلان دروست بوو کە کوژرانی ئەوی لەساڵی ١٩٥٩ لێکەوتەوە. خاتوو سیریماڤۆ باندارانایکێ لەساڵی ١٩١٦ لەبنەماڵەیەکی دەوڵەمەند لەدایك بووو لەساڵی١٩٤٠لەگەڵ سولەیمان باندارانایکێ زەماوەندی کردو تا ساڵی ١٩٥١ کە هاوسەری حیزبی ئازادیی پێك هێنا، بەشداری لە هەوڵە سیاسییەکانی هاوسەریدا نەکرد. خاتوو باندارانایکێ لەساڵی ١٩٥١ بە پێداگری هاوسەری لەپێکهێنانی حیزبی ئازادی سریلانکا بەشداری کردو لەراکێشانی ژنان بۆ ناو حیزبی ئازادی ڕۆڵی بەرچاوی گێڕاو دەنگی ژنان لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٦ی سەیلان کە بە سەرکەتنی حیزبی ئازادی کۆتایی پێهات، فاکتەری گرینگی ئەو سەرکەوتنە بووو هەربۆیەش هەڵبژاردنی خاتوو باندارانایکێ دوای کوژرانی هاوسەری وەك ڕێبەری حیزبی ئازادی کارێکی سروشتی وئاسایی دەهاتە بەرچاو. خاتوو سیریماڤۆ بە کەڵك وەرگرتن لە شەپۆلی هەستی جەماوەر کە دوای کوژرانی هاوسەری بە قازانجی ئەو هەژێندرا بوو، لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٦٠ی سەیلان سەرکەوتو ژمارەی دەنگەکانی کە لەو هەڵبژاردنانەدا بەدەستی هێنا لەژمارەی دەنگە بەدەستهاتووەکانی حیزبی ئازادیی سریلانکا لەسەردەمی هاوسەری زۆرتر بوو. بەلأم ئەم سەرکەوتنە پڕشەنگدارو چاوەڕوان نەکراوە کە پتر جۆرێك دژکردەوەی ڕای گشتی خەڵك لە ئاست کوژرانی سولەیمان باندارانایکێ بوو، ئەم باوەڕەی لە دەروونی‌خاتۆو باندارانایکێ درووست کرد کە کەسایەتی‌و خۆشەویستی خۆی هۆکاری سەرەکی ئەو سەرکەوتنە بووەو هەر ئەم باوەڕە هەڵەیەش هۆکاری لەخۆبایی بوونو توندڕەوی‌و هەڵەکانی دواتری ئەوی پێکهێنا. ڕاوێژکارەکانی حکوومەتی خاتوو باندارنایکێ کە پتر لە توندڕەوەکانی سریلانکا پێکهاتبوون، ئەویان ناچار بە ئەنجامدانی





زەنجیرەیەك کاری توندڕەوی بۆ نەتەوەیی کردنی پیشەو دامەزراوە ئابوورییەکانو دیاریکردنی خاوەندارێتی تاکەکەسی کرد. ئەم کردەوانە پەشۆکاویو قەیرانی ئابووری لێکەوتەوەو هەر بۆیەش حیزبی ئازادی لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٦٥ی سەیلاندا نەیتوانی بەسەر رکەبەرەکەیدا سەرکەوێ. خاتوو باندارانایکێ دوای شکست لە هەڵبژاردنەکانو لەسەرکار لاچوونی لەساڵی ١٩٦٥، هەوڵی بنیاتنانەوەو نوێ کردنەوەی حیزبەکەی داو لە ماوەی پێنج ساڵدا کە رێبەری کەمایەتییە بەرهەڵستکارەکانی دەوڵەتی لە پەرلەمانی سەیلان لەئەستۆ بوو، خۆشەویستی زیاتری لەنێو خەڵکدا بەدەست هێنا. خاتوو باندارانایکێ کە ئەمجارەیان بە کەڵك وەرگرتن لەئەزموونی دەساڵ سەرۆکایەتی دەوڵەتو رێبەری کەمایەتییەکانی بەرهەڵستکاری دەوڵەت سیاسەتێکی شیاوو میانەڕەوی بە کارهێنابوو، لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی١٩٧٠دا بەزۆرینەی دەنگ سەرکەوتو جارێکیتر لەسەر تەختی سەرۆك وەزیرانی سەیلان دانیشت. دووهەمین خولی سەرۆك وەزیرانی خاتوو باندارانایکێ حەوت ساڵ درێژەی کێشاو یەکێك لە گرینگترین کارەکانی ئەو لەم خوولەدا بریتی بوو لە دانانو نووسینەوەی یاسایەکی بنەڕەتیی نوێ لەساڵی ١٩٧٢. بەپێی ئەم یاسایە رێژیمی کۆماری لەم وڵاتە دامەزراو ناوی کۆنی سەیلان گۆڕا بۆ سریلانکا.



**سیریماڤۆ باندارانایکێ یەکەمین سەرۆك وەزیری ژنی جیهان**



خاتوو باندارانایکێ لە کۆتاییەکانی خولی دووهەمی سەرۆك وەزیرانیدا، بەرەو جۆرێك دیکتاتۆریو دەسەڵاتی تاکێتی چووو هەر ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکیو ئاڵۆزیو دواییش سەر نەکەوتنی لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٧. پەرلەمانی سریلانکا دوای سەرنەکەوتنو لەسەرکار لاچوونی دووبارەی خاتوو باندارانایکێ لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی، لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر بەڵگەنامەکانی تایبەت بە یاسا شکێنییەکانی ئەو لە دەورانی سەرۆك وەزیرانی ئەنجامداو دوای سەلماندنی یاساشکێنییەکانیو تۆمەتبارکردنی بەچەوت کەڵك وەرگرتن لە دەسەڵات، ئەوی بۆ ماوەی ٧ ساڵ لە نوێنەرایەتی پەرلەمانی سەیلان بێبەش کرد. خاتوو باندارانایکێ لەساڵ ١٩٨٠و دوابەدوای ئەو بڕیارە، ناچار کرا کە کورسی نوێنەرایەتی پەرلەمانی سەیلان چۆڵ بکاتو دواییش نەیتوانی پێگەی رابردووی خۆی بەدەست بێنێتەوە.

دووهەمین ژنی سەرۆك وەزیرانی جیهانیش هەر ئاسیایی بوو کە ناوبانگو دەسەڵاتی لە باوکی بە میرات وەرگرتو بۆ ماوەی شازدە ساڵ لە هیندووستان حوکمڕانی کرد. "ئیندیرا گاندی"[4] تەنیا منداڵی "جەواهیری لەعلی نێهرۆ"[5] (رێبەری سیاسی هیند) بوو کە بە یەکەمین سەرۆك وەزیرانی ئەم وڵاتە دوای سەربەخۆیی دەژمێردرێت. بەهۆی ئەوە کە ناوبانگو سەرکەوتنی خۆی لە باوکی بە میرات وەرگرتووەو زۆربەی رووداوەکانی ژیانی بەر لە گەیشتن بە پۆستی سەرۆك وەزیرانی لەگەڵ ژیانی باوکی گرێی خواردووە، روونکردنەوەیەکی کورت سەبارەت بە ژیانی نێهرۆ لەم بە شەدا پێویستە: جەواهیری لەعلی نێهرۆ کوڕی پارێزەرو رۆژنامەوانێکی ناسراوی هیندییە(موتی لەعلی نێهرۆ)[6] کە لەساڵی ١٨٨٩ لەشاری **"الله آباد"**ی هیند چاوی بەدونیا پشکوتو دوای تەواوکردنی قۆناغەکانی سەرەتایی لە هیندووستان، بۆ درێژەپێدانی خوێندن رۆیشتە بریتانیاو خویندنی بالآی خۆی لە کۆمبریج تەواو کرد. جەواهیر دوای گەڕانەوە بۆ هیندووستان پیشەی باوکی، واتە پارێزەری دادگای گرتە بەرو لەهەمان کاتیشدا پێوەندیی بە خەباتی سیاسی لەپێناو سەربەخۆیی هیندووستانەوە گرتو لەماوەیەکی کورتدا چووە ناو ریزی نزیکترین هاوکارانی گاندی (رێبەری ناوداری سەربەخۆیی خوازی هیند).

---

4- Indira Gandhi

5- Jawaharlal Nehru

6- Motilal Nehru

بەرهەمی زەماوەندی نێهرۆ و کچێك بەناوی "کەمالی" کچێك بوو کە لە رۆژی ١٩ی نۆڤەمبەری ساڵی١٩١٧ چاوی بە دونیا هەڵێناو ناوی "ئیندرا" یان لەسەردانا. سەردەمی منداڵی ئیندیرا هاوکات بوو لەگەڵ گەشەسەندنی خەباتی سیاسی گەلی هێند کە باوکی رۆڵی بەرچاوی لەم خەباتەدا هەبوو. یەکەمین بیرەوەری سەردەمی منداڵی ئیندیرا بریتی بوو لە گیرانی باوکی لەساڵی ١٩٢١ کە لەو کاتەدا چوار ساڵی تەمەن بووو هاوشێوەی ئەم رووداوە چەند جارێکیتریش لەسەردەمی منداڵیو گەنجێتی ئەودا دووپات بۆوە. نێهرۆ لەسەردەمی منداڵیو لاوێتی ئیندیرادا نزیکەی ٩ ساڵی تەمەنی لە بەندیخانەدا بەسەر بردو یەکێك لەسەرقاڵییەکانی نێهرۆ لە بەندیخانەدا، نووسینی نامە بۆ کچەکەی بوو کە لەرێگای ئەو نامانەوە کچەکەی فێری بابەتە سیاسیو کۆمەڵایەتیو مێژووییەکانی جیهان دەکرد. کۆمەڵێك لەو نامانە کە ٩٠ دانە بوو، دواتر لەژێرناوەکانی "نامەکانی باوکێك بۆ کچەکەی" و"چاوخشاندنێك بەسەر مێژووی جیهان"[٧] بلاو بۆوە. ئیندیرا لەباسی بیرەوەرییەکانی خۆیدا ئەو رۆژانە وەبیر دەهێنێتەوە کە نەتەنیا باوکی بەڵکو دایکیشی لە بەندیخانەدا بوو. لەبەرئەوەی کە دایکیشی (کەمالی) لە تەنیشت باوکی لەخەباتی سیاسیدا بەشداری دەکردو چەندجار لەگەڵ ئەو دەستبەسەرو بەند کرا. لەساڵی ١٩٢١ کە دەورانی زیندانی کرانەکانی نێهرۆو هاوسەری دەستی پێکرد، ئیندرا لەماڵی باپیری (مووتی لەعلی نێهرۆ) دەژیاو لەو ماڵەشدا جگە لە سیاسەت باسی هیچیتر نەدەکرا، لەبەرئەوە کە باپیری ئیندیراش یەکێك لەلایەنگرەکانی گاندی بووو هەرچەند وەك کوڕەکەی رۆڵی بەرچاوی لەخەباتدا نەبوو، بەلام ماڵەکەی جێگای هات وچۆی رێبەرانی شۆڕشگێڕی سەربەخۆیی خوازی هیندو هەروەها جێگەی تاوتوێکردنی باسە سیاسییەکانی سەبارەت بە چۆنیەتی رێبەریو رێنمایی ئەو خەباتە بوو. ئیندیرا لە بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیو گەنجێتیدا دەنووسێ: "من لە یەکەمین ساڵەکانی منداڵیمدا هۆگریم بە سیاسەتەوە گرتو لەگەڵ سیاسەتدا گەورە بووم. ئاواتی سەردەمی منداڵی من ئەوە بوو کە ببم بە ژاندارکی هێندو هەر بەم ئاواتەوە گەورەبووم... خۆخدەو ئاکارم بەراورد لەگەڵ تەمەنم کەمێك توندو تیژ بوو. پۆرەکانم دەیانگوت کە من بە پێچەوانەوە

٧.ئەم دوو پەرتووکە لەلایەن خوالێخۆشبوو مەحموودی تەفەزولی وەرگێڕدراوەتەوەو لەچاپ دراوە



لەدایك بوومو دەبوایە کوڕبوایەم... من دایکم زۆر خۆش دەویستو کاتێك دایکمو پوورەکانم بەشەڕ دەهاتن، بۆ لایەنگری لە دایکم هێرشم دەکردە سر پوورەکانم..."

ئیندیرا بیرەوەرییەکی سەرنج راکێشی سەبارەت بەسەردەمی منداڵی بۆ ژیاننامە نووسی خۆی (زەریرماسانی)[٨] گێڕاوەتەوە کە دەڵێت: "رۆژێك خزمێکمان کە لە پاریسەوە گەڕابۆوە جلێکی جوانی بیانی بۆ هێنابووم، بەلام بەرلەوەی کە وەریگرم دایکم گوتی یەکێك لە درووشمەکانی ئێمە لە خەبات بۆ سەربەخۆیی ئەوەیە کە نابێت جلکی بیانی لەبەر بکەینو تەنیا دەبێت لە کوتاڵی هێندی جلك بۆ خۆمان بدوورینو هەربەم هۆیەشەوە پێشکەشییەکەی وەرنەگرت. ئەو خزمەی کە جلکەکەی هێنابوو گوتی ئەم دروشمانە بۆ خۆتان هەڵگرنو دەسەلاتی وەرگرتن یان وەرنەگرتنی بە خودی ئیندیرا بدەن. دایکم رووی لە من کردو گوتی ئیندیرا چ دەڵێی؟



**وێنەیەکی نموونە لە ئیندیرا گاندی لەگەڵ مهاتماگاندی رێبەری گەورەی هێند**

**ـ ئەم وێنەیە لە رۆژەکانی رۆژووی سیاسی گاندیدا گیراوە**

8-ZareerMasani

لەگەڵ ئەوەی کە زۆر تامەزرۆی ئەو جلکە بووم قەبووڵم نەکرد. خزمەکەمان (ژن بوو) بە تەشەڕەوە گوتی خوشکی پیرۆز، ئەدی بۆچی بە بووکی بیانی یاری دەکەی؟... ئەم قسەیە زۆر لەدڵم گران هاتو لەجیهانی منداڵیمدا چەند رۆژ لەگەڵ دەروونم شەڕم کرد. لە ئاکامدا رۆژێك بڕیاری خوم داو بووکە خۆشەویستەکەم هەڵگرتو بە شەمچەیەك چوومە سەربانی ماڵێ‌و ئاورم تێبەرداو کاتێك دەسووتا نەمتوانی پێش بە گریانم بگرم... لە تەواوی ژیانمدا بەرادەی ئەو رۆژە نەگریاوم‌و لەو رۆژەوە هیچ شتێك بەرادەی شەمچە داگیرساندن رقم هەڵناستێنێ..." ئیندیرا لەتەمەنی ١٨ساڵیدا ناچار بوو هاوکات لەگەڵ دەرس خوێندن، چاوەدێری‌و پەرستاری دایکی نەخۆشی بکات. لەساڵی ١٩٣٥ ئیندیرا لەگەڵ دایکی بۆ ئەڵمانیاو لەوێشەوە بۆ سویسرا رۆیشت. نەخۆشییەکەی دایکی سیل بووو لەو کاتەشدا چارەسەر نەدەکراو هەربۆیەش دایکی ئیندیرا لە فێوریەی ساڵی ١٩٣٦ لەتەمەنی سی وشەش ساڵیدا لە لۆزانی سویسرا کۆچی دوایی کردو ئیندیرا لەگەڵ تەرمەکەی دایکی گەڕایەوە هێند. سەرەڕای ئەمەش کە نێهرۆ بە دژی دەسەڵاتی بریتانیا خەباتی دەکردو لە بەندیخانەی ئەواندا بەند کرابوو، بەڵام کچەکەی بۆ درێژەپێدانی خوێندن ناردە بریتانیاو ئیندرا لە زانکۆی ئاکسفۆد کۆتایی بەخوێندن هێناو دوای گەڕانەوە بۆ هێند بوو بە ئەندامی حیزبی کۆنگرەی هێندو لەرەوتی خەبات بەدژی بریتانیا لەکاتی شەڕدا، ساڵێك لە گرتووخانەدا بەند کرا. ئیندیرا لەساڵی ١٩٤٢ لەتەمەنی ٢٥ ساڵیدا لەگەڵ لاوێکی پارسی بەناوی فیروز گاندی زەماوەندی کردو دوای ئەم زەماوەندە بەناوی ئیندیرا گاندی ناوبانگی دەرکرد. فیروز گاندی زەردەشتییەکی هێند بووو بە پێچەوانەی بڕوای زۆر کەس هیچ خزمایەتی‌و پێوەندییەکی بە مهاتما گاندییەوە نەبوو. فیروز گاندی لەساڵانی پێش زەماوەند لەگەڵ ئیندیرا هات وچۆی بنەماڵەی نێهرۆی دەکردو یەکێك لە ئەندامە تێکۆشەرەکانی حیزبی کۆنگرە بوو، بەڵام بنەماڵەی نێهرۆ لە بەر هۆکاری ئایینی‌و داب‌و نەریتی بنەماڵەکەیان دژی ئەم زەماوەندە بوون. نێهرۆ بۆ خۆشی باوەڕێکی پتەوی بە ئایین نەبووو لەبەر هەندێك هۆکاری تایبەت بە خۆی لەگەڵ زەماوەندی فیروزو ئیندیرا کۆك نەبوو، بەڵام ئیندیرا بڕیاری خۆی دابووو کەسیش نەیدەتوانی رێگری ئەو زەماوەندە بێت. زەماوەندی ئیندیراو فیروز گاندی بە سەرەتایەکی خۆش وسەرکەوتوو دەستی پێکرد، بەڵام ئیندیرا هێدی هێدی سەبارەت بە هاوسەری کە پیاوێکی خۆشگوزەران‌و ژنباز بوو، هەستی بە نامۆیی‌و بێگانەبوون دەکرد. ئیندیرا لەساڵی ١٩٤٧ کە هێندووستان بە سەربەخۆیی گەیشتو نێهرۆ



وەك سەرۆك وەزیرانی هێند هەوساری دەسەڵاتی ئەو وڵاتە بەرینە بەدەستەوە گرت، زیاتر لەجاران رووی کردە تێکۆشانی سیاسی‌و لەحیزبی کۆنگرەی هێنددا بەرپرسایەتی گرینگی بە ئەستۆ گرت. ئیندیرا سەرەڕای ئەوەش کە دوو منداڵی کوڕی لە فیرووز هەبوو، بەکردەوە جیا لە هاوسەری دەژیاو پتر وەك چاوەدێرو پەرستار لەلای باوکی دەژیا. فیروز گاندی لەساڵی ١٩٦٠ بەهۆی شەپڵەی دڵ مردو ئیندیرا خۆی ئەرکی پەروەردەو پێگەیاندنی دوو کوڕەکەی وەئەستۆ گرت. ئیندیرا لەو کاتەدا سەرۆکی رێکخراوەکانی حیزبی کۆنگرە بووو سەرەڕای ئەوە کە لە دەوڵەتی هێنددا هیچ پۆستێکی حکوومەتیی لەئەستۆدا نەبوو، بەڵام باوکی لە زۆربەی بابەتە سیاسییەکان‌و کاروباری تایبەت بە بەڕێوەبردنی دەوڵەت راوێژی لەگەڵ دەکرد. لەساڵی ١٩٦٤ نێهرۆش هەر وەکوو هاوسەری ئیندیرا بەهۆی شەپڵەی دڵ کۆچی دوایی کردو حیزبی کۆنگرە یەکێك لە هاورێیانی نێزیك‌و باوەڕ پێکراوی ئەوی بەناوی "لەعل بەهادۆری شاستری"[9] وەك سەرۆك وەزیرانی هێند هەڵبژارد. ئیندیرا وەك وەزیری هەواڵگری‌و پڕۆپاگەندەی کابینەی (حکوومەت) شاستری دەستی بە تێکۆشانی دەوڵەتی کردو لەرەوتی شەڕی هێندو پاکستان کە لەساڵی ١٩٦٥ روویدا، تواناییەکی زۆری لەخۆی نیشان دا.



**ئیندیرا گاندی‌و کوڕەکەی، راجیڤ گاندی**

---

9-Lal Bahadur shastri





شاستری لەکۆتایی دانوساندنەکانی نێوان خۆیو ئەیوب خانی سەرۆك کۆماری ئەو کاتی پاکستان کە بە نێوبژیوانی "کۆسیگین"[10] ( سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتی شۆڕەوی) بەڕێوە دەچوو، بە سەکتەی دڵ مردو بە مردنی ئەو لە ڕۆژی ١١ی ژانڤییەی ساڵی ١٩٦٦پێشبڕکێیەکی چڕ بۆ بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك وەزیرانی هێند دەستی پێکرد. دوای مردنی شاستری، ئیندیرا گاندیو مۆرارجی دێسای[11] رکەبەری سەرەکیی بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆکایەتی وەزیران بوونو کەمتر کەسێك تێبینی ئەوەی دەکرد کە لەم پێشبڕکێیەدا ئیندیرای ٤٨ ساڵان بتوانێ بەسەر سیاسەتوانی ٧٠ ساڵەو لێهاتوویی وەك مۆرارجی دێسای کە هاورێی نێزیکی گاندی بوو سەرکەوێ، بەلاّم ئیندیرا بە پێچەوانەی چاوەڕوانی زۆر کەس توانی لەو پێشبڕکێیەدا سەرکەوێو لە ڕۆژی ٢٤ ی ژانڤییەی ساڵی ١٩٦٦ بوو بە سەرۆك وەزیرانی هێند.



**سێ سەرۆک وەزیرانی هێند لە وێنەیەک دا**

**نەهرۆ- ئیندیرا و راجیۆ گاندی**

10-Kosygin

11-Morarji Desai



هەڵبژاردنی ژنێك بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی وڵاتێك کە لەو ڕێکەوتەدا ژماری دانیشتوانی دەگەیشتە ٥٠٠ ملیۆن کەس، لەسەرانسەری جیهان بە سەرسووڕمانو حەپەساوییەوە سەیری دەکراو کەمتر کەسێك لەو باوەڕەدا بوو کە دووهەمین جیهان لە بواری ژماری حەشیمەتو هاوکات لەگەڵ ئەو هەموو گیروگرفتانە بتوانرێت بەدەستی ژنێکی ٤٨ ساڵە و بێ ئەزموون لە کاروباری دەوڵەتیدا بەڕێوەبچێت: بەلاّم ئیندیرا لە ماوەیەکی کورتدا توانی نیشان بدات کە لە کاروباری دەوڵەتیدا زۆر لە پێشنیانی خۆی بە تواناترەو تواناییو لێهاتوویيو سووربوونی ئەو لە کارەکاندا ئەگەر لە باوکی زیاتر نەبێ کەمتریش نی‌یە. ئیندیرا دەستبەجێ دوای واژۆ کردنی پەیماننامەی ئاشتی لەنێوان هێندو پاکستان، هەوساری کاروباری هێندی بەدەستەوە گرتو ڕێزی لە نێوەڕۆکی پەیماننامەکە گرت، بەلاّم درێژەی بە بەهێزتر کردنی سوپای هێند داوو هەنگاوێکی‌تری بۆ چارەسەری ناکۆکییەکانی هێندو پاکستان هەڵنەگرت. یەکێك لە کارەکانی حکوومەتەکەی کە پێوەندی بە پاکستانەوە هەبوو، ئەوە بوو کە ئیندیرا پاڵپشتیی لەبزاڤە جیایی خوازەکانی پاکستانی ڕۆژهەلاّت دەکرد. پاڵپشتی کردنی ئیندیرا لەم بزاڤە بووەهۆی دابەشبوونی پاکستانو دروستبوونی وڵاتێکی سەربەخۆ بەناوی بەنگلادێش لەڕۆژهەلاّتی پاکستان. بەهۆی پشتیوانیی سەربازی هێند لە بەنگلادێش بەرامبەر بە پاکستان، خەرێك بوو ئەم دوو دەوڵەتە تووشی شەڕێکی نوێ ببنەوە بەلاّم پاکستان کە بەهۆی جیابوونەوەی بەنگلادێش لاوازتر ببوو، خۆی لەو شەڕە پرمەترسییە هەڵنەقوتاند. ئیندیرا بە سەردانی جۆراجۆر بۆ وڵاتانی دەرەوە پێگەی نێونەتەوەیی هێندی پتەوتر کردو لەگەڵ ئەوەشدا کە مەیلەوچوونی بەرەو ڕۆژهەلاّت دەچووو یارمەتی داراییو سەربازی لە شۆڕەوی وەرگرت، لە ئەمریکاو جیهانی ڕۆژئاواش یارمەتی بەرچاوی وەرگرتو کەڵکی زۆری لە ڕکابەری نێوان ڕۆژهەلاّتو ڕۆژئاوا وەرگرت. ئیندیرا گاندی لەبواری سیاسەتی ناوخۆیشدا هەوڵەکانی بۆ لەناوبردنی هەژاریو کۆنترۆڵی حەشیمەت چڕ کردەوەو هەنگاوی کاریگەری بۆ گەشەسەندنی پیشەو کشتوکاڵ هەڵێنا. سەرکەوتنەکانی ئیندیرا گاندی لە یەکەمین خوولی پێنج ساڵەی حکوومەتەکەیدا بووە هۆی سەرکەوتنی پڕشنگداری حیزبی کۆنگرە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧١ی هێند، بەلاّم هەرئەم سەرکەوتنە چاوەڕوان نەکراوە بووە هۆی ئەوە کە ئیندیرا لە خولی دووهەمی سەرۆك وەزیرانی خۆیدا لە خۆباییو توندڕە بێت. مورارجی دێسای رکەبەری سەرەکی ئیندیرا لە حیزبی کۆنگرە کە لەساڵی ١٩٦٩ لەم حیزبە جیابۆوەو حیزبێکی‌تری بەهەمان ناوی "کۆنگرە " دامەزراند، ئەوی بەوە تۆمەتبار کرد کە یاساکانی هەڵبژاردنی پێشێل کردووە. بە دواداچوونی دێسایو رکەبەری پاڵێوراوی ئەو لە **"الله آباد"** لەسەریەکێك لە پێشێل کارییەکانی ئیندیرا بووە هۆی دەرچوونی بڕیاری تاوانباری ئەو لەساڵی ١٩٧٥ کە ئەگەر ئەم بڕیارە

دوای سەرنەکەوتنی حیزبی کۆنگرە لە هەڵبژاردنەکانیساڵی ١٩٧٧ی هێند، مورارجی دێسای (رکەبەری بەساڵاچووی ئیندیرا گاندی) بەسەرۆکایەتی دەوڵەتێکی هاوبەند لەحیزبە بەرهەڵستکارەکان دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت. بەڵام بەهۆی نەبوونی هەماهەنگی لەنێوان رێبەرانی حیزبە هاوبەندەکان نەیتوانی کارێکی ئەوتۆ بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی هێند ئەنجام بدات. جگە لەسەرنەکەوتنی ئەم دەوڵەتە لە چارەسەرکردنی گرفتە ئابوورییەکانی هێند کە هەندێك نارەزایەتی گشتیی بەدواوە بوو، کردەوە تۆڵە ئەستێنەوەکانی دەوڵەتی دێسای لە ئیندیرا گاندیو خزمەکانی کە بووە هۆی گیرانو بەند کرانی خودی ئیندیراو کورەکەی (سانجای)[12]، هەستی خەڵکی بە قازانجی ئەوان هەژاندو هەلی بۆ سەرکەوتنی ئەوان لەخولی هەڵبژاردنەکانی دواتر رەخساند. نارەزایەتی گشتی خەڵكو سەرهەڵدانی ئاڵۆزیو شێواوی لە هێند بە درێژایی ساڵی ١٩٧٩، دەوڵەتی هێندی ناچار کرد کە رێکەوتی هەڵبژاردنەکانی پەرلمان وەپێش بخات. ئیندیرا گاندیو سانجای کە تازە لە بەندیخانە ئازاد ببوون، لەم هەڵبژاردنانەدا دەستیان بە پێشبرکێیەکی بەرفراوانو هەمەلایەنە کردو بە درووشمی خەبات بۆ نەهێشتنی هەژاریو دابینکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتیو دامەزراندنی حکوومەتی یاسا، سەرنجی زۆربەی دەنگدەرانی هێندیان بۆ لای خۆیان راکێشا. ئیندیرا گاندی کە لەو کاتەدا ژنێکی شەستو دووساڵەبووو بەهێزو توانایيەکی زۆرەوە کە لە ژنێکی ئاوا بەساڵاچوودا بەدی نەدەکرا، توانی لەماوەی دوومانگی کۆتایی ساڵی ١٩٧٩دا زیاتر لە شەست هەزار کیلۆمەتر سەفەر بکاو لە ٣٨٤ ناوەندی هەڵبژاردن وتار بدات. ئیندیرا گاندی هەموو رۆژێك لە چەند کۆبوونەوەی پرۆپاگەندەی هەڵبژاردندا وتاری دەخوێندەوەو جارێکیان ژمارەی وتارەکانی ئەو گەیشتە بیست وتار. دەرەنجامی ئەو هەوڵە بەردەوامو بێ وچانەی ئیندیرا گاندی بریتیبوو لەسەرکەوتنی بەشکۆی حیزبی کۆنگرەی ئیندیرا لە هەڵبژاردنەکانی سێهەمی ژانڤییەی ساڵی ١٩٨٠. لە ئاکامی ئەم هەڵبژاردنانەدا کە ١٩٦ ملیۆن دەنگدەر بەشدارییان تێدا کرد، پاڵێوراوانی حیزبی کۆنگرەی ئیندیرا نێزیکەی دوو لەسەر سێی کورسییەکانی پەرلمانیان بەدەست هێناو لەو نێوانەدا سانجای درەوشاوەترین سەرکەوتنی بەدەست هێناو توانی بە بەدەستهێنانی زیاتر لە سەد هەزار دەنگ بچێتە پەرلمان. ئیندیرا گاندی ئەمجارەیان بەهێزتر لەپێشوو گەرایەوە سەر تەختی دەسەڵات، بەڵام بە ئەزموونێکی کە لە حکوومەتی ٢١

12-Sanjai.



جێبەجێکرابایە، ئیندیرا بۆ ماوەی ٦ساڵ لە بەدەستەوە گرتنی کاروباری دەوڵەت بێبەش دەکرا. ئیندیرا گاندی لەبەرامبەر ئەو هەڵوێستەی بەرهەڵستکارانیدا دژکردەوەیەکی توندوتیژی ئەنجامداو بە راگەیاندنی بارودۆخی نائاسایی، لە ماوەی شەوێکدا لەسەرانسەری هێند ٦٨٦ کەس لە بەرهەڵستکارانی خۆی دەستبەسەرو بەند کرد. ئیندیرا گاندی دواییش بە وەرگرتنی دەسەڵاتە نائاساییەکان لە پەرلمان، یاساو رێساکانی راگەیاندنی هەل ومەرجی نائاسایی کە دەتوانرا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو جێبەجێبکرێت نوێ کردەوە و بەکەڵك وەرگرتن لەم دەسەڵاتانە هەزاران کەس لەنەیارە سیاسییەکانی خۆی دەستبەسەر کردو ئازادی قەڵەمو رادەربرینو کۆبوەنەوەکانی لە هێند بەرتەسك کردووە. بەرگریو دژایەتی توند لەسەرانسەری هێند بەدژی ئەم کارانە سەری هەڵداو ئیندیرا بە راگەیاندنی هەڵبژاردنەکانی پەرلمان لەمانگی مارسی ١٩٧٧، نێوبژیوانی نێوان خۆیو بەرهەڵستکارەکانی بەرای گشتی سپارد. هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٧ ئەزموونێکی تاڵ بوو بۆ ئیندیرا گاندی، لەبەرئەوەی کە نەتەنیا حیزبەکەیو زۆرینەی ئەندامانی پەرلمانی لە دەست دا، بەڵکو نەشی توانی لەناوەندی هەڵبژاردنو زێدی خۆی بەسەر رکەبەرەکەیدا سەرکەویو بچێتە پەرلمانی هێند. لەراستیدا سەرنەکەوتنی ئیندیرا گاندی لەو هەڵبژاردنانەدا وڵامی خەڵکی هێند بوو بەو کردەوە توندوتیژو دیکتاتۆرییانەی ئەو لەکاتی بارودۆخی نائاساییو دەسەڵاتە نائاساییەکان کە دەبوایە ئیندیرا ئەزموونی لێ وەرگرتبایە.



**ئیندیرا لەسەرەتای سەرۆك وەزیرانی**

مانگەی دیکتاتۆریەتی خۆی لەساڵی ١٩٧٥و ١٩٧٦ وەری گرتبوو، ئەمجارەیان بە پارێزو هێمنی زیاترەوە هاتە نێو گۆڕەپانی سیاسەتەو لە یەکەمین وتاری دوای سەرکەوتن لە هەڵبژاردنەکاندا، وتی کە ئامانجی ئەو لەم خولە نوێیەی حکوومەتدا بریتیە لە سەقامگیر کردنی ئاشتی نەتەوەیی‌و چارەسەرکردنی قەیرانی ئابووری وڵاتو بەهیچ جۆرێك هەوڵ نادات بۆ قەرەبوو کردنەوەو تۆڵە سەندنەوە لەو کەسانەی کە لە رابردوودا زوڵمیان لێکردووە هەڵوێست بگرێ. ئیندیرا گاندی لەخولی دووهەمی حکوومەتیدا زیاتر لەجاران دەرفەتی بە کوڕەکەی داو ئەوی لە هەموو کارەکاندا کردە راوێژکاری خۆی. بە جۆرێك کە وردە وردە رۆژنامەکانی هێندو جیهان ئەویان وەك رۆشنایی چاوو جێنشینی ئیندیرا دەزانی‌و دەیان نووسی کە ئیندیرا گاندی دەیهەوێت سانجای بۆ جێنشینی خۆی پەروەردە بکاتو حکوومەت لە بنەماڵەی نێهرۆدا بکاتە میراتگری.



**ئیندیرا گاندی لە رەوتی پێشبرکێیەکانی هەڵبژاردن**



سانجای لاوێکی پڕ جموجۆڵو بەزەبین‌و ژیر بووو ئەو تواناییی‌و لێهاتوویی‌یەی تێدا بەدی دەکرا کە ببێتە جێنشینی دایکی، بەڵام مردنی لەنەکاوی ئەو لە کارەساتی کەوتنە خوارەوەی فرۆکە لە ٢٣ی ژوەنی ساڵی ١٩٨٠، واتە کەمتر لە شەش مانگ دوای سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکانی هێند، ئەم ئاواتەی بەبا داو داخێکی نوێی لەسەردڵی ئیندیرا گاندی دانا. "راجیۆ گاندی"[١٣] کوڕە گەورەی ئیندیرا لە کاتی زیندووبوونی سانجای هیچ هۆگرییەکی ئەوتۆی بە کاروباری سیاسی نەبوو و لە کۆمپانیایەکی فرۆکەوانی هێندا فرۆکەوان بوو. بەڵام دوای مردنی لەنەکاوی سانجای، دایکی داوای لێکرد کە جێگەی چۆڵی ئەو لە تەنیشتی بگرێتەوە. راجیۆ داواکارییەکەی دایکی قەبووڵ کردو لە یەکەمین هەوڵە سیاسییەکانیدا خۆی بۆ پڕ کردنەوەی کورسی چۆڵی براکەی لەناوەندی هەڵبژاردنی "ئامێتی"[١٤] لە ئەیالەتی "ئۆتاد پرادێش"[١٥] پاڵاوتو بە زۆرینەی دەنگ بۆ نوێنەری پەرلمانی هیند هەڵبژێردرا.



**ئیندیرا گاندی لەگەڵ سانجای کە لە کارەساتی کەوتنە خوارەوەی فرۆکەدا کوژرا**

---

13-Rajiv Gandhi.

14-Amethi.

15-uttarpradesh.

ئیندیرا گاندی لە خولی دووهەمی حکوومەتەکەیدا هەندێك سەرکەوتنی لە سیاسەتی دەرەکیو ناوخۆیی بەدەست هێنا، بەلاّم ئەم سەرکەوتنانە بەتایبەت لە بواری ئابووریدا کەمتر لەو رادەیە بوو کە لە رەوتی پێشبڕکێی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٩دا بە جەماوەری هێندی بەڵێنی دابوو. هەندێك لە پڕۆگرامەکانی لەبواری ئابووریدا بەتایبەت پڕۆگرامی کۆنترۆڵ کردنی حەشیمەتو نەزۆك کردنی بەزۆری پیاوان تارادەیەك دژایەتیی لە نێوخەڵکدا دروست کرد، بەلاّم گەورەترین گرفتی نێوخۆیی ئیندیرا بریتیبوو لە بەرەو روو بوونەوەی بزاڤی جیایی خوازانی سیك کە ئیندیرا بە ناچاری ئەم بزووتنەوەیەی بە توندی سەرکوت کردو هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە توندڕەوانی سیك بەدژی ئەو راپەڕن. ئیندیرا گاندی لە رۆژی ٣١ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٨٤ لەلایەن دووکەس لەسەربازانی گاردی پارێزگاری خۆی کە ئەندامی تاقمی سیك بوون تێرۆر کرا. سەرەڕای ئەوە کە پێوەندییەکانی ئیندیرا گاندی لەگەڵ تاقمی سیك کزببووو هەڕەشەی کوشتنی ئەو لەلایەن توندڕەوانی ئەم تاقمە لە ئارادا بوو، بەلاّم بۆچی سەربازانی سیکیان لە گاردی پارێزگاری ئەو لانەبرد؟ پرسیارێکە کە هێشتاش ولاّمێکی ئەوتۆی بۆ نەبیندراوەتەوە. ئەم پرسیارە لە رەوتی دادگایی کردنی تاوانبارانی ئەم تێرۆرەش ولاّمی پێ نەدرایەوە. بەلاّم چەند ساڵ دوای کوژرانی ئیندیرا، ئەگەری بوونی پیلانێك لەنێوان کۆڕو کۆبوونەوە سیاسییەکانو رۆژنامەکانی هێند لە ئارا دابووو یەکێك لە نزیکترین هاوکارانی ئیندیرا بەناوی "راجێندێر کۆمار داوان"[16] بەوە تۆمەتبار دەکرا کە بەشداری لە تێرۆری ئەودا کردووە، بەلاّم لەم دواییانە بە بلاّوبوونەوەی راپۆرتێکی فەرمی لەسەر دەرەنجامەکانی تایبەت بە تێرۆری ئیندیرا گاندی، داوان گەڕایەوە سەر کارەکانیو تۆمەتی بەشداربوونی ئەو سەبارەت بە تێرۆری ئیندیرا بەدرۆ خرایەوە. کوژرانی ئیندیرا گاندی بەدەستی توندڕەوانی سیك راپەڕینێکی جەماوەریی بە دژی ئەوان دروست کردو بۆ قەرەبوو کردنەوەی کوژرانی ئیندیرا هەزاران کەس لە توندڕەوانی سیك لەرەوتی ئەم راپەڕینە گشتییەدا کوژرانو هەزاران بنەماڵەی سیکیش بەهۆی روخاندنو ئاگر تێبەردانی ماڵەکانیان ئاوارە بوون. رێبەرانی حیزبی کۆنگرە رۆژی دوای کوژرانی ئیندیرا، راجیۆگاندییان بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی هێند هەڵبژارد. راجیۆ گاندی بەر لە هەموو کارێك، کۆتایی بە کوشتاری سیکەکانو ئەو ئاڵۆزییە هێنا کە دوای کوژرانی دایکی دروست ببوو. راجیۆ گاندی لەرۆژی ٢٤ ی دێسەمبەری ساڵی ١٩٨٤، واتە کەمتر لە دوومانگ دوای تێرۆری دایکی، هەڵبژاردنە نوێیەکانی پەرلمانی لە هێند ئەنجامداو بەسەرکەوتن لەم هەڵبژاردنانە کە لەژێر کاریگەری تێرۆری دایکی دروست ببوو، دەسەلاّتی

16-Rajnder Kumar Dhawan



لەبنەماڵەی نێهرۆدا جێگیر کرد. ئیندیرا گاندی لە تەمەنی شەست و حەوت ساڵی تیرۆر کراو پتر لە دوو بەشی تەمەنی بە تێکۆشانی سیاسی تێپەر کرد. ئەو نزیکەی شازدە ساڵ لە هێند حوکمڕانی کردو ئەوەندە خۆشەویست بوو کە گەلی هێند دوای کوژرانی ئەو کوڕەکەیان بەبێ ئەزموونی پێویست لە کاروباری حکوومەتو تەنیا بۆ درێژە پێدانی رێبازی دایکی وەك رێبەری خۆیان هەڵبژارد. سەرەڕای ئەوە کە نەیارەکانی ئیندیرا ئەویان بە توندو تیژیو بە کارهێنانی هێزو گرینگی نەدان بە بنەماکانی دیمۆکراسی لەسەردەمی حکوومەتیدا تۆمەتبار دەکردو لەگەڵ ئەوەش کە هەندێك لە کردەوەکانی وەکوو نەزۆك کردنی بەزۆری پیاوان بۆ کۆنترۆڵ کردنی حەشیمەت ناکۆکی زۆری لەهێند دروست کرد بوو، ئەمرۆ بە یەکێك لە خۆشەویست ترینو ناودارترین کەسایەتییەکانی هێند دەژمێردرێتو دوای رێبەرانی گەورەی هێند وەکوو گاندیو نێهرۆ لە ریزی سێهەم جێ دەگرێت.

دووهەمین ژنی سەرۆك کۆماری جیهانیش هەر ئاسیاییە کە وەکوو یەکەمین ژنی سەرۆك کۆماری جیهان (ئیزابێلاپیرۆن)و یەکەمین سەرۆك وەزیرانی جیهان (باندارانایکێ) پێگەو ناوبانگی لە هاوسەری بە میرات وەرگرتووەو بەهۆی ئەو هەموو هەست وسۆزەی کە دوای کوژرانی هەسەری لە نێو خەڵکدا دروستی ببوو، بەم دەسەلاّتە گەیشت. هەڵبەت خۆشی دوای گەیشتن بە پۆستی سەرۆك کۆماری کە هەرگیز پێش کوژرانی هاوسەری چاوەڕوانی نەدەکرد، لێهاتوویی‌و شارەزایی خۆی لەجێبەجێکردنی ئەو ئەرکە دژوارانەی کە لەئەستۆی گرتبوو وەدەرخست. "کورازۆن ئاکینۆ"[17]، سەرۆك کۆماری فیلیپین (ولاّتی حەوت هەزار دوو رەگە) کە لەتەمەنی ٥٣ ساڵیدا ئەم پۆستەی بەدەست هێنا، لەساڵی ١٩٣٣ لەبنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی فیلیپین لەدایك بوو. ئەو شەشەمین منداڵی بنەماڵەکەی بووو دایكو باوکی کە کاتۆلیکێکی دەمارگرژ بوون، کۆرازۆنیان بۆ خوێندن ناردە قوتابخانەیەك کە بەشی هەرە زۆری پرۆگرامەکانی فێرکردنی ئاینی بوو. بنەماڵەی کورازۆن لەنێوان ساڵەکانی شەڕی دووهەمی جیهانیو دوای داگیرکرانی فیلیپین لەلایەن ژاپۆنەوە ئەم ولاّتەیان بەجێ نەهێشت، بەلاّم لەساڵی ١٩٤٢و دوای شەڕی دووهەمی جیهانی بۆ ئەمریکا کۆچیان کردو کورازۆن کە کاتی مانەوەیان لەئەمریکا لەزانکۆکانی فیلادێلفیاو نیۆیۆرك درێژەی بە خوێندن دا. کورازن دوای گەڕانەوەی بۆ فیلیپینو لەتەمەنی بیستو یەك ساڵیدا لەگەڵ لاوێکی هاوتەمەنی بەناوی "بێنیگنۆ ئاکینۆ"[18] کە ئەویش لە بنەماڵەیەکی ناوداری فیلیپین بوو زەماوەندی کرد. ئاکینۆ ساڵێك دوای

17-Corazon Aquino

18-Benigno Aquino





زەماوەند لەگەڵ کورازۆن خۆی بۆ پۆستی سەرۆکی شارەوانیی شاری "کۆنسێپسیۆن"[19] پالاوتەو بەسەرکەوتن لەم هەڵبژاردنانەی شارەوانیدا، لەتەمەنی ٢٢ ساڵی نازناوی لاوترین شارەوانی فیلیپینی وەرگرت. پێشبڕکێیەکانی هەڵبژاردنی ئاکینۆ بۆ بەدەستهێنانی پۆستی شارەوانیی شاری کۆنێپسیۆن یەکەمین ئەزموونی سیاسی کورازۆنیش بوو، لەبەرئەوەی کە کورازۆن تا ئەو کاتە لەهیچ کۆڕو کۆبوونەوەیەکی سیاسیدا بەشداری نەکردبووو کچێکی زۆر شەرمێون بوو. کورازۆن بە پێداگری هاوسەری ناچار بوو لە پێشبڕکێیەکانی هەڵبژاردن بەشداری بکاتو لەگەڵ خەڵك قسە بکات. ئاکینۆ لەتەمەنی ٢٩ ساڵیدا لاوترین "قایم مقام"ی فیلیپینو لەتەمەنی ٣٤ ساڵیدا گەنجترین سێناتۆری فیلیپین بوو. کورازۆن لەگەڵ ئەوەشدا کە دایکی چوار منداڵی کچ بوو، بەلام لە پێشبڕکێیەکانی هەڵبژارنی هاوسەری بۆ بەدەستهێنانی پۆستی سێناتۆری رۆڵی گرینگی نواند. ئاکینۆ لەپۆستی نوێی خۆیدا دەستی کرد بە رەخنەگرتن لە سیاسەتەکانی "مارکووس"[20] (سەرۆك کۆماری فیلیپین)و وردە وردە بوو بە رکەبەری سەرەکی ئەو. ئامانجی دواتری ئاکینۆ بەتەواوی دیار بوو: ئەو دەیهەویست لەساڵی ١٩٧٣ کە دووهەمین خولی سەرۆك کۆماری مارکووس تەواو دەبوو، خۆی بکاتە پاڵێوراوی پۆستی سەرۆك کۆماری فیلیپینو هیچ گومانێکی نەبوو کە لەتەمەنی چل ساڵیدا لاوترین سەرۆك کۆماری فیلیپین دەبێت.



**کورازۆن ئاکینۆ لەگەڵ هاوسەری کە تێرۆرکرانی ئەو بەدەستی ئەفرادی مارکوس هۆکارەکانی لەسەرکار لاچوونی مارکووس و سەرکەوتنی کورازۆن ئاکینۆی لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری فیلیپین ئامادە کرد.**

19-Concepcion

20-Marcos



بەلام سەرۆك کۆماری دەسەلاتخوازی فیلیپین کە ژنێکی لەخۆی پاوانخوازتری هەبووو نەیدەویست بەسانایی دەست لەتەختی دەسەلاتو حکوومەت بەردات، لەساڵی ١٩٧٢ دا واتە ساڵێك بەر لە تەواوبوونی خولی سەرۆك کۆماری، بە بیانوویی دووزینەوەی پیلانێکی دژی دەوڵەت، یاساو رێساکانی راگەیاندنی بارودۆخی نائاساییو حکوومەتی سەربازیی لە ولاتدا راگەیاندو تەواوی بەرهەڵستکارەکانی کە ئاکینۆ لەسەرووی هەموویانەوە بوو دەستبەسەر کرد. مارکووس بۆ بە دەستهێنانی پشتیوانی ئەمریکاییەکان لە حکوومەتەکەی، نەیارانی بەوە تۆمەتبار کرد کە لەگەڵ کۆمۆنیستەکان هاوکارییان کردووەو بەبیانووی سەرکوتی شۆڕشی کۆمۆنیستەکان یاساو رێساکانی حکوومەتی سەربازیو بارودۆخی نائاسایی نوێ کردەوە. ئامانجی سەرەکی مارکووس لەم کردەوانە بریتی بوو لە گۆڕینی یاسای هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار بۆ دوو خولی یەك لەدوای یەك و لەئاکامدا مارکووس توانی خولی سەرۆك کۆماری بۆ ماوەیەکی نادیار نوێ کاتەوە. ئاکینۆ نێزیکەی ٨ ساڵ واتە تا ساڵی ١٩٨٠ لە بەندیخانەدا بوو و لەم ماوەیەدا تەنیا رێگای پێوەندی ئەو بە دنیای دەرەوە هاوسەری بوو کە هەموو حەوتوویەك بۆ بینینی دەچووە بەندیخانەو مۆڵەتی ئەوەی هەبوو بۆ ماوەی کاتژمێرێك بە تەنیا لەگەڵ هاوسەری بمێنێتەوە. کۆرازۆن ئاکینۆ بە کەڵك وەرگرتن لەم هەلکەوتە توانی رۆڵی پێوەندی هاوسەری لەگەڵ گرووپە بەر هەڵستکارەکانی مارکووس لەدەرەوەی بەندیخانە بگێڕێو هاوکات لەگەڵ هێنانی پەیامەکانی بەرهەڵستکاران بۆ هاوسەری، فەرمانەکانی ئاکینۆش بۆ ئەوان ببات. لەراستیدا ئاکینۆ توانی بە هاوکاری کورازۆن لە بەندیخانەوە بزوتنەوە بەرهەڵستکارییەکانی دژی مارکووس رێبەری بکاتو کورازۆن ئاکینۆ بە ئەنجامدانی ئەو کارانە بەکردەوە رۆڵی جێگری هاوسەری لەم بزوتنەوە بەرهەڵستکارییانەدا وەئەستۆ گرت. لەساڵی ١٩٨٠دا کە ئاکینۆ بەهۆی نەخۆشی دڵەوە لەمەترسی مردن دابوو، هەوڵەکانی هاوسەری بۆ سەرنج راکێشانی رای گشتی جیهانو بەتایبەت رۆژنامەکانی ئەمریکا بەباری تەندرووستی ئەو لە بەندیخانەدا، مارکووسی ناچار بە ئازادیی بەمەرجی ئاکینۆ لە بەندیخانەو رۆیشتنی بۆ ئەمریکا بۆ ئەنجامدانی نشتەرگەری دڵ کرد. ئاکینۆ لەگەڵ هاوسەری چوو بۆ ئەمریکاو لەناوەندی پزیشکی بۆستۆن نشتەرگەری لەسەر ئەنجام درا. ئاکینۆ دوای چاك بوونەوە دەستی بە هەڵمەتێکی پرۆپاگەندەیی بەرفراوان بە دژی مارکووس کردو لەساڵی ١٩٨٣ بە مەبەستی درێژەدان بەو هەڵمەتە بۆ روخاندنی مارکووس گەڕایەوە نیشتمان. لایەنگرانی ئاکینۆ لە نێوخۆی ولاتدا ئەویان ئاگادار کردەوە کە لەنەبوونی ئەودا بڕیاری کوشتنی پەسند کراوەو لەکاتی گەڕانەوە دەستبەجێ





دەستبەسەرو ئێعدام دەکرێ. بەڵام ئاکینۆ لەم بڕوایە دابوو بەهۆی ئەو پڕۆپاگەندانەی کە بە دژی مارکووس لە ئەمریکا وەڕێی خستبوو، مارکووس هیچکات ناوێرێ ئەو تیرۆر بکاتو بێ‌گوێدان بەو ئاگادارییانە گەڕایەوە فیلیپین. ڕەنگە گومانی ئاکینۆ سەبارەت بەوە کە مارکووس ناوێرێ ئەو بکوژێ دروست بێت، بەڵام مارکووس بۆ دەرباز بوون لە شەڕی ئاکینۆ مشورێکی تری خوارد بوو: ئاکینۆ هەر بە گەیشتنی بۆ فرۆکەخانەی مانیلی پێتەختی فیلیپین بە تەقەی چەکدارێکی نەناسراو کە جگە لە یاساوڵە هەواڵگرەکانی مارکووس کەسێکی‌تر نەبوو، تیرۆر کرا. ئەم دیمەنە ناحەزو نامرۆڤانەی کە کورازۆن ئاکینۆ لە فرۆکەخانەی مانیل بە چاوی خۆی بینیی، سەرەتای بزوتنەوەیەك بوو کە سێ ساڵ دواتر مارکووسی لەسەر تەختی دەسەڵات هێنایە خوارێو هۆکارەکانی هەڵبژاردنی کورازۆن ئاکینۆی بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری ئامادە کرد. مردنی ئاکینۆ بۆ دیکتاتۆری فیلیپین لە زیندووبوونی مەترسیدارتر بووو ئامادە بوونی ۲ملیۆن کەس لەرێوڕەسمی بەخاك ئەسپاردنی ئاکینۆ، ناوی هاوسەری ئەوی‌کە لە پێشەوەی ئەو حەشیمەتە زۆرەوە دەرۆیشت وەسەر زمانان خست. ئەو هەڵە گەورەیەی کە مارکووس لەکوشتنی ناجوامێرانەی ئاکینۆ ئەنجامی دا، بووە هۆی ئەوەکە بزوتنەوە نهێنی‌یەکانی دژ بە حکوومەتە دیکتاتۆرییەکەی ئاشکرا بێتو دەزگای ئاسایشی فیلیپین نەتوانێ شەپۆلی نارەزایەتی رۆژ لە دوای رۆژ زیاتری خەڵك کۆنترۆل بکات. مارکووس لەژێر گوشاری رای گشتی خەڵکی جیهاندا کە راگەیاندنە گشتییەکانی ئەمریکا لەو دا رۆڵی گرینگیان گێڕا، ناچار بوو ئازادییەکی زۆرتر بۆ گەلی فیلیپین دابین بکاتو بەهەر هەنگاوێك پاشەکشە لەبەرامبەر بەرهەڵستکارەکانی، شەپۆلی نارەزایەتی بە دژی حکوومەتی ئەو بەهێزتر دەبوو.

تەنیا شانسی مارکووس لەو کاتەدا پەرشو بلاوی هێزە بەرهەڵستکارەکانو ناکۆکیو رکەبەری لەنێوان رێبەرانی ئەم گرووپانە بووو مارکووس بەهیوای کەڵك وەرگرتن لەم ناکۆکییانەو جێگیرکردنی پێگەی خۆی لەپۆستی سەرۆك کۆماریدا، رایگەیاند کە لەفێورییەی ساڵی ۱۹۸٦ هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری فیلیپین نوێ دەکرێتەوەو خەڵك بڕیاری یەکلاکەرەوەی نێوان ئەوو بەرهەڵستکارانی پەسند دەکەن. کاتێك کە مارکووس رێکەوتی هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماریی راگەیاند، کورازۆن ئاکینۆ نەببوو بە پاڵێوراوی ئەو پۆستەو ئەگەر ئەو بە دروشمی یەکگرتوویی نەتەوەیی نەهاتبایە نێو گۆڕەپانی هەڵبژاردنەکان، دەنگی بەرهەڵستکارانی مارکووس لەنێوان چەند پاڵێوراو دابەش دەبووو هیچکام لەمانە نەیاندەتوانی لەگەڵ مارکووس کە هێشتاش هێزە چەکدارەکانو توێژی حەساوەو تێری کۆمەڵگا پشتیوانیان لێدەکرد، رکەبەری بکەن. لەم قۆناغە



هەستیارەو کەمتر لەچوارمانگ بەرلە دەستپێکردنی هەڵبژاردنەکان بوو کە کورازۆن هاتە نێو گۆڕەپانی هەڵبژاردنەکانو هاوکات لەگەڵ راگەیاندنی پاڵێوراوی خۆی، داوای لە هەموو هێزە بەرهەڵستکارەکانی حکوومەتی مارکووس کرد کە لە پشت ئەوەوە یەکگرن. مەزنترین سەرکەوتنی کورازاۆن لەرەوتی پێشبڕکێیەکانی هەڵبژاردن کە لێهاتوویی سیاسی ئەو بەرلە سەرکوتن وەدەردەخات، ئەوە بووکە توانی هاوکاری بەرچاوترین رێبەری سیاسی بەرهەڵستکاران (سالڤادۆرلۆرێل)[21] کە پێش ئەو خۆی بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری پالاوتبوو بەدەست بهێنێت. سالڤادۆر لۆرێل خۆی لە کورازۆن بە شایانتر دەزانی، بەڵام کاتێك کە بینی بە هاتنە ژوورێ کورازۆن بۆ گۆڕەپانی پێشبڕکێیەکانی هەڵبژاردن ئیتر شانسی سەرکەوتنی نەماوە، ئامادە بوو وەك پاڵێورای پۆستی جێگری سەرۆك کۆمار لەتەنیشت ئاکینۆ درێژە بە پێشبڕکێیەکە بداتو یەکگرتنی ئەو دوانە هێزە بەرهەڵستکارەکانی‌تریشی بۆ لای خۆی راکێشا. کورازۆن ئاکینۆ زۆربەی کات بەدرێژایی پێشبڕکێیەکانی هەڵبژاردن جلوبەرگێکی زەردی سادەی لەبەر دابووو هەربەم سادەییەوە جیاوازی خۆی لەگەڵ "ئیمێلدا"[22]ی هاوسەری مارکووس کە هەر رۆژ جلوبەرگێکی زریقەو بریقەداری نوێی ئەورووپی لەبەر دەکرد، نیشان داو توانی لەماوەی سێ مانگدا سەفەر بۆ سەد ناوەندی هەڵبژاردن بکاتو لە هەرکام لەم ناوەندانەو تارێك بدات.



**کورازۆن ئاکینۆو جێگرەکەی، سالڤادۆرلۆرێل**

21- Salvador Laurel

22- Imelda





دوایین وتاری هەڵبژاردنەکانی کورازۆن ئاکینۆ لە مانیل کە بەرهەمی راهاتنی ئەو لەماوەی سێ مانگ پێشبڕکێو وتار خوێندوە لە کۆڕوکۆبوونەوە جۆراوجۆرەکان بوو، توانایی ئەوی وەك سیاسەتوانێکی کارامە سەلماندو پشتیوانی رێبەرانی ئایینیی فیلیپین لە کورازۆن لە قۆناغە کۆتاییەکانی پێشبڕکێیەکەدا پێکانی کۆتایی لەپێگەی مارکووس دا. مارکووس کە هەستی دەکرد یارییەکەی دۆڕاندووە، بە شێوازی هەمیشەیی دیکتاتۆرەکانو لەکاتی هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماریدا دەستکاری شانۆی هەڵبژاردنی کردو یاساوڵەکانی لەزۆربەی بنکەکانی هەڵبژاردن بە گۆڕینی سندوقەکانی دەنگدانو نووسینو تۆمارکردنی دەنگی زیادی بەناوی ئەو، ئاکامی هەڵبژاردنەکانیان بە پێچەوانەی راستی راگەیاند، بەلاّم ئاکامی هەڵبژاردن لەمانیلو شارە گەورەکانی فیلیپین کە بەهۆی ئامادەبوونی چاوەدێرانی بیانی نەدەتواندرا فێڵی تێدا بکرێت، نیشانی دەدا کە زۆربەی هەرە زۆری دەنگدەران بە قازانجی کورازۆنو جێگرەکەی دەنگیان داوە. ئەنجامی گشتی دەنگدانەکان لەرۆژی پازدەهەمی فێوریەی ساڵی ١٩٨٦راگەیاندرا. بەپێی ئەم راگەیاندراوە ٥٤ لەسەر ١٠٠ی دەنگدەران بەقازانجی مارکووسو هاوسەری کە پاڵێوراوی جێگری سەرۆك کۆماری بوو دەنگیان دابوو ٤٦ لەسەر ١٠٠ی دەنگدەران بە قازانجی کورازۆن ئاکینۆو سالڤادۆر لۆرێل دەنگیان دابوو. مارکووس بۆ ئەوەی کارەکە کۆتایی هاتوو رابگەێنێت، رێورەسمی سوێند خواردنی خولی نوێی سەرۆك کۆماری خۆی بە رێوە برد. بەلاّم بەهۆی رژانی خەڵك بۆ سەرشەقامەکانو ئەو خۆپێشاندانە بەرینەی کە بە قازانجی ئاکینۆ رێخسترا، روون بۆوە کە بەپێچەوانەی چاوەڕووانی مارکووس یاری هێشتا تەواو نەبووە.



**دوایین سوێندی سەرۆك کۆماری مارکووسو هاوسەری کە لەگەڵ ئەودا بۆ جێگری سەرۆك کۆماری هەڵبژێردرا.**



خۆپێشاندانو شلەژاوی لە فیلیپین بۆ ماوەی سێ رۆژ درێژەی هەبوو، بەلاّم مارکووس هیوادار بوو بتوانێ بەپاڵپشتی سوپای فیلیپین بارودۆخەکە ئاسایی بکاتەوە. لەم میانەدا سەلماندی فێڵی مارکووس لەئەنجامی هەڵبژاردنەکان لەلایەن شاندێکی کۆنگرەی ئەمریکا کە بۆ فیلیپین نێردرا بوون، پێگەی مارکووسی لەنێو سەرکردەکانی سوپا لەرزۆك کردو دوابەدوای رۆژی سێهەمی خۆپیپشاندانەکان کە فیلیپینی بەتەواوی ئیفلیج کرد، سەرکردە سەربازییەکان وەفاداری خۆیان بۆ ئاکینۆ راگەیاندو پەرلمانی فیلیپینیش رایگەیاند کە ئاکامی هەڵبژاردنەکانی پێشوو دروست نیەو بە پووچەڵکردنی دەنگەکانی چەند بنکەیەکی هەڵبژاردن کە فێڵیان تێدا کرابوو، رایگەیاند کە کورازۆنو لۆرێل لە هەڵبژاردنەکان سەرکەوتون. کورازۆن ئاکینۆ لەرۆژی سوێند خواردنی سەرۆك کۆماریدا بەو جل وبەرگە زەردەی کە لەکاتی پێشبڕکێیەکانی هەڵبژاردن لە بەری دەکرد، سواری سەیارەکەی بوو و بەهۆی مانەوە لەپشت چرا سوورەکانی هات وچۆی شەقامەکانی مانیل بڕێك درەنگ گەیشتە رێورەسمی سوێندخواردنی سەرۆك کۆماری. قسەکانی ئەو لە رێورەسمەکەدا کورت، بەلاّم قورسو پتەو بوو. بۆ وێنە دەیگوت: "من بەناوی گەلی فیلیپین دەسەلاّت بەدەستەوە دەگرم...و بەڵێن دەدەم ئەو دەوڵەتەی کە دایدەمەزرێنم دادپەروەریو یاسا جێبەجێ بکات، لەسەر بنەمای راستیو رەوشت کار بکاتو ئازادیو دێمۆکراسی لە وڵاتدا مسۆگەر بکات..." مارکووسو هاوسەری کە نزیکەی بیست ساڵ لە فیلیپین دا حوکمڕانیان کرد، کەمتر لە دوازدە کاتژمێر دوای تەواو بوونی رێورەسمی سوێند خواردنی ئاکینۆ ئەم وڵاتەیان بەجێهێشت. ئەوان لەسەرەتادا بۆ بنکەی ئاسمانی ئەمریکا لە "گوام"و دواتر بۆ دوورگەی هاوایی رۆیشتن. یەکێك لەسەرەتاییترین کارەکانی ئاکینۆ ئەوە بوو کە شاندێکی لێکۆڵینەوەی دامەزراند بۆ لێکۆڵینەوە سەبارەت بەو چەند ملیارد دۆلار پارەو پووڵەی کە مارکووسو دەستو پێوەندییەکانی لەکاتی دەسەلاّتدارێتی بە فیڕۆیان دابوو. ژیانی شاهانەی مارکووس لە کۆشکی سەرۆك کۆماریو جێگەی نیشتەجێ بوونی پیشان خەڵك درا کە بۆ وێنە سرنج راکێشترینیان سێ هەزار جووت پێلاّوی ئیمێڵدا بوو. لەسەرەتادا تواناییو لێهاتوویی کۆرازۆن ئاکینو لە بەڕێوبردنی کاروباری وڵاتی٥٦ ملیۆن کەسیی فیلیپین جێگەی متمانە نەبوو، بەلاّم ئەو بەدانانی کەسانی شارەزاو پسپۆڕ لە کاروباری دەولەتیدا ئەم گرفتەی ئاسان کردەوە. سالڤادۆر لۆرێل (یاوەرو هاوکاری کورازۆن ئاکینۆ لەکاتی پێشبڕکێی هەڵبژاردنەکان بۆ رووخانی حکوومەتی مارکووس) هاوکات لەگەڵ پاراستنی پۆستی جێگری





سەرۆك كۆماری، بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی هەڵبژێردراو لە هەڵبژاردنی کابینەی حکوومەتدا (ئەنجومەنی وەزیران) پتر پسپۆڕیو کارزانی لەبەرچاو گیرا. کورازۆن ئاکینۆ بە هەڵبژاردنی ئێنریلێی[23] هاوکاری مارکووس بۆ پۆستی وەزیری بەرگری فیلیپین، تارادەیەکی زۆر نەرمو نیانیی بۆ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی وڵاتو پاراستنی یەکپارچەیی سوپای فیلیپین لە خۆی وەدەرخست. ئێنریلێ کە لەحکوومەتی مارکووسیش دا وەزیری بەرگری بوو، بۆ پیشاندانی وەفاداری خۆی بۆ کورازۆن ئاکینۆو گواستنەوەی دەسەڵات بە ڕێگایەکی ئاشتی ڕۆڵی کاریگەری نواندو بە پاداشتی ئەم خزمەتە لەسەر پۆستی وەزیری بەرگری جێگیر بوو.

**کورازۆن ئاکینۆ سوێندی سەرۆک کۆماری دەخوات**

**لە پشت سەری کچێکی خۆی ڕاوەستاوە.**

بەڵام ئاکینۆ بەو ڕادەیەی کە لەدانانی دوژمنێکی قەدیمی بۆ پۆستی گرینگی وەزیری بەرگری نەرمو نیان بوو، بەهەمان ڕادەش بۆ لەسەرکار لابردنی سوورو سەرسەخت بوو. ئێنریلێ کەمتر لە ساڵێك دوای هاتنە سەرکاری کورازۆن ئاکینۆ دەستی بە کێشەو ناتەبایی لەگەڵ ئەو کردو دەنگۆ گەلێك سەبارەت بە داڕشتنی پیلانێکی سەربازی لەلایەن ئەوەوە بڵاو بۆوە. ئێنریلێ دەیهەویست بەبیانووی ئەوەکە حکوومەتی کورازۆن خەباتی بەدژی شۆڕشگێڕانی کۆمۆنیست ڕاگرتووە،

23-Enrile



کاروباری خۆی لە کاروباری دەوڵەت جیابکاتەوەو لە دەرفەتێکی گونجاودا بەپاڵپشتی ئەمریکا دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت. بەڵام کورازۆن پێشدەستی کردو بە دڵنیابوونی لەپشتیوانی سەرۆکی ناوەندیو سەرکردە پایە بەرزەکانی سوپا لە حکوومەتەکەی، ئێنریلێی لەسەرکار لابرد.

کورازۆن توانی بە گۆڕینی یاسای بنەڕەتی فیلیپینو پێدانی ئازادی پتر بە گەلو خاوێن کردنەوەی دامو دەزگاکانی دەوڵەت لەکەسانی گەندەڵ، هەندێك لە بەڵێنەکانی جێبەجێبکات، بەڵام لە چارەسەرکردنی گرفتە بنەڕەتییەکانی خەڵك کە کێشەی ئابووریو هەژاریو بێکاری بوو، سەرکەوتنێکی ئەو تۆی بەدەست نەهێنا. هەڵبەت چارەسەرکردنی ئەو گرفتانە کاتی زۆری پێویستە، بەڵام هەر ئەوەندەی کە قەیرانو پەنەمانی ئابووری کۆنترۆڵ کراوەو گەشەسەندێك لە بواری ئابووری ئەگەریش زۆر نی‌یە ئەنجام دراوە، بۆ خۆی سەرکەوتنێك بۆ کورازۆن بە هەژمار دێت. کاتێك کە کورازۆن دەسەڵاتی فیلیپینی بەدەستەوەگرت ئەم وڵاتە ۲۷ ملیارد دۆلار قەرزدار بووو هەمووساڵێك ڕێژەی ئەم قەرزە ۲ ملیارد دۆلار زیاتر دەبوو. حکوومەتی ئاکینۆ لە دووساڵی یەکەمدا یەك ملیارد دۆلاری تریشی بە بڕی ئەم قەرزەوە زیاد کرد، بەڵام ئەو قەرزە نوێیەی فیلیپین بۆ دووبارە بنیاتنانەوەو بوژاندنەوەی ئابووری وڵات بەکار هاتووەو کورازۆن هیواداره کە لەسەرەتای دەیەی ۱۹۹۰دا دەست بە دانەوەی قەرزەکانی فیلیپین بکات.

**کورازۆن لە ڕێورەسمێکی سەربازیدا (۹۱)**

کورازۆن ئاکینۆ کە لە بنەماڵەیەکی دەمارگرژی کاتۆلیك لەدایك بووەو خۆشی لەخوێندنگە ئایینییەکان وانەی خوێندووە، بیرو باوەڕی قووڵی ئایینی هەیەو لە رۆژدا کاتژمێرێکی بۆ خوێندنەوەی پەرتووکی پیرۆز (ئینجیل)و رازو نیازو پاڕانەوە لەگەڵ خودا تەرخان کردووە. ئەو لەرۆژە دژوارەکانی فێوریەی ساڵی ١٩٨٦ کە هیچکەس نەیدەتوانی داهاتوو پێشبینی بکات وتی: من دڵنیام کە موعجزەیەك کۆتایی بەو قەیرانە دەهێنێت‌و جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە کە باوەڕی قووڵم بەهێزێکی نەبیندراو هەست پێ نەکراو هەیە کە لەسەرووی باوەڕی ئێمەیە. ئەو لە وتووێژێك لەگەڵ گۆڤاری ئەمریکایی تایم کە ئەویان وەك "ژنی ساڵ"[24]ی ١٩٨٦ هەڵبژارد گوتی: من لەم باوەڕەدام کە خودا بۆ هەر یەك لەبەندەکانی خۆی چارەنووسێکی دیاری کردووەو چارەنووسی منیش ئەوە بووە کە لەم بارودۆخەدا ببم بە سەرۆکی ولاتێك‌و بە نەرم‌و نیانی‌یەکی کە کەمتر لە دەسەلاتدارانی پیاو دەبیندرێت، چارەسەری ئەو دەردو گرفتانە بکەم کە لەرێژیمێکی دیکتاتۆری بەجێ ماوە.




**کورازۆن ئاکینۆ**

**ژنی یەکەمی**

**ساڵی ١٩٨٦**

٢٤- گۆڤاری تایم ماوەی حەفتا ساڵە کە هەموو ساڵێك کەسایەتییەك وەك "یەکەمین پیاوی ساڵ" هەڵدەبژێری، بەلاّم زۆرکەم بەجێگای پیاو ژنی هەڵبژاردووەو لەو ماوەیەدا تەنیا سێ ژنی بەناوەکانی والیس سیمپسۆن‌و مەلیکە ئێلیزابێتی دووهەم‌و لە کۆتاییدا کورازۆن ئاکینۆی وەك "ژنی یەکەمی ساڵ" هەڵبژاردووە.



چوارەمین ژنی ئاسیایی کە لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا بەدەسەلاّت گەیشتووە، گەنجترین ژنێکە کە تا ئێستا پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرتووە. بی‌نەزیر بوتۆ سەرۆك وەزیرانی پاکستان یەکەم ژنە کە لە ولاتێکی ئیسلامی دەسەلاّتی بەدەستەوە گرتووەو توانیویەتی لەماوەیەکی کورتدا تواناییو شیاوی خۆی لەئەنجامدانی ئەم ئەرکە گرینگ‌و پڕمەترسییە بسەلمێنێت. بی‌نەزیر بوتۆش هەروەك ئیندیرا گاندی سەرۆك وەزیرانی پێشووی هێند، ناوبانگ‌و سەرکەوتنی خۆی لە گۆڕەپانی سیاسەتدا لە باوکی بەمیرات وەرگرتووەو هەر بەم هۆیەشەوە پێش ئەوە ئاماژە بە چۆنیەتی پێشبڕکێ‌و سەرکەوتنی ئەو لە هەڵبژاردنەکانی ئەم دواییانەی پاکستان بکەین، پێویستە کورتەیەك لە ژیانی باوکی (زولفەقارعەلی بوتۆ) بزانین. زولفەقار عەلی بوتۆ لەساڵی ١٩٢٨ لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی راجپووتی هێندووستان لەدایك بووو بەشی هەرە زۆری خوێندنی لە ئەمریکاو بریتانیا تەواو کرد. زولفەقار عەلی بوتۆ خوێندکارێکی کەم وێنە بووو هەربەم هۆیەشەوە دوای تەواو کردنی خوێندنی بالاّ لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، وەك مامۆستای "مافی نێونەتەوەیی" لە زانکۆی "ساوتامپتۆن"[25]ی بریتانیا دەستی بەکار کردو ماوەیەك لەم زانکۆیە وانەی گوتەوە. هێندووستان لەسەردەمی خوێندن‌و وانە وتنەوەی زولفەقار عەلی بوتۆ لە ئەمریکاو بریتانیا سەربەخۆیی وەرگرت‌و بە دوو ولاتی سەربەخۆی هێندو پاکستان دابەش بوو. زولفەقار عەلی بوتۆ دوای دامەزراندنی دەوڵەتی پاکستان گەڕایەوە بۆ نیشتمان‌و سەرەڕای ئەوە کە لەرەوتی خەباتی سەربەخۆیی خوازانەی هێنددا پێوەندی نێزیکی بە نێهرۆ ( رێبەری هێند)و محەمەد عەلی جێناحەوە (رێبەری پاکستان) گرتبوو، بەلاّم بە جێگەی کاری دەوڵەتی، سەرقاڵی ئیشی پارێزەری دادگا بوو.

25-Southam pto







**بێنەزیر بوتۆ لەتەمەنی ٣٥ ساڵیدا بوو بە سەرۆک وەزیرانی پاکستان.**

زولفەقار عەلی بوتۆ لەساڵی ١٩٥٢دا لەگەڵ کچی بازرگانێکی بەرەچەڵەك ئێرانیی دانیشتووی بەمبەئی زەماوەندی کردو کچێكو دوو کوڕی بوو کە ناوی کچەکەی "بینەزیر بوتۆ"و ناوی کورەکانی "غولام مۆرتزاو شەهنەواز"بوو. زولفەقار عەلی بوتۆ لەساڵی ١٩٥٨ لەسەر بانگهێشتی ئەیوب خانی سەرۆك کۆماری ئەو کاتی پاکستان رووی کردە کاروباری دەوڵەتیو دوای بەدەستەوە گرتنی چەند پۆستێکی وەزیری، لەساڵی١٩٦٣دا بوو بە وەزیری کاروباری دەرەوەو لەم پۆستەدا بوو کە ناوبانگی جیهانی وەرگرت. زولفەقار عەلی بوتۆ لەسەر کێشەی کێشمیر سیاسەتێکی قورسو پتەوی بەرامبەر بە هێند بەکار هێناو بۆ رووبەروو بوونەوەی هێرشەکانی هێند، خۆی لەچین نێزیك کردەوە. بوتۆ لەکاتی شەڕی هێندو پاکستان لەساڵی ١٩٦٥ دا لایەنگری سیاسەتی خۆڕاگری لەبەرامبەر هێندییەکانو وەرگرتنی یارمەتی بیانی بۆ درێژەپێدانی شەڕ بوو، بەڵام بەهۆی دژایەتی لەگەڵ ئەو ئیمتیازانەی کە دەوڵەتی پاکستان بەپێی پەیماننامەی تاشکەند بە هێندی دا، وازی لەدەسەلاَت هێنا. زولفەقار عەلی بوتۆ لەساڵی ١٩٦٧دا حیزبی گەلی پاکستانی دامەزراند کە لەسیاسەتی دەرەوە خوازیاری شێوازی توندو تیژتر بەرامبەر بە هێندو لەسیاسەتی ناوخۆیشدا هەواداری شێوەیەك لەسۆسیالیزمی ئیسلامی بوو. حیزبی گەلی پاکستان لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٠ سەرکەوتو زولفەقار



عەلی بوتۆ ساڵێ دواترو دوابەدوای دابەش بوونی پاکستانو ئەو رۆڵەی کە هێندییەکان لەم رووداوەدا نواندیان، بوو بەسەرۆك کۆماری پاکستان. یەکەم هەنگاوی گرینگی سیاسی بوتۆ لەپۆستی سەرۆك کۆماریدا بریتیبوو لە راگەیاندنی رۆیشتنەدەرێی پاکستان لەکۆمەڵەی وڵاتانی هاوبەرژەوەندی بۆ دژایەتیکردنی بڕیاری بریتانیاو هەروەها چەند وڵاتیتری ئەم کۆمەڵەیە سەبارەت بە دان پێدانانی بەنگلادیش (پاکستانی رۆژهەلاَت). زولفەقار عەلی بوتۆ لەیەکەمین ساڵەکانی دەسەلاَتداریدا زنجیرەیەك چاکسازی ئابووریو کۆمەلاَیەتی ئەنجامداو بۆ جێبەجێکردنی پرۆگرامە سۆسیالیستییەکانی حیزبی گەلیپاکستان، پیشە گرینگەکانی ئەم وڵاتەی خۆماڵی کرد. ئەو لەساڵی ١٩٧٤ هەندێك گۆڕانکاریی لە یاسای بنەڕەتی پاکستان ئەنجامداو پۆستی سەرۆك وەزیرانی کرد بە گرینگترینو بەرزترین دەسەلاَتی جێبەجێکردن لەدەوڵەت (بەجێگەی سەرۆك کۆماری)و دوای ئەم ئاڵ وگۆڕییانە لەپۆستی سەرۆك کۆماری دەستی کێشاوەو ئەرکی سەرۆك وەزیرانی لەئەستۆ گرتو تا ساڵی ١٩٧٧ کە بە کودتایەکی سەربازی لەسەرکار لابردرا، لەسەر ئەم پۆستە مایەوە. کودتای سەربازی ساڵی ١٩٧٧ی پاکستان دوابەدوای هەندێك شڵەژاوی روویدا کە لەرەوتی هەڵبژاردنەکانی مانگی مارسی هەمان ساڵ هاتە ئاراوە. بەرهەلستکارانی بوتۆ ئەویان بە ساختەکاری لە هەڵبژاردنەکانو تیرۆری یەکێك لە پالێوراوەکانی پۆستی سەرۆك وەزیرانی کە لەگەڵی ناکۆك بوو تۆمەتبار کرد. ئەم ئاڵۆزیو شڵەژاوییانە بیانوویدا بەدەستی سەرکردەکانی سەربازی کە لەرۆژی پێنجەمی ژوویەی ساڵی ١٩٧٧ بە دژی ئەو کودتا بکەن. رێبەری کودتا سەربازییەکە ژنراڵێك بوو بەناوی **"ضیاء الحق"** کە چەند مانگ پێشتر لەلایەن زولفەقار عەلی بوتۆوە بە سەرۆکی ناوەندی سوپای پاکستان هەڵبژێردرا بوو. ئەگەر چی کودتاکە بە بیانووی کێشەی هەڵبژاردنو ئەو شڵەژاوییەی کە لێی کەوتەوە ئەنجام درا، بەلاَم دەگوترا ئەمریکاییەکان بەهۆی نارازی بوونیان لە سیاسەتە سۆسیالیستییەکانی بوتۆو مەیلەوچوونی بەرەو رۆژهەلاَت(شۆرەوی)و هەروەها چالاکییەکانی ناوەکییەکانی دەستیان لەم کودتایەدا هەبووە.

**"ضیاء الحق"** دوای ئەم کودتایە بەڵێنیدا کە لەماوەی ٣ مانگدا هەڵبژاردنی ئازاد لە پاکستان ئەنجام بداتو حکوومەت بە مەدەنییەکان بسپێرێت، بەلاَم هەرگیز ئەم بەڵێنەی بەجێ نەگەیاند. زۆلفەقار عەلی بوتۆ دوو مانگ دوای کودتاکە دەستبەسەر کراو بەتۆمەتی بەشداری لە تیرۆری کەسێك لە بەرهەڵستکارە سیاسییەکانی لەکاتی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٧ دا





دادگاییو بڕیاری کوشتنی پەسند کرا. بوتۆ لەم دادگاییەدا کە لەمانگی مارسی ساڵی ١٩٧٨ لەدادگای لاهوور بەڕێوە چوو، تواناییەکی ئەوتۆی بۆ هەڵبژاردنی پارێزەرو بەرگری لەخۆی نەبوو. تاوانبارکرانی بوتۆ دژایەتییەکی زۆری لە کۆڕو کۆمەڵە سیاسییەکان لێکەوتەوەو ژمارەیەك لە ڕێبەرانی وڵاتانی دەرەوە بۆ وێنە "ژیسکارد- دێستان"[٢٦]ی سەروك کۆماری ئەوکاتی فەڕانسە، هەوڵێکی زۆری بۆ ڕزگاری ئەو ئەنجامدا.



**"ضیاء الحق" کە لەلایەن زولفەقار عەلی بوتۆوە بوو بە سەرۆکی ناوەندی سوپای پاکستانو بە دژی بوتۆ کودتای کردو دوابەدوای ئەم کودتایە بوتۆ دەست بە سەرو لەسێدارە درا.**

زولفەقار عەلی بوتۆ لە نامەیەکی ڕاچڵەکێنەردا کە لەڕێکەوتی ٣٠ی ژووییەی ساڵی ١٩٧٨ لە بەندیخانەی "ڕەواڵپێندی"[٢٧] بۆ سەرۆك کۆماری فەڕانسەی نووسیبوو لە ڕێگای کچەکەیەوە (بی‌نەزیر بوتۆ) لە بەندیخانە ناردبوویە، هاوکات لەگەڵ سوپاسو ڕێز لێنان لە یارمەتییەکانی سەروك کۆماری فەڕانسە بۆ ڕزگارکردنی ئەو، پوختەیەك لەو ئازارانەی کە لە بەندیخانە دەیچێژا ڕوون کردۆتەوە. بەڵام سەرەکیترین خەمو پەژارەی ئەو کە لەم نامەیەدا ئاماژەی پێکردووە، بریتی‌یە لە ئێشو ئازاری هاوسەر (نووسرەت)و کچەکەیو ئەو چارەنووسەی کە دوای مردنی

---

26-Giscard D'Estaing

27-Rawalpindi



ئەو چاوەڕوانییان دەکات. هەوڵە نێودەوڵەتییەکان بۆ ڕزگار کردنی بوتۆ بێ‌ئاکام مایەوەو بوتۆ لە ڕۆژی چوارەمی ئاپریلی ساڵی ١٩٧٩ لەحەساری بەندیخانەی ڕەواڵپێندی لەسێدارە درا. زولفەقار عەلی بوتۆ لەکاتی مردنیدا ٥١ ساڵی تەمەن بووو دوو ساڵی کۆتایی تەمەنی لە خراپترین بارو دۆخ و لە ژوورێکی تاکەکەسیدا تێپەر کرد.

نووسرەت بیگمو بی‌نەزیر بوتۆ کە چەند ڕۆژ بەر لە جێبەجێکرانی بڕیارەکە بوتۆیان لە بەندیخانە بینیبوو، دواتر ڕایان گەیاند: "عەلی بوتۆ لەژێر بارودۆخی دژوارو نالەباری بەندیخانە وەك پێستو ئێسقانی لێهاتبوو و زۆر بە زەحمەت دەتوانرا بناسرێتەوە".



**بی‌نەزیر بوتۆ – ئەم وینە لە ڕێو ڕەسمی ساڵیادی باوکی‌دا گیراوە.**

بی‌نەزیر بوتۆ لەکاتی لە سێدارەدرانی باوکی ٢٥ ساڵی تەمەن بوو و لە ژیاننامەکەیدا لەژێر ناوی "کچێك لە ڕۆژهەڵات" کە پڕفرۆشترین پەرتووکی پاکستانە دەنووسێت: "باوکم سەرەڕای ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجە ڕووحیو جەستەییە تاقەت پڕووکێنانەی بەندیخانە هەرگیز ورەی دانەبەزیو لە هەموو چاوپێکەوتنەکانیدا داوای لە منو دایکم دەکرد کە لەئاست زەبرو زەنگ سەر دانەخەینو بۆ ڕزگاری ئەو سووکایەتی قەبووڵ نەکەین. تەنانەت ئەو لەڕۆژەکانی کۆتایی تەمەنیدا کە وەك پێستو ئێسقانی لێهاتبوو، بە هەمان دەنگ قورسو پیاوانەکەی داوای لێکردین کە لە درێژە پێدانی خەبات نائومێد نەبینو دڵنیا بین ڕۆژێك دادێت کە چاکە بەسەر خراپەدا زاڵ دەبێت". بی‌نەزیر بوتۆ خوێندنی باڵای لە بریتانیا تەواو کردبووو دەیتوانی لەدەرەوەی پاکستان بە سانایی بژیت، بەڵام داواکارییەکەی باوکی جێبەجێ کردو هەوڵی‌دا





درێژە بە چالاكییەكانی بۆ سەلماندنی بێتاوانی باوكیو رووخاندنی دەسەڵاتی **"ضیاء الحق"** بدات. نزیكترین پشتو پەنای ئەو لەم خەباتەدا دایكی بوو و**"ضیاء الحق"** كە لەبەرامبەر بەهەڵستكارەكانی زۆر توندو بێبەزەیی بوو، نەیتوانی سەبارەت بەم دوو ژنە ئەوەندە توندوتیژی بەكار بهێنێت. براكەی بێنەزیر بوتۆ (غولاًم مۆرتەزا) لەدەرەوەی پاكستان درێژەی بە خەبات دەدا، لەبەرئەوەی كە ئەگەر بگەڕابوایەوە بۆ پاكستان تووشی چارەنووسی باوكی دەبوو. كاتێك كە**"ضیاء الحق"**دوای حەوت ساڵ دیكتاتۆریەتی رەها لەژێر گوشاری نێودەوڵەتی ناچار بوو هەندێك ئازادی بە گەلی پاكستان بدات، بێنەزیر بوتۆ توانی حیزبی گەلی پاكستان زیندوو كاتەوەو لەسەرووی ئەو حیزبەوە درێژە بەخەباتی خۆی بدات بۆ سەقامگیر كردنی دیمۆكراسی لە پاكستان. بەلاًم **"ضیاء الحق"** بۆ جاری چەندەم بوو كە بەڵێنەكانی سەبارەت بە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئازاد لە پاكستان دەخستە ژێر پێی. ئەمجارەیان نە تەنیا بێنەزیر بوتۆو لایەنگرانی لە حیزبی گەلی پاكستان، بەڵكوو ژمارەیەك لە هاوكارەكانی **"ضیاء الحق"** بۆ وێنە مەحەممەدخانی جۆنجۆش[28] (سەرۆك وەزیرانی پاكستان) نارازی بوونی خۆیان لەحكوومەتی تاكەكەسی ئەو راگەیاند. ئەم ناكۆكییانە بوو بەهۆی ئەوە كە جۆنجۆ لەمانگی مەی ساڵی ١٩٨٨ لەسەركار لابربدرێت. لەم میانەدا بێنەزیر بوتۆ كە تازە زەماوەندی كردبوو منداڵێكیشی ببوو، درێژەی دەدا بە خەباتە بێوچانو ماندوو نەناسانەكەی خۆی بەدژی حكوومەتی **"ضیاء الحق"**. حیزبی گەلی پاكستان بەرێبەری بێنەزیر لەسەردەمی باوكی پتر لەنێو خەڵكدا جێگەی كردبۆوەو ئامادەبوونی دەیانو سەدان هەزار كەس لە كۆبوونەوەكانی حیزبیو هەڵبژاردنی ئەودا كارتێكەریو خۆشەویستی ئەوی لەنێو خەڵكدا بەروونی وەدەر دەخست. **"ضیاء الحق"** ئاگاداری ئەو مەترسییە بوو كە بێنەزیر بوتۆ بۆ سەر دەسەڵاتەكەی درووستی كردبووو ژمارەیەك لەلایەنگرانی بێنەزیر بوتۆش هەستیان بەو مەترسییە دەكرد كە سروشتی دەسەڵاتخوازانە و بێ بەزەییانەیو **"ضیاء الحق"**و تەماحی زۆری ئەو بۆ پۆستی دەسەڵات، هەڕەشە لەو ژنە لاوە دووگیانە دەكات. ئەگەر **"ضیاء الحق"** لە رۆژی ١٧ی ئووتی ساڵی ١٩٨٨دا لەئاكامی كارەساتێكی ئاسمانی گیانی لەدەست نەدابوایە، ژیانی بێنەزیر بوتۆ لە مەترسیدا دەبووو ئەو مەترسییە لە ئارادا بوو كە لەكاتی

28-Junejo



ئامادەبوون لەنێو خەڵكو لە كۆڕو كۆمەڵە گشتییەكاندا لەلایەن ئەندامە نهێنییەكانی پۆلیسی **"ضیاء الحق"** بەچەكی سارد یان گەرم تیرۆر بكرێ، بەلاًم تەقینەوەی فڕۆكەیەكی سەربازی كە **"ضیاء الحق"**و ژمارەیەك لەسەركردەكانی سوپای پاكستانی تێدا بوو خاڵێكی وەرچەرخان لەمێژووی پاكستان بوو كە چارەنووسی بێنەزیر بوتۆشی گۆڕی. لە یەكەمین هەڵبژاردنە ئازادەكانی پاكستان كە یازدە ساڵ دوای دەسەڵاتی رەهای **"ضیاء الحق"** ئەنجام درا، حیزبی گەلی پاكستان بەرێبەری بێنەزیر بوتۆو لەگەڵ هەبوونی كارشكێنیی ژمارەیەك لە پاشماوەكانی دەورانی **"ضیاء الحق"** توانی لە ٢٣٧ كورسی ٩٢ كورسی لە پەرلمانی پاكستان بەدەست بهێنیو حیزبی"یەكگرتووی دیمۆكراتیكی ئیسلامی" كە لەیەك گرتنی ٨ حیزبی باڵی راست پێك هاتبوو، بە بەدەست هێنانی ٥٥ كورسی پلەی دوهەمی بەدەست هێنا. بێنەزیر بوتۆ بە نەرمو نیانیو لێهاتوویییەكی تایبەتەوە توانی پشتیوانی چەند گرووپی بچووكی سیاسیش كە ٣٠ كورسی پارلمانیان بەدەست هێنابوو، بۆ لای خۆی راكیشێو بە راگەیاندنی پاڵپشتی زۆرینەی ئەندامانی پەرلمان لە بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات لەلایەن بێنەزیر بوتۆوە، غولاًم ئیسحاق خانی بریكاری سەرۆك كۆماری ناچار بوو كە لەرۆژی دەیەمی دێسەمبەری ساڵی ١٩٨٨دا ئەركی دامەزراندنی حكوومەت (ئەنجومەنی وەزیران) بە بێنەزیر بوتۆ بسپێرێ. بێنەزیر بوتۆ كە كەمتر لەدەساڵ دوای مردنی باوكی واتە لەتەمەنی ٣٥ ساڵیدا پۆستی سەرۆك وەزیرانیی بەدەست هێنا، لە هەڵبژاردنی وەزیرانی حكوومەتو شێوازی حوكمڕانی، لێهاتوویيو شایەستەییەكی لەرادەبەدەری لەخۆی نیشان دا. ئەو لە یەكەمین كۆنفرانسی رۆژنامەوانی خۆیداو دوای بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك وەزیرانی گووتی كە بەرژەوەندییەكانی پاكستان لە پێشووی هەموو شتێك دادەنێتو نایهەوێت تۆڵە لەو كەسانە بستێنێتەوە كە سەبارەت بە خۆیو بنەماڵەكەی خراپ بوون.









**بی‌نەزیر بوتۆ لەکاتی**
**دادگایی کردنی باوکی،**
**هەوڵی زۆری بۆ رزگاری**
**ئەو ئەنجام داو لە رەوتی**
**خەباتی سیاسی خۆشی‌دا**
**هەر هەوڵی دا یادو**
**بیرەوەری باوکی‌و**
**خەباتەکانی زیندوو کاتەوە.**
**وێنەی سەرەوە تایبەتە**
**بە خەباتەکانی رابردووی**
**بوتۆو وێنەی خوارەوەش**
**تایبەتە بە کاتی**
**بەدەستهێنانی پۆستی**
**سەرۆک وەزیرانی**

درووستی وتەکانی بی‌نەزیر لەکاتی هەڵبژارنی ئەندامانی کابینەی حکوومەتەکەی دەرکەوت و ژمارەیەك لە وەزیرانی کارامەو بەرچاوی کابینەی **"ضیاء الحق"**ی بۆ وێنە وەزیری کاروباری دەرەوە لەسەر کارەکەی جێگیر کرد. هەروەها بی‌نەزیر بوتۆ پشتیوانیی لە هەڵبژاردنی غولاَم ئیسحاق خانی بریکاری سەرۆك کۆماری پاکستان بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری کردو جارێکی‌تر نیشانی‌دا کە دەتوانی لەگەڵ دۆستانو هاوکارانی بکوژی باوکی هاوکاری بکات.





**دیمانەی راجیۆ گاندی، سەرۆك وەزیرانی هیند لەگەڵ خاتوو بی‌نەزیر بوتۆ، هەل‌و مەرجی ئاشتی‌و دۆستایەتی ئەم دوو وڵاتەی ئامادە کرد، بەڵام بە لەسەر کار لابرانی راجیۆ گاندی ناکۆکییەکانی ئەم دوو وڵاتە سەبارەت بە کێشەی کێشمیر دەستی پێکردەوە.**

بی‌نەزیر بوتۆ بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەی پاکستانی کە لەسەردەمی **"ضیاء الحق"** بەرەو رۆژئاوادا شکابووە، زۆر نەگۆڕی‌و سوپای پاکستانیش هەر سەرکردەکانی سەردەمی دەسەلاَتداریێتی **"ضیاء الحق"**ی لەسەر مایەوە. هەڵبەت سەرکردەکانی سوپای پاکستان دوای مردنی **"ضیاء الحق"** و ژمارەیەك لە هاوسەفەرانی لەکارەساتێکی ئاسمانی لەساڵی ۱۹۸۸دا، شێوازێکی ئارامتریان بەکار هێناوەو سەرۆکی ناوەندی سوپای پاکستانیش جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکاتەوە کە سوپا ئیتر دەست لەکاروباری سیاسەت وەرنادات، بەلاَم وەفاداری سەرکردەکانی سوپا بەم بەڵێنە بەستراوەتەوە بە سیاسەت‌و ژیری بی‌نەزیر بوتۆوە لە داهاتوودا. گەورەترین گرفتی بی‌نەزیر بوتۆ کە چارەسەرکردنی لە گرفتەکانی‌تر دژوارترە، بریتی‌یە لە قەیرانی ئابووری ئەم وڵاتە ۱۰۰ ملیۆنی‌یە. پاکستان یەکێك لە هەژارترین وڵاتەکانی جیهانەو بی‌نەزیر بوتۆ لە پێشبڕکێیەکانی هەڵبژاردندا بەردەوام جەختی لەسەر ئەم خاڵە دەکردەوە کە ئەگەر بەدەسەلاَت بگات، ئەوە دابینکردنی لانی کەمی ئیمکاناتی ئاسایش‌و کار بۆ گەلی

پاکستان، لەسەرووی هەمووی پرۆگرامەکانیدا دەبێت. هەڵبەت لەساڵی یەکەمی حکوومەتی بێنەزیر بوتۆ هیچ چاکسازییەك لە بارودۆخی ئابووری پاکستان ئەنجام نەدرا، بەڵام بۆ بڕیاردان لەسەر ئەگەری سەرکەوتنی ئەو لە چارەسەرکردنی ئەم کێشانە پێویستی بە کاتی زیاترە. کاتێك کە ئەم پەرتووکە ئامادەی چاپ بوو، راگەیاندرا کە خانمی بێنەزیر بوتۆ دوای ٢٠ مانگ حوکمڕانی بە شێوەیەکی لەنەکاو لەلایەن غولام ئیسحاق خانی سەرۆك کۆماری پاکستان لەسەر کار لابردراوەو یەکێك لە سیاسەتوانە بەرهەڵستکارەکانی تا کاتی هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی داهاتوو بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران هەڵبژێردراوە. بێنەزیر بوتۆ خۆشی لەکاتی لەسەرکار لابرانی، زۆرینەی کورسییەکانی پەرلمانی لەدەست دابووو هەر بۆیەش هاوکات لەگەڵ راگەیاندنی بڕیاری لەسەر کارلابردنی خانمی بێنەزیر بوتۆ، فەرمانی هەڵوەشانەوەی پەرلمانیش پەسند کراو رێکەوتی هەڵبژاردنەکانی داهاتووی پەرلمان بۆ کۆتاییەکانی ئۆکتۆبەری ساڵی١٩٩٠ (سەرەتاکانی خەزەڵوەری ساڵی **١٣٦٩** ی ك.هـ) دیاری کرا. سەرۆك کۆماری پاکستان بە رواڵەت بێنەزیر بوتۆی بەهۆی ناڕەزایەتی گشتی لە شێوازی حکوومەت وناشارەزاییو گەندەڵی لەدەوڵەت لەسەرکار لابردووە، بەڵام بێنەزیر بوتۆ کە ئەم کردەوەیەی سەرۆك کۆمار بە پێشێل کردنی یاسای بنەڕەتی دەزانێ، پێداگرە لەسەر ئەوەی کە غولام ئیسحاق خان لەژێر گوشاری ژێنراڵو رێبەرە سەربازییەکانی پاکستان کە لەحکوومەتەکەی رازی نەبوون، ئەو بڕیارەی دەرکردووە. بێنەزیر بوتۆ جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە دەست لە خەبات هەڵناگرێو ئەگەر هەڵبژاردنەکانی پاکستان لەکاتی دیاری کراوو بە رەچاوکردنی بنەماکانی دیمۆکراسیو ساختەکاری ئەنجام بدرێت، بەهێزێکی زۆرترەوە دەگەڕێتەوە سەر گۆڕەپانی دەسەڵاتو سیاسەت.

کچی دارتاشێکی هەژاری رووسی کە لە خزمەتکاریو جلوبەرگ شووشتنەوە گەیشتە پۆستی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل*

لەنێوان ئەو ژنانەی کە لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا بە دەسەلاّت گەیشتوون، نابێ ناوی "گۆلّدامایێر"[1]ی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل لەساڵەکانی ١٩٦٩ تا ١٩٧٤ لەبیر بکرێت. لەبەرئەوەی ئەم ژنە جگە لەوەیکە لەیەکێك لەقەیرانیترین سەردەمەکانی دەسەلاّتدارێتی٤٠ ساڵەی دەولّەتی ئیسرائیل هەوساری کاروباری ئەم ولاّتەی بەدەستەوە گرت، بەلّکوو هەر لەسەرەتای دامەزراندنی دەولّەتی ئیسرائیلیشەوە رۆلّی گرینگی لەسیاسەتی دەرەکیو ناوخۆیی نواندووەو یەکێك لە دامەزرێنەرانی رێژیمێك بوو کە لەگەڵ ئەو هەموو بچووکییە، بەهۆی پشت ئەستووری بە ئەمریکا یان باشتر بلّێین بەهۆی رۆلّێکی کە بەدەستی یەهوودییەکانی ئەمریکا لە دیاریکردنی رێبازی سیاسی ئەم دەولّەتە دەیگێرێت، بە یەکێك لە داشە سەرەکییەکانی سیاسەتی نێودەولّەتی بەئەژمار دێت.

گۆلّدا مایێر کە لەساڵی ١٩٧٨ لەتەمەنی ٨٠ ساڵیدا مرد، لەساڵی ١٨٩٨ لە بنەماڵەیەکی هەژاری رووسی لە شاری کییەفی رووسیا لە دایك بوو. باوکی گۆلّدامایێر (مووشی مابۆڤیچ)[2] دارتاشێکی هەژار بوو کە بە چەرمەسەریو کەسەرییەکی زۆرەوە دەیتوانی بژێوی بنەمالەکەی دابین بکات. گۆلّداو سێ خوشکەکەی جگە لە برسێتیو هەژاری، لە سووکایەتی پێکردنو ئازاری دراوسێکانو کچانی هاوتەمەنیان مەینەتییان دەچێشت، لەبەرئەوە کە یەهودییەکانی رووسیا لەو کاتانەدا کەمایەتییەکی زوڵم لێکراو بوونو بەردەوام لەژێر ئازارو نەهامەتیو تەنانەت کوشتن دابوونو پۆلیسی تێزاری رووسیاش ئەوانی بە نەتەوەیەکی پیلانگێڕو بێزراو دەناسی. بنەماڵەی مابۆڤیچ لە ساڵی ١٩٠٦دا بە فرۆشتنی هەموو ماڵو ملّکیان توانیان خەرجی سەفەری ئەمریکا دابین بکەنو لەگەڵ کۆمەلّێك لەکۆچبەرانی یەهوودی بەرەو ئەمریکا وەرێکەون. ئەوان لەئەیالەتی "ویسکانسێن"[3]ی ئەمریکا نیشتەجێ بوونو هەر چەند بارودۆخی

* تێبینی: ولاّتێك بەناوی ئیسرائیل لەروانگەی ئێمەوە ( ئێران) دانی پێدا نەنراوەو لە هەر جێگەیەك ناوی هات ئەوە مەبەستمان رێژیمی داگیرکەری قودسە.

1-Golda Meir
2-Moshe Mabovitch
3-Wisconsin



ئەوان بەراورد لەگەڵ رووسیا باشتر بوو، بەلاّم هەر لە برسێتیو هەژاریدا دەژیان. جگە لە باوکی کە لە کارگەیەکی دارتاشیدا کاری دەکرد، دایکیشی ناچاربوو بۆ یارمەتیدانی هاوسەری لە دابینکردنی بژێوی بنەماڵەکەی دوکانێکی عەتر(بۆن) فروشی بچوك بکاتەوەو گۆلّداش کە لەو کاتەدا کچێکی ٩ ساڵە بوو، ناچار بوو بەجێگەی خوێندن لەدووکانی دایکی کار بکات. هەلّبەت گۆلّدا لای باوكو خوشکەکانی زمانی عیبری فێربووو کەم کەم بەهۆی کار لە دووکانە بۆنفرۆشیەکەی دایکیو وتووێژی رۆژانە لەگەڵ خەلّك بە تەواوی بە سەر زمانی ئینگلیزیدا زاڵ بوو.



**گۆلّدامایێر لەسەردەمی گەنجێتیدا**

گۆلّدا لە منداڵییەوە ئاواتی ئەوە بوو ببێتە مامۆستا، بەلاّم باوکی رازی نەبووو دەیگوت زۆربەی ئەو کچانەی کاری مامۆستایەتی دەکەن ناتوانن زەماوەند بکەنو لە مالّدا دەمێننەوە. بەلاّم گۆلّدا کە دەیهەویست بەهەر شێوەیەك بێت بەئامانجی خۆی بگات، لەتەمەنی ١٥ساڵیدا بنەماڵەکەی بەجێهێشتو بڕیاریدا لەشاری "دێنڤێر"[4] لەگەڵ خوشکە گەورەکەی بژی. گۆلّدا پێی وابوو دەتوانێت لای خوشکەکەی درێژە بە خوێندن بداتو کاری مامۆستایەتی ئەنجام بدات. بەلاّم خوشکەکەی بە زەحمەت دەیتوانی بژێوی خۆی دابین بکاتو گۆلّداش ناچاربوو

4-Denever





خەریکی کاری کارەکەر وەك جل شوشتن بێت. گۆڵدا یەکەمجار لەتەمەنی حەڤدە ساڵیدا چووە نێو کاروباری سیاسیو لە فیدراسیۆنێکی کرێکاریدا کە لەژێر دەستی زایۆنیستەکاندا بوو دەستی بەکارو چالاکی کرد. گۆڵدا لەرەوتی ئەم چالاکییانە لەگەڵ لاوێکی یەهودی بەناوی "موریس میرسۆن"[5] ئاشنا بوو. موریس مێرسۆن دروشمی پڕۆپاگەندەی لەسەر قوماش دەنووسیو لەتەمەنی ٢٠ ساڵیدا زەماوەندی لەگەڵ گۆڵدا کرد. گۆڵدا کە لە ڕێکخراوێکی زایۆنیستی بۆ هاندانی یەهودییەکانی ئەمریکا سەبارەت بە کۆچ بۆ فەلەستین کاری دەکرد، لەساڵی ١٩٢١دا هاوسەرەکەی ناچار کرد کە بۆ فەلەستین کۆچ بکەن. ئەم ژنو مێردە لە "کیبۆتز"[6] یان زەوی جوتیاری هاوبەش نیشتەجێ کرانو دوو ساڵ ژیانیان تێدا کرد. گۆڵدا بە تینو گوڕێکی تایبەتەوە لەم زەوییە کشتوکاڵییە خەریکی کاروباری جوتیاریو پەروەردە کردنی پەلەوەر بوو، بەڵام هاوسەری کە لە کاروباری جوتیاریو ژیان لە خەوتنگەی هاوبەش نارازی بوو، داوای لە گۆڵدا کرد کە بگەڕێنەوە بۆ ئەمریکا. گۆڵدا ماییر یەکەمین جار لەکاتی کار لەم زەوییە هاوبەشەدا لەگەڵ "دەیڤید بێن گۆریۆن"[7]، یەکەمین سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل ئاشنا بوو کە داهێنەری ئەم زەوییە هاوبەشانە بوو. بێن گۆریۆن داوای لە گۆڵداو هاوسەری کرد کە ناوی بنەماڵەیی خۆیان لە مێرسۆنەوە کە پتر لەناوی بنە ماڵەی مەسیحییەکان دەچوو، بۆ "ماییر" بگۆڕن (ناوێکی عیبری بوو)و بە دەربڕینی ڕەزامەندی گۆڵداو هاوسەری  لەسەر ئەم پێشنیارە، ناوی بنەماڵەییان لە ناسنامەو بەڵگەکانیاندا گۆرا بۆ ماییر. گۆڵداو هاوسەری لەساڵی ١٩٢٣ بۆ تێل ئاڤیۆو دواتریش بۆ "بيت المقدس" ڕۆیشتنو دوو منداڵەکەیان کە یەکیان کوڕ(مۆنافیم)و ئەوی تریان کچ (سارا) بوو لەم دوو شارە لەدایکبوون. داهاتی هاوسەری گۆڵدا لە شاری "بيت المقدس" زۆر کەم بووو نەیدەتوانی بژێوی بنەماڵە چوار کەسییەکەی دابین بکات، بەم هۆیەشەوە گۆڵدا ماییر جارێکیتر ناچاربوو خەریکی کاروباری ئاشپەزیو پاكو خاوێنیو جلوبەرگ شووشتن بێت. گۆڵدا هاوکات لەگەڵ ئەو هەموو گرفتە، کاروباری سیاسیشی بەجێ نەدەهێشتو بەردەوام لە کۆبوونەوەکانی فیدراسیۆنی کرێکاری یەهود بەناوی "هیستادروت"[8] کە ئێستاش گرینگترین ڕێکخراوی کرێکاری ئیسرائیلە بەشداری دەکردو

5-Morris Myerson
6-Kibbutz
7-David Ben-Gurion
8-Histadrut



لەلایەن ئەم ڕێکخراوە هەندێك کاری پێدەسپێردرا. هاوسەری گۆڵدا لەبیروبۆچونە سوسیالیستیو چالاکییەکانی هاوسەری لە فیدراسیۆنی کرێکاری رازی نەبووو جگە لەمەش لە درێژەپێدانی ژیان لە فەلەستین ماندوو ببووو دەیهەویست بگەڕێنەوە ئەمریکا. گۆڵدا ماییر لە ژیاننامەی خۆیدا کە لەژێر ناوی "ژیانی من" چاپ کراوەو هێستاش یەکێك لە پڕفرۆشترین پەرتوکەکانی ئیسرائیلە، دوای ئاماژە بە ناکۆکییەکانی لەگەڵ هاوسەرەی دەنووسێ: "من لەئاکامدا کەوتمە سەر ئەم دووڕێیانە کە هاوسەرم هەڵبژێرم یا خود ئامانجەکەم، لەئەنجامدا ئامانجەکەم هەڵبژارد". گۆڵدا ماییر دوای جیابوونەوە لەهاوسەری ڕۆڵی گرینگتری لە فیدراسیۆنی کرێکاری بە ئەستۆ گرتو لەساڵی ١٩٢٨دا وەك سەرۆکی یەکیەتی ژنانی کرێکاری یەهودی هەڵبژێردرا. گۆڵداماییر لەساڵی١٩٣٤دا ئەندامی شاندی بەڕێوەبەرایەتی فیدراسیۆنی کرێکارانی یەهود بووو لەساڵی١٩٤٠دا بوو بە سەرۆکی دەفتەری سیاسی فیدراسیۆن. گۆڵدا هاوکات لەگەڵ چالاکی لە فیدراسیۆنی کرێکارانی یەهود، لەگەڵ ڕێکخراوی زایۆنیستی بێن گۆریۆنیش هاوکاری دەکردو بەکردەوە یەکیەتی کرێکارانی یەهودی لەرەوتی ئامانجەکانی زایۆنیستەکان ڕێنمایی دەکرد. گۆڵداماییر بە تەواوبوونی شەڕی دووهەمی جیهانیو زۆر بوونی چالاکییەکانی زایۆنیستەکان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی ئیسرائیلی، لەلایەن بێن گۆریۆنەوە کە لەو کاتەدا سەرۆکی ڕێکخراوی سیاسی زایۆنیستەکان بوو بەرەو ئەمریکا وەڕێکەوت. ئەرکی گۆڵداماییر لەم سەفەرەدا بریتیبوو لە کۆکردنەوەی پارەو پووڵ بۆ دامەزراندنی هێزێکی چەکداری یەهوودی لە فەلەستین. گۆڵداماییر لەم سەفەرەدا لە شارە گەورەکانی ئەمریکا کە جێگەی نیشتەجێ بوونی یەهودییەکانی ئەمریکا بوو وتاری داو لەیەکێك لەم وتارانەی لە شیکاگۆو لەوەڵامی ئەو کەسانی کە رازی نەبوون دەوڵەتێکی یەهوودی لە فەلەستین دابمەزرێت، گوتی: "ئێوە ناتوانن سەبارەت بەوە بڕیار بدەن کە ئێمە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەهودی شەڕ بکەین یان نا... ئێمە بڕیاری خۆمان داوەو شەڕ دەکەین..." گۆڵدا ماییر لەکۆتایی سەفەرەکەیدا توانی٥٠ میلیۆن دۆلار یارمەتی بۆ یەهوودییەکانی فەلەستین کۆبکاتەوە کە بە پێوانەی ئەوکات پارەیەکی زۆر بوو. بێن گۆریۆن بەم پارەیە یەکەم ڕێکخراوی سەربازی یەهوودی بەناوی "هاگانا"[9] دامەزراند کە بنەمای سوپای ئێستای ئیسرائیلەو چەند ساڵ دواتر لە وتارێکدا لەپوستی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیلدا

9-Haganah





گوتی کە گۆڵدا مایێر بە کۆکردنەوەی ئەم پوولە ڕۆڵی بنەڕەتیی لەدامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل نواند، لەبەرئەوەی کە بە بێچەكو چۆڵو دامەزراندنی هێزێکی چەکداری یەهوودی کە بەم پارەیە دامەزرا، دەوڵەتی ئیسرائیل هەر لە لەسەرەتای هێرشەکانی ولاّتانی عەرەبی لەناو دەچوو. بێن گۆریۆن کە بەسەرۆکی دەوڵەتی نوێیّ ئیسرائیل هەڵبژێردرا بوو، دوای پەسەندکرانی بڕیاری دابەش بوونی فەلەستینو دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەهوودی لەبەشێکی ئەم ولاّتە، گۆڵدامایێری بۆ ئەرکێکی گرینگو نهێنی ناردە ئۆردۆن. دەوڵەتی ئۆردۆن ڕێکوپێکترین هێزی ولاّتانی عەرەبی دراوسێی فەلەستینی لەژێر دەست دابوو کە لەژێر سەرکردایەتی ئەفسەرێکی بریتانیایی بەناوی ژێنراڵ "گلووب"[١٠] یان گلووب پاشا بەڕێوە دەچووو دەیتوانی لەهەموو ولاّتانی عەرەبی زیاتر مەترسی بۆ دەوڵەتی نوێی یەهوود دروست بکات. گۆڵدا مایێر کە جلوبەرگی ژنانی عەرەبی لە بەر کردبوو، سێ جار چاوپێکەوتنی لەگەڵ مەلیك "عبداللە"ی پاشای ئۆردۆن ئەنجام داو هەوڵیدا ئەو لە هێرش کردنە سەر دەوڵەتی نوێی ئیسرائیل کە تازە دامەزرابوو، پاشەگەز بکاتەوە. مەلیك "عبداللە" لە دیانەی یەکەمیدا لەگەڵ گۆڵدا مایێر کەوتە ژێر کاریگەری ئەوو بەڵێنی دا کە هێرش نەکاتە سەر دەوڵەتی نوێی ئیسرائیل، بەلاّم مەرج گەلێکی دانا کە دەبوایە لەچاوپێکەوتنەکانی دواتریان تاوتوێ بکرێ. گۆڵدا مایێر لە چاوپێکەوتنی دووهەمدا بۆی دەرکەوت کە شێوازی ئەو گۆڕاوەو بەرواڵەت دوای ڕاوێژ لەگەڵ بریتانیا یا خود بە لەبەرچاوگرتنی پێگەی خۆی لەنێو ولاّتانی عەرەبی نایهەوێت هیچ بەڵێنێك لە مەڕ هێرش نەکردنە سەر دەوڵەتی نوێی ئیسرائیل قەبووڵ بکات. مەلیك"عبداللە" لە چاوپێکەوتنی سێهەمدا داوای لە گۆڵدا مایێر کرد کە ڕێکەوتی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئیسرائیل وەدوا بخەن. کاتێك کە گۆڵدا مایێر وتی ئەم کارە ناکەین مەلیك "عبداللە" لەولاّمدا گوتی: "ئێوە بۆچی ئەوەندە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەهوودی بەپەلەن؟" گۆڵدا مایێر لە ولاّمدا گوتی: "ئێمە دووهەزار ساڵە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەهوودی خۆمان ڕاگرتووە...دیسان دەڵێن بۆ بە پەلەن؟!

10-Glubb





**گۆڵدامایێرو بێن گۆریۆن، یەکەمین سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل**

دوای دامەزرانی دەوڵەتی ئیسرائیل لەمانگی مەی ساڵی١٩٤٨، دەوڵەتی شوڕەوی کە لەو کاتەدا پێوەندی دۆستانەی لەگەڵ ولاّتانی عەرەبی نەبوو، یەکێك لە یەکەمین ولاّتانێك بوو کە دانی بە دەوڵەتی ئیسرائیل دانا. سەرەڕای ئەوەکە بێن گۆریۆن (یەکەمین سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل) بە ئەمریکاو زایۆنیزمی نێودەوڵەتی وابەستە بوو، بۆ دانانی پێوەندی دۆستانە لەگەڵ شۆڕەویو بۆ پتەوتر کردنی پێگەی دەوڵەتی یەهوودو پێشگرتن لە نزیك بوونەوەی عەرەبو شۆڕەوی، داوای لە گۆڵدا مایێر کرد کە وەك باڵوێزی ئیسرائیل بچێتە شۆڕەوی. گۆڵدا مایێر پێشوازی لەم پێشنیارە کرد، چوونکە جگە لەوەی کە بە ڕەچەڵەك رووسی بووو بەزمانی رووسیش وەك زمانەکانی عیبریو ئینگلیزی قسەی دەکرد، تامەزرۆی ئەوە بوو کە لەنزیکەوە رووسیای دوای شۆڕشی بێلشویکی ببینێتو لەگەڵ چۆنیەتی جێبەجێکرانی بیردۆزەکانی سوسیالیستیو مارکسیستی ئاشنا بێت، لەبەرئەوەی کە خۆشی سوسیالیستو هەواداری کرێکاران بووو بەشی هەرە زۆری تەمەنی لە خەبات لە فێدراسیۆنە کرێکارییەکان بۆ بەدەستهێنانی مافی کرێکاران تێپەڕ کردبوو. لە شۆڕەوی پێشوازییەکی گەرم لەلایەن یەهوودییەکانی ئەم ولاّتە لە گۆڵدا مایێر کرا. یەکێك لەو کەسانەی کە لەڕۆژانی سەرەتای نیشتەجێ بوونی ئەو لەهوتێل ناسیۆناڵی مسکۆ سەردانی کرد، هاوسەرە یەهوودییەکەی





مۆلۆتۆفی وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی شۆڕەوی بوو کە زۆر زوو پێکەوە بوونە دۆستو ئەو پێوەندییەی ئەوان کە تا تەواوبوونی ئەرکی گۆڵدامایێر لە مسکۆ درێژەی کێشا، رۆڵی گرنگی لە پتەوکردنی پێوەندی شۆڕەوی‌و ئیسرائیل‌و هەروەها هاوکاری نەکردنی شۆڕەوی لەگەڵ عەرەبەکان لە یەکەمین سالأنی جێگیر بوونی دەوڵەتی یەهوود گێڕا. بەلاّم گۆڵدامایێر لەو شتانەی کە لە شۆڕەوی دەیبینی پەشۆکاوو نائومید بوو، لەبەرئەوە کە لەکاتی مانەوەی لەشۆڕەوی خۆی بۆ کڕینی خواردەمەنی‌و پۆشاکی پێویست سەردانی دووکانەکانی دەکردو کەم‌و کۆڕی‌و ژیانی پڕ لە چەرمەسەری خەڵکی لەنێزیکەوە هەست پێدەکرد. گۆڵدا مایێر دواتر نووسی کە دووساڵ ژیانی مسکۆ بیروباوەڕی منی بە سوسیالیزم لاواز کردو بە دەرکەوتنی گرفتەکانی جێبەجێکرانی بیرودۆزەکانی سوسیالیزم، بێ ئەوەکە بە گشتی دەست لە بیرو باوەڕم هەڵگرم پێدا چوونەوەیەکم تێدا ئەنجام دا. گۆڵدامایێر لەساڵی ١٩٤٩ گەڕایەوە بۆ ئیسرائیل‌و بێن گۆریۆن ئەوی کردە وەزیری تەندرووستی‌و دابینکردنی کاروباری کۆمەلاّیەتی کابینەکەی. گۆڵدامایێر ماوەی حەوت ساڵ لەسەر ئەم پۆستە مایەوەو بەو پێشینەیەی کە لە فێدراسیۆنی کرێکاری ئیسرائیلدا هەیبوو، توانی پێش بە سەرهەڵدانی مانگرتن‌و شڵەژاوی لە پیشە تازە بنیاتنراوەکانی ئیسرائیل بگرێت. بێن گۆریۆن لەساڵی ١٩٥٦ ئەوی کردە وەزیری دەرەوەی حکوومەت‌و کاتێك ژمارەیەك لە هاوکارانی ئەو سەبارەت بەم هەڵبژاردنە نارەزایەتییان دەربڕی‌و وتیان کە ژن ناتوانێ ئەم کارە بەڕێوە ببات، وتی:"گۆڵدا تەنیا پیاوی حکوومەتی منە". گۆڵدا مایێر نێزیکەی ١٠ ساڵ پۆستی وەزیری دەرەوەی بەڕێوە بردو بەمجۆرەی کە گۆریۆن تێبینی کردبوو، هێزو توانایی خۆی لەم پۆستەدا بەرێکوپێکی وەدەر خست‌و تەنانەت لەگەڵ خودی ئەویش (گۆریۆن) ناکۆکیان لێ پەیدابوو. گۆڵدامایێر دوای دەست کێشانەوەی گۆریۆن لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی لەساڵی ١٩٦٣ توانی پۆستی خۆی لە حکوومەتی دواتر بپارێزێ، بەلاّم لەساڵی١٩٦٦ دەستی لەکار کێشاوەو رێبەرایەتی حیزبی سۆسیالیستی "ماپای"[11] بەدەستەوە گرت. گۆڵدامایێر دوای مردنی"لیڤی ئیشکوول"[12] (سەرۆك وەزیری ئیسرائیل لەساڵی١٩٦٩) کە سکرتێری گشتی حیزبی دەسەلاّتداری ئیسرائیل بوو، بە

11-M apai

12-LeviEshkol



جێنشینی ئاسایی ئەو دەژمێردرا. گۆڵدا مایێر لەکاتی بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك وەزیرانی لەساڵی ١٩٦٩دا ٧١ساڵی تەمەن بوو، بەلاّم چالاکی‌و تواناییەکی سەرسووڕهێنەری بۆ بەڕێوەبردنی‌ئەرکەکانی لە خۆی نیشان دەداو رۆژانە١٦ کاتژمێر کاری دەکرد. ئەو زۆربەی کارەکانی پەیوەست بە پۆستی سەرۆك وەزیرانی لە ماڵی خۆی ئەنجام دەداو هەندێك لە کۆبوونەوەکانی حکومەتی لە چێشتخانەی ماڵەوە بەڕێوە دەبردو هاوکات لەگەڵ بەڕێوەچوونی هەندێك لەم کۆبوونەوانە کە تا شەودرەنگ درێژەی دەکێشا، چێشتی بۆ هاوکارانی درووست دەکردو لەکاتی چێشت لێنانیشدا درێژەی بە وتووێژەکانی دەدا. کاتێك کە گۆڵدا مایێر بوو بە سەرۆك وەزیران، زۆربەی شیکەرەوە سیاسییەکانی رۆژئاوا تێبینی ئەوەیان کرد بوو کە هەندێك نەرم‌و نیای لەسیاسەتی رەق‌و توندنی ئیسرائیل سەبارەت بە ولاّتانی عەرەبی دروست دەبێت. چەند فاکتەرێکی جۆراجۆر بۆ ئەم گەشبینی‌یە هەبوو کە بەرچاوترینیان ژن بوونی سەرۆك وەزیرانی نوێی ئیسرائیل‌و بیرو باوەڕی سوسیالیستی ئەو بوو، بەلاّم گۆڵدا مایێر بە پێچەوانەی هەموو ئەو پێشبینیانە لە پێشینیانی خۆی سەرسەخترو لاسارتر بووو ئامادە نەبوو هەنگاوێك بۆ نێزیکی‌و دیالۆگ لەگەڵ دراوسێ عەرەبەکانی هەڵگرێت. "جمال عبدالناصر"ی سەرۆك کۆماری میسر کە سەرسەخترین دوژمنی ئیسرائیل بە ئەژمار دەهات، ساڵێك دوای هاتنە سەر کاری گۆڵدا مایێر بە سەکتەی دڵ مردو جێنشینەکەی (انور سادات) سیاسەتی ئاشتی خوازانەی سەبارەت بە ئیسرائیل گرتە بەر، بەلاّم گۆڵدا مایێر ئامادە نەبوو نەرم‌و نیانی پتر لە خۆی نیشان بدات. گۆڵدامایێر لە وتووێژێکدا کە لەگەڵ "ئۆریانا-فالاچی"[13]، رۆژنامەوانی ناوداری ئیتالیایی لەنۆڤەمبەری ساڵی ١٩٧٢دا لەماڵی خۆی ئەنجامی دا، هەندێك مەرجی پێشەکیی وەکوو وتووێژی راستەوخۆ لەگەڵ هەرکام لە رێبەرانی عەرەب کە پێش هەر رێکەوتنێك دان بە ئیسرائیل دابنێن، راگەیاندو جگە لەمەش جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە هەرگیز ئامادە نی‌یە سەبارەت بە شاری "بیت المقدس"و بەرزاییەکانی جەولان (گولاّن) سازش بکات. هەروەها بە راشکاوی رایگەیاند کە ئیسرائیل هیچکات ناگەڕێتەوە سەر سنوورەکانی پێش شەڕی ١٩٦٧. ئەم مەرجانە لەمپەرێك بوو لەبەردەم پێشدەستی رێبەرانی عەرەب سەبارەت بە وتووێژ لەگەڵ ئیسرائیل. هەروەها گۆڵدامایێر لەم وتووێژەدا رایگەیاند کە تا

13-O riana Fallaci





تەمەنی ٧٥ساڵی درێژە بە کارەکەی وەك سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل دەداتو لەساڵی ١٩٧٣و دوای ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی پەرلمان دەست لە کار دەکێشێتەوە. ئەو تەنانەت رێکەوتی دەست کێشانەوەی بۆ رۆژنامەوانەکە ئاشکرا کردو وتی: لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٣ بێ سرنجدان بە ئاکامی هەڵبژاردنەکانی پەرلمان دەست لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل دەکێشێتەوە. بەڵام شەڕی بە ناوبانگی "کیپۆر"[١٤] یان شەڕی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٣ کە لەسەرەتاکانی ئەم مانگە روویدا، جێبەجێکردنی ئەم بڕیارەی وەدواخست.



گۆڵدا مایێر

لەکاتی

سەرۆك وەزیرانیدا

---

14-Kippour



ئەنوەر سادات کە لەهەوڵەکانی بۆ بەدەستهێنانی ئیمتیاز لەئسرائیل سەبارەت بە چۆڵکردنی بیابانی سینا هیچ دەرەنجامێکی بەدەست نەهێنا بوو، لەسەرەتاکانی ساڵی ١٩٧٣دا خۆی بۆ دەستپێکردنی شەڕێکی نوێ بۆ وەرگرتنەوەی ناوچە داگیرکراوەکان لە ئیسرائیل ئامادە کرد. ئەنوەر سادات ئەم شەڕەی بە غافڵگیر کردنی ئیسرائیلییەکان لەیەکێك لەجێژنە گرینگەکانی ئایینی یەهوود کە "رۆژی کیپۆر"ی پێدەوترێو لەم جێژنەدا خواردنو خواردنەوەو کارکردن قەدەغەیە، دەست پێکرد. گۆڵدا مایێر لە بیرەوەرییەکانیدا ئەم رۆژە بە تاڵترین رۆژەکانی ژیانی ناودەباتو ئەوەش نەك بەهۆی ئەوەکە غافڵگیر بووە بەڵکوو بەهۆی ئەوە کەلەکاتی خۆیدا بڕیاری نەداوە! بەجۆرەی کە گۆڵدا مایێر باسی دەکات، رووداوەکە بەم شێوەیە بوو کە ئەو رۆژی پێنجەمی ئۆکتۆبەر، واتە رۆژێك پێش هێرشی هێزەکانی میسر لەنێوان هەواڵەکاندا ئەم هەواڵە کورتە دەخوێنێتەوە کە دەوڵەتی شۆڕەوی داوای لە هاوولاتیانی خۆی کردووە کە سووریەو میسر بەجێ بهێڵنو چۆڵکردنی هاوولاتیانی شۆڕەوی لەم ولاتانە دەستی پێکردووە. گۆڵدا مایێر وەبیری دێتەوە کە شۆڕەوی  لەسەرەتای دەستپێکردنی شەڕی ١٩٦٧ی عەرەبو ئیسرائیلیش ئەندامانی خۆی لە سووریەو میسر دەباتە دەرێو دەستبەجێ ئەم بیرە دێتە ناو مێشکییەوە کە رەنگە پیلانێکیتری شەڕ بە دژی ئیسرائیل لە ئارادابێت. گۆڵدا مایێر بە پەلە پێوەندی بە وەزیری بەرگری خۆی بەناوی"مووشیدایان"[١٥] دەگرێتو پەشۆکاوی خۆی سەبارەت بەم بابەتە لەگەڵ باس دەکات. مووشی دایان سەبارەت بەم بابەتە لەگەڵ گۆڵدامایێر هاوبیر نەبووو پێشنیاری ئەو سەبارەت بە راگەیاندنی باری ئامادەباشی سەربازیو بانگهێشتی هێزە پاشەکەوتەکان رەت دەکاتەوە. هەروەها گۆڵدامایێر پێوەندی بە کاربەدەستانی هەواڵگری ئیسرائیلەوە دەگرێتو ئەوانیش دەڵێن ئەم جموجۆ لەسەربازییانەی میسر لە رۆژهەلاتی کەناڵی سویز ئاساییەو هیچ نیشانەیەك بۆ هێرشی میسر نابیندرێت. گۆڵدا مایێر رازی نابێت بەلاّم پەسندکرانی بڕیاری کۆتایی لەسەر پێشنیارەکەی بە کۆبوونەوەی نائاسایی کابینەی حکوومەت دوای رۆژی کیپۆر دەسپێرێ. میسرییەکان لە هەمان شەوی جێژنی کیپۆر کە یەهوودییەکان رۆژووی ٢٤ کاتژمێرەی خۆیان دەست پێدەکەن، هێزەکانیان بۆ کەناری رۆژهەلاتی کەناڵی سویز دەگوازنەوەو لە کۆتایی جێژنی کیپۆردا کە سەربازانی ئیسرائیلی بەهۆی برسێتیو تینوێتی

---

15-Moshe Dayan





بێهێز دەبن، هێرشەکە دەست پێدەکەن. گۆڵدامایێر لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا کە بە شێوەی پەرتووک لەژێر ناوی "ژیانی من"چاپ کراوە، بەم شێوەیە باس لەو رۆژە تاڵەو ئەو هەڵەیەی دەکات: "لەبەرابەر دڵنیایی دەزگاکانی هەواڵگری سەبارەت بەوەی کە هیچ نیشانەیەك لە ئامادەبوونی هێزەکانی میسر بۆ هێرشی سەربازی نەدەبینرا، سووربوونی من بۆ راگەیاندنی بارودۆخی ئامادەباشیو بانگێشتی سەربازە پاشەکەوتەکان نابەجێ دەهاتە بەرچاو، لەکاتێکدا دەبوایە ولاّمی بانگەوازی دڵم دابایەوەو وەکوو زۆر بابەتیتر خۆم سەبارەت بەم بابەتەش بریاری پێویستم پەسند بکردایە..." ئەم کارەساتەی کە لەرۆژی جێژنی کیپۆر روویدا زامێکی کووشندەی لەسەر ورەی من داناو لەگەڵ ئەوەش کە ئیسرائیل توانی لەمەترسی ئەم شەڕەش رزگاری بێت، من ئیتر هەرگیز وەك ژنی پێش شەڕی کیپۆر نابم..." چوار رۆژی سەرەتایی شەڕی کیپۆر کە سەرجەم ١٨ رۆژی خایاند بۆ گۆڵدامایێر وەکوو مۆتەکەیەك وابوو، ئەمەش بە شێوەیەك بوو کە نەیدەتوانی لەم چوار شەوو رۆژەدا بخەوێت. گۆڵدامایێر لە بیرووەرییەکانی خۆیدا ئاماژە بە وردەکارییەکانی ئەم رۆژانە ناکات بەڵام سکرتێرو نهێنی پارێزی ئەو بەناوی "لووکادۆر"[١٦] دواتر بە ژیاننامە نووسی گۆڵدای (سلاتێر)[١٧] وتووە کە "گۆڵدامایێر لەو کاتانەدا رۆژانە چەند جار دەرگای ژوورەکەی لەخۆی دادەخستو دەگریاو جارێکیان بەمنی گوت کە خۆکوشتنم لە قەبووڵکردنی شکستو ملکەچی پێ باشترە". رەشبینی و نەفس نزمی مووشی دایانی وەزیری بەرگری کابینەی گۆڵدا کە دەیهەویست لە رۆژی دوای داگیرسانی شەڕەکە دەست لەکار بکێشێتەوە، ببووە هۆی نائومێدی و دابەزینی ورەی گۆڵدا لە رۆژانی سەرەتایی شەڕەکە، بەلاّم گۆڵدامایێر لە ترسی ئەوە کە دەست لەکار کێشانەوەی ئەو ببێتە هۆی دابەزینی ورەی سەربازانی سووپای ئیسرائیل داواکارییەکەی قبووڵ نەکرد. هاوکات لەگەڵ هێرشی سەربازی میسر لە درێژایی کەناڵی سویزو پەڕینەوەیان لەو کەناڵە کە بە شاکارێکی سەربازی دەژمێردرا، هێزەکانی سووریەش بە درێژایی سنوورەکانی باکووری ئیسرائیل هێرشیان کردو ئیسرائیل لە بارودۆخێکدا لە دوو بەرەوە تووشی شەڕ بوو کە یەك لەسەر چواری هێزەکانی سوپا لە پشوو دابوون. گۆڵدامایێر دەستبەجێ فەرمانی ئامادەباشی گشتیو

16-Lou Kaddar

17-Slater



بانگهێشتنی هێزە پاشەکەوتەکانی دەرکرد، بەلاّم تا کۆبوونەوەو وەرێکەوتنی ئەو هێزانە بۆ بەرەکانی شەڕ، هێزەکانی میسر تا ناوەندی بیابانی سینا پێشڕەوییان کردو سوپای سووریەش بەرزاییەکانی جەولانی کە لە شەڕی ١٩٦٧ لەدەست دابوو لە ئیسرائیلی ئەستاندەوە. گۆڵدامایێر بە پاڕانەوە داوای یارمەتی بەپەلەی لە نیکسۆنی سەرۆك کۆماری ئەوکاتی ئەمریکا کردو هەر بەم هۆیەشەوە گرووپێك لە سێناتۆرو نوێنەرانی کۆنگرەی ئەمریکا داوایان لە نیکسۆن کرد کە راستەوخۆ بۆ یارمەتی ئیسرائیل بچێتە ناو شەڕەوە. نیکسۆن ئەم پێشنیارەی قەبووڵ نەکردو، بەلاّم بە ناردنی یارمەتی بە پەلە لەرێگای ئاسمانیو دەریاییەوەو هەروەها داسەپاندنی گوشاری سیاسی لەسەر ولاّتانی عەرەبی، پێشڕەوی هێزەکانی میسرو سووریەی بۆ ناو خاکی ئیسرائیل راگرت. هێزەکانی ئیسرائیل لە پێنج رۆژی سەرەتای شەڕەکەدا توانیان لەهەر دوو بەرەدا هێرش بکەنە سەر هێزەکانی سووریەو میسرو لەسەرەتای حەوتووی دووهەمی ئەو شەڕەدا توانیان هەندێك سەرکەوتن بەدەست بهێنن. لەشەوی حەڤدەهەمی ئۆکتۆبەردا هێزەکانی ئیسرائیل لە کەناڵی سویز پەڕینەوەو چوونە ناو خاکی میسرو لە ماوەی حەوتوویەکدا توانیان تا ١٠١ کیلۆمەتری شاری قاهیرە پێشڕەوی بکەن. ئیسرائیلییەکان لە بەرەی باکووریشدا دوای وەرگرتنەوەی بەرزاییەکانی جەولان گەیشتنە ٦٠ کیلۆمەتری شاری دیمەشق. لەم قۆناغەدا بووکە بەهۆی گووشاری ئەمریکاو شۆڕەویو هەڵوێستی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پێشڕەوی هێزەکانی ئیسرائیل بۆ دیمەشقو قاهیرە راگیراو لە رۆژی ٢٤ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٣دا یاساو رێساکانی ئاگربەست جێبەجێکرا. شەڕی کیپۆر سەرەتای دەستپێکردنی هەندێك رووداو بوو کە بە وتووێژی راستەوخۆی نێوان ئیسرائیلو میسرو هەروەها سەفەری ئەنوەرسادات بۆ شاری "بيت المقدس"و بەستنی پەیماننامەی ئاشتی لەنێوان میسرو ئیسرائیل کۆتایی پێهاتو سەرجەم ئەم رووداوانە لە بەرژەوەندی ئیسرائیلدا بوو، بەلاّم گۆڵدامایێر تا کۆتایی تەمەنی لەوە کە بۆچی لەکاتی پێویستدا فەرمانی ئامادەباشی گشتی نەداوەو بەم هۆیەوە سوپای ئیسرائیل لەسەرەتاکانی شەڕ شکستی خواردووە، خۆی نەبەخشیو شەش مانگ دواتر دەستی لە کار کێشاوەو چوار ساڵی پاشماوەی ژیانی خەریکی نووسینی بیرەوەریو سەفەر بوو. گۆڵدامایێر لە بیرەوەرییەکانیدا





ئاماژە بە منداڵو نەوەکانی دەکاتو ناوی پێنج نەوەی هێناوەو باسی شەشەمیان ناکات. بەڵام دوکتور "پیەر رێنچنیك"[18] لەپەرتووکی بیرەوەرییەکانی خۆیدا لەژێر ناوی "مێژووسازانی نەخۆش" نووسیویەتی، گۆڵدامایێر نەوەیەکی دواکەوتووی مێشکی هەبوو کە تووشی نەخۆشی"مۆنگۆلیدا"[19] یان نەخۆشی مەنگۆلیا بووەو لەکاتی مردنی گۆڵدامایێردا ٢٢ ساڵی تەمەن بووە. دوکتور رێنچنیك کە گۆڵدامایێری بە ژنێکی دڵرەقو بێسۆز ناساندوە دەنووسێ: "گۆڵدامایێر لەتەواوی ژیانی خۆیدا تەنانەت جارێك ئامادە نەبوو نەوە نەخۆشەکەی ببینێتو حاشای لەبوونی ئەو کردووە". هەروەها دوکتور رێنچنیك لە پەرتووکەکەیدا دەنووسێ کە گۆڵدامایێر لەتەمەنی ٧٠ساڵیدا تووشی جۆرێك شێرپەنجەی "لێنفاوی"[20] بووە کە بەخواردنی دەواو دەرمانو چارەسەری کیمیایی ئەو نەخۆشییەی کۆنترۆڵ دەکرد. ئەو لەکاتی گەیشتن بە پۆستی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیلیش ئەو نەخۆشییەی بووە بەڵام ئاشکرای نەکردووەو نەخۆشییەکەی بە "نهێنییەکی نێو دەوڵەتی" دادەندرا. دوکتور رێنچنیك لەو باوەڕەدایە کە ئاسەواری خواردنی



**گۆڵدامایێر لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا**

18-Pierre Rentchnick

19-Monholide

20-Lymphatic



دەرمانە دژە شێرپەنجەکان لە فاکتەرەکانیتر لەمەڕ بێئیرادەییو بێبڕیاری ئەو لەکاتی شەڕی کیپۆر کاریگەرتر بووەو دەست کێشانەوەشی لەپۆستی سەرۆك وەزیرانی بەهۆی ئەم نەخۆشییەوە بووە. گۆڵدا مایێر لە وتووێژێکدا لەگەڵ "ئۆریانا-فالاچی"، ژنە رۆژنامەوانی ئیتالیایی کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، وتبووی ئاواتی ئەوەیە بمرێت پێش ئەوەکە پیر بێت. گۆڵدامایێر لەم وتووێژەدا وتبووی کە لە نەخۆشییە دەروونییەکانی پیری زیاتر دەترسێ تا لە نەخۆشییە جەستەییەکانی، لەبەرئەوەی کە دەترسا لەتەمەنی پیریدا ساغی وسلامەتی بیری لەدەست بداتو مردنی ناوەختی بە ئەقڵی ساغەوە لەتەمەنی درێژ بە بیری نقوستانەوە پێباشتر بوو. ئەو بەم ئاواتەی خۆی گەیشتو تا پێش مردنیشی هەر وەك سیاسەتوانێکی بەرچاوو لێهاتوو رێزی لێدەگیراو دوای مردنیشی یەهوودییەکانی سەرانسەری جیهان وەك "دایەگەورەی ئیسرائیل" رێزیان لێنا. لە لێکدانەوەیەکی کۆتایی لەسەر کەسایەتی ئەم دایەگەورەیەی ئیسرائیل پێویستە بوترێت کە بێگومان ئەو یەکێك لە بێبەزەییو تووڕەترین ژنانی ناوداری جیهانەو دەمارگرژی ئەو سەبارەت بە زایۆنیزم باشترین شایەتی ئەم بۆچوونەیە. ئەو لە وتارو وتووێژە جۆراوجۆرەکانیدا لەسەر کێشەی فەلەستین هەموو کات نکۆڵیی لەهەبوونی ناسنامەی ئەم نەتەوەیە کردووە. بەم ئەقڵییەتەوە پاساوی سیاسەتە شۆڤینییەکانی حکوومەتەکەیو پێشبینیانو داهاتووی سەبارەت بە فەلەستینییەکان دەهێنێتەوەکە بەهۆی ئەوەی فەلەستینییەکان دەیانهەوێت ئێمە بنبڕ بکەن ئێمەش مافی لەناو بردنی ئەوانمان هەیە!. گۆڵدامایێر تەنەت بەرەشبینییەوە دەیڕوانییە رێکەوتنی ساداتو بێگینو تا کۆتایی تەمەنی پێی وانەبوو کە ئاشتی راستەقینە لەنێوان ئیسرائیل‌و عەرەبەکاندا سەقامگیر دەبێت.





# ژنێک کە درێژترین ماوەی سەرۆک وەزیرانی بریتانیای لە سەدەی بیستەمدا تۆمار کرد

مارگرێت تاچێر[1] یەکەمین سەرۆک وەزیرانی ژنی بریتانیاو ئەوروپایە کە لەمانگی مەی ساڵی١٩٨٩دا دەیەمین ساڵی سەرۆک وەزیرانی خۆی تێپەڕ کردو بەم شێوەیە درێژترین ماوەی تۆمارکراوی سەرک وەزیرانی بریتانیای لەسەدەی بیستەمدا شکاند. مارگرێت تاچێر کە نازناوی ژنی ئاسنینی بریتانیای وەرگرتووە بە باوەڕی زۆربەی بریتانیاییەکان یەکێک لە بەهێزترین‌و مکوڕترین دەسلاتدارانی بریتانیایەو لەراپرسییەکی گشتیدا لە بریتانیا، زۆربەی ئەو کەسانەی کە پرسیاریان لێکرا بوو ئەوەیان لە هەندێک بواردا لەچێرچیل بەتواناتر دەزانی. لە راپرسییەکی کە لە رەوتی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨٨ی ئەمریکا ئەنجام درا، زۆربەی هەرەزۆری ئەمریکاییەکان رایانگەیاند کە ئەگەر مارگرێت تاچێر ئەمریکایی بوایە، ئەویان بە جێگای دوو پاڵێوراوەکەی حیزبی کۆماریخوازو دێمۆکرات هەڵدەبژاردو هەر بەم هۆیەشەوە مارگرێت تاچێر بە سانایی دەیتوانی پۆستی سەرۆک کۆماری ئەمریکا بەدەست بێنێ! ژنی ئاسنینی بریتانیا کە ناوی "مارگرێت هیلدا رۆبێرتس"[2]ە لەساڵی ١٩٢٥ لەبنەماڵەیەکی مام ناوەندی بریتانیایی لە شارۆچکەی "گرانتهام"[3] لە ١٦٠ کیلۆمەتری باکووری شاری لەندەن چاوی بەدونیا هەڵێنا. باوکی مارگرێت (ئالفرێد رۆبێرش)[4] کە کوڕی پینەچییەک بوو، دووکانێکی بچوکی لە شارۆچکەکەیان بووو مارگرێت‌و خوشکە گەورەکەی (مۆریل)[5] لە خانوویەکی دوو ژووری لە نهۆمی سەرەوەی ئەم دووکانە ژیانیان بەسەردەبرد. ئالفرێد رۆبێرتس پێڕەوی رێبازی مەزهەبی "میتۆدیست"[6] بوو کە پەلێک لەمەزهەبی بریتانیایەو منداڵەکانی بەپێی بنەماکانی ئەو مەزهەبە کە رێکوپێکی‌و رێسایەکی تایبەتی لە کاردا دروست دەکات پەروەردە دەکرد.

1-Margaret Thatcher
2-Margaret Hilda Roberts
3-Grantham
4-Alfred Roberts
5-Muriel
6-Methodist





مارگرێت تاچیر لەسەرەتای سەرۆک وەزیری خۆیدا

باوکی مارگرێت یەکێک لەلایەنگرە دەمارگرژەکانی حیزبی "پارێزگاران"و بەرهەڵستکاری سەرسەختی حیزبی کرێکار بووو مارگرێت تاچێر لە منداڵییەوە لەگەڵ باسی سیاسی لە ماڵەوەو دووکانی بابی ئاشنا ببوو. ئالفرێد رۆبێرتس لە هەڵبژاردنی شارەوانی‌یەکانی بریتانیا لەلایەن حیزبی پارێزگارانەوە خۆی بۆ ئەندامی ئەنجومەنی شاری گرانتهام پالاوت‌و دوای سەرکەوتن لەم هەڵبژاردنانەدا پۆستی سەرۆکی شارەوانی گرانتهامی بەدەست هێنا، بەڵام بە سەرکەوتنی حیزبی کرێکاران لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٢ لەسەرکار لابردراو مارگرێت تاچێر ئێستاش خەم‌و پەژارەی باوکی لەم شکستەدا لەبیرە. مارگرێت تاچێر قوتابییەکی زۆر رێکوپێک‌و ژیر بووو وەڵامی هەموو پرسیارەکانی مامۆستای دەزانی. ئەو لەتەمەنی ٩ ساڵیدا لە کێبڕکێیەکانی هۆنراوە بێژی خەڵاتی یەکەمی بەدەست هێناو کاتێک سەرۆکی قوتابخانە هاوکات لەگەڵ پێدانی خەلاتەکەی وتی کە شانست هێناوە لەنێوان قوتابییەکانی پۆلی بەرزتر سەرکەوتنت بەدەست هێنا، مارگرێت تاچێر بە وردبینی‌یەکی تایبەتەوە وتی: "بەڕێز، سەرۆکی قوتابخانە من شانسم نەهێنا بەڵکوو شیاوی ئەم خەلاتە بووم!". مارگرێت دوای تەواوکردنی قۆناغەکانی سەرەتایی‌و ناوەندی لە گرانتهام، رۆیشتە زانکۆی ئۆکسفۆردو لەبەشی کیمیا





درێژەی بەخوێندندا. ئەو هۆگرییەکی تایبەتی بەم بەشە نەبوو بەڵام ئەم بەشەی لەبەرئەوە هەڵبژارد بوو کە دەیتوانی دوای تەواوکردنی خوێندن کارێکی باش پەیدا بکات. لەم کاتەدا زانکۆی ئۆکسفۆرد گۆڕەپانی چالاکی سیاسی بوو لەنێوان هەوادارانی حیزبی پارێزگاران‌و لاینگرانی حیزبی کرێکاران کە تازە لە یەکەمین هەڵبژارنەکانی دوای شەڕ سەرکەوتبوو. مارگرێت تاچێریش کە لەژێر کاریگەری بیروباوەڕی باوکیدا هەواداری حیزبی پارێزگاران بوو، پەیوەندی بە ئەنجوومەنی لایەنگرانی حیزبی پارێزگارانی زانکۆوە گرت‌و بەهۆی چالاکی زۆرو بەردەوام توانی لەساڵی ١٩٤٦دا وەك سەرۆکی ئەو ئەنجوومەنە هەڵبژێردرێت. مارگرێت تاچێر لەو کاتەدا کچێکی جوان‌و ناسك بوو، بەڵام بە پێچەوانەی زۆربەی کچانی هاوتەمەنی دڵداری نەبووو هەمووی کاتە بەتاڵەکانی بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی ئەنجومەنی خوێندکارانی پارێزگار تەرخان دەکرد. مارگرێت تاچێر دوای تەواوکردنی خوێندن لە بەشی کیمیای زانکۆی ئۆکسفۆرد، لە کارخانەیەکی پەلاستیك سازی دەستی بەکار کرد. زۆربەی کارمەندان‌و کرێکارانی ئەم کارخانەیە لایەنگری حیزبی کرێکاران بوون، بەڵام مارگرێت لە دمەتەقێ‌و راوێژ لەگەڵ ئەوان ماندوو نەدەبووو لە ماوەی ٣ ساڵ کارکردن لەم کارخانەیەدا توانی ژمارەیەکیان بۆ لای حیزبی پارێزگاران رابکێشێ. هەوڵ‌و تێکۆشانی مارگرێت تاچێر لە حیزبی پارێزگاران بووە هۆی ئەوە کە لەنێوان ئەندامانی ناوچەیی ئەم حیزبە ناوبانگ‌و رێزی تایبەت بەدەست بهێنێ‌و حیزبی پارێزگاران لەساڵی١٩٥٠دا ئەویان بۆ پالێوراوی نوێنەرایەتی پەرلمان لەبنکەی هەڵبژاردنی "دارتفۆرد"[7] لەباشوری لەندەن هەڵبژارد. مارگرێت رۆبێرتس لەتەمەنی ٢٥ ساڵیدا گەنجترین پالێوراوی حیزبی پارێزگاران لەهەڵبژاردنەکانی پەرلمان بوو، بەڵام سەرکەوتنی ئەو لەم پێشبڕکێیەدا دوور دەهاتە بەرچاو، لەبەرئەوە کە دارتفۆرد ناوەندێکی کرێکاری‌و ناوچەی دەسەلآت‌و کارتێکەری حیزبی کرێکاران بوو و لە ٢٠ ساڵ لەمەوبەرەوە کورسی نوێنەرایەتی ئەم ناوچەیەی بەدەستەوە بوو. مارگرێت رۆبێرتس لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٠دا شکستی لە رکەبەرەکەی خوارد، بەڵام لەرەوتی پێشبڕکێیەکانی ئەم هەڵبژاردنانەدا لەگەڵ پیاوێك بەناوی "دێنیس تاچێر"[8] ئاشنا بوو و دواتر زەماوەندی لەگەڵ کرد. دێنیس تاچێر خاوەنی کارخانەیەکی

---

7-Darfrord

8-Denis Thatcher



رەنگسازی‌و یەکێك لەلایەنگرە دەمارگرژەکانی حیزبی پارێزگاران بوو کە لەدابینکردنی خەرجی پێشبڕکێیەکانی هەڵبژاردنی مارگرێت بەشداری کرد بوو. دێنیس تاچێر کە لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا ئەفسەری تۆپخانە بووو لەبەرەی شەڕی فرانسەو ئیتالیا بە پلەی سەرگوردی خزمەتی دەکرد، پێشتر زەماوەندی کرد بوو، بەڵام لەگەڵ هاوسەری بەهۆی نەسازان‌و یەك نەگرتنەوەی هەلسوکەوتیان لە یەکتر جیاببوونەوە.

دێنیس تاچێر دوای هەرس هێنانی مارگرێت لە هەڵبژاردنەکاندا پێشنیاری زەماوەندی پێکرد، بەڵام مارگرێت تاچێر قەبوولی ئەم پێشنیارەی لەبەر هەلسوکەوت‌و راوێژو ناسیاری زیاتر ئەو وەدواخست. دێنیس تاچێر ١٠ساڵ لە مارگرێت رۆبێرتس گەورەتر بوو، بەڵام لە ئاکامدا مارگرێت پێشنیارەکەی قەبووڵ کردو لەساڵی ١٩٥١دا زەماوەندیان کرد. مارگرێت رۆبێرتس کە ئیتر بەناوی مارگرێت تاچێر باسی دەکەیەن، دوای زەماوەند جارێکی‌تر لەلایەن حیزبی پارێزگارانەوە بوو بە پالێوراوی دارتفۆرد، بەڵام دیسان نەیتوانی بەسەر رکەبەرەکەی سەرکەوێت. مارگرێت تاچێر دوای ئەم شکستە بڕیاریدا تا ماوەیەك خەیاڵی نوێنەری پەرلمان لەبیر خۆی بباتەوەو خەریکی ماڵداری بێت. مارگرێت لەساڵی ١٩٥٣کوڕو کچێکی جمکی بووو پاشان لە بەشی ماف درێژەی بە خوێندن داو دوای سەرکەوتن لەم بەشە دەستی بەکاری پارێزەری دادگا کردو لە بەشی باج‌و تۆماری کۆمپانیاکان پسپۆڕی بەدەست هێنا.

مارگرێت لەساڵی ١٩٥٨دا جارێکی‌تر رۆڵی گرینگتری لەحیزبی پارێزگاران بە ئەستۆ گرت‌و لەساڵی ١٩٥٩دا لە بنکەی هەڵبژاردنی "فینچلی"[9] لە دەوروبەری شاری لەندەن بوو بە پالێوراوی نوێنەری پەرلمان‌و ئەمجارەیان بە زۆرینەی دەنگ بە سەر رکەبەرەکەی لەحیزبی کرێکاران سەرکەوت‌و بۆ یەکەمین جار لەتەمەنی ٣٤ساڵیدا رۆیشتە پەرلمان. جگەلە وتارو دەربڕینی بەهێزی خودی مارگرێت تاچێر لەم پێشبڕکێیەدا، هۆکارێکی‌تری سەرکەوتنی ئەو بریتی بوولە دەست ئاواڵە بوونی هاوسەری لە دابینکردنی خەرجییەکانی پڕۆپاگەندەی هەڵبژاردنی ئەو کە بەبێ قسوری دابینی دەکرد. مارگرێت تاچێر لەو رۆژەوە کە چووە ناو پەرلمان بەهۆی بەشداری لە باس‌و دمەقالییەکانی پەرلمان‌و وتنی چەند وتاری پڕدەنگ‌و پەنگ سەرنجی هەمووانی بۆ لای خۆی راکێشاوو بە خێرایی بووە بەرچاوترین‌و ناودارترین پەرلمانتاری

---

9-Finchley





ژن. ئەو یەکێك لە نەیارانی دەمارگرژی حکومەتی کرێکاری "هارۆڵد-ویلسۆن"[10] بووو بەتووندی رەخنەی لەسەر سیاسەتەکانی باجو پرۆگرامە سوسیالیستەکانی ئەو دەگرت. جارێکیان یەکێك لەوەزیرانی حکومەتی ویلسۆن هاوکات لەگەڵ ولاّمدانەوەی قسەکانی مارگرێت، وتی کە ژن نابێت خۆ لە هەموو کاروبارێکی حکومەتەوە هەڵقوتێنێ، تاچێریش وتەیەکی "سۆفۆلکیس"[11]ی (بیرمەندو درامانووسی ناوداری یونانی) گێڕاوە کە وتبووی: " کاتێك ژنو پیاو لەهەڵکەوتو پێگەیەکی یەکسان دابن ژن سەرکەوتووترە".



**چوار دیمەن لە ژیانی مارگرێت تاچێر:لەگەڵ خوشکە گەورەکەی (مۆریل) لەکاتی منداڵی – لەگەڵ دایكو باوکی لەسەردەمی خوێندن-لەگەڵ هاوسەری-لەگەڵ منداڵە جمکەکانی.**

10-Harold Wilson

11-Sophocles



مارگرێت تاچێر لەساڵی ١٩٦٧دا بوو بە ئەندامی "کابینەی سێبەری"[12] حیزبی پارێزگارانو لەم کابینەیەدا پۆستی وەزیری نیشتەجێ‌و گواستنەوەو وەزیری پەروەردەو فێرکردنی وەئەستۆ گرت. دوای سەرکەوتنی حیزبی پارێزگاران لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی١٩٧٠دا سەرۆك وەزیرانی نوێی بریتانیا لەحیزبی پارێزگاران (ئیدواردهێت)[13] مارگرێتی بۆ دواین پۆستی خۆی لەکابینەی سێبەردا، واتە پۆستی وەزیری پەروەردەو فێرکردن هەڵبژارد. مارگرێت تاچێر لە بەڕیوەبردنی کاروباری پەروەردەو راهێنان تواناییەکی زۆری لە خۆی نیشان دا، بەلاّم یەکێك لە بڕیارەکانی ئەو لەمەڕ بڕینی بەشە شیری قوتابخانە سەرەتاییەکان بۆ دابینکردنی خەرجی وەزارەتەکانیتر، ناکۆکیو دژایەتی زۆری لێکەوتەوەو ئەو درووشمە بە نێوبانگەی کە ئەو کات کەوتە سەرزمان بریتیبوو لە "میسیز تاچێر، مێلك ئیسناچێر"[14] کە مانای "خاتوو تاچێر، دزی شیر"ی دەدا. لەساڵی ١٩٧٤و دوابەدوای مانگرتنی کرێکاران کە ئابووری بریتانیای فەلەج کردبوو، حیزبی کرێکاران سەرکەوتو جارێکیتر هارۆڵد ویلسون پۆستی سەرۆك وەزیرانی بریتانیای بەدەستەوە گرت. پێگەی ئیدوارد هێتیش دوابەدوای سەرنەکەوتنی حیزبی پارێزگاران کەوتە بەر مەترسیو مارگرێت تاچێر یەکێك لەو کەسانە بوو کە دژایەتی دەکرد.



**مارگرێت تاچێرو ئیدوارد هێتی سەرۆك وەزیرانی پێشووی بریتانیا**

١٢. کابینەی سێبەر (Shadow Cabinet) لەئەندامانی حیزبە کەمایەتییەکان پێك دێت

13-Edward Heath

14-Mrs.Thathcher,Milk snatcher

مارگرێت تاچێر کە لەکۆتاییەکانی حکوومەتی هێت داو پێش شکستی حیزبی پارێزگاران لە هەڵبژاردنەکان ناکۆکی لەگەڵ ئەو پەیدا کردبوو، ئەوەی بە بێ‌سیاسەت‌و ناشیاوو بێ‌بڕیاری تۆمەتبار دەکردو ئەوەی بە شایستەی ڕێبەری حیزبی پارێزگاران نەدەزانی. پێش دەستپێکردنی کۆنفرانسی حیزبی پارێزگاران لەفێورییەی ساڵی ١٩٧٥، ســێ کەس پاڵێوراوی جێنشینی ئیدوارد بۆ پلەی ڕێبەری حیزب بوون‌و خۆشی ئامادە نەبوو دەست لەکارەکەی بکێشێتەوە. ئیدوارد کە هەستی دەکرد زۆربەی ئەندامانی کۆنفرانس دەنگی نادەنێ، لەکاتی دەستپێکردنی کۆنفرانسە حیزبییەکان خۆی نەپالاوت و بەدەست کێشانەوەی دوو پاڵێوراوەکەی‌تری باڵی راستی حیزب، ســەرکەوتنی پاڵێوراوی سێهەم بەناوی "ویلیام وایت لاو"[15] لە قۆڵی میانەڕەوی حیزب مسۆگەر بوو. کە مارگرێت تاچێر لەو کاتەدا بوو هاتە نیو گۆڕەپانەوەو خۆی بۆ بەدەسیتهێنانی پۆستی ڕێبەری حیزب پالاوت. وتاربێژی ئەو لە کۆنفرانسە حیزبییەکان کە پاڵێوراوی خۆشی تێدا ڕاگەیاند، هەموانی خستە ژێر کاریگەری وتەکانی. مارگرێت تاچێر جگە لە وتاربێژی‌و دەربڕینی بەهێز، پرۆگرامێکی نوێی بۆ حیزبی پارێزگاران ئامادە کردبوو کەبە وتەی ئەو سەرکەوتنی حیزبەکەیانی لە هەڵبژاردنەکانی دواتری بەریتانیا مسۆگەر دەکرد. کۆنفرانسی پارتی پارێزگاران لە ڕۆژی یازدەهەمی فیۆرییەی ساڵی ١٩٧٥دا بە ١٤٦ دەنگ لەبەرانبەر ٧٩ دەنگ مارگرێت تاچێری بەڕێبەری حیزب هەڵبژارد. ئەمە یەکەمین جاربوو لەمێژوودا ژنێك ڕێبەرایەتی حیزبی سەرەکی بریتانیا وەئەستۆ دەگرێت. دژکردەوەی ڕای گشتی گەلی بەریتانیا لەمەڕ هەڵبژاردنی مارگرێت تاچێر بۆ ڕێبەری حیزبی پارێزگاران جیاواز بوو، لەکاتێکدا کە ڕۆژنامەمەکانی  سەربە حیزبی پارێزگاران توانایی‌و لێهاتوی ئەویان ستایش دەکرد، ڕۆژنامەکانی سەربەخۆو سەربە حیزبی کرێکاران بە ئاماژەکردن بەو ئاژاوەیەی کە لەکاتی وەزیری پەروەردەو فێرکرن دروستی کربوو، سەرکەوتنی ئەویان لە پۆستی ڕێبەری حیزبی پارێزگاران بەدوور دەزانی. هەرچەندە ئەم بابەتە بەڕاشکاوی نەدەوترا، بەلاّم بەهۆی ئەو رەخنانەی کە لەحیزبی پارێزگاران سەبارەت بە هەڵبژاردنی مارگرێت تاچێر دەگیرا، ژن بوونی ئەویان بە خاڵی لاوازی ئەم هەڵبژاردنە دادەنا. وردە وردە ئەم شێوە بیرکردنەوەیە سەبارەت بە مارگرێت تاچێر گـۆڕاو خاتوو تاچێر لە بەرەوروو بوونەوەی هارۆڵد ویلسۆنی سەرۆك وەزیرانی بریتانیاو لەپۆستی ڕێبەرایەتی حیزبی بەرهەڵستکاری دەوڵەتدا نیشانی دا کە لەخەباتدا زۆر

---

15-William Whitelaw



سەختکۆش‌و ماندوو نەناسە. هارۆڵد ویلسۆن لەمانگی مارسی ساڵی ١٩٧٦دا بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو دەستی لەکار کێشاوەو وەزیری دەرەوەی کابینەکەی بەناوی "جیمز کالاهان"[16] بۆ جێنشینی ئەو هەڵبژێردرا. گیروگرفتە ناوخۆیی‌و دەرەکییەکانی بریتانیا لەسەردەمی کالاهان دەرفەتێکی باشی بۆ خەبات بەدژی حکومەتی کرێکاری‌دا بەدەست مارگرێت تاچێر. دمەقاڵەی توندو بەردەوامی مارگرێت تاچێر لەگەڵ سەرۆك وەزیران لە کۆبوونەوەکانی پەرلماندا بابەتی هەمیشەیی‌و ڕۆژانەی چاپەمەنی‌و راگەیێنە گشتییەکانی بریتانیا بوو. مارگرێت تاچێر لەساڵی ١٩٧٨دا بۆ وڵاّتانی جۆراوجۆر سەفەری کردو توانایی‌و لێهاتوویی خۆی وەك سیاسەتوانێك لەکاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ رێبەرانی ئەو وڵاّتانەدا سەلماند. یەکێك لەم سەفەرانەی کە لەکۆتایی ئاپریلی ساڵی ١٩٧٨دا (بانەمەری ساڵی ١٣٥٧ی ك .ه) ئەنجام درا، سەفەر بۆ ئێران‌و چاوپێکەوتن لەگەڵ مەحمەد رەزا شاو فەرەح بوو. لەو کاتەدا هێشتا شۆڕشی ئێران رووی نەدابوو و مارگرێت تاچێر لە وتووێژێکی ڕۆژنامەوانیدا لە تاران پێشتیوانی خۆی بۆ ڕێژیمی پاشایەتی راگەیاند.



**مارگرێت تاچێر لەگەڵ هاوسەرو منداڵەکانی**

---

16-James Callaghan





حیزبی پارێزگارانی بریتانیا لە هەڵبژاردنەکانی مانگی مەیی ساڵی ١٩٧٩ی بریتانیا بە ڕێبەری مارگرێت تاچێر بە زۆرینەی دەنگ بەسەر حیزبی کرێکاران سەرکەوتو بۆ یەکەمین جار لە مێژووی بریتانیادا ژنێك بەپۆستی سەرۆك وەزیری ئەو وڵاتە گەیشت. مارگرێت تاچێر لەگەڵ هاوسەری کە ئیتر بەناوی "بۆس"[17] واتە سەرۆك بانگی دەکرد، ڕۆیشتە کۆشکی پاشایەتی بریتانیاو بڕیاری سەرۆك وەزیرانیو ئەرکی دامەزراندنی کابینەی حکوومەتی لە مەلیکە ئێلیزابێتی دووهەم وەرگرت. مارگرێت تاچێر ڕۆژی دواتر ناوی ئەندامانی کابینە٢٢ کەسییەکی ڕاگەیاند. لەو کابینەیەدا لێهاتووترینو شارەزاترین ئەندامانی حیزبی پارێزگاران بەشدارییان کرد کە ژمارەیەکیان لە رابردوودا لەگەڵ هەڵبژاردنی مارگرێت بۆ ڕێبەری حیزب دژایەتییان کردبوو و ویلیام وایت لاوی رکەبەری سەرەکی ئەو لەکاتی هەڵبژاردنەکانی ڕێبەری حیزب یەکێك لەو ئەندامانە بوو. وایت لاو لەکابینەی حکوومەتی مارگرێت دا پۆستی جێگری سەرۆك وەزیرانو وەزیری دەوڵەتی وەرگرت.



**مارگرێت تاچێرو هاوسەری لەبەرامبەر بارەگای سەرۆك وەزیرانی بریتانیا**

17-The Boss



لۆرد کارینگتۆن[18] (سیاسەتوانی کارامەی بریتانیا) پۆستی وەزیری دەرەوەی وەئەستۆ گرتو سێر جێفری هاو[19] بۆ پۆستی مۆرەداری پاشایەتی هەڵبژێردرا کە هەمان وەزیری ئابووریو دارایی بووو فرانسیس پیم[20] پۆستی وەزیری بەرگری پێئەسپێردرا. خاتوو "ساڵی ئۆپێن هیم"[21] تەنیا ژنی کابینەی مارگرێت تاچێر (جگە لەخۆی) بوو کە پۆستی وەزارەتخانەی دەرەجە دووهەمی (کاروباری بەکاربەران) وەئەستۆ گرت. مارگرێت تاچێر دوای ناساندنی ئەندامانی کابینەکەی، ژمارەیەك لە ڕۆژنامەوانانو فیلمبەردارانی تەلەفزیۆنی بۆ وتووێژ لە بینایەی ژمارە١٠ی داونینگ ئێستریت[22] وەرگرت کە جێگای نیشتەجێ بوونی سەرۆك وەزیران بوو. یەکێك لە هەواڵنەرەکان دیواری ژووری کۆبوونەوەکانی کابینەی پێشان دا کە بە وێنەی سەرۆك وەزیرەکانی بریتانیا لە "ویلیام پیت"[23] ەوە تا کالاهان ڕازابۆوەو گووتی: دەڵێی جێگایەك بۆ ئێوە نەماوەتەوە. مارگرێت تاچێر بە گاڵتە وتی:"نیگەران مەبە من وێنەی هەموویان دەهێنمە خوارێ!". خاتوو تاچێر لە یەکەمین ڕۆژی سەرۆك وەزیرانی خۆیدا یەکێك لە بەڵێنەکانی خۆی سەبارەت بە زۆر کردنی بوودجەی پۆلیس بە بڕی سەد میلیۆن پۆند بە مەبەستی پترکردنی مووچەی ئەندامانی پۆلیس جێبەجێکرد. دووهەمین فەرمانی ئەو لەسەرەتای دەستپێکردنی پۆستی سەرۆك وەزیرانی ئەوە بوو کە مووچەی کادیرەکانی هێزی چەکداریی تا ئاستی مووچەی کارمەندانی مەدەنی بەرز کردەوە. بەڵام خانمی تاچێر لەگەڵ ئەو هەموو دەست ئاواڵەییە لە پترکردنی مووچەی ئەندامانی هێزی سەربازیو ئاسایش، لەئاست داواکاری فێدراسیۆنە کرێکارییەکان کە مووچەی زۆرتریان بۆ درێژەپێدانی چالاکییەکانیان دەویست خۆڕاگری کرد. هەروەك مارگرێت تاچێر لەکاتی پێشبڕکێیەکانی هەڵبژاردندا بەڵێنی دابوو، کەمکردنەوەی باج لەسەر داهاتو بەرنگار بوونەوەی قەیرانی ئابووریی لەسەروەی پڕۆگرامەکانی داناو بۆ قەرەبوو کردنەوەی دابەزینی داهاتی دەوڵەت، ڕێژەی باج لەسەر نرخی زیاد کراوی کەلو پەلی بە کار

18-Lord Carrington
19-Sir Geoffrey Howe
20-Francis Pym
21-Sally Oppenheim
22-Downing Street
23-william Pitt





هاتووی له ٨ تا ١٥ له‌سه‌ر ١٠٠ به‌رز کرده‌وه. به‌هۆی ئه‌م پڕۆگرامه گوشاری باج له‌سه‌ر چینی مووچه‌خۆرو که‌م داهاتی کۆمه‌ڵگا بۆ خاوه‌ن داهاته زۆره‌کانو ئه‌و که‌سانه گواسترایه‌وه که توانایی کڕینیان زۆرتر بوو.

***

**مارگرێت تاچێرو کارتێر، سه‌رۆك کۆماری پێشووی ئه‌مریکا**

مارگرێت تاچێر سێ مانگ دوای شۆڕشی ئیسلامی ئێران بوو به سه‌رۆك وه‌زیرانو یه‌کێك له‌سه‌ره‌تاییترین بابه‌ته‌کانی په‌یوه‌ست به سیاسه‌تی ده‌ره‌وه بریتی بوو له‌دانانی ڕێبازی گشتی سیاستی بریتانیا له‌ئاست حکومه‌تی نوێی ئێران. هه‌ر وه‌ك پێشتر ئاماژه‌ی پێکرا، خانمی تاچێر له‌کاتی ڕێبه‌ری حیزبو ساڵێك پێش ئه‌وه‌ی ببێته سه‌رۆك وه‌زیرانی بریتانیا، بۆ ئێران سه‌فه‌ری کردبووو به‌ڵێنی به محه‌مه‌د ڕه‌زا شاو فه‌راح دابوو که ئه‌گه‌ر بتوانێ له هه‌ڵبژاردنه‌کانی ساڵی ١٩٧٩دا سه‌رکه‌وێ ئه‌وه پشتیوانی له‌ڕژێمی شا ده‌کات. ڕژێمی پاشایه‌تی ئێران له ڕه‌وتی هه‌ڵبژاردنه‌کانی سه‌رۆك وه‌زیرانی بریتانیا ڕوخاو بابه‌تی په‌نابه‌ری محه‌مه‌د ڕه‌زا شا بۆ ئه‌مریکا یان یه‌کێك له ولاته‌کانی ئه‌ورووپا وه‌ك بابه‌تێکی گه‌رمو به‌رچاوی ڕۆژانه‌ی ڕۆژنامه‌کانو کۆڕوکۆبوونه‌وه نێوده‌وڵه‌تییه‌کانی لێهات. "ویلیام شاوکرۆس"[24]، نووسه‌ری به‌ناوبانگی بریتانیایی له‌م دواییانه‌دا په‌رتووکێکی له‌ژێر ناوی "دوایین سه‌فه‌ری شا"[25] نووسیوه‌و له‌م په‌رتووکه‌دا ڕۆژه کۆتاییه‌کانی

24-William Shawcross

25-The Shah's Last Ride



پاشایه‌تی‌و ژیانی پاشای ئێران له تاراوگه ڕوون ده‌کاته‌وه‌و ئاماژه به ڕۆڵی خانمی تاچێر له‌م میانه‌دا ده‌کات‌و ده‌نووسێ که‌خانمی تاچێر له ڕه‌وتی پێشبڕکێیه‌کانی هه‌ڵبژاردن و حه‌وتوویه‌ك به‌ر له‌وه‌ی ببێته سه‌رۆك وه‌زیرانی بریتانیا، له وتووێژێکی تایبه‌تدا له‌گه‌ڵ "ئالان هارت"[26]، په‌یامنێری ته‌له‌فزیۆنی بریتانیا له‌وه‌ڵامی ئه‌م پرسیاره که ئه‌گه‌ر پاشای ئێران داوای مافی په‌نابه‌ری له‌بریتانیا بکات‌و ئێوه‌ش سه‌رۆك وه‌زیرانی ئه‌و ولاته بن چ هه‌ڵویستێك ده‌گرن؟ وتی: "ئه‌گه‌ر نه‌توانم مافی په‌نابه‌ری به‌پاشای ئێران بده‌م له بریتانیایی بوونی خۆم شه‌رم ده‌که‌م!". شاوکرۆس درێژه‌ی پێده‌داو ده‌ڵێت: "دوای ئه‌وه‌ی که مارگرێت تاچێر بوو به سه‌رۆك وه‌زیرانی به‌ریتانیا، کاربه‌ده‌ستانی وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه ڕاپۆرتێکیان له‌سه‌ر بارودۆخی ئێران پێشکه‌ش به سه‌رۆك وه‌زیرانی بریتانیا کردو لۆرد کارینگتۆنی وه‌زیری ده‌ره‌وه‌ی کابینه خانمی تاچێر ئه‌وی ڕازی کرد که ئه‌گه‌ر بریتانیا مافی په‌نابه‌ری به‌شای ئێران بدات ئه‌وه باڵوێزخانه‌ی بریتانیا له‌ئێران ده‌که‌وێته به‌ر هێرش‌و به‌رژه‌وه‌ندییه‌کانیان له‌تاران ده‌که‌وێته مه‌ترسییه‌وه" کاربه‌ده‌ستانی وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی بریتانیا هه‌ندێك هه‌واڵیان پێگه‌یشتبوو سه‌باره‌ت به‌وه‌که شای ئێران ده‌یه‌وێت له‌سه‌ر به‌ڵێنه‌کانی خاتوو مارگرێت داوای په‌نابه‌ری له بریتانیا بکات‌و له ماڵه‌که‌ی خۆی له "سۆری"[27] له‌نده‌ن نیشته‌جێ بێت. مارگرێت ڕایگه‌یاند که ئه‌گه‌ر پاشای ئێران ئه‌م داوایه‌ی لێ بکات، ئه‌وه قه‌بووڵ نه‌کردنی بۆ ئه‌و زۆر ئه‌سته‌م‌و دژوار ده‌بێت، هه‌رله‌به‌ر ئه‌مه‌ش ده‌بێ هه‌ندێ کار بکرێت که پاشای ئێران داوای مافی په‌نابه‌ری له بریتانیا نه‌کات. کاربه‌ده‌ستانی وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی بریتانیا پێشنیاریان کرد که یه‌کێك له دیپلۆماتکاره به‌ئه‌زموونه‌کانی بریتانیا که ماوه‌یه‌کی زۆر باڵوێزی بریتانیا له تاران بووه‌و له‌نزیکه‌وه له‌گه‌ڵ شای ئێران یه‌کتر ده‌ناسن، بنێرنه دوورگه‌ی "باماها"[28] ( پاشای ئێران به شێوه‌یه‌کی کاتی‌و تا په‌یداکردنی په‌ناگایه‌کی هه‌میشه‌یی له‌وێ ده‌ژیا) بۆ ئه‌وه‌ی شای ئێران له‌م باره‌یه‌وه ڕازی بکات. "سێردێنیس ڕایت"[29]ی باڵوێزی بریتانیا له ئێران له ساڵه‌کانی ١٩٦٣ تا ١٩٧١بۆ ئه‌نجامدانی ئه‌م کاره هه‌ڵبژێردرا، به‌ڵام به‌هۆی ئه‌وه که نه‌یانده‌ویست سه‌فه‌ری ڕایت سه‌رنجی که‌س ڕابکێشێ، ئه‌ویان

26 Alan Hart

27-Surrey

28-Bahamas

29-Sir Denis Wright

بەناوی خوازەی "ئێوارد ویلسۆن"[30] بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە نارد. شاوکرۆس دواتر چۆنیەتی چاوپێکەوتن‌و وتووێژەکانی سێردێنیس رایت یا خود ئیدوارد ویلسۆن لەگەڵ شای ئێران بەم شێوەیە روون دەکاتەوە:

... ویلسۆن (دێنیس رایت) دوای سلاّو چاک‌و خۆشی ئاسایی، بۆ شای روون کردەوە کە دەوڵەتی خاوەن شکۆ شاژنی بریتانیا بەم دەرئەنجامە گەیشتووە تا کاتێك کار بەدەستانی نوێی ئێران تەواو بە سەر بارودۆخەکەدا زاڵ نەبن (بە واتەیەکی‌تر تا کاتێك مەترسی لەسەر ئەفرادی باڵۆێزخانەی بریتانیا ماوە) ئەوە دەوڵەتی بریتانیا ناتوانێ مافی پەنابەری بە ئێوەو منداڵەکانتان بدات. ئەو گوتی هیوادارە شای ئێران ئەم بابەتە قەبوول بکەن‌و تیێبگەن... وتووێژەکانی ئەوان زیاتر لە کاتژمێرێکی خایاندو لەم کاتەدا ویلسۆن گوتی:"دەوڵەتی من دەیهەوێت کەکاتێك سەبارەت بە پەنابەری ئێوە پرسیاریان لێکرد، بەدڵنیاییەوە ولاّم بداتەوە ئێوە ئەم بابەتەتان قەبوولکردووەو تێگەیشتوون کە داوای پەنابەری نەکەن..." شای ئێران دیسان دوودڵ بووو هەر بەم هۆیەشەوە ولاّمی روونی نەدایەوە. ویلسۆن بە پێداگری وتی وەزیری نوێی دەرەوەی بریتانیا (لۆرد گارینگتۆن) کە پشتیوانی کۆنی شا بوو، دەیهەوێت بە دڵنیا بوون لە ئێوە بڵێت کە ئەم بابەتەتان قەبوولکردووەو تێدەگەن...وشەکانی "قەبوولکردن"و "تێگەیشتن" دوو وشەی سەرەکی بوون کە بەردەوام دووپات دەبوونەوە... لە ئاکامدا شای ئێران ئەم بابەتەی قەبووڵ کرد، بەلاّم بە مەرجێك کە دەوڵەتی بریتانیا رابگەیێنێت ئەو هەرگیز داوای مافی پەنابەریی لە بریتانیا نەکردووە.

خاڵێکی‌تر کە دەبێ بەم روونکردنانەی شاوکرۆس زیاد بکرێت ئەوەیە کە دەوڵەتی خانمی تاچێر نەتەنیا ئامادە نەبوو مافی پەنابەری بە شاو بنەماڵەکەی بدات بەڵکو بە نهێنی داوای لە دەوڵەتی باماها کرد (یەکێك لە ولاّتانی هاوبەرژەوەندی بریتانیا ورێکەوت بوو) کە شای ئێران لەم ولاّتە دەربکات‌و هەر وەك دەزانین محەمەد رەزا شا لەوێوە بەرەو مەکزیك‌و دوایش رۆیشتە ئەمریکاو پاناماو میسر. یەکەمین جار بابەتی گوشارهێنانە سەر دەوڵەتی باماها بۆ دەرکردنی شای ئێران لەم ولاّتە لەلایەن "هامیلتۆن جۆردۆن"[31]ی راوێژکارو سەرۆکی ستاڤی کۆشکی سپی لەسەردەمی کارتێردا ئاشکرا بووو کار بەدەستانی بریتانی دوای بلاّوبوونەوەی ئەم بابەتە لە پەرتووکە

---

30-Edward Wilson

31-Hamiltn Jordan



بەناوبانگەکەی هامیلتۆن جۆردۆن لەژێر ناوی "قەیران"[32] لە دان پێدانان یا خود رەدکردنەوەی ئەم بابەتە خۆیان پاراست.

***

کاتێك کە مارگرێت تاچێر پۆستی سەرۆك وەزیرانی بەدەستەوە گرت، رێژەی پەنەمان لەم ولاّتەدا لە ٢٠ لەسەر ١٠٠ لە ساڵدا تێدەپەڕی‌و تا ساڵی ١٩٨٠ش هەر لە رێژەی ٢٢ لەسەر ١٠٠ مایەوە. بەلاّم لەساڵی ١٩٨١دا بە کۆنترۆلی مووچەو سیاسەتی بە فیرۆ نەدان کە لەگەڵ کەمکردنەوەی نرخی باج لەسەر داهات لە ٨٣ لەسەر ١٠٠ بۆ٦٠ لەسەر ١٠٠ هاوکات بوو، رێژەی پەنەمان وردەوردە کەمتر بۆوەو لە نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٨٣دا بە ٤ لەسەر ١٠٠ گەیشت. بارودۆخی ناسك‌و لەرزۆکی لیرەی بریتانیا سەقامگیر بوو، بەلاّم بەرز بوونەوەی نرخی بەرابەری لیرە بەراورد لەگەڵ دراوە بیانییەکان بووە هۆی زۆر بوونی هاتنە ناوەوەی کەل‌و پەل‌و کەم بوونەوەی هەناردنی شت‌و مەك بۆ دەرەوە کە لەئەنجامدا رێژەی بێکاری لەسەرەتای بەدەستەوەگرتنی دەسەلاّت لەلایەن مارگرێت تاچێرەوە لە ٥/٤ لەسەر١٠٠ بۆ ١٣/٣ لەسەر١٠٠ لە کۆتایی ساڵی چوارەمی حکوومەتەکەی بەرز بۆوەو ژمارەی بێکارانی بریتانیا لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٣دا لە سنووری سێ میلیۆن کەس تێپەڕی. تەرازنامەی ئابووری خانمی تاچێر لەروانگەی زۆربەی گەلی بریتانیاوە نێگەتیڤ بووو هەر بەم هۆیەشەوە لەراپرسییەکی گشتیدا تەنیا ٢٥ لەسەر١٠٠ی خەڵك لە حکوومەتی ئەو رازی بوون‌و ئەمەش کەمترین رادەی نارازی بوونی گەلی بریتانیا لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی لەسەرۆك وەزیرانی بریتانیا بوو. لەهەڵکەوتێکی ئاوادا بوو کە حکوومەتی سەربازی ئەرژانتین هەلەکەی قواستەوەو دووبارە داواکارییە کۆنەکانی سەبارەت بە خاوەنداریەتی دوورگەکانی "فاڵك لەند"[33] کە دەکەوێتە خوارووی باشووری رۆژئاوای زەریای ئەتلەسەوە دەست پێکردووە. کۆمەڵە دوورگەکانی فاڵك لەند کە ناوی راستەقینەی ئەو "ماڵڤیناس"[34]ە لە دووسەد دوورگەی گەورەو بچووك پێك هاتووەو تا ساڵی ١٧٧٠ کە بریتانیاییەکان بە ناچاری بەجێیان هێشت لەژێر دەسەلاّتی بریتانیادا بوو. بریتانیاییەکان لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا جارێکی‌تر ئەم

---

32-Crisis

33-Falkland

34-Malvinas





دووڕگانەیان داگیر کردووەو گوێیان بە داواکارییەکانی ئەرژانتین نەداو دەستیان بە دامەزراندنی بنکەو دام ودەزگاکانی سەربازیو دەریاییەکان کردەوە. حکوومەتی سەربازی ئەرژانتین کە لە ئاپریلی ساڵی ١٩٨٢دا دەیهەویست لەناوخۆی وڵات لایەنگریو خۆشەویستی بەدەست بهێنێ، بو سەلماندنی داواکاری ئەرژانتین سەبارەت بە خاوەندارێتی ئەم دووڕگانە دەستبەکار بووو بە هێرشێکی لەنەکاو هێزە بچووکە دەرباییەکەی بریتانیای تێك شکاندو بنکە سەربازییەکانی بریتانیای لەم دووڕگانە داگیر کرد. مارگرێت تاچێر وڵامێکی بەپەلەو ئازایانەی بەم هێرشە داوەو چالاکییە سەربازییەکانی بریتانیا بۆ وەرگرتنەوەی دووڕگەکانی فالّك لەند بەسەرکردایەتی راستەوخۆی خانمی تاچێر لە رۆژی ٢١ مەیی ساڵی ١٩٨٢ بە ئاکام گەیشتو هێزەکانی ئەرژانتین بە دانی زیانو زەرەرێکی قوورسی مرۆڤیو ماددی لە دووڕگەکان دەرکران.

مارگرێت تاچێر لە رەوتی شەڕی فالّك لەنددا، نێوبژیوانی ئەمریکاو هاوپەیمانە ئەورووپییەکانی بریتانیای سەبارەت بە تاوتوێکردنی ئەم ناکۆکییانەو پێدانی هەندێك ئیمتیاز بە ئەرژانتین قەبووڵ نەکردو لێبڕاوانە بە هیچشتێك جگە لە تێکشکاندنی قوورسی هێزەکانی ئەرژانتین رازی نەبوو. سەرکەوتنی مارگرێت لە شەڕی فالّك لەند هەموو خاڵە لاوازەکانی سیاسەتی ناوخۆیی ئەوی قەرەبوو کردەوەو بە کەڵك وەرگرتن لەم هەلە هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی بریتانیای لە ژووەنی ساڵی ١٩٨٣دا واتە ساڵێك بەر لەکاتی دیاری کراوی خۆی ئەنجام دا. باری ئابووری بریتانیا لە ماوەی نێوان شەڕی فالّك لەندو هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی ساڵی١٩٨٣وردە وردە باشتر ببووو هەر بەم هۆیەشەوە حیزبی پارێزگارانی بریتانیا بە رێبەری مارگرێت تاچێر گەورەترین سەرکەوتنی خۆی دوای شەڕی دووهەمی جیهانی بەدەست هێنا. حیزبی پارێزگاران لە کۆتایی ئەم هەڵبژاردنانەدا بەدەست هێنانی ٣٩٧ کورسی لە کۆی ٦٥٠ کورسی پەرلمان بە زۆرینەی دەنگ سەرکەوتو خانمی مارگرێت خولی دووهەمی سەرۆك وەزیرانی خۆی بەهێزو تواناییەکی زۆرەوە دەست پێکرد. کارنامەی خانمی تاچێر لە خولی دووهەمی سەرۆك وەزیرانیدا پڕشەنگدارتر لە چوار ساڵی یەکەمی حوکمڕانی ئەو بووو هەر بەم هۆیەشەوە جارێکیتر لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨٧دا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەلاّم لە خولی سێهەمی سەرۆك وەزیرانی خۆیدا تووشی کێشەو گرفت بووو دوایین ڕاپرسی لە گەلی بریتانیا نیشان دەدات کە بە شێوەیەکی هەست پێکراو خۆشەویستی مارگرێت تاچێر دابەزیوە. رۆژنامەی ناوداری تایمزی لەندەن لە ژمارەیەکی خۆیدا لە بەرواری ٢٧ی مارسی ١٩٨٩(٧ی خاکەلێوەی ١٣٦٨.ك.ه) ئاکامی ئەو ڕاپرسییانە بلاّو دەکاتەوەو دەنووسێ سەرەڕای ئەوە کە



هێشتاش لەنێوان دەنگداران ژمارەی هەوادارانی حیزبی پارێزگاران ٤٪ لەلایەنگرانی حیزبی کرێکاران زیاترە، بەلاّم جیاوازی ئەوان سەبارەت بە دوایین هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی بریتانیا زۆر کەمتر بۆتەوە. لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨٧دا ٤٣٪ی دەنگدەران بە قازانجی حیزبی پارێزگارانو ٣٢٪یش بە قازانجی حیزبی کرێکاران دەنگیان دابوو کە جیاوازی ئەوان ١١لەسەر١٠٠ بوو. خاڵێکی سەرنج ڕاکێش کە لە لێکۆڵینەوەکانی رۆژنامەی تایمز دەردەکەوێت ئەوەیە کە ژمارەیەکی بەرچاو لەلایەنگرانی خانمی تاچێر لەنێوان دەنگدەرانی ژن کەم بۆتەوەو بەو شێوەیەی کە ڕاپرسییەکان نیشان دەدەن ئەگەر هەڵبژاردنە نوێیەکانی پەرلمان دەست پێ بکاتەوە ئەوە زۆربەی ژنانی بریتانیایی بەتایبەت لە گرووپی تەمەنی ١٨تا٢٤ساڵ بە حیزبی کرێکاران دەنگ دەدەن. هەڵبەت خانمی تاچێر ( لەکاتی نووسینی ئەم پەرتووکە) بەهۆی ئەوەکە لایەنگری زۆری لەپەرلماندا هەیە گرینگییەکی ئەوتۆ بەم ڕاپرسییانە نادات‌و لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا وتوویەتی کە تا ساڵی ١٩٩٢ بەبێ هیچ دوودڵیو گومانێك درێژە بە حکوومەتی خۆی دەداتو بە سەرکەوتنی خۆی لە هەڵبژاردنەکانی داهاتووی بریتانیا هیوادارە. هەروەها لەم وتووێژەدا جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە لەتوانایی ئەو بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری سەرۆك وەزیری کەم نەبۆتەوەو لە هەڵبژاردنەکانی داهاتووشدا تەختی دەسەلاّت چۆل ناکات.

***




**رۆژنامەکانی بریتانیا دوای شەڕی فالّك لەند مارگرێت تاچێریان ستاییش دەکرد، بەلاّم رۆژنامەکانی ئەمریکای لاتین زۆر بە توندی هێرشیان کردە سەری. لە وێنەی سەرەوەدا گۆڤارێکی ئەرژانتینی وێنەی خانمی مارگرێتی لە قەیافەی دزێکی دەریایی کێشاوەتەوەو گۆڤارێکی بریتانیای وێنەی مارگرێتی وەك وێنەی مەلیکە ڤیکتۆریا کێشاوەتەوە.**

لەروانگەی زۆربەی خەڵکی بریتانیاوە تەرازنامەی دە ساڵەی حکوومەتی مارگرێت تاچێر پۆزێتیڤە. هەڵبەت هەر وەك ئاماژەی پێکرا، ژمارەی هەوادارانی خانمی تاچێر بەراورد لەگەڵ ساڵانی پێشوو کەمتر بۆتەوە، بەڵام ناڕازی بوونی بەشێك لەرای گشتی بریتانیا لەحکوومەتی مارگرێت تاچێر پتر لەبەر سیاسەتی نێوخۆیی‌و کێشەو گرفتی ئابووریە لەکاتێکدا لەسەر ئاستی سیاسەتی دەرەکی زۆربەی هەرەزۆری گەلی بریتانیا پشتیوانی لەخانمی مارگرێت تاچێر دەکەن‌و زۆر کەس ئەو بە بەهێزترین سیاسەتوانی سەدەی بیستەمی بریتانیا ناودەبەن. بریتانیا لەسەردەمی ١٠ساڵەی حکوومەتی مارگرێت تاچێردا بەراورد لەگەڵ پێگەی نێودەوڵەتی بریتانیا بەر لە دەستپێکردنی حوکمڕانی ئەو لەساڵی ١٩٧٩دا، کێشی قورستری لەسەر ئاستی سیاسەتی جیهانیدا بەدەست هێناو ڕۆڵ‌و کارتێکەری مارگرێت تاچێر لە سیاسەتی جیهاندا لە پێشینیانی خۆی زۆر زیاترە. مارگرێت تاچێر دوای بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك وەزیرانی لەسەرەتاوە پەیوەندی نزیکی لەگەڵ کارتێرو دوا جاریش ڕەیگان‌و لە کۆتاییشدا بووش داناو کۆتایی بە ڕکاربەرییەکانی ئەمریکاو بریتانیا لە بەشە جۆراجۆرەکانی جیهان هێنا کە پێگەی بریتانیای لەرزۆك کردبوو. ئەو لەپەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی ئەندامی بازاری هاوبەشی ئەورووپاش هێزو توانایییەکی زۆری لە خۆی وەدەرخست‌و دەستکەوتێکی زۆری بۆ بریتانیا بەدیاری هێنا. سەرسەختی خانمی تاچێر لەداسەپاندنی بیروبۆچوونەکانی‌لەسەر ڕێبەرانی وڵاتانی‌تری ئەورووپا کە هەندێك ڕەخنەو دژایەتی لێکەوتەوە، پێگەی سیاسی ئەوی بردە سەری‌و لە نێو هاوکارانیدا بە دووگۆلی نوێی ئەورووپا ناوی دەرکرد. مارگرێت تاچێر لەسەرەتای بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات، لەئاست شۆڕەوی سیاسەتێکی سەرسەختانەو قوورسی گرتە بەرو بەتووندی لەبەرامبەر سیاسەتە داگیرکارانەکەی بێرژێنیڤ‌و دەست تێوەردانی شۆڕەوی لە کاروباری ئەفغانستان دژایەتی کرد. مارگرێت تاچێر یەکەمین دەسەڵاتدری ڕۆژئاواییی بوو کە لە لەندەن لەگەڵ "گۆرباچۆف"و پێش هاتنە سەرکاری ئەو وتووێژی کرد. گۆرباچۆف کە بە سەرکردایەتی شاندێکی نوێنەرانی پەرلمانی شۆڕەوی ڕۆیشتبووە بریتانیا لەو کاتەدا ئەندامی دەفتەری سیاسی حیزبی کۆمۆنیست‌و یەکێك لە پاڵێوراوانی چاوەڕوانکراوی ڕێبەرایەتی شۆڕەوی دوای "ئاندرۆ پۆڤ "ی ڕێبەری نەخۆشی ئەم وڵاتە بوو. مارگرێت تاچێر دوای دیمانەیەکی درێژخایەن لەگەڵ گۆرباچۆف بەم ڕستەیە کەئەو پیاوێکی ڕاست بین‌و ژیرەو "دەتوانرێت مامەڵەی لەگەڵ بکرێت" ڕێزی لێ نا. لەگەڵ ئەمەشدا خانمی تاچێر دوای هاتنە سەرکاری گۆرباچۆف بە گومان‌و پارێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ سیاسەتی ئاواڵەی ئەو دەکردو بەراشکاوی دژایەتیی لەگەڵ پێشنیاری ڕێبەری نوێ شۆڕەوی سەبارەت بە



نەهێشتنی چەکی ئەتۆمی(ناوەکی) لە ئەورووپا دەکرد. تاچێر لە سەفەرێکیدا بۆ مسکۆ لە کۆتاییەکانی مانگی مارسی ساڵی١٩٨٧ لە وتووێژێکدا لەگەڵ تەلەفزیۆنی مسکۆ وتی کە هێزێکی پارێزەری ئەتۆمی لەگەڵ ئەو هەموو مەترسییەی کە هەیەتی باشترین پارێزەری ئاشتی لە جیهانە. خانمی تاچێر بۆ پاساو هێنانەوەی وتەکانی گوتی: "ئەورووپا لە نیوەی سەدەی بیستەمدا دوو شەڕی گەورەو مەترسیداری بینیوەو ئەگەر نێزیکەی چل ساڵە کە لەسەرهەڵدانی شەڕێکی‌تر پارێزراوە بەهۆی ئەم چەکە ئەتۆمی‌یەیە... من ناتوانم لەم بابەتە تێبگەم کەبۆچی ئێوە لە بیری لەناو بردنی چەکی ناوەکین‌و باس لە هەڕەشە لەسەر ئاشتی بەهۆی هێزەکانی‌ترەوە ناکەن؟"

هەواڵنێرێکی‌تری ڕووسی لە ڕەوتی ئەم وتووێژەدا لە مارگرێت تاچێری پرسی: "سەرەڕای ئەمەش ئایا دان بەمە دانانێن کە ئەورووپا لە ماوەی ئەو چل ساڵەدا چەند جار لەسەرەتای شەڕێکی ناوەکی مەترسیدار بووە؟" خانمی تاچێر لە وڵامدا وتی: "بەڵێ، بەڵام تەنیا لەسەرەتای دەستپێکردنی شەڕی ئەتۆمی دابووەو ئەگەر شەڕێك ڕووی نەداوە لە بەر ترس لە ئاکامەکانی ئەو شەڕە بووە... ڕەنگە ئێمە تا ئێستا بەبێ بوونی ئەم هاوسەنگەییە مەترسیدارە(چەکی ناوەکی) کێشەوگرفتی شەڕێکی‌تریشمان لە ئەستۆدا بوایە." مارگرێت لەسەردەمی سەرۆك وەزیرانی خۆیدا چەند جار سەفەری بۆ وڵاتانی ئەفریقایی‌و ئاسیایی کردووەو سەرەڕای هەبوونی قەیرانێك کە بەهۆی دژایەتی ئەو سەبارەت بە ئابلۆقەی ئابووری ڕێژیمی ڕەگەزپەرستی خوارووی ئەفریقا لەنێوان پێوەندییەکانی بریتانیا لەگەڵ کۆمەڵەی وڵاتە هاوبەرژەوەندییەکان سەری هەڵدا، زیانێك لە بنەمای ئەم کۆمەڵە نەدراوە.

**ئەم وێنەیەی خانمی تاچێر کە لەسەر گۆڤاری ئێکۆنۆمیستی لەندەن چاپ کراوە، ئەو بە دووگۆڵ دەشوبهێنی**

لەسەردەمی دەسەڵاتداری تاچێردا پێوەندی نێزیك لەنێوان بریتانیاو ولاَتە عەرەبییەکان درووست بووو کڕینی چەند میلیارد دۆلاری چەكو چۆڵ لەلایەن ولاَتانی کەناری باشوری کەنداوی فارس لە بریتانیا، یارمەتی گەشەسەندنی ئابووری ئەو ولاَتەی داوە. لەسەردەمی حکومەتی مارگرێت تاچێردا پێوەندی بریتانیاو ئێران بەسەر چەند قۆناغێکی قەیرانی‌و ناسکدا تێپەڕیوەو لە ئاکامدا بەهۆی پشتیوانی دەوڵەتی بریتانیا لە سەلمانی ڕۆشدی، نووسەری بەرەچەڵەك هێندیی پەرتۆکی پڕلە کوفری "ئایاتی شەیتانی" پەیوەندییە سیاسییەکانی ئەم دوو ولاَتە بە تەواوی پچڕاوە. حکومەتی تاچێر بەر لە ئێران لەگەڵ لیبیاش پێوەندییەکانی پچڕاند بووو هەروەها پێوەندی بریتانیا لەگەڵ ژمارەیەك لە ولاَتانی ئەمریکای لاتین دوای ڕووداوی دوورگەکانی فالْك لەند ئاسایی نەبۆتەوە. زۆربەی گەلی بریتانیا دوای شەڕی فالْك لەندو وەرگرتنەوەی ئەم دوورگانە لە ئەرژانتین پشتیوانیان لە مارگرێت تاچێر دەکردو سەرکەتنی بێ‌وێنەی حیزبی پارێزگاران لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨٢دا زۆرتر بەهۆی ئەم سیاسەتەی ئەو بوو، بەلاَم درووستی سیاسەتی مارگرێت تاچێر لە ڕاگرتنی ئەو دوورگانەو نەسازان لەگەڵ ئەرژانتین دوای تێپەڕ بوونی چەند ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوە، لە کۆڕو کۆبوونەوە سیاسییەکانی بریتانیا کەوتۆتە ژێر پرسیارو ڕەخنەی لێگیراوە. دەوڵەتی بریتانیا بۆ پاراستنی ئەو دوورگە دوورانە کە گرینگییەکی ئیستراتیژی ئەوتۆی نی‌یە، ساڵانە٦٧٢ میلیۆن دۆلاَر خەرج دەکات‌و ئەمەش لە کاتێکدایە کە ژمارەی دانیشتوانی ئەم دوورگانە لە ٢٠٠٠ کەس کەمترەو دەوڵەتی بریتانیا بە پێوانەی گۆڤاری تایمی ئەمریکایی ساڵانە بۆ هەر نەفەرێك **٣٧٣** هەزار دۆلار خەرج دەکات! سوور بوونی خانمی تاچێر لە پاراستنی دوورگەکانی فالْك لەند جگە لەم خەرجییە بەردەوامە، ساڵانە چەندین میلیارد دۆلاَر زیان لە بازاڕی هەناردەی بریتانیا لە ولاَتانی ئەمریکای باشوور دەدات، بەلاَم بە هیچ شێوەیەك ئامادە نی‌یە سیاسەتی خۆی سەبارەت بە دوورگەکانی فالْك لەند بگۆڕێ‌و جۆرێك سازشی سیاسی لەگەڵ ئەرژانتین ئەنجام بدات.

***

سەرەڕای پشتیوانی زۆربەی دەنگدارانی بریتانیایی لە مارگرێت تاچێر کە بووە هۆی سەرکەوتنی ئەو لە سێ هەڵبژاردنەکەی پێشوو، زۆربەی ڕووناکبیرانو چینی کرێکاری بریتانیا بە توندی ڕەخنە لە سیاسەتە ناوخۆیی‌و دەرەکییەکانی ئەو دەگرن. لەم دوایییانەدا قسەو باسی



ناڕەزایەتی‌و ڕەخنە لە شێوازی حکوومەتی مارگرێت تاچێر لەنێوان ڕێبەرانی کۆنی حیزبی پارێزگاران بە گوێ دەگات‌و ژمارەیەك لە وەزیرانی پێشووی مارگرێت تاچێر وەکوو فرانسیس پیم، وەزیری دەرەوەی پێشووو "جان نۆت"[٣٥]ی وەزیری بەرگری پێشوو کە بەهۆی دژایەتی لەگەڵ سیاسەتەکانی ئەو دەستیان لەکار کێشاوەتەوە، ئەو بە جۆرێك "سەرەڕۆیی پشت ئەستوور بە زۆرینە"[٣٦] تۆمەتبار دەکەن. وەزیری پێشووتری ئەو بەناوی "ویلیام وایت لاو" کە نەیتوانی درێژە بە هاوکاری ئەو بدات، وتوویەتی کە خانمی تاچێر دوای هەر سەرکەوتنێك لە هەڵبژاردنەکاندا زیاتر لە خۆبایی بووەو بەهۆی ئەوە کە پێی‌وابوو خەڵك دەنگیان بە سیاسەتەکانی ئەو داوە، لەسەر داسەپاندنی ڕوانگەکانی بەسەر کەسانی دەوروبەریدا پتر پێدادەگرێ. لەساڵی ١٩٨٨دا دوو پەرتووك سەبارەت بە ڕەخنە لە شێوازی حکوومەتی ئەو بلاَو بۆوەو خەڵك بە خێرایی پێشوازییان لێکردو لە کۆروکۆبوونەوە سیاسی‌و کۆمەلاَیەتییەکانی بریتانیا باسی لێکرا. ناوی پەرتووکێکیان "تاچێریسم"[٣٧]و ناوی ئەوی تریشیان "ڕێگای دژواری بنیاتنانەوە: تاچێریسمو قەیرانی چەپ"[٣٨]ە. پەرتووکی یەکەمیان لە کۆمەڵێك ڕوانگەی نووسەرانی بریتانیایی سەبارەت بە چۆنیەتی حکوومەتی تاچێر پێك هاتووە کە "ڕۆبێرت ئێسکید لێسکی"[٣٩] کۆی کردۆتەوەو پەرتووکی دووهەمیش شیکردنەوەیەکی حکوومەتی تاچێرو فاکتەرەکانی هەرەس هێنانی قۆڵی چەپ لە سێ هەڵبژاردنەکانی ئەم دوایییانەی بریتانیایە کە "ئێستۆرات هاڵ"[٤٠] نووسیویەتی. لە هەر دوو پەرتووکەکەدا وشەی "تاچێریسم" نەوەك ئایدۆلۆژیایەك، بەڵکوو وەکوو شێوازی حکوومەت‌و ڕێبەری شی کراوەتەوەو نووسەرانی ئەم دوو پەرتووکە ئەو شێوە حکوومەتەیان بەحکوومەتی دیکتاتۆری‌و دژ بەبنەماکانی دێموکراسی لەبریتانیا ناساندوە. لەپەرتووکی "تاچێریسم"دا ڕەخنە لەسەرکەوتنە ئابوورییەکانی تاچێریش گیراوە کە فاکتەری سەرەکی سەرکەوتنی ئەو لە هەڵبژرادنەکان بووە.

35-Joho Nott

36-Authoritaian Populism

37-Thetcherism

38-The Hard Road to Renewal: Thatcherism and the Crisis of the Left

39-Robert Skidelsky

40-Stuart Hall





بۆ وێنە نووسراوە کە لەساڵی ١٩٧٩دا تا دەیەمین ساڵی حکوومەتی مارگرێت تاچێر ئاستی بەرهەمە پیشەییەکان لە بریتانیا تەنیا ٦٪ بەرز بۆتەوەو ئەمەش لەکاتێکدایە کە لەم ماوەیەدا ئاستی بەرز بوونەوەی ئەم بەرهەمانە لە ژاپۆن ٣٨٪، لە ئەمریکا٢٥٪و لە ئیتالیا ١٥ لەسەر ١٠٠ بووە.



**لە دەیەمین ساڵیسەرۆک وزیرانیدا ئاسەواری ماندووبوونو تێکچرژاوی لە رووخساری مارگرێت تاچێر وەدەرکەوتووە.**

نووسەرانی ئەم پەرتووکانە لەو باوەڕە دان کە یەکێك لە فاکتەرە سەرەکییەکانی سەقامگیری سیاسیی بارودۆخی ئابووری بریتانیا لەو ماوەیەدا بەهۆی داهاتی٢١٠میلیارد پۆندی نەتی باکوور بووەو لێهاتووییو پسپۆری خانمی مارگرێت تاچێر هیچ رۆڵێکی تێدا نەنواندووە. ناوی دوایین پەرتووك کە لە بریتانیا لە بارەی مارگرێت تاچێرو دەورانی حکوومەتی ئەو بڵاوبۆتەوە، بریتیە لە "یەکێك لە ئێمە"[41] کە لەلایەن "هۆکۆیانگ"[42]ەوە کە لێکۆڵەری سیاسییو رۆژنامە نووسی ناوداری بریتانیایە نووسراوە. ئەم پەرتووکەش کە لە ئاپریلی ساڵی١٩٨٩دا چاپ کراوە، پتر زمانی رەخنەگرانەی هەیەو نووسەر لە زمانی ئەو کەسانەی کە وتووێژی لەگەڵ ئەنجام داونو ژمارەیەك لە ئەندامانی بەرزی حیزبی پارێزگارانو وەزیرەکانی پێشووی کابینەی مارگرێت تاچێریشی تێدایە، مارگرێت تاچێری بە لەخۆبایی بوونو کورتبینییو لاسارییو پێداگری لەسەر داسەپاندنی بیروبۆچوونەکانی تۆمەتبار کردووە. لەم پەرتووکەشدا نووسراوە کە سەرکەوتنەکانی حکوومەتی مارگرێت تاچێر لە بواری ئابووریدا زۆرتر بەهۆی بەرز بوونەوەی

41-One of Us

42-Hogo Young



بەرهەمی نەوتی باکوور بووە نەوەك لەبەر شایستەییو کارزانی ئەو. لە لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەندا تەرازنامەی حکوومەتی١٠ساڵەی ئەو نێگەتیڤ بووە، لەبەرئەوەی کە لەسەردەمی حوکمڕانی ئەودا دەوڵەمەندان دەوڵەمەندترو چینە کەم داهاتەکانی کۆمەڵگاش هەژارتر بوون. خانمی تاچێر بەرز بوونەوەی لیرە لە ئاست نرخی دراوە بیانییەکانو بەرز بوونەوەی داهاتی دەوڵەت بەراورد لەگەڵ خەرجییەکانی دەوڵەت بە سەرکەوتنی مەزنی خۆی دەزانێ، ئەمەش لە کاتێکدایە کە بەرز بوونەوەی نەگونجاوی نرخی لیرە لە ئاست دراوە بیانییەکان بۆتە هۆی دابەزینی هێزی رەکەبەری بەرهەمەکانی بریتانیا لەبەرامبەر بەرهەمی وڵاتانیترو بریتانیا لەساڵی ١٩٨٨دا ١٥میلیارد لیرەی لە بازرگانی دەرەکی کەم وکورتی هێناوە. واتەیەکیتری دابەزینی ئاستی بازرگانی دەرەکی ئەوەیە کە بریتانیا تووشی دابەزینی ئاستی بەرهەمو بەرز بوونەوەی بێکاری بووەو ئەمەش بە گەورەترین ئاستی رێژەی بێکاری لەنێوان وڵاتانی ئەورووپی دەژمێردرێت. نووسەری ئەم پەرتووکە نکۆڵی لەهەندێك لەسەرکەوتنەکانی دەورانی حکوومەتی مارگرێت تاچێرو تایبەتمەندییە باشەکانی خودی ئەو ناکات، بەڵام لەو باوەڕەدایە کە زۆربەی خەڵکی بریتانیا سوودیان لە حکوومەتی ئەو وەرنەگرتووەو ئەگەر گەشەی بەدرووی ئابووری بریتانیا لەسەردەمی ١٠ ساڵەی دەسەڵاتداری ئەو بەم شێوەیە درێژە بکێشێ ئەوە لەسەرەتاکانی دەیەی ١٩٩٠دا جێگەی خۆی بە وەستانو قەیرانێکی توند دەسپێرێو بەدەستپێکردنی ئەم قەیرانەش تەمەنی دەسەڵاتی مارگرێت تاچێر کۆتایی پێدێت.





## دەست لەکارکێشانەوەی خاتوو تاچێرو ئەو ئاژاوەیەی

## کە بە نووسینی پەرتووکی بیرەوەرییەکانی درووستی کرد

هەروەك لە کۆتایی بەشی تایبەت بە خانمی تاچێر لەچاپی یەکەمی ئەم پەرتووکەدا تێبینی کراوە، "ژنی ئاسنینی بریتانیا" لەدەیەمین ساڵی سەرۆك وەزیرانی خۆیدا بەملاوە تووشی هێرشێکی توند لەلایەن رۆژنامەکانی بریتانیاو تەنانەت هاوکارەکانی پێشووی خۆی بۆوەو لەئاکامدا ناچار بوو دەست لەکار بکێشێتەوە. مارگرێت تاچێر لە دوایین ساڵی دەسەڵاتداری خۆیدا بە لەسەرکار لابردنی چەند کەس لەوەزیرانی پایەبەرزی کابینەکەی، ویستی دەوڵەتێکی یەکدەستو ملکەچی خۆی دابمەزرێنێ، بەلام وەزیرانی پایەبەرزی کابینەی خاتوو تاچێر کە کارتێکەرییەکی زۆریان لەنێوان نوێنەرانی حیزبی پارێزگاران لە پەرلماندا هەبوو، ژمارەیەك لە نوێنەرانی سەربەحیزبی پارێزگارانیان بەدژی کابینەی تاچێر هەڵگەڕاندەوەو هەربەم هۆیەشەوە مارگرێت تاچێر کە زۆربەی لایەنگرەکانی لەپەرلمان لە دەست دابوو، بە ناچاری لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٠داو دوای نێزیکەی ١١ ساڵو نیو سەرۆك وەزیرانی دەستی لە کار کێشاوە. مارگرێت تاچێر بەر لە دەستکێشانەوە لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی بە پێشگرتن لە هەڵبژاردنی نەیارانی قەستەسەری خۆی بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی، تۆڵەی لێ ستاندنەوە و"جان مەیجێر" کە وەك جێنشینی ئەو هەڵبژێردرابوو، یەکێك لە وەزیرە لاوەکانی کابینەی تاچێرو سەرخستراوی ئەو بوو. خانمی تاچێر دوای دەست کێشانەوە لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی بە نازناوی لۆردی بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنی لۆردەکانی بریتانیا کە پۆستێکی تەشریفاتی (نافەرمی) بوو. ئەو چەند ساڵێکیش بێ‌دەنگ مایەوەو لە وتووێژو وتاربێژی خۆی پاراست بەلاّم لەنەکاو بە بلاّوکردنەوەی پەرتووکی بیرەوەرییەکانی لەساڵی ١٩٩٣ ئاژاوەیەکی نوێی ناوە. مارگرێت تاچێر لەو پەرتووکەکەیدا (چاپی یەکەمی بە ٥٠٠ هەزار پەرتووك دوای دوومانگ وەدەست نەکەوتو لەهەمان ساڵدا وەرگێڕدراوە سەر دە زمان) بە توندی هێرشی کردۆتە سەر هاوکارەکانی پێشووی خۆیو سووکایەتی پێکردوونو تەنانەت لە بارەی دەسەڵاتدارانی زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ کردبوون، زمانێکی رەخنە گرانەو توندی بەکار هێناوە. جان مەیجێری





**دوایین وێنەی مارگرێت تاچێر کەلەسەر پەرتووکەکەی دراوە.**

جێنشینی خانمی تاچێر لەیەکەمین هەڵبژاردنەکانی دوای دەست لەکارکێشانەوەی مارگرێت تاچێر توانی لایەنگیری زۆرینەی نوێنەرانی حیزبی پارێزگاران لەپەرلمان بپارێزێتو خۆی لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی پارێزگاری بریتانیادا بمێنێتەوە، بەلاّم لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٧دا نەیتوانی بەسەر حیزبی کرێکارانی بریتانیا بە رێبەری تۆنی بلێر سەرکەوێتو پۆستی سەرۆك وەزیرانی بریتانیاو رێبەری حیزبی پارێزگارانی لەدەست دا. جێگەی باسە کە سەرکەوتنی تۆنی بلێری سەرۆك وەزیرانی لاوو جوان چاکی نوێیێ بریتانیا پتر بەهۆی دەنگی ژنان لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٧ی بریتانیا بووەو ئێستاش ژمارەی ژنانی نوێنەری پەرلمانی بریتانیا زیاتر لە دوو بەرابەری پەرلمانی پێشووە.

# ژنانی دەسەڵاتداری جیهان لە دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەمدا

ژنان لە دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەمدا پێشکەوتنی تازەو گەورەیان لە گۆڕەپانی سیاسەتو ئابووری جیهاندا بەدەست هێنا. ناودارترین ژنی ئەو سەدەیە کە پێشتر بەناوی "ژنی ئاسنینی بریتانیا" باسمان لێکرد، لە ئاکامدا دوای نزیکەی ١١ ساڵو نیو حوکمڕانی ناچار بوو دەست لەدەسەلاّت بکێشێتەوە. بەلاّم دوای ئەو ژنانی لێهاتوویتر لە ولاّتانی ئەورووپیو ئاسیایو ئەمریکایی پۆستی گرینگی سەرۆك کۆماریو سەرۆك وەزیرانو زۆر پۆستی گرینگیان وەك وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بەدەست هێنا (مادلین ئالّبرایت)و تا سالاّنی کۆتایی سەدەی بیستەمیش هەر لەسەر پۆستەکانیان مانەوە. ماوەیەکی کورت دوای دەست لەکار کێشانەوەی خانمی تاچێرلە پۆستی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا، بۆ یەکەمین جار لەولاّتی ئیرلەندا ژنێك پۆستی سەرۆك کۆماری ئەم ولاّتەی وەرگرت. ناوی ئەم ژنە خاتوو "ماری رابینسۆن"[1]ە کە تاقانە کچی دایكو باوكێکی پزیشکی کاتۆلیکی ئیرلەندایە. چوار براکەی خانمی رابینسۆن وەك باوکیان وەدوای پزیشکی کەوتن، بەلاّم ماری رابینسۆن خوێندکاری بەشی ماف بووو لەبەشی مافی زانکۆی هاڤاردی ئەمریکادا خوێندنی تەواو کرد. ماری دوای گەڕانەوە بۆ ئیرلەندا کاری پارێزەری هەڵبژاردو لە ئاکامدا لەگەڵ یەکێك لەهاوکارانی بەناوی نیکۆلا رابینسۆن کە کوڕی بانکدارێکی پرۆتستانی بوو زەماوەندی کردو هاوکات لەگەڵ کارەکەی چووە نێو جیهانی سیاسەتو لەتەمەنی ٢٥ سالّیدا بوو بە نوێنەری ئیرلەنداو لەوێش وەك پارێزەرو دواکاری سەرسەختی مافی ژنان ناوبانگی دەرکردو لەئاکامدا لە هەڵبژاردنەکانی مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٩٠دا بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری ئیرلەندا هەڵبژێردرا. خاتوو رابینسۆن لە ماوەی حەوت ساڵ سەرۆك کۆماری خۆیدا، خۆشەویستیو متمانەی گەلی ئیرلەندای بەدەست هێناوەو هەڵوەمەرجی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییە کۆنەکانی ئیرلەنداو بریتانیای سەبارەت بە ئیرلەندای باشوور ئامادە کردووە. خانمی رابینسۆن جگە لەوەکە سیاسەتوانێکی بەرچاوو بەرێوەبەرێکی بەتواناو پارێزەرێکی شارەزاو لێهاتووە، بەڵکوو دایکێکی کەم وێنەشەو لە پەروەردەو فێرکردنی کچو دوو کوڕەکەی ئەوپەڕی چاوەدێریو وردبینی بەکار هێناوە. هەروەها خاتوو رابینسۆن رێزێکی تایبەتیش لە هاوسەری دەگرێ کە یەکێك لە پارێزەرە ناودارەکانی ئیرلەندایەو چەند جاریش وتوویەتی کە هاوسەرم باشترین راوێژکارو باشترین هاندەرو لەهەمان کاتیشدا باشترین رەخنەگری منە. ئەو لە زۆر هەڵەدا منی رێنوێنی کردووەو هۆکاری گرینگی سەرکەوتنە سیاسیو کۆمەلاّیەتییەکانی من بووە.

1-Mary Robinson





خانمی رابینسۆن سەرۆك کۆماری ئیرلەندا

# دایك سەرۆك وەزیرانو کچ سەرۆك کۆمار!

دوای خاتوو رابینسۆن کە سێهەمین سەرۆك کۆماری جیهانە (دوای ئیزابیلاپێرۆن، سەرۆك کۆماری ئارژانتینو خانمی ئاکینۆ، سەرۆك کۆماری فیلیپین) ژنێکی ئاسایی‌تریش بەناوی"چاندریکا"، کچی گەنجی یەکەمین سەرۆك وەزیرانی ژنی جیهان بەناوی "خانمی سیریماڤۆ باندارانایك" بە پۆستی سەرۆك وەزیرانی گەیشتووە. چاندریکا کە پلەی دوکتورای لەزانکۆی بەناوبانگی "سووربۆن"ی پاریس وەرگرتوە، پێش ئەوە کە پۆستی سەرۆك کۆماری سریلانکا بەدەست بهێنێ لە پێشبڕکێیەکانی هەڵبژاردنی سەرۆك وەزیرانی سریلانکا کە دایکی پالّێوراوی حیزبی ئازادی بوو، رۆڵی گرینگی نواندو خانمی باندارانایك بە سەرکەوتنی ئەم حیزبە لەهەڵبژاردنەکانی مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٩٤ دوای هەڤدە ساڵ گەڕایەوە سەر پۆستی سەرۆك وەزیرانیو ساڵی دواتر بە هەڵبژاردنی چاندریکا بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی جیهاندا دایكو کچێك پۆستی سەرۆك وەزیرانیو سەرۆك کۆماری ولاّتێکیان بەدەستەوە گرت. چاندریکا لە پۆستی سەرۆك کۆماری دژی هەندێك کردەوەی دایکی بوو، بەلاّم ئەم دایكو کچە پێش ئەوەی ئەم ناکۆکییانە ببنە قەیرانێکی سیاسی لەسەر ئاستی سریلانکا پێکەوە

سازشیان دەکرد. هاوکات لەگەڵ هەڵبژاردنی دایكو کچێك بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانیو سەرۆك کۆمای لە سریلانکا، ژنان لە وڵاتانیتری نیمچە قارەی هێندیش (هێند، پاکستان، بەنگلادێش) هەندێك سەرکەوتنی مەزنی سیاسییان بەدەست هێنا. لە پاکستاندا بێنەزیر بوتۆ جارێکیتریش بەسەر رکەبەرەکانیدا سەرکەوتو بۆ جاری دووهەم پۆستی سەرۆك وەزیرانی پاکستانی بەدەست هێناو لە بەنگلادێش دا "بیگم خالیدە زیا"ی بێوەژنی رێبەری کۆچکردووی بەنگلادێش **(ضیاء الرحمن)** کە رێبەرایەتی حیزبی ناسیۆنالیستی بەنگلادێشی دوای مردنی هاوسەری بەدەستەوە گرتبوو، دوای دە ساڵ خەباتی بێوچان لەبەرامبەر دەوڵەتی میلیتاری ژێنراڵ حوسێن محەمەد ئیرشادا و لە یەکەمین هەڵبژاردنی ئازادی بەنگلادێش، دوای رووخانی دەوڵەتی میلیتاری محەمەد ئیرشاد سەرکەوتنی بەدەست هێناو بە پۆستی سەرۆك وەزیرانی بەنگلادێش گەیشت.



**بیگم خالیدە زیا** **خانمی شێخ حوسەینە**

رکەبەری سەرەکی بیگم خالیدە زیا لەم هەڵبژاردنانەدا ژنێك بەناوی خاتوو شێخ حوسەینە، کچی "**مجیب الرحمن**"ی رێبەری خەباتی سەربەخۆیی خوازانەی بەنگلادێشو یەکەمین سەرۆك وەزیرانی ئەم وڵاتە دوای سەربەخۆیی بوو کە بە جیاوازییەکی کەمەوە لە خاتوو بیگم خالیدە شکستی خوارد، بەڵام لە هەڵبژاردنەکانی دواتردا توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێو وەك دووهەمین سەرۆك وەزیرانی ژنی بەنگلادێش دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت. بێنەزیر بوتۆ لە پاکستان بۆ جاری دووهەم بەهۆی پیلانی هاوکارەکانیو بەپشتیوانی سەرکردە سەربازییەکان لەسەرکار لابردراو بە تۆمەتی چەوت کەڵك وەرگرتن لە دەسەڵاتو هەروەها یارمەتیدانی هاوسەری کە پێشتر لە مامەڵە پڕ قازانجەکانی دەوڵەت پووڵو پارەی دزیبوو، کەوتە ژێر راوەدوونان. ئەم تۆمەتانەی کە خرایە پاڵ بێنەزیر بوتۆوە نەسەلمێندرا، بەڵام گەڵاڵە کردنی ئەم تۆمەتانەو ئەو پڕۆپاگەندانەی کە بە دژی ئەو ئەنجام درا، بووە هۆی سەرنەکەوتنی حیزبەکەی



لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی١٩٩٧ی پاکستانو رکەبەری قەدیمی ئەو بەناوی نەوازشەریف جارێکیتر دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت. ئێستاش کە بێنەزیر بوتۆ سەرۆکی کومیتەی بەرهەڵستکاری دەوڵەتە لە پەرلمان، دەستی لە خەبات هەڵنەگرتووەو هیوادارە کە جارێکیتر لە هەڵبژاردنەکانی داهاتووی پەرلمان سەرکەویو ئەمجارەیان ئەگەر سەرکەوت هەندێك چاکسازی لە یاسای بنەڕەتی پاکستان ئەنجام دەدات بۆ ئەوەی رێگە لەسەر هەڵدانی بارودۆخێکیتر بگرێت کە ببێتە هۆی لەسەرکار لابردنی نایاسایی ئەو. لە کۆتایشدا لە هێنددا رێبەرانی حیزبی کۆنگرە دوای دوو جار شکست هێنان لە هەڵبژاردنەکان، جارێکیتریش بیریان لەوە کردەوە کە بە کەڵك وەرتن لە ژن دەتوانن سرنجی رای گشتی بۆ لای خۆیان راکێشنو دەسەڵات بەدەست بگرنەوە. ئیندیراگاندی (کچی نێهرۆ) کە دوای باوکی بەهێزترینو خۆشەویست ترین سەرۆك وەزیرانی هێند بووو راجیۆگاندی کە دوای ئەو بە پۆستی سەرۆك وەزیران گەیشت، کوژرانو ئێستاش رێبەرانی حیزبی کۆنگرە دەیانهەوێ رەزایەتی وەرگرن بۆئەوەی وەك رێبەری حیزبی کۆنگرە لە هەڵبژاردنەکانی داهاتووی هێند بەشداری بکات. سۆنیا گاندیی[١] هاوسەری بەرەچەڵەك ئیتالیایی راجیۆگاندی (ماوەیەك لەمەوبەر پەرتووکێکی پڕفرۆشی لە بارەی هاوسەری نووسی).



**خانمی سۆنیا گاندی**

تا کاتێك ئەم پەرتووکە ئامادەی چاپ دەبێت، سۆنیا گاندی رێبەرایەتی خەباتی سیاسیی بۆ جێنشینی هاوسەری قەبووڵ نەکردووە، بەڵام ئەگەر ئەم پێشنیارەی رێبەرانی حیزبی کۆنگرە قەبووڵ بکات بە ئەگەرێکی بەهێز دەبێتە سەرۆك وەزیرانی داهاتووی هێند.

---

1-Sonia Gandhi

# ژنە دەسەڵاتدارەکانی تری دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم

لەدەیەی کۆتایی سەدەی بیستەمدا (لەساڵی ١٩٩٠بەملاوە) جگە لەم ژنانەی کەلە بەشەکانی رابردوودا باسمان لێوە کردن، پێنج ژنیتر لە بەشە جۆراجۆرەکانی جیهان بە پۆستی سەرۆك کۆماریو سەرۆك وەزیرانی گەیشتوون کە ئاماژەیەکی کورتیان پێدەکەین.

١-لە هەڵبژاردنە گشتییەکانی ساڵی١٩٩٠ی نیکاراگوای، خانمی "ڤیۆلیتا چامۆرۆ"[2] توانی لە رکەبەری سەرەکی خۆی بەناوی "دانیەل ئۆرتێگا"ی رێبەری شۆڕشگێڕی نیکاراگوای بباتەوەو بۆ یەکەمین جار رێژیمی شۆڕشی لەرێگای هەڵبژاردنەوە جێگەی خۆی بەحکوومەتێکی هەڵبژێردراوی دێموکراتی ئەسپارد.

٢-خاتوو "گرۆ هارلێم برۆنتلەند"[3] کە لەساڵی ١٩٩٠دا بەملاوە پۆستی سەرۆك وەزیرانی لە ئەستۆ دایە، کاتێك کە خوێندکاری پزیشکی بوو هاتە نێو جیهانی سیاسەتەوەو دوای بەدەستهێنانی رێبەرایەتی حیزبی کرێکاری نەروێژ بە پۆستی سەرۆك وەزیرانی گەیشت. خانمی برۆنتلەند وەرزش وانەو چەند جار مەودای بەینی ماڵ (لە ئۆسلۆ)و ڤیلاکەی کە لە چل کیلومتری شاری ئۆسلۆیە بەخلیسکانە رۆیشتووە.



**خانمی برۆتلەند، سەرۆك وەزیرانی نەروێژ**

2-Violetta Chamorro

3-Gro Harlem Brundtland



٣- لەسەرەتاکانی ساڵی١٩٩٣دا، خانمی تانسۆ چیلەر[4]ی وەزیری ئابووری کابینەی سولەیمان دێمیرێل، دوابەدوای مردنی "تۆرگۆت ئۆزال"ی سەرۆك کۆماری تووركیەو هەڵبژێردرانی سولەیمان دێمیرێلی سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتی تووركیە بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری، بوو بە جێنشینی ئەوو بۆ یەکەمین جار لەمێژووی تووركیەدا ژنێك بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی هەڵبژێردرا. خانمی چیلەر کە ژنێکی گەنجو دەوڵەمەندو لە هەمانکاتیشدا خوێنکاری ئەمریکا بوو، لەجێبەجێکردنی بەڵێنەکانی بۆ چاکسازی باری ئابووری و چارەسەرکردنی کێشەی کوردەکان سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو دوای سێ مانگ سەرۆك وەزیرانیو دوابەدوای سەرکەوتنی حیزبی ئیسلامی رێفاە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی١٩٩٥ دەستی لە کار کێشاوە.



**خانمی تانسۆ چیلەر سەرۆك وەزیرانی تورکیا**

خانمی تانسۆ چیلەر لە کابینەی هاوبەندی جێنشینی خۆیدا (نجم الدین ئەربەکان) پۆستی وەزیری دەرەوەی وەرگرت، بەڵام ئەربەکان کە رووبەرووی دژایەتی توندی سوپا لەمەڕ جێبەجێکردنی پرۆگرامەکانی ببۆوە، دوای نزیکەی ساڵێك حوکمڕانی ناچار بوو دەست لەکار بکێشێتەوەو هەر بەم هۆیەشەوە تانسۆ چیلەریش پۆستەکەی لەدەست دا. تانسۆ چیلەر بۆ گەڕانەوەی بۆسەر دەسەڵات چاوەڕوانی هەڵبژاردنەکانی داهاتووی تووركیە دەکات.

4-Tansu Gillar



**خانمی تانسۆ چیلەر لە ڕێورەسمێکی ئایینیدا لەنێوان ژمارەیەک  لەلایەنگرەکانی**

٤- لەمانگی ژوییەی ساڵی ١٩٩٣دا، لێخ والّسای سەرۆك كۆماری ئەوكاتی لەهێستان (پۆڵندا) لەنێوان سەرسووڕمانی هاوكارەكانیدا یەكێك لەپەرلمانتارە ژنەكانی لەهێستانی بەناوی "هانا-سوچوكا"[٥] بۆ سەرۆك وەزیرانی ئەم ولاّتە هەڵبژارد. سوچوكا كە لەو كاتەدا ٤٦ ساڵی تەمەن بووو هێستاش زەماوەندی نەكردبوو، لای نوێنەرانی پەرلمانی لەهێستان زۆر خۆشەویستو ناودار بوو، بلاّم هەرگیز كەسێك باوەڕی نەدەكرد ڕۆژێك پۆستی سەرۆك وەزیرانی لەهێستان بەو بدرێت. سوچوكا كابینەیەكی هاوبەندی بە بەشداری وەزیرانی حەوت حیزبی لەهێستان دامەزراندو توانی لەپەرلمانی لەهێستان كە لەوكاتەدا بەتووندی تووشی شێواویو ناكۆكی هاتبووە دەنگی متمانە وەرگرێت. سوچوكا كە باوكی دەرمانسازەو خۆشی دوكتورای مافی هەیە، یەكێك لەسەركەوتووترین سەرۆك وەزیرانی لەهێستانی دوای ڕووخانی ڕێژیمی كۆمۆنیستی ئەو ولاّتەیە. سوچوكا دوای لەسەركار لابرانی لێخ والّسا، پۆستی سەرۆك وەزیرانی لەدەست داوە بەلاّم هێشتاش یەكێك لە نوێنەرە بەهێزەكانی پەرلمانی لەهێستانە.

---

5-Hanna Suchocka





**خاتوو سوچوكا سەرۆك وەزیرانی پۆڵۆنیا**

٥-لەناوەڕاستەكانی ساڵی ١٩٩٣دا، كانەداش بۆیەكەمین جار بوو بە خاوەنی سەرۆك وەزیرانی ژن. یەكەمین سەرۆك وەزیرانی ژنی كانەدا خانمی "كیم كامبێڵ"[٦]ە كە لەتەمەنی ٤٦ساڵیدا بە پۆستی سەرۆك وەزیرانی كانەدا گەیشت. خانمی كامبێڵ ژیانێكی تاڵو پڕ كارەساتی بووەو دوای جیا بوونەوەی دایكو باوكی، سەرپەرشتی باوكی لە ئەستۆە گرتووەو دووجار شووی كردووەو تەلاّقی وەرگرتووەو لە ئاكامدا هاتە نێو جیهانی سیاسەت. خانمی كامبێڵ كە مارگرێت تاچێری كانەدای پێدەڵێن، لەساڵی١٩٩٣دا ڕێبەری حیزبی گەشەسەندنی كانەدای بەدەستەوە گرتو بە وتاربێژی پڕجۆش توانی ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنەكان سەرخات. بەلاّم خانمی كامبێڵ نەیتوانی ئەم چاوەڕوانییە گەورانە جێبەجێ بكات كە لەكاتی پێشبڕكێی هەڵبژاردنەكاندا بە خەڵكی دابووو هەربەم هۆیەشەوە لە هەڵبژاردنەكانی دواتری كانەدا لەحیزبی لیبراڵ شكستی خوارد. لەگەڵ ئەمەشدا خانمی كامبێڵ خەیاڵی گەڕانەوە بۆ سەر دەسەلاّتی هەر لەمێشك دایەو بە سەرۆكایەتی كەمینەی بەرهەڵستكاری دەوڵەت لە پەرلمانی كانەدا خۆی بۆ هەڵبژاردنەكانی داهاتووی پەرلمانی كانەدا ئامادە دەكات.

---

6-Kim Campbell

# لە هاوسەری مائۆوە تا هاوسەری کلینتۆن!

هەر وەك لە بەشەکانی پێشووی ئەم پەرتووکەدا ئاماژەی پێکرا، تەنیا ئەو ژنانەی کە پۆستە فەرمییەکانی وەکوو سەرۆك وەزیری یا خود سەرۆك کۆمارییان وەرگرتووە بە ژنانی دەسەڵاتداری جیهان بە هەژمار نایەن، بەڵکوو زۆر ژنی‌تریش هەبووە کە وەك هاوسەر یان دایكو تەنانەت کچی خاوەن دەسەڵاتەکان، پتر لەو ژنانەی کە پۆستی شاژن یان سەرۆك کۆمارو سەرۆك وەزیرانیان وەرگرتووە لەسەر رەوتی مێژووی ولاتەکەیان یا خود مێژووی جیهان شوێنپەنجەیان داناوە.



**خاتوو جیانگ کینگ، بێوەژنی مائۆ لە دادگا**

وێنەی ئە ژنانە لە رابردوودا بریتیە لە کاترین دۆمێدیسی، دایکی سێ پاشای فەرانسەو لەسەدی هاوچەرخیشدا بریتین لە مەلیکە ئالێکساندرای هاوسەری دوایین تێزاری رووسیاو خانمی ویلسۆنی هاوسەری سەرۆك کۆماری ئەمریکاو لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمیشدا دەتوانین ناوی خانمی "چیانکا یچك"ی هاوسەری دوایین سەرۆك کۆماری چین بەر لەدەسەلاتی کۆمۆنیستەکانو هەروەها خانمی جیانك کینکی هاوسەری مائۆ (رێبەری کۆمۆنیستەکانی چین) بهێنین.بە باوەڕی ئەو کەسانەی کە لە نێزیکەوە لەگەڵ جیانك کینك هەڵسوکەوتیان کردووە (بۆ وێنە پزیشکی تایبەتی ئەو کە لەم دواییانەدا پەرتووکێکی لەسەر ژیانی مائۆ نووسیوە) خانمی جیانك کینك لە هەموو کەس زیاتر کارتێکەری لەسەر رێبەری چین بووەو لەسالانی کۆتایی تەمەنی مائۆدا سەرۆکی راستەقینەی چین بووە. خاتوو جیانك کینك کە لەسەردەمی گەنجێتیدا سەما کارو هوونەرمەندی شانۆ بووە، دوای مردنی مائۆ بە هاوکاریو هاوپەیمانی لەگەڵ رێبەرانی سیاسیو سەربازی چین کە دواتر بە گرووپی چوار



کەسی ناوبانگیان دەرکرد، ویستی کودتایەك ئەنجام بدات و لەم رێگەیەشەوە دەسەلاَت بەدەستەوە بگرێت، بەلاَم سەر نەکەوتو لە دادگاییەکەی پڕدەنگوپەنگدا بە مەرگ مەحکووم کرا. بڕیاری کوشتنی ئەو لەبەر رێزلێنان لە مائۆ گۆڕا بۆ زیندانی ئەبەدیو لە ئاکامدا لە بەندیخانەدا مرد.



**هیلاری کلینتۆن، هاوسەری سەرۆك کۆماری ئەمریکا**

هیلاری کلینتۆن، هاوسەری بیل کلینتۆنی سەرۆك کۆماری ئەمریکا یەکێکی‌تر لە ژنە کارتێکەرو دەسەلاتدارەکانی جیهانە کەلە هەموو کەسێك زیاتر، کارتێکەریی لەسەر هاوسەری هەیەو کلینتۆن لە هەموو بڕیارە سیاسییەکانو هەڵبژاردنی پۆستەکانی دەوڵەتیدا راوێژ لەگەڵ ئەو دەکات. رۆژنامەکانی ئەمریکا لە خانمی کلینتۆن کە لە زانکۆ هاپۆلی کلینتۆن بووەو لەکاتی خوێندکاریدا زەماوەندی لەگەڵ ئەو کردووە، وەك بەهێزترینو کارتێکەرترین خانمی یەکەمی ئەمریکا یاد دەکەنەوەو تەنانەت ژمارەیەك لە رۆژنامەکانی ئەمریکا بە گاڵتە بە جێگەی پرێزیدێنت یان سەرۆك کۆمار، ناوی هاوسەری خانمی هیلارییان لەسەر کلینتۆن داناوە.

لەساڵی ١٩٨٨دا لە ولاَتانی جیهان ٩٦ وەزیری ژن لەسەر پۆستە گرینگەکانی وەکوو وەزیری کاروباری دەرەوە ودادو هەروەها وەزیری کاروباری فێرکردنو پەروەردە خزمەت دەکەن. یەکێك لە دەسەلاَتدارترینیان خانمی "مادلین ئالّبرایت"ی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکایە. لە ئەمریکادا دوای پۆستی سەرۆك کۆماری، پۆستی وەزیری دەرەوە بەرزترین پۆستەو خانمی مادلین ئالّبرایت کە کۆچبەرێکی چێکییە لە زۆربەی کاروبارە گرینگەکانی پەیوەست بە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بە تەنیا بڕیار دەدات.

